# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ئەهلی ئاگر

بابەت : ئاینی

نووسینی : یوسف الحاج احمد

وەرگێڕانی : ابراهیم حسن سعید

تایپ و نەخشەسازی: نوسینگەی هیوا

تیراژ: ( ١٠٠٠ ) دانە

چاپ: ( یەکەم ): هەولێر ( ٢٠١٤ )

لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٤٢٩ ) ساڵی ( ٢٠١٤ ) دراوەتێ

## بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَ لِلَّه نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ ، وَنَعُوذُ بِاللَّه مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا ومن سيئاتِ أعمالنا، مَنْ يَهْدِهِ اللَّهُ فَلا مُضلَّ لَهُ ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورسُولُهُ، أرْسلهُ بالهُدى ودين الحق ليُظهِرَهُ لدِّين كُلِّه ولو كرِهَ الكافرون، وبَعد:

بزانە ئەی موسوڵمان کەوا ئاگر هیچ کەس ناتوانێ بەرگەی بگرێ، چونکە سزای خودایە، ئەو بەندانەی پێ سزا دەدا، کە خۆی بیەوێ، کەسانێکیش، کە خۆی بیەوێ، ڕزگاریان دەکا لێی. خودای گەورە وابکات بە کەرەمو لوتفو بەزەیی منو هەموو باوەڕدارێکی پیاوو ژن ڕزگار بکات لەو سزایە بە ئێشو دژوارە..

لەفەرمودەیەکی (صحیح) دا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ((بەهەشتو ئاگر کەوتنە مشتو مڕ، ئاگر وتی: بۆچی من تەرخانو تایبەت کراوم بۆ ئەو کەسانەی ڕوح گەورەنو زۆردارن، بەهەشتیش وتی: منیش بۆچی تەنها خەڵکی ڕەشو ڕووتو هەژارو برسی دێنە ناوم؟! خوای گەورە فەرمووی بە بەهەشت: تۆ تەنها ڕەحمەتی منی، کێم ویست لەبەندەکانم بە تۆ ڕەحمی پێ دەکەم، بە ئاگریشی فەرموو: تۆش سزای منی کێم بوێ بە تۆ سزای دەدەم، بڕیاریشم داوە کەوا هەردووکتان پڕ بکەمەوە، سەبارەت بە ئاگر ئەوا قەت پڕ نابێ هەتا خوای پەروەردگار پێی پیرۆزی نەخاتە ناو.

جا ئاگر دەڵێت: بەسمە، بەسمە، بەسمە، ئەنجا بەمە پڕ دەبێت و ئەوەی لەنێوی دایە کۆدەکرێنەوەو هەندێکیان بەسەر هەندێکیان دادەڕێن، خودای گەورەش

هیچ زوڵم و ستەمێك لەهیچ کام لەدروست کراوەکانی ناکات، سەبارەت بە بەهەشتیش ئەوا خوای گەورە خەڵکانێکی بۆ سازش و ئامادە دەکات)) (رواه مسلم وهذا لفظه وروى نحوه البخاري وأحمد والبيهقي). هەروەها بزانە کەوا بەهەشت و ئاگر دوو دروست کراوی خودای گەورەن، کە بە هیچ شێوەیەك نارۆن و لەناو ناچن، خودای گەورە ئەوانەی دروست کردووە پێش دروست کراوەکانی تری، بۆ هەردووکیان خەڵکێکی بۆ وەدی هێناون ئەو خەڵکانە ئەوەی بچێتە بەهەشت ئەوا لەچاکەو فەزڵ و بەزەیی خودایە، ئەوەی بچێتە ناو ئاگریش -خودا بمان پارێزێ- ئەوا لەدادگەری خودایە، جا هەر یەکێك لەم خەڵکانە ئەوەی بۆی دانراوە ئەوا دەچێتە ئەوێ ئەمەش بەپێی ئەو کردەوەیەی کە کردویەتی بەبێ ئەوەی زوڵم و ستەمی لێ بکرێ.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (کاتێك خوای گەورە بەهەشت و ئاگری دروست کرد جبریلی نارد بۆ بەهەشت و پێی فەرموو: برۆ سەیری بکەو بزانە لەنێوی دا چیم بۆ خەڵکەکەی سازش داوەو ئامادەکردووە. دەڵێت: جا هات و تەماشای کردو روانیە ئەو شتانەی کە خودای گەورە ئامادەی کردووە بۆ خەڵکەکەی. دەڵێت: جا گەڕایەوە لای پەروەردگارو وتی: سوێند بە گەورەیت هەر کەسێك دەنگ و باسی ئەو بەهەشتە بزانێت کاری بۆ دەکات بۆ ئەوەی بچێتە ناوی، جا فەرمان کرا بە بەهەشت، کە دەورە بدرێت بە میحنەت و ناخۆشی، ئەم جارە فەرمووی: دە ئێستا برۆ تەماشای بکەو بزانە لەنێوی دا چیم ئامادەکردووە بۆ خەڵکەکەی، دەڵێت: گەڕاوە لای بینی دەورە دراوە بە ناخۆشی و مەینەتی جا گەڕاوە لای پەروەردگاری و وتی:

سوێند بە گەورەیت دەترسم کەس نەتوانێ ئەم بەهەشتە بەدەست بێنێ و بچێتە نێویەوە، فەرموی: برۆ تەماشای ئاگر بکەو بزانە چیم ئامادەکردووە بۆ خەڵکەکەی، دەڵێت: چوو سەیری کردو بینی هەندێکی کەوتۆتە سەرهەندێکی، گەڕایەوە لای

پەروەردگارو وتی: سوێند بە گەورەیت هەر کەسێك دەنگو باسی بزانێت خۆی لێ دەپارێزێ بۆ ئەوەی نەچێتە نێویەوە، جا فەرمان کرا بە ئاگر دەورە بدرێت بە خۆشیو لەزەتو شەهەوات، فەرموی: دە ئێستا برۆ تەماشای بکە. ئەویش هەڵسا تەماشای کردو وتی: سوێند بە گەورەیت دەترسم کەس قوتاری نەبێو بچێتە نێویەوە) (رواه ابو داود والنسائي والترمذي واللفظ له وقال : حديث حسن صحيح).

خوای گەورە رێزی لێنام بەوەی بتوانم پەڕاوێك دابنێم بەناوی ((ئەهلی بەهەشت)) کە تیایدا ئەو کەسانەم باس کردووە، کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە، جا هەندێك برا ئاماژەی ئەوەیان بۆ کردم –خوا پاداشتی خێریان بداتەوە–

پەڕاوێك دابنێم پێچەوانەی پەڕاوی یەکەم، کە تیایدا ئەو کەسانە باس بکەم، کە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی مژدەی ئاگریان پێداون، چونکە لەمەوە پەندو ئامۆژگاریەکی زۆری تێدایە، کەوا دەکا موسڵمان بەردەوام لەنێوان خۆشیو ناخۆشی و ترسو هیوا دا بژی..جا پرسم بە خوای گەورە کردو عەزمم جەزم کرد.

ئەنجا من وا لێرەدا داوا لەپەروەردگار دەکەم کەوا ئیخلاسو نیازپاکیم پێ ببەخشێ لەم کارەو هەموو کارەکانی ترمو وا بکات لێمی وەربگرێتو پاداشتم بداتەوە لەرۆژێك ، کە ماڵو مناڵ سودی نیە تەنیا دڵێکی سەلامەتو پڕ نوورو ئیمان نەبێ، هەروا داوای لێدەکەم کە بەرەحمەتی بەرفراوانی خۆی دایكو باوكو خاوو خێزانو وەچەکەم لەئاگر بپارێزێ..

جا ئەوەی لێرەدا دەبێ هەموو بیزانین ئەوەیە، کە کەس بۆی نیە مژدە بداتە کەسێك بە چوونە ژوورەوەی ناو ئاگر مەگەر ئەو کەسە لەبارەیەوە دەقێکی راستو ئاشکرا هەبێت لەکیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) پاشان من ئەوەم لەبیر نەکردووە لەسەرەتای ئەم پەڕاوە چەند شتێکی گرنگ باس بکەم وەك وەسف کردنی

ئاگر و وەسف کردنی ئەو کەسانەی دەچنە نێویەوە —خودا بمان پارێزێ لێی— هەروەها وەسف کردنی ئەو کردەوانەی کەوا زۆربەی خەڵك بەو هۆیەوە دەچنە نێوی، جا بگرە لەو بابەتانەو ئیدیکەش، کە خوای گەورە دەرگای لێکردیمەوە، جا حەمدو سوپاس‌و ستایش هەر بۆ ئەوە... وصلی الله علی الرحمة المهداة محمد بن عبدالله.وآخر دعوانا أنِ الحَمْدُلله ربِّ العالمین

دیمەشقی شام/ یەك شەممە ٢٠/شوال /١٤٢٦

خزمەت گوزاری سوننەت

یوسف الحاج احمد

# پێشەكی وەرگێر:

**الحمد الله والصلاه والسلام على رسول الله وعلى اله واصحابه ومن والاه.**

له ڕاستی دا دوژمنایەتی له نێوان مرۆڤ و شەیتان دوژمنایەتیەكە، ڕەگ و ریشاڵێكی كۆنی هەیە، هەر لەو كاتەوە دروست بووە، كه خوای گەورە ئادەمی دروست كرد، هێشتا ڕۆحی نەهاویشتبووە ناو ئادەم شەیتان دەستی كرد بە سوڕانەوە له دەوری پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ( كاتێك خوای گەورە وێنەی ئادەمی كێشا لە بەهەشت، ماوەیەك وازی لێهێنا، كه هەر خۆی دەزانێ، جا ئیبلیس دەستی كرد بە سوڕانەوە لە دەوری بۆ ئەوەی بزانی ئەوە چییە، كاتێك بینی ناوی بۆشە، زانی كەوا ئەمە دروست كراوێكە خۆی پێ ناگیرێ) رواه مسلم.

كاتێك خوای گەورە (سبحانه وتعالى) روحی فوو كردە لاشەی ئادەم، فەرمانی بە فریشتەكان كرد ڕێزی بگرن، ئیبلیسیش یەكێك بوو لەو كەسانەی كەوا لە گەڵ فریشتەكان عیبادەتی خوای گەورەیان دەكرد، بۆیە فەرمانەكەی خوای گەورە ئەویشی گرتەوە، بەلام ئەو خۆی بە گەورە زانی و ڕێزی ئادەمی نەگرت و فەرمانی پەروەردگاری شكاند بە بەهانەی ئەوەی، كە وتی ﴿قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴿١٢﴾﴾ الاعراف١٢.

كە باوكە ئادەم چاوی هەڵێنا، بینی وا ڕێزێكی زۆری دەگرن لە لایەن باشترین و ملكەچ ترین دروستكراوەكانی خوای بالا دەست ئەویش فریشتە پاكەكانن بەلام لە تەك ئەوەش دوژمنێكی سەرسەخت دەبینی كەوا هەڕەشە لە خۆی و نەوەكانی دەكات و دەیەوێ گومرایان بكات و لە ناویان ببات و بەتبەختیان بكات، شەیتان بەهۆی خۆهەڵكێشان و خۆبەزلزانین خوای گەورە دەری كرد لە بەهەشت بەڵێنێكی لەخوای گەورە وەرگرت بۆ ئەوەی بە زیندوویی بیهێڵێتەوە هەتا ڕۆژی دوایی شەیتان وتی:

﴿قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ

﴿... وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾﴾ الاعراف ١٦-١٧

ئەو وتەیەی شەیتان ئەوە دەردەخا، کە چەندە کۆشش و هەوڵی بێ وچان دەدا بۆ گومڕا کردنی نەوەکانی ئادەم، ئەو لە هەموو ئاراستەکان بۆ مرۆڤ دێت، لە لای ڕاست و چەپ، لە پێشەوە و لە دواوە، ساتێك چیە شەیتان و دار و دەستەکەی پشو نادەن بەڵکو بەردەوامە لە پیلان گێڕان لە دژی نەوەکانی ئادەم بە هەردوو ڕەگەزەوە بۆ ئەوەی بەرەو ئاگری دۆزەخی ببەن.

خوای گەورە (سبحانە وتعالی) زۆر ئاگاداری ئێمەی کردۆتەوە لە قورئانی پیرۆز لە شەیتان و فڕ و فێڵەکانی و کارامەیی و لێزانی لە گومڕا کردن و بەردەوامی و موکڕی لەسەر ئەمە هەر وەکو دەفەرموێ ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾ الاعراف ٢٧.

هەروا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ فاطر ٦.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيْطَٰنَ وَلِيًّا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴾ النساء ١١٩.

دوژمنایەتی شەیتانیش لاناچێ، چونکە ئەو وا دەزانی کەوا خوای گەورە دەری کرد و بێ بەشی کرد لەو بەهەشتە ئەوا بە هۆی باوکمان ئادەمەوە بوو، جا هەر دەبێ تۆڵە لە خۆی و نەوەکانی بسەنێتەوە، هەر وەکو وتویەتی: ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ الاسراء ٦٢.

ئامانجەکانی شەیتان:

شەیتان هەموو هەوڵ و کۆشش و ماندوبونی لەگەڵ مرۆڤ ئەوەیە، کە ئامانجێکی دووری بێتە دی ئەویش ئەوەیە مرۆڤ بخاتە دۆزەخ هەروەکو کە خۆی ئەهلی دۆزەخە و حەسادەتی بە نەوەی ئادەم دێت یەکێکیان بچێتە بەهەشت چونکە خۆی لێی بێ بەشە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز لە بارەی شەیتان دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ فاطر ٦.

ئەمە سەبارەت بە ئامانجە دوورەكەی سەبارەت بە ئامانجە نزیكەكانی ئەوا زۆر زۆرن لەوانەی كە لە هەموویان ترسناكترە.

١-نەوەی ئادەم توشی كوفر و شیرك دەكات بەوەی جگە لە خوا بپەرستن و جگە لە شەریعەتەكەی بگرنە بەر و كار پێبكەن، خوای گەورە فەرموویەتی ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ ﴾ الحشر ١٦

٢-ڕازاندنەوەی گوناه و تاوان پێكردنیان.

ئەگەر شەیتان نەیتوانی نەوەی ئادەم توشی كوفر و شیرك بكات، ئەوا بێ ئومێد نابێت و شێوازێكی تر لە فرِ و فێڵەكانی بەكار دەهێنێ ئەویش گوناه كردنە بە نەوەی ئادەم و تاوان پێ كردنیانە و چاندنی دوژمنایەتی و دووبەرەكیە لە نێوان ڕیزەكانیان پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( شەیتان بێ ئومێد بووە لەوەی لەم وڵاتە ببەسترێ، بەڵام هەر كاتێك ئێوە كارە باشەكانی خۆتان بە بچوك زانی ئەوا ئەو پێی دڵ خۆش دەبێ).

٣-تێك دان و خراپ كردنی كارە باشەكان.

ئەگەر شەیتان نەیتوانی نەوەی ئادەم بگێڕێتەوە لە كاری باش، ئەوا هەوڵ دەدات بۆ ئەوەی ئەو كارە باشانەی دەیكەن تێكی بدات و گەندەڵی بكات و نیەتەكان خراپ بكات بۆ ئەوەی بێ بەشیان بكات لە پاداشت، لە ڕاستی دا شەیتان زۆرێكی لە نەوەی ئادەم ڕەنج بە خەسار دایە بەوەی نیەتیانی گۆڕیوە لە كارە باشەكان بۆ ئەوەی ریا و مەراپی تێدا بكەن بۆ ئەوەی هیچ پاداشتێك لەسەری وەرنەگرن لە لایەن خوای گەورە.

شەیتانی نەفرەتی لە دوو ڕێگاوە نەوەكانی ئادەم هەڵدەخەڵەتێنێ.

١-لە ڕێگای شوبوهات: بەوەی گومان دەخانە ناو بیر و باوەڕیان و وایان لێ دەكات بە گومان بن لە بوونی خوا و پێغەمبەرەكان و فریشتەكان و ڕۆژی دوایی و .... هتد. ئەمەش كە زۆر ترسناكە و وا دەكات نەوەكانی ئادەم هیچ بیر و باوەڕێكیان نەبێت و لەسەر هیچ بیر و باوەڕێك نەبن، تەنها ئەوەی ئەو وەسوەسەی دڵیان دەكات، لەمەش شەیتان زۆر سەركەوتوو بووە و توانیویەتی خەڵكێكی زۆر كافر بكات و بێ باوەڕ بكات چارەسەری ئەمەش بەوە دەكرێ موسوڵمان ڕوو بكاتە زانستە شەرعیەكان و فێریان ببێ بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو گومانانە بداتەوە كە شەیتانەكانی مرۆڤ و جنۆكە بڵاوی دەكەنەوە و بانگەشەی بۆ دەكەن.

٢-لە ڕێگای شەهەوات و ئارەزوو بازی: شەیتان ئەگەر بیر و باوەڕی لاواز و كز كرد و گومانی هاویشتە ناوی ئەوا زۆر ئاسانە و ڕێ خۆشكردنێكە بۆ ئەوەی توشی جۆرەها گوناهیان بكات بگرە لە زینا و جوێن و درۆ و ڕیبا و بوختان و كوشتن و.... هتد. بەڵام ئەگەر ئەو نەیتوانی گومان بخاتە ناو بیر و باوەڕی موسوڵمان ئەوا دەست دەكات بە ڕازاندنەوەی گوناه و تاوان و سەرپێچیەكان و وا دەكات تاوانەكان لە لای نەوەی ئادەم خۆش بكات و وەسوەسەی دەخاتە نێو دڵەكان بۆ ئەوەی بەرە و تاوانەكە بڕۆن، شەیتانیش بۆ ئەوەی یەكێك توشی تاوانێك بكات ئەوا یەكسەر نالێ بڕۆ ئەم تاوانە بكە، بۆ نمونە ئەگەر بیەوێ زینا بە یەكێك بكا، ئەوا یەكسەر نالێ بڕۆ زینا بكە، بەڵكو لە (مقدمات)ی زینا دەست پێ دەكات، یەكەمجار دەڵێ بۆ تەماشای بكە، جا كە تەماشای كرد و دڵی گرتی ئەوا ئەوجارە دەڵێ بڕۆ قسەی لەگەڵ بكە، كە قسەشی لەگەڵ كرد و زیاتر ئاشنای بوو شەهوەتی جوڵاو زیاتر هەردوولا گیرۆدەی یەكتر بوون ئەوا ئەوجارە دەڵێ مەوعیدی لەگەڵ دابنێ و گەشتێك بكەن پێكەوە جا كە مەوعیدەكە دانرا ئەوا ئەو كارەی ئەو دەیویست دێتە دی، بەڵام بە هەر حال ئەگەر موسوڵمان خاوەن عەقیدەیەكی ڕاست و دروست بێت ئەوا با ساتێك لە ساتەكانیش شەیتان فێڵی لێ كرد و

توشی تاوانی کرد ئەوا یەکسەر ئەو بیرو باوەڕی وایە، کە خاوەن خوایەکی بەزەییەو لە گوناهەکان خۆش دەبێ و تۆبە وەردەگرێ و خۆی بە هەڵە دەزانێ کەوا ئەم گوناهەی کردووە، بەڵام ئەو کەسەی عەقیدەی گۆڕاوە و بە گومانە لێی ئەوا بۆچی خۆی بە هەڵە بزانێ؟! بەڵکو دەبینی ئەوەی لەسەریەتی هەر ئەوە ڕاستە و ئیتر بۆ چی بگەڕێتەوە و تۆبە بکات!

خوای گەورە (سبحانه وتعالى) لە گوناهەکانی بەندەکانی خۆش دەبێ بە مەرجێك ئەگەر:

١-تاوانەکە ئاشکرا نەکات لەناو خەڵکی و باسی نەکات، بەڵکو لە نێوان خۆی و خوایدا بگەڕێتەوە و تۆبە بکات و ئابڕوی خۆی نەبات لەناو خەڵکی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( خوای گەورە لە گوناهی ئوممەتەکەم خۆش دەبێ تەنها ئەوانە نەبن کەوا گوناهەکانیان ئاشکرا دەکەن ئاشکرا کردنی تاوانیش وەکو ئەوەی پیاوێك بەشەو گوناهێك دەکات، پاشان بەیانی دەکاتەوە و خواش گوناهەکەی داپۆشتووە، بەڵام ئەو دەڵێ: فلان ئەم شەو ئەوها و ئەوهام کرد، لە کاتێك خوای گەورە داپیۆشتبوو بەڵام ئەو هەڵسا بە لادانی ئەو پەردەیە).

٢-پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ( چەند کەسانێك دەناسم لە ئوممەتەکەم، کە دێن لە ڕۆژی دوایی، کە چاکەی وایان کردیە وەکو چیای (تەهامە)ن لە سپیاتی بەڵام خوای گەورە دەیکاتە خۆڵەمێش و پەرت و بڵاویان دەکات) یەکیان دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا سیفەتی ئەوانەمان بۆ باس بکە، چونکە نەوەك ئێمە لەو کەسانە بین و نەشزانین. فەرمووی: ( ئەوان براتانن و لە ئێوەن و شەونوێژ دەکەن وەکو ئێوە، بەڵام کاتێك تەنها دەبن لەگەڵ خۆیان و کەسیان لێ دیار نیە ئەوا سنورەکانی خوای گەورە دەبەزێنن)

جا با ئێمە مەردی خوا بین و بە گوێی پەیامبەری خوا محمد (ﷺ) بکەین و ڕاستە شەقامی ئیسلام بگرین و شەیتان بە دوژمنی خۆمان بزانین بۆ ئەوەی ڕزگارمان بێت لە ئاگری دۆزەخ و شاد بین بە بەهشتەکەی خوای گەورە، خودایە خۆم و نەوەم و باوك و دایك و موسوڵمانە باوەڕدارەکانم بە پیاو و ژنەوە بپارێزی لە فڕ و فێڵەکانی شەیتان و بمان پارێزی لە ئاگری دۆزەخ و بە بەهەشتی فیردەوسمان شاد بکەی.

**وەرگێڕ**

# بەشی یەکەم

## باس کردنی ئاگر لەقورئانی پیرۆز

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغْنِيَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۚ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾﴾ آل عمران: ١١٦

**واتە: ئەوانەی بێ بڕوابوون هەرگیز سودیان پێ ناگەیەنن نەماڵەکانیان نە منداڵەکانیان لەلای خوای گەورە ئەوانە هاوەڵی ئاگرن‌و بە هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە.**

هەروەها دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾﴾ آل عمران: ١٩٢

**واتە: پەروەردگارا بەراستی تۆ هەر کەس بخەیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئیتر شەرمەزارو ریسواو خەجاڵەتت کردووە، (جا بێگومان لەوێ) ستەمکاران هیچ جۆرە پشتیوانیەکیان نیە.**

هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾ النساء: ١٤٥

**واتە: بەراستی دووڕووەکان لەچینی هەرە خوارێی ناو دۆزەخ دان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت.**

هەروەها دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَاۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾﴾ المائدة: ٣٧

واتە: ئەوانە دەیانەوێ لەدۆزەخ دەربچن (بەڵام خەیاڵیان خاوە) لەکاتێکدا دەرچونیان لێی نیە، ئەوانە سزایەکی بەردەوامیان بۆ ئامادەیە.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُوا۟ يَـٰلَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأنعام: ٢٧

واتە: جا ئەگەر ئەوانە ببینی (لەقیامەتدا) لەسەر لێواری دۆزەخ راوەستێنراون (بەدەم حەسرەتو ئاهو ناڵەوە) جا دەڵێن: خۆزگە جارێکی تر گێڕاینایەتەوە بۆ دونیا (لەم سەر ئەنجامە شومە رزگارمان دەبوو) ئەوسا هەرگیز نیشانە و بەڵگەو ئایەتەکانی خوامان بەدرۆ نەدەزانیو، باوەڕی بەتینمان پێی دەبوو.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾الأعراف: ٣٦

واتە: (بەڵام) ئەوانەش بڕوایان بە ئایەتو فەرمانەکانی ئێمە نەبووە، لووت بەرزبوون بەرامبەریان ئائەوان نیشتەجێی ناو ئاگری دۆزەخنو بەهەمیشەیی تیایدان.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾هود: ١٠٦

واتە: جا ئەوانەی بەدبەختو چارە رەش بوون، ئەوا لەناو ئاگردان، هەناسە هەڵمژینو هەناسەدانەوەیان زۆر سەختو دژوارە

هەروەها دەفەرموێ: هەروەها دەفەرموێ:﴿ لَوْ يَعْلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمْ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾الأنبياء: ٣٩

واتە:ئەگەر بێ باوەڕان هەواڵی ئەو ڕۆژەیان بزانیایە(کە بەڕێوەیەو نزیکەو دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە)، کاتێك ناتوانن بڵێسەی ئاگر لەدەمو چاوو روخسارو لەپشتیان دوور بخەنەوە، بەراستی ئەوانە سەرکەوتوو رزگار نابن (ئەوانە نە گاڵتەیان دەکرد و نە بێ باوەڕ دەبوون و نە پەلەیان دەکرد).٩٦

هەروەها دەفەرموێ:﴿ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ ﴾المؤمنون: ١٠٧ - ١٠٨

واتە: پەروەردگارە لەناو ئاگری دۆزەخ‌و سزاکەی دا دەرمان بهێنە ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە (بۆ گومڕایی) ئەوە ئیتر دیارە ئێمە کەسانێکی ستەمکارین، (خوای گەورە لەوەڵامیاندا بە توڕەییەوە) دەفەرموێت: بێ دەنگ بن‌و دەمتان داخەن قسەشم لەگەڵدا مەکەن.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَمَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٥٧﴾ ﴾النور: ٥٧

واتە: وامەزانە ئەوانەی کە بێ باوەڕو خوانەناس بوون لەدەست سزاو تۆڵەی خودا لەسەر زەوی رزگاریان دەبێ، ئەوانە لەقیامەتدا شوێنیان ئاگری دۆزەخە، ئای! چ سەرەنجامێکی خراپە.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾النمل: ٩٠

واتە:ئەوەش بە تاوان‌و گوناهو خراپەوە دێت، بەرووداو سەرەو خوار دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە و (پێیان دەوترێت): ئایا پاداشتان دەدرێتەوە جگە لەوەی دەتان کرد؟!

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُواْ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ السجدة: ٢٠

واتە: ئەوانەش تاوانبارو یاخی بوون، شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە ، هەر کاتێك ویستیان لێی دەربچن، دەگێڕدرێنەوە بۆ ناوی، پێیان دەوترێت: بچێژن سزای ئەو ئاگرەی ، کە بڕواتان پیێ نەبوو.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ ﴾الأحزاب: ٦٦

واتە: ڕۆژێك دێت ئەم دیو ئەو دیوی پێدەکرێت لەناو ئاگردا (تا چاك ببرژێن و بسوتێن) بە دەم ئاهو ناڵەوە دەڵێن: ئای خۆزگە فەرمان بەرداری خوا بوینایە، گوێڕایەڵی پێغەمبەر بوینایە.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ ﴾الزمر: ١٦

واتە: ئەوانە لەسەروویانەوە پەڵە هەوری دووکەڵ لەئاگر دەوری داون لەژێریشیانەوە هەمان پەڵە هەورو دووکەڵ هەیە، ئا بەو شێوەیە خوای گەورە بەندەکانی دەترسێنێت و پێیان دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم پارێزگار بن و خۆتان لەسزای من بپارێزن.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِى ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ ﴾الزمر: ١٩

واتە: جا ئایا ئەو کەسەی کە بەهۆی خراپیو خوانەناسیەوە بڕیاری سزادانی دابێت، تۆ هیچ کارو باری ئەوت بەدەستە...ئایا تۆ دەتوانیت ئەو جۆرە کەسانە ڕزگار بکەیت کە لەناو ئاگری دۆزەخدا گیریا خواردووە؟!

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ﴾غافر: ٦

واتە: ئا بەو شێوەیە بڕیاری پەروەردگاری تۆ ئەی محمد (ﷺ) چەسپا بەسەر ئەوانەدا کە خوانەناسو بێ باوەڕ بوون، بەڕاستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ۖ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾ ﴾غافر: ٤٦

واتە: ئاگری دۆزەخە کە بەیانیانو ئێواران نیشانیان دەدرێت، یاخود پێیان دەچێژنرێت، لە(جیهانی بەرزەخ)دا ڕۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت ئا دەی تاقمو دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێشو ئازاری زۆر ناخۆشەوە.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ يَتَحَآجُّونَ فِى ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴿٤٧﴾ ﴾غافر: ٤٧

واتە: ئەو کاتە ئیتر شەڕو کێش دەست پێ دەکەن لەناو ئاگری دۆزەخ دا، لاوازو چەوساوەکان بەدەسەڵات دارو لووت بەرزەکان دەڵێن: خوا بەڕاستی ئێمەی شوێن کەوتەی ئێوە بووین، ئایا ئێوە ناتوانن تۆزێك سزای ئاگرمان لەسەر کەم بکەنەوە؟.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُواْ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓاْ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُواْ بَلَىٰ ۚ قَالُواْ فَٱدْعُواْ ۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾غافر: ٤٩ - ٥٠

واتە: ئینجا ئەوانەی کە لەناو ئاگری دۆزەخ دان بەفریشتەکانی کارگێڕی دۆزەخ دەڵێن: داوا لەپەروەردگارتان بکەن تەنها ڕۆژێك سزاو ئازارمان لەسەر کەم بکاتەوە ، ئەوانیش لەوەڵامی داخوازیەکەیان دا دەڵێن: باشە، مەگەر پێغەمبەرەکانتان بەبەڵگەو نیشانەی ڕوونو ئاشکراوە ڕەوانە نەکرابوون بۆتان؟ هەمووان بەیەك دەنگ دەڵێن: بەڵێ ڕاستە، ئینجا فریشتەکان دەڵێن: دەی کەوابوو هەرداوا بکەنو بپاڕێنەوە بێ گومان داخوازیو پاڕانەوەی کافران بەهیچ ناچێت، تازە هیچ نرخێکی نیەو گیرا نابێت.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ ۖ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾فصلت: ٢٨

واتە: ئا ئەوەی پاداشتی دوژمنانی خودا هەر ئاگرەکەی دۆزەخە، کەماڵو نیشتەجێی هەمیشەییانە لەتۆڵەی ئەوەی کە سەرسەختانە بەرەنگاری ئایەتەکانی ئێمەیان دەکرد.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾الجاثية: ٣٤

واتە: پێیان دەوترێت لەمڕۆ بەدواوە ئێوە فەرامۆش دەکرێن و پشت گوێتان دەخەین، هەروەکو چۆن ئێوە بڕوابوونتان بەم ڕۆژە فەرامۆش کرد، شوێنی نیشتەجێو حەوانەوەشتان ناو ئاگری دۆزەخە، کەسیشتان دەست ناکەوێت پشتیوانیو پشتگیریتان لێ بکات.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنْتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنْتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾الأحقاف: ٢٠

واتە: ڕۆژێك دێت، کە بێ بڕوایان بەرەو دۆزەخ دەبرێن و نیشانتان دەدرێتو پێیان دەوترێت: هەرچی خۆشیو شادیەکتان هەبوو لەژیانی دونیاتاندا ئەنجامتانداو بە ئارەزووی خۆتان ڕاتان بوارد، کەوا بوو ئەمڕۆ ئیتر نۆرەی ئەوەیە کە سزای خەجالەتیو ڕیسوایی بدرێنەوە، بەهۆی ئەوەی کە لووت بەرزیتان دەکرد لەزەویدا بە ناحەقو بەهۆی دەرچوونتان لەسنووررو فەرمانی خودا.

هەروەها فەرمووی:﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾الأحقاف: ٣٤

واتە: ڕۆژێك دێت کافرو خوانەناسان دۆزەخیان نیشان دەدرێت و پێیان دەوترێت: ئێستا دەڵێن چی؟! ئا ئەمە ئیتر حەقو حەقیقەتو ڕاستەقینە نیە؟! (هەموو بەیەك دەنگ) دەڵێن: بەڵێ سوێند بە پەروەردگارمان ڕاستەو هەقە (بەڵام ئەو سوێند خواردنو دان پێدانانە، تازە بێ سوودە) بۆیە خوا دەفەرموێت: مادەم وایە سزاو ئەشکەنجەی ناو ئاگر بچێژن لەسەر ئەنجامی بێ بڕوایی و کافربونتاندا.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ ﴾القمر: ٤٨

واتە: ڕۆژێك دێت لەسەر ڕوویان ڕادەکێشرێن لەناو ئاگری دۆزەخدا، پێیان دەوترێت، دە بچێژن تاڵاوی دۆزەخ.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ﴾الحديد: ١٥

واتە:ئەمڕۆ هیچ جۆرە پاکانەو بارمتەیەك لەئێوەو لەوانەش، کە بێ باوەڕ بوون وەرناگیرێت، شوێنەوارو مەنزڵگای هەموتان ئاگری دۆزەخە، هەر ئەو شایستەتانە، ئای چ سەرەنجامێکی خراپو نالەبارە.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ لَّن تُغْنِىَ عَنْهُمْ أَمْوَٰلُهُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ ﴾المجادلة: ١٧

واتە:نەماڵو سامانیان نە ڕۆڵەکانیان هەرگیز نابنە هۆی ئەوەی، کە لەدەست تۆڵەی خودا ڕزگاریان بکات، ئەوانە نیشتەجێی ناو دۆزەخن و تیایدا بۆ هەمیشە بە زیندوویی دەمێننەوە.

هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٠﴾ ﴾التغابن: ١٠

واتە:ئەوانەش کە بێ باوەڕ بوون و ئایەتو فەرمانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی، ئا ئەوانە نیشتەجێی ناو ئاگرنو ژیانی نەبڕاوە تیایدا دەبەنە سەر، ئای کە سەرەنجامێکی زۆر ناخۆشو نالەبارە.

# نمونەی منو نمونەی ئوممەتەكەم

عن أبى هُريره –رضي الله عنه– قال قال رسول الله(ﷺ) (( أنّما مثلي وَمَثَلَ أمتي كَمَثَلِ رَجُلٍ استَوقَدَ ناراً، فَجَعَلَت الدَوابُّ والفراشُ يَقَعْنَ فيه، فأنا آخِذُ بِحجزِكم وأنتُم تُقحمون فيه: نمونەی منو ئوممەتەكەم وەكو نمونەی پیاوێك وایە ئاگرێك بكاتەوە، چوارپێیەكانو باڵندەی وەك پەپوولە دێن خۆیان داوێنە ناوی، منیش لچكی كراسەكانی ئێوە دەگرم بۆ ئەوەی نەكەونە ناوی بەڵام ئێوە خۆتان داوێنە ناوی) رواه مسلم.

وفى روایه (مَثَلي كَمثلِ رَجُلٍ استَوقدَ ناراً، فَلمّا أضاءَتْ ما حَولَها جَعَلَ الفراشُ وهذهِ الدوابُّ التي في النّار يَقَعْنَ فيها، وجَعَلَ يَحْجُزُهُنَّ ويَغلِبْنَهُ فَيَتَقَحّمْنَ فيها، قال فذلك مَثلي وَمَثَلَكُمْ، أنا آخذُ بِحُجَزكم عن النّار، هَلُمَّ عن النّار، هَلُمَّ عن النّار ، فَتَغلبوني تُقَحَّمون فيها: نمونەی من وەك نمونەی پیاوێك وایە ئاگرێك بكاتەوە، جا كاتێك ئاگرەكە چوار دەوری خۆی رووناك كردەوە پەپولەو گیاندارەكان هاتن بۆ ئەوەی خۆیان باوێنە ناویٚ پیاوەكەش كلكو گوێیانی دەگرت بۆ ئەوەی نەكەونە ناوی، بەڵام ئەوان بەسەری زاڵ دەبوونو خۆیان دەهاوێشتە ناوی، دەڵێت: نمونەی منو ئێوەش وەكو ئەمە، لچكی كراسەكانتان دەگرمو دەڵێم: ئاگاتان لەئاگر بیٚ و نەكەونە ناوی، ئاگاتان لەئاگر بیٚو نەكەونە ناوی، بەڵام ئێوە بە قسەم ناكەنو زاڵ دەبن بەسەرمو دەڕۆنە ناوی) رواه مسلم.

زانایان دەفەرموون: (حُجَزة) و(مَعْقد) شوێن گرتنی پۆشاكی مرۆڤن، جا ئەگەر یەكێك بیەویٚ یەكێك بگرێتەوەو نەیەڵێت بەرببێتەوە ئەوا ئەو شوێنانەی پۆشاكی دەگرێت بۆ ئەوەی بەر نەبێتەوە...ئەمەش نمونەیەكە لە ماندوبوونی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئەوەی رزگارمان بكاو، نەیەڵێت بكەوینە ناو ئەو گوناهە لەناوبەرانەی لەبەردەماندایە، چونكە پێغەمبەر (ﷺ) لەنەفسی خۆمان لەپێشترە بۆمان، جا ئێمە

به هۆی نەزانیو نەفامیمانو بەهۆی زاڵ بوونی هەواو ئارەزوو بازی وای لێهاتووە دوژمنە نەفرەتیەکەمان بەسەردا زاڵ دەبیٚ بەوەی ببینە پەپولەیەك یان بەرخێك بەڵکو کەمتر لەمانە، (ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم).

پێشەوا (نووی) – رەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بەربوونەوەی نەفامو سەرپێچی کەران بەوەی ئەنجامی دەدەن لەگوناهو تاوان و ئارەزووبازی بۆ ناو ئاگری رۆژی دوایی و موکوڕیان لەسەر ئەم کارەو لەگەڵ ئەوەی کە نایەڵێت بکەونە ناویو جلو بەرگیان دەگرێت، بەوەی چواندوە کاتێك لەئاگری دونیا پەپولەکان خۆیان بە ئاگر دادەنو خۆیان داوێنە ناویەوە چونکە ئارەزویان وایەو هۆشیان نیە، جا ئەوانە هەردوکیان لەنەفامی خۆیان موکوڕن لەسەر ئەوەی خۆیان بفەوتێننو بەهیلاك ببەن. خودای گەورە بەگەورەییو دەسەڵاتی خۆی لەوەمان بپارێزیٚ.

# بەشی دووەم

# سیفەتی ئاگر

(خودا بمان پارێزێ)

●(ابن مسعود) –رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت –دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لەرۆژی دواییدا ئاگر دێنن، کە حەفتا هەزار قوڵپی هەیە، هەر قوڵپێکیش حەفتا هەزار فریشتەی لەلایە رای دەکێشن) (رواه مسلم).

## ئاگر دەبینێ و قسە دەکا

خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾﴾ الفرقان: ١٢

واتە: کاتێك هەر لەدوورەوە ئەو ئاگرە بڵێسەدارە خوانەناسان دەبینێت دەنگی خەشمو قینو هەناسەی داخ لەدڵی دەبیستن.

●(أبو هُريره) – رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: (لەرۆژی قیامەت پارچەك لەئاگر لەشێوەی مل دێتە دەرێ دووچاوی هەنە پێیان دەبینێو، دوو گوێچکەشی هەنە پێیان دەبیستێو، زمانێکی هەیەو قسەی پێدەکاتو دەڵێت: خودای گەورە رای سپاردوم سێ کەسان بسوتێنم و سزا بدەم: خاوەن دەسەڵاتێکی سەرکەشو ستەم کار، هەر کەسێك هاوبەشو شەریك بۆ خوا ئەنجام بدا، لەگەڵ وێنەکێشەکان (المُصوّرين) (حديث صحيح، رواه أحمد، والترمذي والبهقي).

## چین‌و پلەکانی ئاگر

بزانە کەوا ئاگر حەوت چین‌و پلەی هەیە، عەرەب لەزمانی خۆیان (أدراك) بەکاردێنن بۆ هەر پلەیەك دابەزێتە خوارەوە. بۆ نمونە (للبئر أدراك) واتە: بیر چەند پلەیەکی هەیە بۆ خوارەوە، بەوەی بڵندیش بێت بۆ سەرەوە پێی دەڵێن (أدراج)، کەواتە بەهەشت (أدراج)ی بۆ بەکاردێ و ئاگریش (أدراك)ی بۆ بەکاردێت.

بەرزترین پلەی ئاگر (جهنم)ە پاشان (لظى) پاشان (الحُطَمة) پاشان (السعير) پاشان (السقر) پاشان (الهاوية) هەموو ئەو ناوانەش بە ناوی پلەی یەکەم ناودەبرێن. خودای باڵا دەست بە بەخشش‌و بەزەیی خۆی لەسزای ئەو ئاگرە بمان پارێزێ. (تفسير القرطبي).

## گڕو تینی گەرماییەکەی

● (أبو هريره) – رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت– لە پێغەمبەری (ﷺ) گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: ((ئەو ئاگرەی ئێوە، کە نەوەی ئادەم بەکاری دەهێنێ بەشێکە لەحەفتا بەشی ئاگری (جهنم). وتیان: وەڵڵاهی هەر ئاگری دونیا کافیە بۆ سزادان! فەرمووی: ((ئاگری دۆزەخ شەست‌و نۆ هێندەی ئاگری دونیا گەرمترو بەگڕوتین ترە)) رواه مالك والبخاري ومسلم.

● هەر ئەو فەرمودەیە پێشەوا (أحمد) و (ابن حبان) و (بيهقي) بە زیادەیەك گێڕاویانەتەوە کە: ((ئاگری دۆزەخ دوو جار بە ئاوی رووبار دادراوە، ئەگەر وانەبا خوای گەورە سودی بۆ هیچ کەسێك تێدا نەدەهێشتەوە)) (حديث صحيح).

● لەریوایەتی (بيهقي) شدا هاتووە، کەوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((وا گومان دەبەن، کە ئاگری دۆزەخ وەکو ئەو ئاگرەی ئێوە وایە؟ ئاگری دۆزەخ لەقیر

رەش ترە ، بەشێکە لەشەش ئەوەندە بەشە یان چلو هەندێك بەش)) راوی ئەم فەرمودەیە (أبو سُهیل)ە کەوتۆتە گومان، کە ئایا شەستو هەندێکە یان چلو هەندێك.

● (أبو هریرە) –رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر لەو مزگەوتە هەزار کەس یان زیاتری لەنێو بێت و لەناویان یەکێکی ئاگری تێدا بێت ئەگەر بەس بێتو هەناسەیەك بداتو هەناسەکە بەریان بکەوێت ئەوا مزگەوتو ئەوەی لەنێویشی دایە دەیسوتێنێت ) (رواه أبویعلی واسنادە حسن، وقیل فی متنه نکارة، وصححه الالبانی).

● (ابن عباس) –رەزاو رەحمەتی خوای لێ بێت – لەبارەی فەرمایشتی خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍ بَعِيدٍ﴾الفرقان: ١٢

واتە: کاتێك دۆزەخ کافرو خوانەناسەکان دەبینێ لەدووری سەدساڵە رێ.

ئەمەش لەم کاتەیە، کە دۆزەخ دەهێنن هەفتا هەزار قوڵپی هەیە هەر قولپێك حەفتا هەزار فریشتە رای دەکێشن، گەر بەری بدەن پڕ دەداتە هەموو چاكو خراپێك .﴿سَمِعُوا لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾﴾الفرقان: ١٢

واتە: دەنگی خەشمو قینو هەناسەی داخ لەدڵی دەبیستن.

هەناسەیەك دەدا لەبەتینیو گڕی گەرماییەکەی دڵۆپە فرمێسکێك چیە نامێنێ لەچاو، پاشان هەناسەیەکی تر دەدات دڵەکان هەمووی لەشوێنی خۆی دەپچڕێنێ، هەروا گەروشیان دەپچڕێنێ هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَبَلَغَتِ الْقُلُوبُ الْحَنَاجِرَ ﴿١٠﴾﴾الأحزاب: ١٠

واتە: کاتێك دڵەکان گەیشتبونە گەروو) (رواه آدم ابن ابی إیاس فی تفسیرە موقوفا) (ضعیف موقوف)

## تاریکایی و رەشیو پڕوشکەکانی ئاگر

●(أبو هريرە) –ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت– لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی ((هەزار ساڵ ئاگر سوتێنرا هەتا سور هەڵگەڕا، پاشان هەزار ساڵی تر سوتێنرا هەتا سپی هەڵگەڕا، پاشان هەزار ساڵی تر سوتێنرا هەتا ڕەش بوو، ئێستا ڕەشە وەك شەوی تاریك)) ((رواه الترمذي وقال حديث أبي هريرة هذا موقوف، ولا أعلم أحداً رَفَعَهُ غير يحيى بن أبي بكير عن شريك) (فيه ضعف لأجل شريك).

هەر ئەم فەرمودەیە (مالك) ریوایەتی کردووەو (بيهقی) لە(شعب الايمان) بە (مختصر)ی (رفع)ی کردووە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرمویەتی ((وادەزانن ئاگری دۆزەخ وەکو ئاگری ئێوە سورە بەڵکو لەقیر ڕەش ترە)).

(رزين)یش بەزیادەیەکی تریش گێڕایتیەوە، کە دەڵێ ((ئەگەر ئەهلی ئاگر بێنە ناو ئاگری ئێوە ئەوا لەناوی پاڵ دەدەنەوەو دەخەون)).

## دۆڵو چیاکانی ئاگر

●(أبی سعید) – ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی ((ویل)) دۆڵێکە لەدۆزەخ ، چل پایز کافری فڕێ دەدەنە ناو هێشتا ناگاتە بنی) (رواه الامام احمد).

پێشەوا (ترمذي)یش ئەم فەرمودەیەی ریوایەت کردووە ، بەڵام بەم بێژەیە، کە پێغەمبەری (ﷺ) دەربارەی (ویل) دەفەرموێ : ((دۆڵێکە دەکەوێتە نێوان دوو چیاوە ماوەی چل پایز کافری فڕێ دەدەنە ناو هێشتا ناگاتە بنی)).

هەر ئەم فەرمودەیە (ابن حبان) ریوایەتی کردووەو ، (بيهقی)یش لەڕێگای (حاکم)ەوە کە دەفەرموێ (کافری تێ هەڵدەدەنە ناویەوە ، ماوەی چل پایز پێش

ئەوەی حیساب‌و کیتابی خەڵکی تەواو ببێت)) (قال الحافظ رووه كلهم عن طريق عمرو بن الحارث عن درّج، عن أبي الهيثم الا الترمذي فانه رواه من طريق ابن لهيعة عن درّاج، وقال: غريب لا نعرفه إلا من حديث ابن لهيعة عن درّاج)) (فيه ضعف).

*(أبی سعيد) – ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ – لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کەوا لەبارەی ئایەتی ﴿ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾ ﴾المدثر: ١٧ فەرمویەتی: ((چیایەکە لەئاگر ئەرك بار دەکرێ بەوەی سەربکەوێ، جا، کە دەستەکانی دانا سەری دەتاوێتەوە ئەگەر هەڵیشی گرت وەکو خۆی لێدێتەوە،ئەگەر پێیەکانیشی لەسەر دانا دەتاوێنەوە گەر هەڵیشی گرت وەزعی وەکو خۆی لێ دێنەوە، حەفتا پایزی پێدەچی هەتا دەگاتە سەری پاشان دەکەوێتە خوارەوە بە هەمان ئەو ماوەیەی، کە سەری سەرکەوتووە)). (رواة أحمد بنحوه، والحاكم عن طريق درّاج أيضاً، وفيه ضعف).

## قوڵی‌و دووری بنەکەی

● (خالد)ی کوڕی (عمیر) دەڵێت: (عُتْبة)ی کوڕی (غزوان)– ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ– وتارێکی خوێندەوەو تیایدا وتی: بۆمان باس کراوە ، کەوا بەردێك لەسەر لێواری دۆزەخ تێ هەڵدەدەنە ناوی حەفتا ساڵ شۆڕ دەبێتەوە هێشتا ناگاتە بنی، خوای گەورەش بەڵێنی داوە پڕیشی بکاتەوە، ئایا لاتان سەیرە؟ (هكذا رواه مسلم).

●(حسن) –ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەڵێت: (عُتبە)ی کوڕی (غزوان) – ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ –لەسەر ئەو مینبەرەی ئێمە واتە مینبەری بەسرە – دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بەردێکی گەورە لەسەر لێواری دۆزەخ فڕێ دەدەنە ناو دۆزەخ حەفتا ساڵی پێدەچێ هێشتا ناگاتە بنی)). (عمر)یش – ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێ بێ – دەی ووت: زۆر یادی ئاگر بکەن چونکە گەرمیەکەی زۆر

بەتینەو، بنەکەی زۆر دورو قوڵە، قامچیەکانیشی لەئاسنن. (رواه الترمذي وقال: لا نعرف للحسن سماعاً للعتبة بن غزوان، وإنما قدِم عتبة بن غزوان البصرة في زمن عُمر ، وولد الحسن لسنتين مضت من خلافة عمر (حديث صحيح لغيره).

● (أبی موسی)ی (الاشعری) -رەزاو رەحمەتی خوای لیٚ بیٚت-لەپیٚغەمبەری خوا (ﷺ) ریوایەت دەکات، کە فەرمویەتی (ئەگەر بەردیٚك حەفتا پایز فرِیٚ بدریٚتە ناو دۆزەخ هیٚشتا ناگاتە بنی)). (رواه البزّار وأبو يعلى وابن حبّان في صحيحه، والبيهقي كلهم من طريق عطاء بن السائب) (حديث صحيح لغيره).

● (أبو هريره) -رەزاو رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ- دەڵیٚت: لەلای پیٚغەمبەری خوا بووین(ﷺ) گویٚمان لەدەنگی کەوتنە خوارەوەی شتیٚك بوو، فەرمووی: ((دەزانن ئەوە چیە؟)) وتمان: خواو پیٚغەمبەرکەی زاناترن، فەرموی ((ئەوە بەردیٚکە خوای گەورە ماوەی حەفتا پایزە فرِیٚی داوەتە ناو دۆزەخ ئیٚستا گەیشتە بنی)) (حديث صحيح رواه مسلم).

● (معاذ)ی کوری (جبل) - رەزاو رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ - هەواڵی داوە، کەوا پیٚغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((سویٚند بەو کەسەی نەفسی منی لەدەستە لە لیٚواری ئاگر تا دەگاتە بنەکەی قوڵیو دووریەکەی وەك بەردیٚك وایە، کە کیٚشەکەی بە قەد حەوت وشتری ورگ پرِو قەڵەو وایە فرِیٚدریٚتە ناو ئاگر ماوەی حەفتا پایز هیٚشتا ناگاتە بنی)) ((رواه الطبراني ورواته رواة الصحيح، إلا أن الراوي عن معاذٍ لم يُسم ) (حديث صحيح لغيره).

# زنجیرەكانی ئاگر

● (عبدالله)ی كوڕی (عمرو) –ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ– دەڵێت: پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر پارچە قورقوشمێك وەكو ئەمە )) ئاماژەی بۆ جامێك كرد ((لەئاسمانەوە بنێردرێتە سەر زەوی، كە پێنج سەد ساڵ ڕۆژە ڕێیە ئەوا پێش ئەوەی شەو دابیٚ دەگاتە سەری، ئەگەریش پارچە قورقوشمەكە لەسەری زنجیرێك قایم بكرێتو پاشان شۆڕ بكرێتەوە ئەوا ماوەی حەفتا پایز دەڕوات هێشتا ناگاتە كۆتاییەكەی )) ((رواه أحمد والترمذي والبيهقي كلهم من طريق درّاج عن عيسى بن هلال الصدفي عنه، وقال الترمذي: اسناده حسن)).

●(يَعلى)ی كوڕی (مُنْيَة) – خوای لیٚ ڕازی بیٚ – ئەم فەرمودەیەی بەرزكردۆتەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) كە فەرمویەتی ((خوای گەورە پارچە هەورێكی تاریك دروست دەكات جا دەوتریٚ: ئەی ئەهلی ئاگر چ شتێك داوا دەكەن؟ ئەوانیش بەو پارچە هەورە هەوری دونیایان بەبیردێتەوە، دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئاومان دەویٚ جا كۆتو زنجیریان بۆ دەبارێنیٚ، كە زیاتر دەستو پیٚو دەمیان دەبەستێتەوەو، زیاتر ئاگر گڕیان تیٚ دەگریٚو دەیانسوتێنیٚ) (رواه الطبراني وقد روي موقوفاً عليه وهو أصح، وهذا الحديث ضعيف في سنده انقطاع وضعف ، كما بيَنه الحافظ الهيثمي في مجمع الزوائد).

● عن أبى سعيد الخدرى –رضي الله عنه – عن النبي –(ﷺ) – قال: (لو أنَّ مَقْمَعاً من حديد جَهَنَّمْ وضع في الأرض فاجتمع لَهُ الثّقلان ما أقلوه من الأرض)) رواه احمد وأبو يعلى والحاكم وقال: صحيح الاسناد.

وفي رواية لأحمد وأبي يعلى قالا: قال رسول الله –(ﷺ)– (لو ضُرب الجَبَلُ بِمَقْمَعْ من حديد جَهَنَّم لتَفتَتت ثُمَّ عاد).

ورؤى هذه الحاكم أيضاً إلا أنّهُ قال: (لتفتت فصار رماداً) وقال صحيح الاسناد (لكنّه ضعيف لأنه من رواية دراج عن أبي السمع)

((ئەگەر کوتکێکی ئاسنینی دۆزەخ لەزەوی دابنرێو مرۆڤ و جنۆکە هەموو پێکەوە بیانەوێ لەزەوی هەڵیبگرن ئەوا بۆیان ناکرێ)).

(أحمد) و (أبو يعلى)ش لەریوایەتی خۆیان وتویانە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((ئەگەر بە کوتکی ئاسنی دۆزەخ لەچیا بدرێ ئەوا پارچە پارچە دەبێتو پاشان دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی)).

ئەم فەرمودەیە (حاکم)یش گێڕاویەتەوەو دەڵێ: ((پارچە پارچە دەبێتو پاشان دەبێت بە خۆڵە مێش)).

● (ابن مسعود) لەبارەی ئایەتی : (وقودها الناس والحجاره) دەفەرموێ:

ئەوە بەردێکە لەکبریت لەو ڕۆژەی دروست کراوە، کە خوا ئاسمانەکانو زەوی تێدا دروست کردووە، ئەو بەردە خوا لەئاسمانی دونیا دایناوە بۆ کافرەکان. رواه الحاكم مرفوعاً وقال صحيح على شرط الشيخين(صحيح).

## مارو دووپشکەکانی ناو ئاگر

●عن عبدالله بن الحارث بن جزء الزبيدي – رضي الله عنه – قال: قال: رسول الله صلى الله عليه وسلم (إنَّ في النَّار حَيّاتٌ كأمثال أعناق البُختِ تلسَعُ إحداهُنَّ اللسعة فيَجِدُ حَرَّها سبعين خريفاً، وإنَّ في النَار عقارب كأمثال البِغال الموكفةِ تَلْسَعُ إحداهُنَّ اللسعة فيجد حموتَها أربعين سنة)) رواة أحمد والطبراني وقال الحاكم صحيح الاسناد. (حديث حسن).

((لەناو ئاگر چەند ئەژدیهایەکی تێدایە، کە وەك ملی وشتر وانە، ئەگەر یەکێکیان بەیەکێکی وەدا ئەوا حەفتا ساڵ هەر ئێشەکەی و گەرمیەکەی دەمێنێ، هەروەها چەند

دوپشکێکی تێدایە ، کە وەك ئێستری زین کراو وانە، ئەگەر بەیەکێکی وەدا ئەوا چل ساڵان ئێش و گەرمیەکەی دەمێنیٚ)).

● (یزید)ی کوڕی (شجره) – خوای لیٚ رازی بێت – وتویەتی: ((دۆزەخ چەند بیرێکی لەناوە هەر بیرێك کەنارێکی هەیە وەك کەناری رووبار. لەنێویدا ئەژدیهاو دووپشکی زۆر زەبەلاحی تێدایە ، جا ئەگەر ئەهلی ئاگر داوایان کرد سزایان لەسەر سوك بکریٚ، پێیان دەڵێن: دەوەرنە دەریٚ بۆ سەر کەنارەکە، جا ئەو جانەوەرانەی ناو بیرەکە لێوو ئەنیشکەکانیان دەگەزنو دەیانهێننە دەریٚ، جا دووبارە زوو دەگەڕێنەوە ناو ئاگرێك، کە لەئاگری یەکەم گەورەترو گەرمترە، توشی خروشتێك دەبن هەتا یەکێکیان هەندە خۆی دەخورێنیٚ هەتا ئێسکی بە دیار دەکەون، جا پێیان دەڵێن: فلانە کەس! ئایا ئەمە بە ئێشو نارەحەتە بۆت؟ ئەویش دەڵیٚ بەڵیٚ، پێی دەڵێن: ئەو سزایە هی ئەوەیە، کە تۆ پێشتر موسڵمانانت نارەحەت دەکرد و ئازار دەدا) (رواه ابن ابی الدنیا وهو حدیث صحیح موقوف).

● (ابن مسعود) – خوای لیٚ رازی بێت – لەبارەی ئایەتی ﴿زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ﴾ النحل: ٨٨ وتویەتی واتە زیاتر دووپشکیان بۆ زیاد دەکەین، کە کەڵبەکانی وەك دارخورمایەکی درێژ وایە. (رواه أبو یعلی والحاکم موقوفاً وقال: صحیح علی شرط الشیخین).

## خواردنەوەی ئەهلی ئاگر

●عن أبي هريرة – رضي الله عنه – عن النبي (ﷺ) قال: ((إنَّ الحميم ليُصَبَّ على رؤوسهم فينفذ الحميمُ، حتّى يخلص إلى جوفه، فليسلُتُ ما في جوفه حتّى يمرق من قدميه، وهو الصَّهرُ ثُمَّ يُعاد كما كان) رواه الترمذي والبيهقي وهو حديث حسن

وفي رواية البيهقي قال: ((فيخلص فينفذ الجُمْجُمَةَ حتَى يخلُصَ إلى جوفه))

((ئاوی کوڵاو بەسەریان دادەکرێ، هەتا لەگەرمیان دەچێتە ناو هەناویان و هەناویان پارچە پارچە دەکات هەتا لەپێیەکانی دێتە دەرێ، ئەمەش کە توانەوەیە پاشان دووبارە وەکو جارانی لێ دێتەوە)).

لەریوایەتی (بیهقی)ش دا دەڵێت (ئێسکی جومجومەی سەری کون دەکات هەتا دەگاتە هەناوی))

وشەی (حمیم) خوای گەورە لەقورئانەکەی باسی کردووە کە دەفەرموێ: ﴿ وَسُقُوا مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾محمد: ١٥

هەروەها خوای گەورە لەقورئانەکەی دەفەرموێ:

﴿ هَٰذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ ﴿٥٧﴾ ﴾ص: ٥٧

هەورەها دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ ﴾النبأ: ٢٤ – ٢٥

زانایان لەمەڕ وشەی (غساق) ڕاجیان، (ابن عباس) وتویەتی (غساق) ئەو شتەیە کە لەنێوان پێستو گۆشتی کافر دێتە دەرێ، هەندێکیش دەڵێن: کێم و خێزاوی ئاگرە، ئەم وتەیەش هی (ابراهیم) و(قتادە) و (عطیة) و (عکرمە)یە، (کعب)یش وتویەتی: (کانیەکە لەدۆزەخ ژەهری دووپشكو ئەژدیهای دەرژێتە ناو، هەتاوەکو زۆلکاوێکی لێدێ

جا یەکێکی دێنن و دەیهاوێنە ناوی، کاتێك دەری دێنن هەموو گۆشتو پێستی لەئێسقان داماڵاوەو، هاتۆتە خواریێو بە قوڵە پێو گۆزینگەکانی وەنوساوە، جا گۆشتو پێستەکەی لەدوو خۆی رادەکێشێ، هەرەکو ئەوەی مرۆۋ جلی لەدوو بخشێ، (عبدالله)ی کوڕی (عمرو) یش لەبارەی (غساق) وتویەتی: ئەوە کێمو خێزاوی خەستی دۆزەخیانە، ئەگەر دڵۆپێکی لەرۆژئاوا برژێ ئەوا خەڵکی رۆژهەڵات هەموو لەبەر بۆنەکەی بۆگەن دەبن، ئەگەر دڵۆپێکیشی لەرۆژهەڵات رژا ئەوا ئەهلی رۆژئاوا لەبەر بۆنەکەی هەموو بۆگەن دەبن، هەندێکیش لەزانایان راڤەی تریان بۆ ئەم وشەیە کردووە. والله تعالى أعلم وأحكم.

● عن عبدالله بن عمرو قال: قال رسول الله (ﷺ) ((مَنْ شربَ الخمر فَسَكِرَ لم تقبل له صلاة أربعين صباحاً، فإن مات دخَلَ النّار، فإن تابَ تابَ الله عليه، فإن عاد فشربَ فَسَكِرَ، لم تُقبل له صلاة أربعين صباحاً ، فإن مات دخَلَ النار، فإن تاب تاب الله عليه، فإن عاد فشرِبَ فسَكِرَ، لم تُقبل له صلاة أربعين صباحاً، فإن مات دخل النار، فإن تاب تاب الله عليه، فإن عاد الرابعة، كان حقاً على الله أن يسقيهُ من طينة الخبال يوم القيامة)) قالوا: يا رسول الله وما طينة الخبال؟ قال: ((عصارة أهل النار)). (رواه ابن حبان (صحيح).

((ئەوەی ئارەقی خواردەوەو سەرخۆش بوو ئەوا چل رۆژان نوێژی لێ وەرناگیرێ، ئەگەریش لەسەر ئەو بارە بمرێ دەچێتە نێو ئاگرەوە، ئەگەریش تۆبەبکا خوای گەورە تۆبەی لێ وەردەگرێ، ئەگەر جارێکی تریش ئارەقی خواردەوەو سەرخۆش بوو ئەوا چل رۆژان نوێژی لێ وەرناگیرێ، ئەگەر لەسەر ئەو بارەش بمرێ دەچێتە نێو ئاگرەوە، ئەگەریش تۆبە بکا خودا تۆبەکەی وەردەگرێ، ئەگەر جارێکی تریش ئارەقی خواردەوەو سەرخۆش بوو ئەوا چل رۆژان نوێژی لێ وەرناگیرێ، ئەگەر لەسەر ئەو بارەش بمرێ دەچێتە نێو ئاگرەوە، ئەگەریش تۆبە بکاو خوای گەورە تۆبەکەی

وەردەگرێ، ئەگەر جاری چوارەمیش ئارەقی خواردەوە ئەوا خوای گەورە لەسەرەخۆی واجیب کردووە، کە لەرۆژی قیامەت (طینة الخبال)ی دەرخوارد بدا)) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (طینة الخبال)) چیە؟ فەرمووی: (((خێزاوو کێمی ئەهلی ئاگرە)).

## خواردنی ئەهلی ئاگر

● (ابن عباس) دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە :﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾آل عمران: ١٠٢ پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((لو أنَّ قطرة من الزقوم قطرت في دار الدنيا لأفسدت على أهلِ الدنيا معايشهم، فكيف بِمَنْ يكونُ طعامَهُ؟))رواه الترمذي وابن ماجه.

((ئەگەر دڵۆپێك لە(زقّوم) رژایە سەر دونیا ئەوا ژیان تێك دەچێ لەئەهلی سەر زەوی، جا چ دەڵێی بەوەی ئەو شتە خواردنی بێ)).

هەر ئەم فەرمودەیە (ابن حبان)یش لە(صحیح)ەکەی خۆی بەم بێژەیە ریوایەتی کردووە،، کە وتویەتی (جا بەوە چ دەڵێی کە بێجگە لەو خواردنە هیچ خواردنێکی تری نەبێ)).

(حاکم)یش ئەم فەرمودەیەی بە بێژەیەکی تر ریوایەت کردووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((سوێند بە خوا ئەگەر دڵۆپێك لە(زقّوم) برژێتە ناو رووبارەکانی زەوی ئەوا هەموو بۆگەن دەکات)) یان وتی ((ژیان لەخەڵکی سەر زەوی تاڵ دەکات، جا چ دەڵێی بەوەی ئەوە خواردنی بێ؟)) ضعفه الامام الالباني ، وذكر أن المرفوع فيه تدليس والموقوف هو الاصح، لكن فيه ضعف، والله تعالى أعلم.

# گەورەیی لاشەی ئەهلی ئاگر

● عن أبي هريرة – رضي الله عنه– عن النبي (ﷺ) قال: ((ما بين منكبي الكافر في النار مسيرة ثلاثة أيّام للراكب المُسرع) رواه البخاري.

((نێوان هەردوو شانی کافر لەناو ئاگردا سێ ڕۆژە ڕێیە، کە سوارچاکێکی خێرا بیبڕێ)).

● عن أبي هريره –رضي الله عنه– عن النبي (ﷺ) قال: ((ضرس الكافر مثلَ أحُد، وفخذه مثلُ البيضاء، ومقعده من النار بين قديد ومكة، وكثافة جَسَدِه إثنان وأربعون ذراعاً الجبّار)) رواه أحمد ( حديث صحيح لغيره)

((ددانی کافران لەناو ئاگردا هەندی چیای ئوحد گەورە دەبێ، رانیشیان وەکو چیای (بیضاء) قەبەو ئەستور دەبێ، مەنزڵگاشی لەناو ئاگر وەك نێوانی (قدید) و(مكة) وایە گەورەیی لاشەشی چڵو دوو هەنگاوە بەهەنگاوی پەروەردگار.

● لەریوایەتی (مسلم)یش داهاتووە، کە ((ددانی کافر – یان کەڵبەی کافر– وەك چیای ئوحد وایە، ئەستوری پێستیشی سێ ڕۆژە ڕێیە)) (صحيح).

● لەریوایەتی (ترمذي)شدا هاتووە، کە ((ددانی کافر لەرۆژی قیامەت دا وەك چیای ئوحد وایە، رانیشی وەك چیای (بیضاء) قەبەو گەورەیە، جێگاشی لەناو ئاگر وەك نێوانی مەدینەو (ربذة)یە (حديث حسن).

● لەریوایەتێکی تریش کە (ترمذي) هێناویەتی هاتووە، کە ((ئەستوری پێستی کافر هەفتاو دوو هەنگاوە، ددانیشی وەك چیای ئوحدە، شوێنی دانیشتنی لەدۆزەخ وەك نێوان مەککەو مەدینە وایە)) (حديث صحيح)).

● (حاکم)یش بەم شێوەیە ئەم فەرمودەی ریوایەت کردووە، کە ((ددانی کافر لەرۆژی قیامەت دا وەك چیای ئوحد وایە، پانی پێستەکەشی هەفتا هەنگاوە، رانیشی

لەقەبەو گەورەیی وەك چیای(بیضاء) وایە، رانیشی وەك (ورقات) وایە، شوێنیشی لەناو ئاگر وەك نێوانی منو (ربذة) وایە (حدیث حسن صحیح).

● وعَن ابن عمر – رضي الله عنه – قال : قال رسول الله (ﷺ) : (إنَّ يُسحبُ لِسانُهُ الفرسخ والفرسخين[1]، يَتوطؤه الناس) (رواه الترمذي ) (حديث ضعيف).

((کافر زمانی بە ئەندازەی فەرسەخێك یان دووان رادەكێشرێ و خەڵكی بەسەریدا دەڕۆن.

● وعن أبي سعيد =رضي الله عنه– قال عن النبي (ﷺ) قال: ((مقعد الكافر في النّار مسيرة ثلاثة أيّام، وكل ضرس مثل أحُدٍ، وفخذه مثل ورقات، وجلده سوى لَحمِهِ وعظامه أربعون ذراعاً)) رواه أحمد وأبو يعلى والحاكم وكلهم عن روايه أبى لهيعه (حسن لغيره).

((شوێنی کافر لەناو ئاگر سێ ڕۆژە ڕێیە هەر ددانێکیش وەك چیای ئوحود وایە و رانیشی وەك چیای وەرقانە، ئەستوری پێستیشی چل بستە)).

● وعن مجاهد قال: ابن عباس –رضي الله عنهما–: أتدري ما سعة جهنَّم؟ قُلْتُ لا، قال: أجل والله لا تدري، إنَّ بين شحمة أذن أحدِهِم وبين عاتقِهِ مسيرة سبعين خريفاً، تجري فيه أودية القيح والدّم، قلت: أنهارٌ؟ قال: بل أودية ) رواه احمد باسناد صحيح، ، والحاكم وقال صحيح الاسناد: (صحيح موقوف).

موجاهید وتویەتی: ئیبن عباس پێی وتم: ئایا دەزانی فراوانی دۆزەخ چەندە؟ وتم: نەخێر، وتی : بەڵێ وەڵڵاهی دەزانم نایزانی، نێوان گوێچكەی یەكێكیان هەتا ملی هەفتا پاییزە، كە چەند دۆڵێكی كێمو خوێنی لێ دروست دەبێت، وتم: چەند رووبارێك؟ ووتی: نا بەڵكو چەند دۆڵێك؟

---

(١)الفرسخ: واتە سێ میل یان سێ كات ژمێر و نیو بەرۆیشتنی وشتر (وەرگێڕ).

## شیوەنو گریانی دۆزەخیەکان

● عن عبدالله بن عمرو–رضي الله عنهما–قال: إنَّ أهل النّار يدعونَ مالكاً فلا يُجيبُهمْ أربعين عاماً، ثم يقول: ﴿إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ٧٧﴾الزخرف: ٧٧ ثم يدعونَ ربَّهم فيقولون: ﴿رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ١٠٧﴾المؤمنون: ١٠٧فلا يجيبهم مثل الدُّنيا، ثُمَّ يقول:﴿ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ١٠٨﴾المؤمنون: ١٠٨ ثُمّ ييأس القوم فما هو إلا الزَّفيرُ والشهيق تُشبهُ أصواتهم أصوات الحمير أوَّلها شهيق[1] وآخرها زفير[2]. رواه الطبراني موقوفا ورواته محتج بهم في الصحيح (صحيح).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر –خوایان لێ رازی بێ – وتویەتی: ئەهلی ئاگر چل ساڵان بانگی مالك دەکەن ئەویش وەڵامیان ناداتەوە، پاشان پێیان دەڵێ: (ئێوە هەر لەنێوی دەمێننەوە) پاشان داوا لەپەروەردگاریان دەکەنو دەڵێن: (پەروەردگارمان لەئاگرمان دەربێنە ئەگەر جارێکی تر گەڕاینەوە ئەوە ئێمە ستەم کارین) جا خوای پەروەردگار چۆن لەدونیا کاتێك دەپاڕانەوە وەڵامی نەدەدانەوە ئەوهاش لەو رۆژە وەڵامیان ناداتەوە، پاشان پێیان دەڵێ (چەغەبن تیایداو قسەمەکەن) پاشان ئەوانە هیوا بڕ دەبنو هەر گریانو شیوەنیان بۆ دەمینێتەوە، کەوا دەنگیان وەك دەنگی گوێ درێژ وایە، کە یەکەمیان (شهیق)و کۆتاییەکەشی(زفیر)ە.

(١) الشهيق: دەنگێکە لەسینگ دەردەچێ.

(٢) الزفير:دەنگێکە لەگەرو دەردەچێ

# فریشتەکانی ئاگر

خوای گەورە لەوەسفی فریشتەکانی ئاگر دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾التحريم: ٦

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ ﴾المدثر: ٢٧ - ٣٠

پێشەوا (قرطبي) فەرمویەتی: واتە لەسەر شوێنی سەقەر (١٩) فریشتە هەن خەڵك فڕێ دەدەنە ناو ئاگر.

پاشان وتراوە: کە دەرگەوانەکانی دۆزەخ (١٩) فریشتەن ، کە یەکێکیا ناوی (مالك) و هەژدەکەی تریشیان فریشتەن. لەوانەیە ئەو نۆزدە فریشتەیە نەقیبەکان بن، لەوانەشە هەر نۆزدە فریشتەی ئاسایی بن ئەمەش کە رای زۆربەی موفەسیرەکانە.

پاشان وتویەتی: (إن شاء الله) ئەوەی راستە لەوبارەیەوە ئەوەیە، کە ئەو نۆزدە یە سەرۆكو نەقیبن، بەڵام کۆی هەمویان ئەوا ناتوانین ئەژماریان بکەین، هەروەکو خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ هەر خۆی دەزانی سەربازەکانی خۆی چەندن﴾المدثر: ٣١ لەفەرمودەیەکی راستیشدا هاتووە کە (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) رەزای خوای لێ بێ – دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا فەرمویەتی: (يؤتى بالنار يوم القيامة، لها سبعون ألف زِمام، مع كل زمام سبعون ألف ملك يجرّونها) رواه مسلم.

((ئاگر لەرۆژی دواییدا دەهێندرێت، کە حەفتا هەزار قولپی هەیە، هەر قولپێکیش حەفتا هەزار فریشتە رای دەکێشێ)).

(ابن عبّاس) فەرمویەتی: نێوانی هەردوو شانی یەکێك لەوفریشتانە یەك ساڵە ڕێیە، ئەوەندە بەهێزیشن ئەگەر یەکێکیان قامچیەك راوەشێنێ ئەوا بەیەك جار هەفتا هەزار مرۆڤ داوێتە ناو دۆزەخ.

هەروەها (قرطبي) باسی فەرمودەیەکی پێغەمبەری کردووە(ﷺ) کەلەبارەی دەرگەوانەکانی دۆزەخ فەرمویەتی: ((ما بين منكبي أحدهم كما بين المشرق والمغرب) قال الحافظ العراقي حديث معضل.

((نێوانی هەردوو شانی یەکێکیان وەك نێوانی ڕۆهەڵاتو ڕۆژئاوایە)).

# بەشی سێیەم

# حاڵو گوزەرانی ئەهلی ئاگر

● عن أبي سعيد الخدري –رضي الله عنه – قال: قال رسول الله (ﷺ): ((يقولُ الله عزَّ وجل: يا آدمُ، فيقول: لبيك وسعديك، والخير في يديك، قال: يقول: أخرِج بعثَ النار، قال: وما بعث النّار؟ قال: من كل ألف تسعمئة وتسعة وتسعين، قال فذاك حين يشيب الصغير وتضعُ كل ذات حملٍ حَمْلَها، وترى الناس سكارى وما هم بسكارى، ولكنّ عذاب الله شديد)).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((خوای گەورە فەرمووی: ئەی ئادەم، وتی: بەڵێ ئەی پەروەردگارم ئەی ئەو کەسەی هەموو خێرو چاکەیەك بەدەستی تۆیە، وتی: فەرموی: ئەهلی ئاگر دەست نیشان بکەو دەربێنە، وتی: نازانم ئەوانە چنە؟ فەرمووی: لەهەزاری نۆسەدو نەوەدو نۆکەس، وتی: ئەمەش لەوکاتەیە، کە منداڵ قژی سپی دەبێتو هەموو خاوەن زگێکیش زگەکەی خۆی دادەنێو دەبینی کەوا خەڵکی ئاگایان لەخۆ نیە بەڵام ئاگایان لەخۆیە، بەڵام لەبەر توندی سزای گەورە وایان لێهاتووە)).

(أبو سعيد) –رضي الله عنه – وتی: ئەم هەواڵە هاوەڵەکانی زۆر دڵ تەنگ کرد، بۆیە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کێمان ئەو تاکە پیاوەینە؟ فەرموی: ((با موژدەتان بدەمێ لەیأجوجو مأجوج "هەزار بەر ئەوان دەکەوێت، لەئێوەش یەکێك)) پاشان فەرمووی: ((سوێند بێ بە پەروەردگار من هیوام وایە چارەگی ئەهلی بەهەشت بن)) ((أبوسعيد)) وتی: جا سوپاس گوزاری خوامان کردو وتمان (الله أكبر) – پاشان فەرموی: ((سوێند بە پەروەردگارم من هیوام وایە سێیەکی ئەهلی بەهەشت بن)) (أبو سعيد) وتی: سوپاس گوزاری خوامان کردو وتمان (الله اكبر) پاشان فەرمووی: ((سوێند بە پەروەردگار من هیوام وایە نیوەی ئەهلی بەهەشت بن نمونەی ئێوە لەچاو

ئوممەتەکانی تر وەك تەلەمویەکی سپییە لەپێستی گایەکی ڕەشدا یان وەك ئەو پەڵە وایە کە لەلاقی گوێ درێژ هەیە)) (رواه مسلم).

## سوك ترین سزای ئەهلی ئاگر

● عن النعمان بن بشير – رضي الله عنهما– عن النبي (ﷺ) قال: ((إنَّ أهونَ أهل النار عذاباً رجُلٌ في أخمص قدميه جَمْرِتان يغلي منهما دماغَهُ كما يغلي المِرجل بالقُمقُم)) رواه البخاري.

((سوکترین سزای ئەهلی ئاگر پیاوێکە لەژێر سنگی قاچەکانی دوو پۆلیە ئاگر هەیە، کە لەگەرمیان دەماغی لەگەڵ دەکوڵێ وەکو ئەوەی ئاو لەنێو مەنجەڵێکی مسدا بکوڵێ))

● پێشەوا (مسلم)یش ئەم فەرمودەیەی ریوایەت کردووە بەڵام بەم بێژەیە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((سوکترین سزای ئەهلی ئاگر یەکێکە، کە دوو نەعلی لەپێدا بن و دوو بەستەری هەبێت لەئاگر، کە لەگەرمیان دەماغی لەگەڵ دەکوڵێ هەروەکو ئاو، کەلەناو مەنجەڵی مسدا دەکوڵێ، وادەزانێ کەس لەو سزای توندترو بەئێشترنییە، لەکاتێکدا، ئەوەیان سوکترین سزای هەیە).

● وعن أبي سعيد الخدري – رضي الله عنه – عن النبي (ﷺ): ((إنَّ إهْوَنَ أهلِ النّار عذاباً رجُلٌ مُنتعِلٌ بنعلين مِن نارٍ يغلي منهُما دِماغُهُ مَعَ إجزاء العذابِ، ومِنهُم مَن في النَار إلى كعبية مع إجزاء العذاب، ومِنهُم مَن في النار إلى ركبتيه مع إجزاء العذاب، ومنهم مَن في النّار إلى صدرِهِ مع إجزاء العذاب قد اغتمَرَ)) رواة احمد والبزار ورواتة رواه الصحيح.

((سوکترین سزای ئەهلی ئاگر پیاوێکە، کە دوو نەعلی ئاگری لەپێ دانە، کە دەماغی لەگەڵ دەکوڵێو سزایەکەشی دەگات بە هەموو لەشی، هەیانە هەتا گۆزینگەکانی لەناو

ئاگرەو سزایەکەش دەگات بە هەموو لەشی، هەیانە هەتا ئەژنۆکانی لەناو ئاگرە لەگەڵ گەیشتنی سزا بە هەموو لەشی، هەیانە هەتا لووتی لەناو ئاگرە لەگەڵ گەیشتنی سزا بە هەموو لەشی، هەیانە هەتا سنگی کەوتۆتە ناو ئاگر لەگەڵ گەیشتنی سزا بە هەموو لەشی، کەتیایدا نوقم بووە)).

● وعن ابن عباس رضي الله عنهما عم النبي (ﷺ) قال: ((إنَّ أهونَ أهلِ النّار عذاباً أبو طالب وهو مُنتَعِلٌ بِنعلينِ يغلي منهُما دماغُهُ) (رواه مسلم).

((سوکترین سزای ئەهلی ئاگر بۆ (أبو طالب)ە کە دوو نەعلی لەبەر دانەو دەماغی لەگەڵ دا دەکوڵێ)).

## ئەوانەی یەکەم جار ئاگریان پێ گەرم دەکرێ

● عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ:

((حَدَّثَنِي رَسُولُ اللَّه -صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وسَلَّمَ-: أَنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ, يَنْزِلُ إِلَى الْعِبَادِ لِيَقْضِي بَيْنَهُمْ، وَكُلُّ أُمَّةٍ جَاثِيَةٌ، فَأَوَّلُ مَنْ يَدْعُو بِهِ رَجُلٌ جَمَعَ الْقُرْآنَ، وَرَجُلٌ يَقْتَتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّه، وَرَجُلٌ كَثِيرُ الْمَالِ، فَيَقُولُ اللَّهُ لِلْقَارِئِ: أَلَمْ أُعَلِّمْكَ مَا أَنْزَلْتُ عَلَى رَسُولِي؟

قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ،

قَالَ: فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا عُلِّمْتَ؟

قَالَ: كُنْتُ أَقُومُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَآنَاءَ النَّهَارِ،

فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللَّهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: إِنَّ فُلَانًا قَارِئٌ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ،

وَيُؤْتَى بِصَاحِبِ الْمَالِ، فَيَقُولُ اللّٰهُ لَهُ: أَلَمْ أُوَسِّعْ عَلَيْكَ حَتَّى لَمْ أَدعْكَ تَحْتَاجُ إِلَى أَحَدٍ؟ قَالَ: بَلَى يَا ربِّ،

قَالَ: فَمَاذَا عَمِلْتَ فِيمَا آتَيْتُكَ؟

قَالَ: كُنْتُ أَصِلُ الرَّحِمَ، وَأَتَصَدَّقُ،

فَيَقُولُ اللّٰهُ لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللّٰهُ تَعَالَى: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ جَوَادٌ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ،

وَيُؤْتَى بِالَّذِي قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللّٰه، فَيَقُولُ اللّٰهُ لَهُ: فِي مَاذَا قُتِلْتَ؟

فَيَقُولُ: أُمِرْتُ بِالْجِهَاد فِي سبِيلِكَ، فَقَاتَلْتُ حَتَّى قُتِلْتُ،

فَيَقُولُ اللّٰهُ تَعَالَى لَهُ: كَذَبْتَ، وَتَقُولُ لَهُ الْمَلَائِكَةُ: كَذَبْتَ، وَيَقُولُ اللّٰهُ: بَلْ أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ: فُلَانٌ جَرِيءٌ، فَقَدْ قِيلَ ذَاكَ،

ثُمَّ ضَرَبَ رسُولُ اللّٰه –صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ– عَلَى رُكْبَتِي، فَقَالَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ, أُولَئِكَ الثَّلَاثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ اللّٰه, تُسَعَّرُ بِهِمْ النَّارُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))(صحيح رواه الترمذي، وصححه الحاكم، ووافقه الذهبي).

((لەرۆژی قیامەتدا خوای گەورە دێت بۆ ئەوەی حوکم لەنێوان بەندەکان دا بکات، کە هەموو ئوممەتێك لەسەر چۆکانەو چۆکی داوەتەوە، ئەوانەی بانگ دەکرێن یەکەمین کەس ئەوا کەسێکە، کە قورئان فێربووە، یەکێکیش جەنگاوە لەرێی خودا، یەکێکی تریش کە ماڵ و سامانی زۆرە، خودا دەفەرموێتە قورئان خوێنەکە: ئایا ئەو شتەم فێرنەکردی، کە بۆ پێغەمبەرەکەم ڕەوانە کردبوو؟

دەڵێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم.

دەفەرموێ: ئەوەی فێری بووی چیت پێکرد؟

دەڵێت: شەوو رۆژ لەخزمەتی دابوم و کارم پێ دەکرد.

خوای گەورە پێی دەڵێ  درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد، خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بەڵکو ویستت بڵێن فلان قورئان خوێنە، خۆ ئەمەشیان وت.

خاوەن ماڵو سامانەکەش دەهێنن، خوای گەورە پێی دەفەرمووێ: ئایا بەسەرم دانەباراندبووی  هەتا وام لێکردبووی پێویستت بەکەس نەبێ؟

دەڵێت: بەڵێ ئەی پەروەردگارم.

دەڵێ: چیت کرد بەوەی پێم دای؟

دەڵێت: سەردانی خزمو کەسانم پێ دەکرد و خێرو خێراتم پێ دەکرد.

خوای گەورە پێی دەفەرموێ : درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد، خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بەڵکو ویستت بڵێن: فلان سەخیە، خۆ ئەمەشیان وت.

ئەو کەسەش دەهێنن، کەوا لەپێناوی خوا جەنگاوە، خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بۆچی جەنگاییو شەڕت کرد؟

دەڵێت: فەرمانت کرد بجەنگێن لەپێناوت منیش شەڕم کرد هەتا کوژرام.

خوای گەورە پێی دەفەرموێ : درۆت کرد، فریشتەکانیش پێی دەڵێن درۆت کرد، خوای گەورە دەفەرموێ: بەڵکو ویستت بڵێن: فلان ئازایە، خۆ ئەمەشیان وت))

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دا لەچۆکی (أبو هريرە)و فەرمووی: ((ئەی (أبا هريرە) ئەو سێ کەسە یەکەمین کەسن لەدروست کراوانی خودا، کە لەرۆژی قیامەتدا ئاگریان پێ گەرم دەکرێ)).

پێشەوا (نووی) لەشەرحی (صحیح مسلم) دا وتویەتی: سزادانی ئەو سێ کەسەو بردنیان بۆ ناو ئاگر، بەڵگەیە لەسەر حەرام بوونی ریابازی و بە ئێشی سزاکەیو هەروا هاندانیشە لەسەر پاك کردنەوەی نیەت لەکردەوەکاندا، هەروکو خوای گەورە

دەفەرموێ، ئەو گشت گێریەی باسیش کراوە سەبارەت بە گەورەیی جیهاد کردن ئەوا بۆ ئەو کەسانەیە، کە بە ئیخلاس بۆ خودا دەیکەن، هەروەها مەدح کردنی زانایانو خێرکەرەکان ئەمەش هەمووی مەبەست پێی ئەوەیە، کە تەنها بۆ خوای پەروەردگار بێ.

پێشەوا (شوکانی) لە (نیل الأوطار) وتویەتی: ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە ئەوەی کردەوە باشەکان ئەنجام دەدات بە نیەتی خراپ ئەوە دەبێتە چەرمەسەریو بەڵایەکی گەورە بۆی، چونکە ئەوەی بووە هۆی راکێشانی لەسەردەمو چاو بۆ ناو ئاگر ئەوا نیەتە خراپەکەی بوو، ئەمەش کافیە بۆ ئەو کەسەی خاوەن دڵێکەو بیر دەکاتەوەو گوێی لێیە بۆ ئەوەی ئاگای لەخۆ بێو نەکەوێتە ناو ئەم کارە ترسناکە.

خودایە من داوای ئیخلاست لێ دەکەم لەو وتەو کرداردا جا چ بە نهێنی چ بە ئاشکرا ...ئامین.

## مشتو مڕی نێوان بە هەشتو ئاگر

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ " : تَحَاجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ , فَقَالَتِ النَّارُ : أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ وَالْمُتَجَبِّرِينَ ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ فَمَا لِي لا يَدْخُلُنِي إِلا ضُعَفَاءُ النَّاسِ وَسَقَطُهُمْ وَغِرَّتُهُمْ , فَقَالَ اللَّهُ لِلْجَنَّة : إِنَّمَا أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي ، وَقَالَ لِلنَّارِ : إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي وَلِكُلٍّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا مِلْؤُهَا ، فَأَمَّا النَّارُ فَلا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ فِيهَا رِجْلَهُ ، فَتَقُولُ : قَطْ قَطْ ، فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ ، وَلا يَظْلِمُ اللَّهُ مِنْ خَلْقِه أَحَدًا ، وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا. " (رواه مسلم).

((بەهەشتو ئاگر کەوتنە مشتو مڕ لەگەڵ یەکتری، ئاگر وتی: من جێگەی ستەم کارو بەدفەڕو خۆ بەگەورەگرەکانم، بەهەشتیش وتی: منیش جێگای خەڵکانی هەژارو پەککەوتەکانم، جا خودا فەرمویە بەهەشت: تۆ رەحمەتی منی ئەوەی بمەوێ بە تۆ رەحمی پێدەکەم، وتیە ئاگریش: تۆ سزای منی، ئەوەی بمەوێ بە تۆ سزای دەدەم، وە هەردوکتان دەبێت پڕ بکرێن، سەبارەت بە ئاگر ئەوا قەت پڕ نابێت هەتا پەروەدگار قاچی خۆی تێ نەکا، جا دەڵێ: بەسمە، بەسمە، بەسمە، ئا لەو کاتە پڕ دەبێ، هەندێکی دەچێتەوە بار یەکتری، خوداش ستەم لەهیچ دروستکراوێکی ناکات، بەهەشتیش خودا دروست کراوانێکی تری بۆ وەدیدەهێنێ)).

**ڕاڤەی فەرموودەکە:**

پێشەوا (بخاری) لە(صحیح)ەکەی خۆی دەفەرموێ: (تحاجّت) واتە کەوتنە مشتو مڕ هەر خوداش دەزانێ ئە مشتو مڕە چۆنە. (اوثرت) واتە: تایبەتمەند کراوم (بالمتکبرین والمتجبرین) هەندێك دەڵێن بەیەك مانا هاتووە، هەندێکیش دەڵێن: (المتکبر) واتە ئەو کەسەی خۆی بە گەورە دەزانێ لەکاتێکدا هیچیش نیە (متجبر)یش واتە ئەو کەسە سەختەی، کە کەس ناتوانێ بگاتە لای، (ضعفاء الناس وسقطهم) واتە ئەوانەی کەوتونە لەپێش چاوی خەڵكو سوك بوینە، ئەمەش سەبارەت بە زۆرینەی خەڵك، بەڵام لەلایەن خواوە ئەوانە زۆر بەڕێزنو قەدر گرانو خاوەن پلەن، بەڵام ئەوانە لەدەروونیان ئەوەندە خوا بە گەورە دەگرن بۆیە دەروونی خۆیان دەشکێننو مل کەچی فەرمانەکانی خوا دەبن.

پێشەوا (نووی) لەشەرحی (صحیح مسلم)دا لەبارەی ئەم فەرمودەیە فەرمویەتی: ڕووکەشی ئەم فەرمودەیە وایە، کە خوای گەورە وادەکات بەهەشتو ئاگر بفامن بۆیە کەوتنە مشتو مڕ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، کە هەتا سەر ئەوها تێبگەنو هەست بکەن.

هەر پێشەوا (نووی) لەدرێژەی شەرحی فەرمودەكەدا وتویەتی: ئەم فەرمودەیە یەكێكە لەم فەرمودە ناودارانەی ، كە باسی (صفات) دەكات، پێشتریش چەند جار باسمان كردووە كە زانایان دوو رایان هەیە لەم بارەیەوە: یەكەمیان: كە وتەی زۆرینەی سەلەفە لەگەڵ دەستەیەك لە(متكلمين)ەكان، كە دەڵێن: نابێ تەئویل بكرێ، بەڵكو دەبێ باوەڕمان وابێ كە هەقە بەو پێیەی خوا مەبەستیەتی بە جۆرێك كە شایەنی بێت. دووەمیش: وتەی زۆربەی (متكلمين)ەكانە، كە دەڵێن: دەبێ ماناكەی تەئویل بكرێو لێك بدرێتەوە بەجۆرێك شایەنی بێت.

زانای پایەبەرزیش (أبو العز الحنفی) لەشەرحی (العقیده الطحاوية)دا وتویەتی: پێویستە ئەوەی لەبابەت (صفات) بوو تەماشا بكرێ، ئەوەی خواو پێغەمبەرەكەی جێگیریان كردبوو بڕیاریان لەسەردابوو ئەوا ئێمەش جێگیری دەكەینو وەری دەگرین، ئەوەی خواو پێغەمبەرەكەشی رەتیان كردبێتەوە ئەوا ئێمەش رەتی دەكەینەوە، ئەو بێژانەی لەدەقەكان داهاتووە ئەوا لە(إثبات)و (نفی) دا وەردەگیرێ، ئەو بێژەوە مانایانەی خواو پێغەمبەرەكەی جێگیریان كردووە ئێمەش جێگیری دەكەین ئەوەی بەو دەقانەش لەو بێژەو مانایانە رەت كراوەتەوە ئێمەش رەتی دەكەینەوە، بەڵام سەبارەت بەو بێژانەی، كە نە (نفی) تێدایەو نە (إثبات) ئەوا بڕیاری لەسەر نادرێ هەتا تەماشای مەبەستو ویستی بێژەرەكەی نەكرێ، ئەگەر مانایەكەی رەوانو راست بوو وەردەگیرێ.

پێشەوا (أبو حنيفه)ش دەفەرموێ: خودا دەستو (وجه)و (نفس)ی هەیە هەروەكو، كە لەقورئان دا باسی دەستو (وجه)و (نفس) كراوە، خودا ئەو سیفەتانەی هەیە بەبێ ئەوەی بچوێنرێ بەهیچ دروست كراوێك، ناشبێت بوترێ: مەبەست لەدەستی واتە هێزو توانای چونكە ئەمە لەكارخستنی سیفەتێكە لەسیفەتەكانی.

پێشەوا (ابن تیمیه)ش لە (العقیدة الواسطیة) دا وتویەتی: ئەوەی دەچێتە ناو باوەڕ بوون بەوەی خوا لەکیتابەکەی وەسفی خۆی پێ کردووە هەروا پێغەمبەرەکەشی بێ ئەوەی بگۆڕدرێ یان لەکاربخرێ یان بچوێنرێ یان (تمثیل) بکرێ بەڵکو باوەڕیان وایە کە خوا (لیس کمثله شيء وهو السمیع البصیر)ە، ئەوەی خوا خۆی پێ وەسف کردووە رەتی ناکەنەوەو، وشەکانیش لانادەن‌و ناگۆڕن لەجێگای خۆیانداو ناوەکان‌و ئایەتەکانیشی لێك نادەنەوە بە مانایەك، کە خوا مەبەستی نەبێ‌و، سیفەتەکانی ناچوێنن بە سیفەتی دروست کراوەکانی، چونکە هیچ وێنەو نمونەو هاوەڵی نیەو، خودا قیاس ناکرێتە سەر دروست کراوەکانی، چونکە هەر خۆی زاناترە بەخۆی لەکەسانی ترو، لەهەموو کەسێکیش لەدروست کراوەکانی راست گۆترو رەوان بێژترە، پاشان پەیامبەرە راست گۆیەکانی بە پێچەوانەی ئەوانەی بەبێ زانیاری لەسەر خوا دەدوێن، بۆیە خودا دەفەرموێ ﴿سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾﴾الصافات: ١٨٠ - ١٨٢خودا لەو ئایەتە نەفسی خۆی بەپاك راگرتووە لەبارەی ئەوانەی بەشتی نابەجێ وەسفی دەکەن، سەلامیشی لەپەیامبەران کردووە چونکە هەق‌و باشە لەبارەی خواوە دەیڵێن‌و بەدووری دەگرن لەهەموو کەم‌و کوڕیەك. خوای گەورە لەو ئایەتە هەندێك وەسفی بۆ خۆی رەت کردۆتەوەو هەندێکیشی (إثبات) کردووە، جا ئەهلی سوننەت‌و جەماعەت نابێ لەوەی پێغەمبەران هێناویانە لابدەن، چونکە هەر ئەو رێگایە رێگایەکی راستە، رێگای ئەو کەسانەی خوا بەخشیبوی بە پێغەمبەران و راست گۆیان‌و شەهیدەکان‌و پیاوچاکان.

زانای پایەبەرز (أبو العز الحنفي) فەرمویەتی: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾الشوری: ١١ مەبەست لەو ئایەتە رەت کردنەوەی (صفات) نیە هەروەکو ئەهلی بیدعە دەڵێن، چونکە (أبو حنیفه) لە (فقه

الأكبر) وتويەتی:خودا ناشوبهێتە هیچ كام لەدروست كراوەكانی و سیفەتەكانی هەمووی خیلافی سیفەتی دروست كراوەكانە، دەزانێ نەوەك وەك زانینی ئێمە، تواناداره نەك وەك توانای ئێمە، دەبینێ نەك وەك بینینی ئێمە، قسە دەكات نەك وەك قسەكردنی ئێمە.

پێشەوا (نووی) لەشەرحی (صحیح مسلم) دا وتویەتی: سەبارەت بەم وتەیە، كە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: (ولا یظلم الله من خلقه أحداً) واتە خودا بەهیچ شێوەیەك ستەم لەدروست كراوەكانی ناكات و ئەمە ئەستەمە لەحەقی خوای گەورە، جا ئەوەی بە گوناه یان بەبێ گوناه سزای بدات ئەوا لەدادگەری خۆیەتی.

سەبارەت بەو وتەیەش كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (وأما الجنة فإنَّ الله ينشيء لها خلقاً) ئەوە بەڵگەی ئەهلی سونەیە لەسەر ئەوەی كەوا پاداشت مەرج نیە هەر لەسەر كردەوەكان بێت، وەك نمونەی منداڵو شێتەكان، كە هیچ كردەوەیەكیان نەكردووە، جا هەمووی بە هۆی رەحمەتی خوا لەبەهەشتن، ئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانی بەهەشتەكەی خوا.

## بانگهێشتی خوا بۆ سوكترین سزای ئەهلی ئاگر

●عن أنس رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ) ((إنَّ اللهَ يقولُ لأهونِ أهلِ النَّار عذاباً: لو أنَّ لك ما في الأرضِ من شيء كُنتَ تفتدي به؟ قال: نعم، قال: فقد سألتُكَ ما هو أهونُ مِنْ هذا وأنت في صلب آدم أن لا تشرك بي شيئاً فأبيت إلا الشرك)) (رواه البخاري و مسلم)).

((خوای گەورە دەفەرموێتە ئەو كەسەی كە سوكترین سزای هەیە: ئەوەی لەسەر زەوی هەتبو دەتكردە فیدای خۆت؟ دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێ: من شتێكی زۆر لەوە

ساناترم لیٚ داواکردبووی کاتێك تۆ لەپشتی ئادەم دا بوویت ئەویش هاوەڵم بۆ بڕیارنەدەی بەڵام تۆ هەر موکڕ بووی هاوەڵم بۆ دابنێی)).

## بانگ کردنی ئەهلی ئاگر بۆ بەهەشتیەکان

خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَـٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَـٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَـٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ﴾الأعراف: ٥٠

خوای گەورە لەبارەی ئاینده بەبێژەی رابردوو دەری بڕیوە، چونکە لەبەر روونیو ئاشکرایی کارەکەو روودانی وەکو بڵێی روویداوە، خوتی گەورە دەفەرمویٚ (ونادی) هەندێك دەڵێن: ئەگەر ئەهلی ئەعراف چوونە بەهەشت ئەوا ئەهلی ئاگر ئارەزوو دەکەنو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئێمە خزمو کەسمان لەبەهەشتە مۆڵەتمان بدە بۆ ئەوەی بیانبینینو قسەیان لەگەڵ بکەین ئەهلی بەهەشتیش نایانناسنەوە لەبەر ئەوەی دەمو چاویان رەش بووە، جا دەڵێن: أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ لێرە دیار دەکەویٚ، کەوا مرۆڤ ئەگەر سزاش بدریٚ ئەوا ناتوانیٚ دەست بەرداری خواردنو خواردنەوە بێت. ئەهلی بەهەشتیش وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن: إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَـٰفِرِينَ (ابن عباس) یش لەبارەی ئایەتی (وَنَادَىٰٓ أَصۡحَـٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَـٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ) دا فەرمویەتی پیاوێك بانگی برایەکەی خۆی دەکات و پێی دەڵیٚ: براکەم بگە هانام وامن سوتام و هەندێك ئاوم بەسەر دابکە. جا بە برایەکەی دەڵێن وەڵامی بدەوەو بڵیٚ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَـٰفِرِينَ (عقیل بن شهر الریاحی) وتویەتی جارێکیان (عبدالله)ی کوڕی (عمر) ئاوێکی ساردی نۆش کردو پاشان

بەگریانێکی زۆر کوڵ گریا، پێیان ووت: چی تۆی گریاند؟ وتی ئەو ئایەتەم بەبیر هاتەوە ، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾سبأ: ٥٤ جا زانیم ئەهلی ئاگر حەزیان لەهیچ نیە تەنها ئاوی سارد نەبێ. خوای گەورەش فەرمویەتی: ﴿أَنْ أَفِيضُوا عَلَيْنَا مِنَ الْمَاءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ ﴾

## بانگ کردنی ئەهلی بەهەشت بۆ ئاگرنشینەکان

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَنَادَىٰ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾الأعراف: ٤٤

خودای گەورە لەبارەی ئاینده بە بێژەی رابردوو دەری بڕیوە، چونکە لەبەر روونیو ئاشکرایی کارەکەو روودانی وەکو بڵێی روویداوە.

ئەهلی بەهەشت بانگی ئاگر نشینەکان دەکەنو پێیان دەڵێن: ئەی ئەهلی ئاگر ئێمە ئەوەی خوای گەورە بەڵێنی پێدابوەین هاتەدی بۆمانو بینیمان لەدونیا بەوەی لەسەر زاری پێغەمبەرانی پێی راگەیاندوین ،کەوا باوەڕ بوون بە خوای تاکو تەنیا و گوێڕایەڵی کرنی خۆیو پێغەمبەرانی ئەم جۆرە پاداشتەی هەیە، ئایا ئێوەش ئەوەی خواتان بەڵێنی پێدابوون هاتەدی بەوەی ئەگەر باوەڕ بە خوا نەهێننو سەرپێچی بکەن لەسزا بە دوور دەبن؟ ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ، ئەوەی خوامان بەڵێنی پێدابوین، لەسەرشۆڕیو نەهامەتیو سزا بۆمان هاتەدی. جا لەو کاتە بانگ دەرێك دەڵێت ﴿أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ ﴾ئەم رۆژەش ناسراوە بە رۆژی(الأذان).

پێشەوا (قرطبي) لە(جامع)ەكەی خۆی هێناویەتی: كەوا (طاوس) چووە لای (هشام)ی كوڕی (عبدالملك)و پێی وت: لەخوا بترسەو ئاگات لەڕۆژی (الأذان) بێت (هشام)یش ووتی: ڕۆژی (الأذان) چیە؟

(طاوس) دەڵێ: ئەو ئایەتەیە، كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾الأعراف: ٤٤

جا (هشام) دەست بەجێ لەهۆش خۆی چوو، . (طاوس) وتی: ئەگەر وەسف كردنی ئەو ڕۆژە كاریگەریەكەی ئەوها بێ ئەدی بەوە چ دەڵێی ئەگەر ببینیێ.

خودایە من دەزانم كەوا كەس كردەوەكەی خۆی ڕزگاری ناكا لەڕۆژی قیامەت، بەڵكە هەمووی بە ڕەحمەتی تۆیە، خودایە من داوای ئەو ڕەحمەتت لێ دەكەم بۆ خۆمو وەچەمو دایكو باوكو باوەڕدارن لەدونیا لەقیامەت...ئامین.

## ئاخافتنێكی گرنگ لەنێوان پیاوێكی بەهەشتیو پیاوێكی ئەهلی ئاگر

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾﴾الصافات: ٥٠ - ٦١

(کاتێك ئەهلی بەهەشت لەنێوان خۆیان دادەنیشن و پرسیار لەیەکتری دەکەن لەبارەی هەندێك لەکاروباری دونیا، لەوانە ئەوەی گوێیان لێ دەبوو لەکافرەکان لەرەت کردنەوەی باوەڕ بە خوای تاکو تەنیا و زیندوبونەوە، جا یەکێك لەوانە دەڵێت: من وابیرم دێت برادەرێکم هەبوو بەردەوام لەگەڵم دابوو، هەوڵی دەدا گومڕام بکاو سەرم لێ بشێوێنێو بمخاتە نێو زۆڵکاوی شیرکو لام بدا لەیەکتاپەرستیو باوەڕبوون بە خوداو بڕوابوون بە پێغەمبەرەکەی محمد(ﷺ) جا پێمی دەوت: تۆ بڕوادەکەی کاتێك ئێمە دەمرینو پاش مردن، کە بووینەوە خۆڵو جەستەمان هەڵوەشایەوە جارێکی تر زیندوو بکرێینەوەو پاداشت لەسەر کردەوە چاکەکانمان وەربگرینو سزاش بدرێین لەسەر کردەوە خراپەکان؟

بەهەشتیەکە، کە ئەو چیرۆکەیان بۆ دەگێڕێتەوە دەڵێ: دەوەرن ئێستا با بەیەکەوە بڕۆین ئەهلی ئاگر ببینین، کە چۆن واپاداشتی کردەوە خراپەکانیان دەدرێتەوە، جا رووی خۆی وەردەگێڕیو دەبینی لەنێو ئاگردا دەسوتێو سزایەکی بە ئێش دەدرێ، پێی دەڵێ: سوێند بەخوا نزیك بوو تۆ من فریو بدەیو گومڕام بکەو بم خەیە ئەو شوێنەی واتۆ لەنێوی دای، ئەگەر خوای گەورە منی نەپاراستایە لەشیرکو رێنمایی نەکردبام بۆ دەست گرتن بەو ئاینە ئەوا وەکو تۆ بووم ئێستاو رایان دەکێشام بۆ ناو ئەو ئاگرە بڵێسە دارە بۆ ئەوەی سزاکەی بچێژم.

بەهەشتیەکە لەخۆشی نیعمەتی خوا کە دەرهەقی کردوە دەڵێ: ئایا ئێمە هەتا هەتایە لەناو ئەو نازو نیعمەتانەدا ژیان بەسەر دەبەینو قەت ناپچڕیو بێ بەش ناکرێین لێی؟ ئایا جارێکی تر لەپاش مردنی یەکەم جارێکی تر نامرینەوەو جارێکی تریش هیچ ئێشو ئازارو سزایەك پێمان ناگات؟ ئێمە ئەوەی لەنێوی داینە لەخۆشیو رابواردن هەر بەردەوامەو جارێکی تر مردن نیەو، لەسزای خوا ئەمینینو، ئەمەش کە بردنەوەیەکە، لەسەرووی هەموو بردنەوکانو سەرفرازیەکانە.

جا بۆ گەیشتن بەم مەرامو ئامانجە پێویستە بڕواداران کارو کۆششو کردەوەی چاك ئەنجام بدەنو کێبڕکێ بکەن لەسەر کردەوە چاکەکان جا ئەوەی کردەوەیەکی چاکی کرد ئەوا بۆ خۆیەتی، ئەوەی خراپەیەکیشی کرد ئەوا لەسەری دەوەستێ خواش ستەم لەهیچ بەندەیەکی ناکات.

## دوو ڕووەکان لەژێرەوە ژێرەوەی ئاگردان

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾النساء: ١٤٥

(زەمەخشری) وتویەتی: دوو ڕووەمان پیسترین کافرنو لەهەموان زیاتر تووشی توڕەیی و سزای خوا دەبنەوە، چونکە ئەوان بە فێڵو تەڵەکەبازی و چەواشەکاریو ریابازیو قەشمەری خۆوانیشان دەدەن کەوا موسڵمانن بۆ ئەوەی ئیسلامو موسڵمانان لەناو ببەن بۆیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزاندن :﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾النساء: ١٤٥

پێشەوا (قرطبي) وتویەتی: دووڕوو لەبەر ئەوەی کوفرەکەی خەست ترەو زۆرتر دەتوانێ بێتە نێو موسڵمانان بۆ ئەوەی زەرەریان لێ بداتو ئەزیەتیان بدات بۆیە فڕێدەدرێتە ژێرەوە ژێرەوەی ئاگر.

(ابن مسعود) فەرمویەتی: لەبارەی ئایەتی ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾النساء: ١٤٥ وتویەتی ئەوان لەناو چەند تابوتێکی ئاسنین دان، کە لەسەریان داخراوەو ناتوانن بیکەنەوە. (أخرجە ابن أبی شیبە، وابن أبی الدنیا، وابن أبی حاتم فی صفە النار.

(أبو هريرة) ئایەتی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾النساء: ١٤٥ وتویەتی: (الدرك الاسفل): چەند خانوەکی ئاسنینە و دەرگاکانی هەمووی داخراوەو قوفل دراوە، کە لەژێریانو سەرەوەیان ئاگریان بۆ گڕ دەدرێ. (أخرجه عبد بن حميد).

(ابن مسعود) فەرمویەتی: ئایا کێ لەئەهلی ئاگر توندترین سزای هەیە؟ پیاوێك ووتی: دوورووەکان فەرمووی: راست دەکەی، ئایا دەزانی چۆن سزا دەدرێن؟ وتی: نەخێر، فەرموی: لەناو چەند تابوتێکی ئاسنین دادەنرێن و لەسەریان قوفل دەدرێ پاشان فڕێ دەدرێنە ژێرەوەی ژێرەوە و لەناو چەند تەندورێکی زۆر تەسك دان، کەپێی دەوترێ: پردی خەمناکی، کە هەتا هەتا لەناوی دا دەمێننەوە.

## سیفەتی دووروویی‌و دوورووەکان

براو خوشکی ئازیزم بزانە کە دوورووەکان درۆزنو خاینن‌و، پەنهانی‌و ئاشکرایان وەك یەك نیەو دژیەکە، لەبیروباوەڕیشدا کوفر دەشارێتەوەو بەرواڵەتیش خۆی بە موسڵمان نیشان دەدات.

پێناسەی دوو روو ئەوەیە: باوەڕ ئاشکرا بکاو کوفر بشارێتەوە، هەندێ جار بە ریابازیش دەوترێ دووروویی، خاوەنی (لسان العرب) وتویەتی: چونکە دووروویی‌و ریابازی هەردووکیان ئاشکرای شتێك دەکەن، کە خیلاف ناخیتیان.

(ابن تیمیه) وتویەتی: بنچینەی دووروویی، کە لەسەری دامەزراوە درۆیەو، ئەوەشە کە یەکێك بە زوبانی شتێك بڵێ و خیلاف دڵی بێت هەروەکو خوای گەورە لەبارەی

دوورەووەكان هەواڵی پێداوین، كە ئەوانە: ﴿ يَقُولُونَ بِأَلۡسِنَتِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ ﴾الفتح: ١١

پەیوەندی نێوان (تقیة) و (نفاق)یش ئەوەیە، كە (مُنافق) لەدڵەوە كافرە بەڵام لەرواڵەتدا وا خۆی نیشان دەدا ، كە باوەڕدارەو كردەوەی باوەڕداران دەكات، بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێ لەو كۆمەڵگایە ئیسلامیەی تیایدا دەژی هەروەها بۆ ئەوەی ئەو تایبەتمەندیەی باوەڕدار بە دەستی هێناوە ئەویش بە دەستی بهێنێ، بۆیە لێرەدا (نفاق) جیاوازیەكی زۆری هەیە لەگەڵ (تقیة) چونكە ئەو كەسەی (تقیة) دەكات باوەڕدارە بەڵام لەترسی نەفسی خۆی بۆ ئەوەی نەوەك توشی فیتنەیەك ببێ ئەوا هەندێك نیشانەی كوفر یان گوناهی لێ بەدی دەكرێ لەگەڵ رق لێ بوونەوەیەكی زۆر لەناو دڵیەوە كاتێك ئەنجامی دەداو دڵیشی بەردەوام ئارامو هۆگرە بە ئیمان.

## گرنگترین سیفاتی دووروەكان، كە لەقورئان دا هاتووە:

### (١) تێكدانی زەوی و چاكەكردنی:

خوای گەورە لەوەسفی دو٥ورووەكان دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ ئەوانە كاتێك پێیان دەوترێت تۆوی گوناهو تاوان و خراپەكاری مەچێنن لە زەویدا، دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها چاكسازی دەكەین!! ئاگادار بن، كە ڕاستی هەر ئەوانە تۆوی خراپە دەچێنن، بەڵام (بەهۆی لووت بەرزی و دەردەدارییانەوە) هەستی پێ ناكەن و (خۆیانی لێ گێل دەكەن). البقرە: ١١ – ١٢

**(٢) تۆمەتبارکردنی باوەڕداران بەوەی نەفامو گێلن:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ کاتێك پێیان دەوترێت ئیمان و باوەڕ بهێنن وەکو ئەوە هەموو خەڵکە (بێ فێڵ و ڕاستگۆیانە) کە باوەڕیان هێناوە، دەڵێن: چۆن ئێمە وەکو ئەو خەڵکە عەقڵ و گێلانە باوەڕ دەهێنین، (خەڵکینە) چاك بزانن و ئاگادارین کە هەر ئەوانە خۆیان کەم عەقڵ و گێل و نەفامن، بەڵام بۆ خۆیان نازانن. البقرة: ١٣

**(٣) فێڵ کردن لەباوەڕداران بەوەی لەلای ئەوان خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن، پاشان لەلای پێری خۆیان کوفر ئاشکرا دەکەن:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمْ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسْتَهْزِئُ بِهِمْ وَيَمُدُّهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیمانداریین و باوەڕمان هێناوە!!، کەچی کاتێك بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین!! (١٤) (بەڵام خەیاڵیان خاوە چونکە) خوا سزای گاڵتەجارییەکەیان لێدەستێنێت و (دەیانکاتە پەندو گاڵتەجاڕ)، ئەوە جارێ بەرەڵای کردوون تا کوێرانە مل بنێن و درێژە بەگومڕایی خۆیان بدەن. البقرة: ١٤ — ١٥

**(٤) گوێ نەدانیان بە شەرعی خوا لەلایەك، لەلایەكی تریش قەدەغەی خەڵك دەكەن كەوا حوكم بكەن بەوەی خوا ناردویەتە خوار:**

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾﴾

ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لاف ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی كە بۆ تۆ ڕەوانەكراوە و بەوەش كە پێش تۆ ڕەوانەكراوە (بۆ پێغەمبەران)! كەچی دەیانەوێت ڕووبكەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بكەن و چارەسەری كێشەكانیان بكەن، لەكاتێكدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە كە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بكات بەگومڕاییەكی دوورو بێ سنوور. (٦٠) كاتێكیش پێیان بوترێ: وەرن بۆ لای ئەو (قورئانەی) كە خوا ناردوویەتی یە خوارەوە و بۆ لای پێغەمبەرەكەی (بۆ چارەسەری كێشەكانتان) كەچی دەبینی دووڕووەكان پشتت تێدەكەن و ڕووت لێ وەردەگێڕن بەتەواوی. النساء: ٦٠ — ٦١

**٥- كافرەكان دەكەنە دۆست و خۆشەویستی خۆیان**

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ الْعِزَّةَ فَإِنَّ الْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾﴾

(ئەی پێغەمبەر مژدە بە دووڕووەكان بدە كە بەڕاستی سزایەكی بەئێشیان بۆ ئامادە

کراوە!! ئەو دووڕووانەی کە بێ باوەڕەکان دەکەنە پشتیوان و یارویاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەیانەوێت عیززەت و دەسەڵات و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ (ئەوانە بەهەڵەدا چوون) چونکە بەڕاستی عیزەت و باڵاداستی و سەربەرزیی هەر هەمووی بۆ خوایە. النساو: ١٣٨ – ١٣٩

**(٦) فەرمان کردن بە خراپەو قەدەغەکردنی چاکە:**

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾.

دووڕووەکان لە پیاوان و لە ژنان سەر بەیەکترن و وەك یەکن لەم ڕەفتارانەدا: فەرمان بەگوناهو خراپە و تاوان دەدەن و قەدەغەی خێرو چاکە دەکەن و دەستیان دەنوقێنن (ماڵ و سامان بەشی کەس نادەن)، ئەوانە خوایان فەرامۆش کردووە، خوایش ئەوانی پشت گوێ خستووە، بەڕاستی دووڕووەکان هەرخۆیان یاخی و لە ئایین دەرچوونالتوبة: ٦٧

# جۆرەکانی دووڕوویی (نفاق)

**دووڕوویی (نفاق) دوو جۆرە:**

**(١) دووڕوویی لەبیروباوەڕدا:** ئەوەیەکە باوەڕ بە دیار بخاو کوفر بشارێتەوە، ئەمەش پێی دەگوترێ (النفاق الاکبر) کە ئەم جۆرە مرۆڤ بە تەواوی لەئیسلام دەباتە دەرێ، خاوەنەکەشی دەچێتە ژێرەوە ژێرەوەی ئاگر (فی الدرك الاسفل من النار).

ئەم جۆرە (نفاق)ەش دەبێتە شەش جۆر:

١- بەدرۆ خستنەوەی پێغەمبەر (ﷺ)

٢- بەدرۆخستنەوەی هەندێك لەوەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی.

٣- رق لێبونەوە لەپێغەمبەر (ﷺ).

٤- رق لێبونەوە لەهەندێك لەوشتانەی پێغەمبەر (ﷺ) هێناویەتی.

٥- دڵ خۆش بوون بە دابەزینی ئاستی ئەو دینەی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی.

٦-پێناخۆش بوونو دڵ گرانی ئەو دینەی پێغەمبەر (ﷺ) سەربکەوێ.

**(٢) دووڕوویی بەکردار(النفاق العملی):** ئەوەیە، کە مرۆڤ لەپەنهانو ئاشکرادا باوەڕداربێ بەڵام چەند گوناهێك ئەنجام دەدا وەك (خیانەت کردن لەئەمانەت و درۆکردنو بەڵێن نەهێنانەجێ...).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((دوو روو سێ نیشانەی هەیە: بەدرۆ رووداوەکان بگێڕێتەوە، ئەگەر بەڵێنی دا بەجێی نەهێنێ، ئەگەر ئەمانەتێکی لەلا دانرا خیانەتی لێ بکا)) (متفق علیه).

لەفەرمودەیەکی تریش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((چوار شت ئەوەی لێی بێتە دی دەبێتە دووڕووەکی تەواو، ئەوەی یەکێکیشی لەو چوار خەسڵەتە لێ بێتە دی ئەوا خەسڵەتێکی دووڕوویی لێ هاتتەدی هەتا وازی لێ نەهێنێ: ئەگەر ئەمانەتێکیان لەلادانا خیانەتی لێ بکا، بەدرۆ رووداوەکان بگێڕتەوە، ئەگەر پەیمانی دا پەیمانەکەی نەهێنێتە دی، ئەگەر دژایەتی یەکێکی کرد زۆر بە خراپی سنوور ببەزێنێ)) متفق علیه.

# حوكمی دوو روویی(النفاق)

●حوكمی دووروویی لەبیروباوەڕدا(حكم النفاق الاعتقادی): حوكمی ئەو جۆرە مانەوەیە لەناو ئاگر بە هەتا هەتایی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾ خوا (هەڕەشەی كردوە و) بەڵێنی ئاگری دۆزەخی بە دووڕووەكان لە پیاوان و ژنان و بەبێ باوەڕانیش داوە، كە بەردەوام و نەمرن تیایدا، ئەو دۆزەخەیان بەسە و كالاّ بەقەد باڵایەو خوا نەفرەتی لێكردوون و سزای بەردەوامیش بەشیانە و بۆیان ئامادەیە التوبة: ٦٨

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾ بەڕاستی دووڕووەكان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێكت دەست ناكەوێت النساء: ١٤٥

●حوكمی دووروویی بەكردار (حكم النفاق العملی): حوكمی وەكو حوكمی (فیسق) وایە، ئەم جۆرە ئەنجامدانی گوناهێكی گەورەیەو دەبێ بگەڕێتەوەو تۆبەی لێ بكا.

هەندێكیش دەڵێن: ئەم جۆرە ئەنجامدانی هەندێك كارە لەكارەكانی دووڕووەكان، لەگەڵ هەبوونی باوەڕ لەناو دڵ دا، ئەمەش، كە لەئیسلامی دەرناكا، بەڵام ئەگەر لەسەری بەردەوام بوو دەبێتە هۆكارێك بۆ جۆری یەكەم، خاوەنەكەشی لەدڵیدا باوەڕو دووروویی لەنێو دایە، ئەگەریش زۆربوو ئەوە دەبێتە دووڕووەكی تەواو. والله تعالى أعلم.

# پاشەگەزبوونەوە(الرّدە)

لەزمانی عەرەبیدا (ردّە) بەمانای گەڕانەوە دێ.

لەزاراوەی شەرعیشدا کافر بوونە لەپاش ئیسلام بوون.

جۆرەکانی پاشەگەزبوونەوە(الردّە):

پاشەگەزبوونەوە –خواپەناماندا– بەوە دێتە کایەوە ئەگەر مرۆڤ هەڵوەشێنەوەیەك لەهەڵوەشێنەوەکانی ئیسلام ئەنجام بدا، هەڵوەشێنەوەکانی ئیسلامیش زۆرن بەلام هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ چوار بەش:

(١) پاشەگەزبوونەوە بە گوفتار(الردّة بالقول): وەك جوێندان بەخوای گەورە، یان جوێن دان بە پێغەمبەرەکەی، یان فریشتەکانی، یان یەکێك لەپێغەمبەرەکانی یان دینەکەی، یان پڕوپاگەندە کردنی زانینی عیلمی غەیب، یان پڕوپاگەندە کردنی پێغەمبەرایەتی، یان باوەڕ کردن بەو کەسەی ئەو پڕوپاگەندەیە دەکات، یان پاڕانەوە جگە لەخوا، یان پشت بەستن پێی، کەلەکاتێکدا لەتوانای دانەبێتو هەر خودا بتوانێ بیکا، یان پەنای پێ بگرێ...هتد.

(٢) پاشەگەزبوونەوە بەکردار(الردّة بالفعل): وەك سوجدە بردن بۆ بتو شەیتانو، عەورەتی ئافرەتو، درەختو، بەردو، قەبرو سەبڕین بۆی، هەروەها فڕێدانی قورئان بۆ ناو پیسایی‌و جا بائایەتێکیش بێت یان ئەنجامدانی جادووگەری‌و هەروا حوکم کردن جگە لەوەی خوا ناردویەتە خوار بە مەرجێك لەناخەوە بەحەڵاڵی بزانێ[1]...هتد.

---

(١) مەرج نیە ئەوەی بەحەلالی بزانێ حوکم کردن بەجگە لەشەریعەتی خوا ئەنجا کافر ببێ، چونکە ئەم بەمەرج دانانە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر نییە،بەڵکو ئەو کەسەی حوکم بەجگە لەشەریعەتی خوا دەکا حاکمی شەرعی تەحقیقی لەگەڵ دەکات کە ئایە عوزری نەزانینی هەیە یان تەئویلی کردیە یان هەر عوزرێکی تر کە بەعوزر دانراوە ئەنجا بڕیاری لەسەر کافر بوونی یان کافر نەبوونی دەدات.

(٣)پاشەگەزبوونەوە بە بیروباوەڕ: وەکو ئەوەی باوەڕت وابێ لەگەڵ خودادا هاوەڵێك هەیە، یان زیناو ئارەق‌و ریبا حەلالە، یان نان حەرامە، یان نوێژ واجب نیە، یان هەر شتێك هاوشێوەی ئەوانە بێت کەوا زانایان ئیجماعیان بەستوە لەسەر حەلاڵ کردنی یان حەرام کردنی یان واجب کردنی بە ئیجماعێکی قەگعی، کەوا کەس نیە نەیزانی...هتد.

(٤) پاشەگەزبوونەوە بە گومان (الردّه بالشك): وەکو ئەوەی گومانی هەبێ لەو شتانەی پێشوو باسمان لێوە کرد، وەکو ئەوەی گومانی هەبێ لەحەرام بوونی شیرك، یان حەرام کردنی زینا یان ئارەق، یان گومانی لەحەلال کردنی نان هەبێ، یان گومانی هەبێ لەپەیامی پێغەمبەر (ﷺ) یان پەیامی پێغەمبەرانی تر، یان گومانت هەبێ لەراست گۆییان، یان گومانت لەئایینی ئیسلام هەبێ، یان گومانت هەبێ لەگونجاندنی ئەم ئایینە بۆ هەموو ساتێك، یان گومانی هەبێت لەقورئان با ئایەتێکیش بێت، یان گومانی هەبێت لەوەی قورئان کامیلەو بێ کەم‌و کوڕیە، بەڵگەش لەسەر کوفرکردنی ئەو کەسە بەدرۆخستنەوەیەتی بەبێ ئەوەی هەستیش بە خۆی بکات، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾بەڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین و (نایەڵین دەستی خیانەتکار هیچ جۆرە دەستێکی تێ بخات و هەموو هەوڵێك بۆ دەستکاری کردنی نەزۆکە الحجر: ٩

جا ئەوەی بڵێ قورئان کەم‌و کوڕی هەیە، ئەوەا مانای ئەوەیە، کە بێ دەسەڵاتی‌و بێ هێزی داوەتە پاڵ خوا بەوەی ناتوانێ قورئانەکەی بپارێزێ، پاشان بە درۆخستنەوەیەتی بۆ ئەو ئایەتە.

(٥) پاشەگەزبوونەوە بە وازهێنان: وەك ئەوەی نوێژ نەكاو نوێژ رەت بكاتەوە یان بە ئەنقەست نەی كات، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ ((ئەوەی مرۆڤ كافرو موشریك دەكات نوێژ نەكردنە)) (رواه مسلم).

# الفسق

(فِسق) لەزمانی عەرەبیدا بەمانای دەرچوون دێت.

لەزاراوەی شەرعیشدا: دەرچوونە لەفەرمانی خوا، هەندێك جار دەرچوونەكە دەرچوونەكی بەتەواوی‌و یەكجاری یە بۆیە بە كافر دەوترێت فاسق، هەندێك جاریش دەرچونەكە جوزئیە، بۆیە بەو باوەڕدارەی كە گوناهی گەورەی ئەنجام داوە دەوترێ فاسیق.

لەوپێناسەیەدا دەردەكەوێ كەوا (فیسق) دوو جۆرە: جۆری یەكەم: فیسقێك بەتەواوی لەمیللەتی ئیسلامت دەردەكا، ئەم جۆرەیان كوفرە بۆیە بە كافر دەوترێت فاسیق، خوای گەورە لەبارەی شەیتان دەفەرموێ: (ففسق عن أمر ربه).

جۆری دووەم: ئەو فیسقەی موسڵمان بە تەواوی لەئیسلام دەرناكا، بەڵكو لەبەرئەوەی گوناهێكی گەورەی ئەنجام داوە بۆیە پێی دەوترێت (فاسیق) خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ ئەوانەی كە بوختان دەكەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار كەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخیەكاندان النور: ٤

## الضلال:

الضلال: واتە لادان لەرێگای راست ، کە بەم پێیە دژی وشەی (هدایە)یە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَّنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا ١٥ ﴾ ئەوەی هەوڵی دابێت ڕێبازی ڕاست و دروست بگرێت، ئەوە بەڕاستی بەقازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومڕا بووەو ڕێبازی سەرلێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومڕاییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پیغەمبەرێکی بۆ دەنێرین. الإسراء: ١٥.

## الطواغيت

الطاغوت: ئەو شتەیە، کە جگە لەخوا بپەرستی جا ئەو شتە مرۆڤ بێت یان دار بێت یان بەرد یان هەرشتێکی تر ئەوا پێی دەوترێت تاغوت.

گەورەی هەموو تاغوتەکانیش شەیتانەو پاشای سەرکردەی کافرەکانو هەموو کافرەکان بە گشتی.

## لێدوانێك بۆ دووڕووان:

*ئەی ئەو كەسەی فێڵ لەخودا دەكەی، لەكاتێك دا خوا لەخشتەت دەبات.

*ئەی ئەو كەسی دڵت نەخۆشە و خوداش نەخۆشیەكەی بۆ زیاتر دەكات.

*ئەی ئەو كەسەی ئاشكراو پەنهانی وەكو یەك نیە.

*ئەی ئەو كەسەی سەیركردنی خوا بۆت بە هەند وەرناگری، كاتێك لەخەڵك خۆ دەشاریەوە بۆ ئەوەی سنورەكانی خوا ببەزێنیۆ بەگوناهو تاوانەكان بێنە مەیدان و دژایەتی خوایان پیێ بكەی، ئەو ئایەتە بە بیری خۆت بێنەوە، كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ ﴾ ئەوانە دەیانەوێت خیانەت و تاوانەكانیان لەخەڵكی بشارنەوە، لەكاتێكدا ناتوانن لە خوای بشارنەوە كە لەگەڵیاندایەو چاودێریانە، بەشەودا قسەی واهەڵدەبەستن خوا پێی ڕازی نیە و خوا بەردەوام گەمارۆدەری ئەو كارو كردەوانەیە كە ئەنجامی دەدەن. النساء: ١٠٨

بترسە لەغەزەبی خوداو خۆت لەئاگر ڕزگار بكە و قسەی شاعیریش لەبیر مەكە، كە وتویەتی:

وإذا خلوتَ بريبة في ظُلمة     والنَّفسُ داعية إلى العصيان

فاستحي من نظرِ الاله وقُلْ لَها     إنَّ الذي خَلَقَ الظلام يراني

*ئەی ئەو كەسەی بە تەمبەڵیو سستی هەڵدەستی بۆ نوێژو عیبادەتەكانی تر كە بیری لێ ناكایەوەو بۆ خوا ئەنجامی نادەی، كەواتە بزانە، كە تۆ بۆ دووڕوویی‌و ریابازیتە نەك بۆ گوێڕایەڵی كردن‌و بەجێ هێنانی فەرمانەكان. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ

ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ ﴾ بەڕاستی دووڕووەکان (وا دەزانن) فێڵ لە خوا دەکەن (لەکاتێکدا) ئەو زاتە فێڵەکانیان پووچ دەکاتەوە (نازانن کە دیار و نادیار، لای خوا ڕوون و ئاشکرایە)، هەر کاتێکیش (بۆ ڕیاو ڕووپامایی) هەڵدەستن بۆ نوێژ، زۆر بەلەش گرانیی و تەمەڵیی هەڵدەستن، ئەوانە ڕیایی و ڕوپامایی بۆ خەڵکی دەکەن، زۆر کەم یادی خوا دەکەن. النساء: ١٤٢)

ئاگات لەخۆ بێ لەتەمبەڵیو سستی لەکردنی عیبادەتەکان، چونکە ئەمانە هەموو لەنیشانەکانی دووڕووین، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو کاتی ئەو عیبادەتانە کاتی ئیسراحەتو لەزەتو خەوبوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((نوێژی بەیانیو نوێژی عیشا گرانترین نوێژن لەسەر دووڕووەکان ئەگەر بزانن چ پاداشتێکی هەیە ئەوا بە گاگۆلە بۆی دەهاتن، خەریکە فەرمان بکەم بە یەکێك قامەت بکات پاشان فەرمان بکەم بەپیاوێك پێش نوێژی بۆ خەڵك بکا پاشان دەست بدەمە گورزەئاگرێك بچم ئەوانە بسوتێنم کە نایەت بۆ نوێژکردن)(متفق علیە).

جا ئاگات لەخۆ بێ لەو سیفەتە خراپەو خێرابە بۆ ئەنجامدانی عیبادەتەکان بە هیمەتێکی بەرزو چالاکیەکی بەردەوامو بێ تەمبەڵیو بێزاریو کەم تەرخەمی.

●ئەی ئەو کەسەی ئەگەر پێی وترا فەسادی لەزەوی دا مەکە: دەڵێ: من چاکەکارو چاکسازم، درۆ مەکە لەقسەکردندا چونکە ئەم سیفەتە گەورەترین سیفەتی موونافیقی عەمەلیەو، چەقی بازنەکەیەتی، کە لەسەری دامەزراوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ﴾خوا شایەتی دەدا کە ئەو ناپاك و دووڕووانە درۆزنن. المنافقون:١

پێغەمبەریش (ﷺ) لەفەرمودەیەك ئاگاداری ئێمەی کردۆتەوە، کە فەرمویەتی: ((نیشانەی دو روو سێ نە: ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، ئەگەر پەیمانو بەڵێنی دا

بەجێی نەگەیەنێ، ئەگەریش راسپاردەیەکی لەلادانرا خیانەتی لێ بکات) (رواه مسلم). جا درۆ نیشانەیەکی ئاشکرایە گەواهی دەدات لەسەر خاوەنەکەی بەدوو روویی چونکە درۆ راستیەکان سەراوگێڕ دەکاتو موخالەفەی واقیعە، لەلایەکی تریش بەڵگەیە لەسەر پیسی خاونەکەی.

ئاگاداری ئاگاداری لەدرۆکردن جا چ بەگاڵتەبێ چ بە راستی چونکە رێگایەکە بەرەو هەڵدێرو فەوتانو رێچکەیەکە بۆ کەوتنە ناو داوەکانی شەیتانو، دوورکەوتنەوە لەئیمان.

●ئەی ئەو کەسەی مۆری لەسەر دڵی دراوە، کە قەت تێ ناگاو نافامێ، نەکەی گاڵتە بکەی بەباوەڕدارە مولتەزیمو چاکەکان، ئاگادار بە نەکەی بە کەیفی خۆت باسی کەمو کوڕیان بکەی و بەزبان ئازاریان بدەی وەکو کەسێك، کە هیچ کاری نەبێت تەنها تانەو تەشەردان نەبێت لەوانە خوای گەورەی دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا لَقُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا۟ إِلَىٰ شَيَـٰطِينِهِمْ قَالُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴿١٤﴾ کاتێکیش (دووڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیمانداریین و باوەڕمان هێناوە ! !، کەچی کاتێك بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان ڕادەبوێرین! ! البقرة: ١٤

ئاگادای ئاگاداری لەمومارەسەکردنی ئەو کارە دزێوە بەهەنجەتی گاڵتەو گەپ کردنو رابواردن، چونکە خوای گەورە ئاگاداری ئێمەی کردۆتەوە،کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَـٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ (کاتێك تۆ ئەی پێغەمبەر لەگوفتاری نابەجێیان ئاگادار

دەبیت) و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمەو گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟! التوبة: ٦٥

●ئەی ئەو کەسەی حەزدەکات بەدڕەوشتی لەنێوان ئیمانداران بڵاو بێتەوە، ئایا لەسزای خوای ناترسی؟؟ خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾النور: ١٩

●ئەی ئەو کەسەی کارە خراپەکان دەبینێ و، قەدەغەیان ناکات،بەڵکو فەرمان بە خراپە دەکات و قەدەغەی چاکە دەکات و، ڕووی گرژ نابێت و توڕە نابێت کاتێك سنورە قەدەغەکراوەکانی خوا دەبەزێنرێ، ئەم ئایەتە بێنە بیرە خۆت، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾ بە ڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زیناو تاوان لە ناو ئەوانەدا باوەڕیان هێناوە بڵاوبێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهان بۆیان ئامادەیەو خوا خۆی چاك دەزانێت (سەرەنجامی زیناو شەڕواڵپیسی بەرەو کوێ دەچێت) ئێوە نایزانن. التوبة: ٦٧

●ئەی ئەو کەسەی لەکردەوەکانی دا مەبەست خودا نیە و کار بۆ ڕۆژی دوایی ناکات، ئاگاداربە نەکەی لەنوێژی بە کۆمەڵ دوابکەوی لەمزگەوت.

(ابن مسعود) وتویەتی: ئێمەت دەبینی کەوا کەسمان(لەنوێژی بە کۆمەڵ) دوا نەدەکەوت مەگەر دوو ڕوو بوایە، جاری وا هەبوو بە دوو پیاوان پیاوێکیان دەهێنا بۆ

ئەوەی بیبەنە ناو ریزی نوێژکەران. (رواه مسلم) چونکە دواکەوتن لەنوێژی بەکۆمەڵ لەمزگەوت بەبێ عوزرەکی شەرعی گوناهێکی گەورەیەو بەڵگەیە لەسەر نەخۆشی دڵو، نیشانەیەکیشە لەسەر موخالەفەکردنی کۆمەڵی موسڵمانانو بەجێنەهێنانی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی.

●ئەی ئەو کەسەی خیانەت لەئەمانەت دەکات ،نەکەی وابکەی چونکە ئەمە سیفەتێکە لەسیفەتەکانی نیفاقی عەمەلی، بزانە کەوا خیانەت کردن لەئەمانەت تەنها لەپارەو پول نیە، بەڵکو هەر یەکە لەخیانەتی وتەو کردارو بڵاوکردنەوەی نهێنی و جگە لەمانە دەگرێتەوە، ئیسلام ئێمەی لەو سیفەتە بەدو درێوە ئاگادار کردۆتەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلْيُؤَدِّ ٱلَّذِى ٱؤْتُمِنَ أَمَٰنَتَهُۥ وَلْيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ﴾البقرة: ٢٨٣ بشزانە کەوا خیانەت کردن لەئەمانەت جاری وا هەیە لەنێوان بەندەو خوای گەورە دەبێت لەعیبادەتەکانو مامەلەکردنەکاندا هەندێك جاریش لەنێوان مرۆڤەکاندا روودەدات لەگرێبەستی کڕینو فرۆشتندا جا خیانەت کردن بەڵگەیە لەسەر لاوازی باوەڕ (أنس) خوای لێ رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر وتاری بۆ ئێمە بفەرموبایە دەیفەرموو((لا إيمان لمن لا أمانه له: ئەو کەسە باوەڕدارێکی تەواو نیە ئەگەر ئەمانەتی لەلا نەبێ)) (حديث صحيح رواه الامام احمد).

● ئەی ئەوکەسەی بەڵێنی خۆی ناباتە سەرو بەجێی ناگەیەنێ، بزانە کەوا ئەو سیفەتە سیفەتێکی مونافیقی عەمەلیە و زەرەر بە تاكو کۆمەڵگا دەگەیەنێو سیفەتێکە یەك ناگرێتەوە لەگەڵ باوەڕداری راست گۆ، ئاگاداربەو نەکەی بەڵێن بەخەڵك بدەیو پاشان جێ بەجێی نەکەی یان دوابکەوی بەبێ عوزرێکی شەرعی، چونکە ئەمە دەبێتە بەڵگەی نەگرتنی رێزی بەرامبەرو هەست نەکردن بە هەستو سۆزیان، بێجگە لەمەش دەبێتە نەمانی متمانە لەنێو ئەندامانی کۆمەڵگادا. وتەی شاعیریش لەبیر نەچێ کە وتویەتی :

**یا واعداً أخلَفَ في وعده          ما الخلف من سيرةِ أهل الوفا**

●ئەی ئەو کەسەی کە دژایەتی یەکێکی کرد، ئەوا زیادەڕۆیی تێدا بکاو ستەم بکاو لەهەق لابدا، فەرمودەی پێغەمبەری خوات لەبیر نەچێ، کەلەبارەی مونافیق فەرمویەتی: ((ئەگەر دژایەتی کرد سنور ببەزێنێ))[1] هەروەها لەفەرمودەیەکی تریش فەرمویەتی: (( سنور بەزاندنو خراپەکاری بەرەو ئاگر دەڕوا))[2].

بزانە کەوا سنور بەزاندن لەدژایەتی کردندا سیفەتێکی بەدو نگریسەو خاوەنەکەی تووشی نیفاق دەکات چونکە دەرچوونە لەهەقو هەق پێشێل دەکرێتو باتیلو دەست درێژی کردنو بەدڕەوشتی زۆر دەبێت.

ئاگات لەخۆت بێ لەدەست درێژی کردنو سنور بەزاندن چ لەکاتی شێنەییت چ لەکاتی توڕەییت، نەفسی خۆت فێرە راست گۆیی بکەو، مەهێلە نیفاق کەلێنێك ببینێتەوە بۆ ناو دەروونت بۆ ئەوەی هەق رەت بکەیتەوە.

●ئەی ئەو کەسەی، کە ئەگەر پەیمانی دا غەدر دەکاو هەڵیدەوەشێنێتەوە، چۆن ئاگات لەفەرمودەی خوا نیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٩١﴾ ﴾: بەوەفاو بە ئەمەك بن بۆ ئەنجامدانی پەیمانی خوا کاتێك بڕیاری دەدەنْ و سوێند و پەیمان و بەڵێنتان هەڵمەوەشێننەوە دوای ئەوەی کە دووپات کرابۆوە و تەئکیدی لەسەر کرابوو، لە کاتێکدا کە ئێوە خواتان کردۆتە کەفیل و زامن بەسەر خۆتانەوە، بێگومان خوا دەزانێت بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن. النحل ٩١

پاشان چۆن فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) لەبیر دەکەی، کە فەرمویەتی: (لِكُلِّ غادر لواء

---

(١) متفق عليه

(٢) متفق عليه

يوم القيامة يُعرَفُ به): ئەوانەی غەدر دەكەن لەرۆژی قیامەت ئالآیەكیان هەیەو پێی دەناسرێن)) (رواه مسلم).

هەر ئەوەش نا بەڵكو تەعالیمی ئیسلام قەدەغەی غەدر دەكات هەتا لەگەڵ كافرانیش چونكە ئەم سیفەتە بەدە وادەكات متمانە نەمێنێ لەنێو مرۆڤەكان‌و وادەكات مافەكان بفەوتێ و دەبێتە هۆی تێكدانی ژیان، بشزانە كەوا ئەو سیفەتە بەدە بەڵگەیە لەسەر نیەت خراپی‌و دەروون پیسی، شاعیر وتویەتی:

والغَدرُ بالعهد قبيح جداً      شرُّ الورى مَن ليس يراعي عهْداً.

*لەدواییدا ئەی ئەو كەسەی رێگای هیدایەتی واز لێهێناوەو رێگاكانی گومڕایی گرتۆتە بەر لەبیر مەكە كەوا نیفاق چەند شیكل‌و وێنەیەكی جۆراو جۆری هەیە كە هەموویان دەوەستێتە سەر بە دیار خشتنی هەق بەرواڵەت بە خیلافی ئەوەی لەناو دڵدا هەیە جا ئەو شتانە چ وتە یان كردار یان نیەت بێت.

ئەوەش بزانە كەوا نیفاق تاك‌و كۆمەڵگا دەفەوتێنێ‌و بە هیلاكی دەباو رێگایەكیشە بۆ فەوتاندنی مافەكان‌و نیشانەیەكیشە بۆ نەمانی متمانە لەنێو خەڵكدا. جا وەكو ئەوە بە كە شاعیر فەرمویەتی:

خــلِّ النــفاق لأهله      وعلــيك فالتمِس الطريق

وارغب بنصبف أن تُرى،      إلا عـــــدواً أو صـــديقاً

## خۆش گوزەرانترین کەس لەدونیا

## (لەکاتێك کە ئەهلی ئاگرە)

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ((خۆش گوزەرانترین کەس لەدونیا، کە لەئەهلی ئاگرە لەرۆژی قیامەتدا دەیهێننو، جارێك دەیهاوێنە ناو ئاگرو پاشان پێی دەڵێن: ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ خێرو خۆشیەکت چێشتووە؟ هیچ نیعمەتێکت دەرهەق کراوە؟ دەڵێ: نەخێر، سوێند بە تۆ، کەسێکیش دێنن لەئەهلی دونیا کەلەناخۆشترین ژیان بووە، بەڵام ئەهلی بەهەشتەو جارێك دەیهاوێنە ناو بەهەشتو پاشان پێی دەڵێن: ئەی نەوەی ئادەم ئایە هیچ ناخۆشیەکت بینیوە؟ هیچ تۆشی مەینەتو تەنگانە بووی؟ دەڵێ: نەخێر، سوێند بە تۆ، توشی هیچ ناخۆشیەك نەبویمەو هیچ مەینەتو ئازارم نەچەشتووە))(رواه مسلم وأحمد والنسائی وابن ماجه).

جا ئەی بەندەی خودا بیر لەسەرەنجامت بکەوەو، سوود لەدەوڵەمەندیت وەربگرە پێش فەقیر بوونتو، سوود لەلەش ساغیت وەربگرە پێش نەخۆش کەوتنتو، سوود لەژیانت وەربگرە پێش مردنت، چونکە تۆ نازانی بەیانی چیت بەسەر دێ.

## پردی (صراط) لەسەر دۆزەخە

(صراط) ئەو پردەیە خوای گەورە لەسەر ئاگر دایدەمەزرێنێو، خەڵکی بەسەریدا دەڕۆن، کە جێی پێ هەڵخلیسکانە، پێغەمبەران –علیهم الصلاة والسلام– لەسەری دەڕۆنو دەفەرموون خودایە سەهلو سانای بکەی!

شیخ الاسلام (ابن تیمیة) لە(العقیدة الواسطیة) وتویەتی: (صراط) لەسەر دۆزەخ دانراوە، کە پردێکە لەنێوان بەهەشتو ئاگر دایە، خەڵکی بە پێی کردەوەکانیان بەسەریدا دەڕۆنو، هەیانە وەك چاو تروکانێك بەسەریدا دەڕۆن، هەیانە وەك سوارچاکێك بەسەریدا دەڕوات، هەیانە وەك رۆیشتنی وشتر بەسەریدا دەڕواتو، هەیانە

بە غاردانە دەڕواتو ، هەیانە بەڕۆیشتنی ئاسایی بەسەریدا دەڕواتو، هەیانە بە گورگە لۆقی بەسەریدا دەڕواتو، هەیانە دەگیرێو فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخ، چونکە ئەو پردە چەند قولابێکی لەسەرە بەپێی کردەوەی خەڵکەکان دەیانگرێ، ئەوەی بەسەر ئەو پردە دابڕوات دەچێتە بەهەشت، ئەگەر بەسەریدارۆیشت لەلای قەنتەرەیەك لەنێوان بەهەشتو دۆزەخ رادەگیرێنو، تۆڵە لەهەندێك دەسنرێتەوە بۆ هەندێك، جا ئەگەر پاكو خاوێن بوونەوە مۆڵەتیان پێ دەدرێت بۆ چوونە ژوورەوەی بەهەشت.

(سفارینی) وتویەتی: (صراط) لەزمانی عەرەبیدا بە مانای رێگای روونو ئاشکرا دێت.

لەشەرعیشدا: پردێکی درێژەو لەسەر دۆزەخ دانراوە، کە هەموو بەسەریدا دەڕۆنو، قەنتەرەیەکە لەنێوان بەهەشتو ئاگردا.

(أبو العز)یش، کە راڤەی مەتنی عەقیدەی تەحاوی کردووە لەبارەی (صراط) وتویەتی:

(باوەڕمان بە (صراط) هەیە، کە پردێکە لەسەر دۆزەخ، پێش ئەمە خەڵکێك دەکەونە ناو تاریکیەك هەروەکو دایکمان (عائیشە) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پرسیارکرا لەپێغەمبەری خوا، کە کاتێك زەوی ئاسمانەکان دەگۆڕێنو(تبدیل) دەکرێن خەڵکی لەکوێنە؟ فەرموی ((پێش پردەکە لەناو تاریکایەك دان)) (رواه مسلم).

زانای پایەبەرز (السفارینی) رای ئەو زانایانەی باس کردووە لەبارەی (صراط) کە ئایە مەجازیە یان راستە؟ وتویەتی: زانایان یەك دەنگن لەسەر بوونی (صراط) بەڵام ئەهلی حەق بڕوایان بە ظاهری دەقەکان هەیە کەوا (صراط) پردێکە لەسەر دۆزەخ، کە لەشمشێر تیژترەو لەموو باریك ترە، بەڵام (عبدالجبار المعتزلی) ئەمەی رەت کردۆتەوە لەگەڵ دارو دەستەکەی چونکە وا گومان دەبەن، کە ئەوە ناتواندرێ باوەڕداران بەسەری دابڕۆن لەلایەکی تریش ئەمە ئازاردانو سزادانی باوەڕدارە زانراویشە کەوا

سزاو ئازار لەرۆژی قیامەتدا لەسەر باوەڕداران‌و پیاوچاکان نیە، بەڵکو ئەمە ڕێگای بەهەشتە هەروەکو خوای گەورە ئاماژەی پێکردووە کە دەڵێ: ﴿سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ۝٥﴾ ئەوانەرێنموویی دەکات بۆ جێگە و ڕێگەی خۆش و دڵ و دەروون و بیرو هۆشیان ئاسوودەدەکات محمد: ٥

لەبارەی ڕێگای ئاگریش فەرمویەتی: ﴿فَاهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْجَحِيمِ ۝٢٣﴾ ئینجا ڕێنماییان بکەن بۆ ڕێگەی دۆزەخ چونکە بێ باوەڕ و تاوانبارن. الصافات: ٢٣

هەندێکیش وایان لێك داوەوە، کەوا هەندێك کاری بەد دەبنە هۆی ئەم ئازاردانە، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە هەموو پووچەو ڕاست نیە بەڵکو دەبێ دەقەکان لەسەر حەقیقەیتی خۆیان وەربگیرێن پەڕینەوەش لەسەر (صراط) سەیرترنیە لەڕۆیشتن لەسەر ئاو فڕین لەهەواو ڕاوەستان تیایدا، زانای پایە بەرز (القرافی) ڕەتی کردۆتەوە کەوا (صراط) لەشمشێر تیژتربێت و لەموو باریك تر بێت هەروەها ڕای مامۆستایەکەی (العز بن عبدالسلام)یش هەر ئەوهایە، بەڵام ئەوەی هەق بێ لەباری (صراط)دا ئەوەیە، کە دەقی ڕاست‌و ڕەوانی لەسەر هاتووە و دەبێ بەبێ تەئویل کردن‌و بەظاهری خۆی وەربگیرێ، هەروەکو کە لەهەردوو (صحیحین)و (مسانید)و(سنن)کاندا هاتووە، کە هەمووی ئەوە روون دەکاتەوە، کە (صراط) پردێکە لەسەر دۆزەخ دانراوەو هەموو خەڵکی بەسەریدا دەڕۆن‌و هەریەکە بە جۆرێك دەپەڕێتەوە لەسەری.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((لەرۆژی قیامەتدا میزان دادەنرێ، ئەگەر ئاسمانەکان‌و زەوی لەسەر دابنرێ ئەوا جێی دەبێتەوە، جا فریشتەکان دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان! چ بەو میزانە دەپێوی؟ خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوەی بمەوێ لەدروست کروەکانی خۆم پێی دەپێوم، فریشتەکان دەڵێن: پاك‌و بێگەری بۆ تۆ بە پێی پێویست تۆمان نەپەرستووە، جا (صراط) دادەنرێ، کە لە موس تیژترە، فریشتەکان

دەڵێن: كێ بەسەر ئەوەدا دەپەڕێنیەوە؟ دەفەرموێ: ئەوەی كە بمەوێ لەدروست كروەكانی خۆم، دەڵێن: پاكو بێ گەردی بۆ تۆ بەپێی پێویست تۆمان نەپەرستووە))
(حديث صحيح لغيره صححه الحاكم ووافقه الذهبي).

لە(صحيح مسلم)یشدا هاتووە، كە (أبو سعيد) وتویەتی: پێم گەیشتووە كە (صراط) لەمووباریك ترە و لەشمشێر تیژترە والله تعالى أعلم.

## رۆیشتنی باوەڕدارەكان بەسەر (صراط)و
## جیاواز كردنەوەی باوەڕدارەكان لە دووڕووەكان

كاتێك كافرەكان و موشریكەكان بەدۆزەخ شاد دەكرێن، لەگۆڕەپانی مەحشەردا شوێن كەوتەی پێغەمبەران، كە خوای تاكو تەنیایان پەرستووە دەمێننەوە لەگەل گوناهبارەكان، كە دووڕووشیان لەنێو دایە و پێش پردەكە دەكەونە تاریكیەك، هەروەكو (عائیشە) رەزای خوای لێ بێت وتویەتی: پرسیار لەپێغەمبەری خوا كرا كەكاتێك ئاسمانەكانو زەوی دەگۆڕێن خەڵك لەكوێن؟ فەرمووی: ((پێش پردەكە لەناو تاریكایەك دان)) (رواه مسلم).

(ابن أبي العز) وتویەتی: ئالەو شوێنە دووڕووەكان لەباوەڕدارەكان جیا دەكرێنەوەو باوەڕدارەكان پێشیان دەكەونو پەرژینێك لەنێوانیان دا دەنرێ، كە ناتوانن بچنە لایان.

(عبدالله) وتویەتی: لەرۆژی قیامەتدا خوای گەورە خەڵكی كۆدەكاتەوە...هەتا لەدرێژەی باسەكەی دا وتویەتی: هەیانە نورەكەی، بەقەد چیایەكی گەورەیە پێی دەدرێ، هەندێكیش نورەكەی، كە پێی دەدرێ لەوە بچوكترە، هەندێكیش بەقەدەر دارخورمایەك پێی دەدرێ، هەندێكیش لەوە كەمتر، هەتا ، كە كۆتایان پیاوێكە نورەكەی بە قەدەر سەرە پەنجەی گەورە پێی دەدرێ، كە تاوێك دادەگیرسێو تاوێك

دەكوژێتەوە، ئەگەر پێشەخۆی رووناك بۆوە دەڕوا، ئەگەریش كوژایەوە هەڵدەستێتەوە، هەروا وتویەتی: جا خوای گەورە لەپێشیانە هەتا بەرەو ئاگریان دەبەن، شوێنەواری وەك (حد السيف) دەمێنێتەوە.

پاشان وتویەتی: جا دەڵێن: بە ئەندازەی نورەكەیان هەر یەكە دەڕۆن، هەیە وەك چاو تروكانێك دەڕواتو، هەیە وەك هەورە تریشقە دەڕوات، هەیە وەك رۆیشتنی هەور دەڕوات ، هەیە وەك ئەستێرە پرژێن دەڕوات، هەیە وەك با دەڕوات، هەیە وەك ئەسپ دەڕوات، هەیە وەك پیاوی ئاسایی دەڕوات هەتا ئەو كەسەی ، كە نورەكەی پێ دەدرێ لەسەر پشتی پێیەتی، كەلەسەر دەمو چاو دەستو پێ گورگە لۆقی دەكات، دەستێك رادەكێشرێو، دەستێك هەڵدەواسرێ، پێیەك رادەكێشرێو، پێیەكیش هەڵدەواسرێو، ئاگر توشی كەلێنەكانی دێتو، بەردەوام ئەوها دەبێت هەتا قوتاری دەبێت، ئەگەر قوتاری بوو لەسەریی رادەوەستێتو دەڵێ سوپاس بۆ ئەو خوایەی،كە ئەوەی منی بەخشیوە نەیداوەتە كەس، كە منی لەئاگر رزگار كرد پاش ئەوەی كە دیتم. (رواه البيهقي، وابن أبي الدنيا، والطبراني وهو حسن).

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾ رۆژێك دێت كە دەبینیت پیاوانی ئیماندارو ژنانی ئیماندار بەرەو

بەهەشت بەڕێ دەکرێن، نوورو ڕوناکایەکی ئاشکرا لەبەردەم و لەلای ڕاستیانەوە دەڕوا، فریشتەکان پێیان دەڵێن: مژدەی ئێوە ئەمڕۆ باخەکانی بەهەشتەکەچەندەها ڕوبار بەناویاندا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەو بێ سنوور (١٢) (ئا لەو ڕۆژەدا کەئیمانداران بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن) پیاوان و ژنانی دووڕوو دەهێنرێنە سەر ڕێیان، بەغەمبارییەوە بۆ ئیمانداران دەڕوانن، ئیماندارانیش هیچ لایان لێ ناکەنەوە، بۆیە بەغەمو پەژارەیەکی زۆرەوە پێیان دەڵێن: دە تەماشایەکمان بکەن با لەنووری ڕووخسارتان بەهرەوەر ببین، بەڵام پێیان دەوترێت بگەڕێنەوە دواوە، خۆتان بەشوێن نوورو ڕوناکیدا بگەڕێن، دەستبەجێ دیوارێك دروست دەکرێت لەنێوان ئیمانداران و دووڕووەکاندا دەروازەیەکیشی تێدایە، دیوی ناوەوە کەرووی لەئیماندارانە ڕووی لەرەحمەت و بەهەشتەو دیوی دەرەوە، کەرووی لەدووڕووەکانە ڕووی لەسزاو دۆزەخە (١٣) ئینجا دووڕووەکان هاوار لەئیمانداران دەکەن، ئایا ئێمە هاوڕێی ئێوە نەبووین ؟!، ئێمە هاوکاری ئێوە نەبووین ؟! ئیمانداران دەڵێن: بەڵێ وایە، بەڵام ئێوە خۆتان تووشی دووڕوویی و پیلانگێڕیی کرد، خۆتان مەڵاس دابوو، بۆ فرسەت دەگەڕان کەزەرەر بدەن لەئیمانداران، هەمیشە لەگومان و دوودڵیدا دەژیان و بڵاویشتان دکردەوە، هیواو ئاواتی بێ جێ سەری لێ تێك دابوون، هەتا ویستی خوا یەخەی پێگرتن و کۆتایی بەژیانتان هات، شەیتانیش غەڕاو گومڕای کردبوون بەمیهرەبانی خوا و لەرێبازەکەی وێڵی کردبوون (١٤) ئەمڕۆ ئیتر هیچ جۆرە پاکانەو بارامتەیەك لەئێوە و لەوانەش کەبێ باوەڕ بوون وەرناگیرێت، شوێنەوار و مەنزڵگای هەمووتان ئاگری دۆزەخە، هەر ئەوەش شایستەتانە، ئای چ سەرەنجامێکی خراپ و نالەبارە. الحديد: ١٢ — ١٥

باوەڕداران لەڕۆژی قیامەت ڕێگایان بۆ ڕووناك دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بگەنە بەهەشتو لەسەر پردەکە هیچ پێیان هەڵناخلیسکێو ناترسن، دووڕووەکانیش ئەوانەی

لەدونیا وا گومانیان دەبرد، کە لەگەل موسلمانانن‌و لەوانن، بەلام لەراستیدا لەوان نەبوون و ئەو رێگا رووناکەی ئەوان گرتبویانەبەر ئەوانە نەیانگرتبوە بەر، ئەوانەی خۆیان بێ بەش کردبوو لەرووناکی قورئانی پیرۆز، ئا ئەو ردوورووانە لەئەهلی ئیمان داوادەکەن، کە چاوەڕێیان بکەن بۆ ئەوەی بەرووناکیەکەی ئەوان رێگایان بۆ رووناك ببێتەوە، جا لێرەدا فێلیان لێ دەکرێ هەروەکو، کە ئەوان لەدونیا فێلیان لێدەکردن‌و، پێیان دەوترێ: دەبگەڕێنەوە بەلکە رووناکیەکتان دەست بکەوێ، بەم شێوەیە دووررووەکان دەگەڕێنەوە دواوەو باوەڕدارەکانیش پێش دەکەون، جا، کە کاتێك هەردوو کۆمەڵ لەیەکتر جیاواز کرانەوە خوای گەورە دیوارێك دەخاتە نێوانیان کە دەرگایەکی هەیە، کە ناوەڕۆکەکەی رەحمەتەو رووکەشەکەی سزایە، جا سەرەنجامی باوەڕدارەکان بۆ بەهەشتەو، سەرەنجامی دووررووەکانیش بۆ ئاگرە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبەو پەشیمانیەکی پەخت و دلسۆزانەوە ڕوو بکەنەوە خوا، نزیکە پەرۆەردگارتان لە هەلە و گوناهەکانتان خۆش ببێت و بتانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەنداها و ڕوبار بەژێر درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، ڕۆژێك دێت کە خوا پێغەمبەر و ئەوانەی لە خزمەتیدا خەجالەت و شەرمەزار ناکات، نوورو ڕوناکیان دەدرەوشێتەوەو دێت و دەچێت لە بەردەم و لای ڕاستیانەوە و دەلێن: پەروەردگارا ئەم نوورو ڕوناکیەمان بۆ زیاد بکەو لێمان خۆش ببە، چونکە بەڕاستی تۆ دەسەلاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. التحریم: ٨

(مجاهد)و (الضحاك) و(حسن البصری)و جگە لەوانەش فەرمویانە: ئەوەیە، کە باوەڕداران دەیڵێن کاتێك لەرۆژی قیامەت دا دەبینن کە ڕووناکی دووڕووەکان کوژایەتەوە.

## ئایا پەڕینەوە لەسەر (صراط) تەنها بۆ باوەڕدارانەو موشریکەکان ناگرێتەوە؟

هەندێك فەرمودە بەڵگەنە لەسەر ئەوەی ئوممەتە کافرەکان بەدوای ئەو خوایانەیان دەکەون، کە دەیانپەرست، جا ئەو خوایانە دەڕۆن هەتا بەندەکانی خۆی دەهاوێتە ناو ئاگر، پاشان باوەڕدارەکان دەمێننەوە، کە دووڕووشیان لەنێودایە لەگەل چەند باوەڕدارێکی تاوانبار، ئا ئەوانە بەسەر پردی (صراط)دا دەڕۆن.

مەسەلەی(صراط)یش کە تەنها باوەڕداران بەسەری دا دەڕۆن ئەوا لە(ابن رجب) بترازێ کەس باسی لێوە نەکردووە[1]، لەکیتابی(التخويف من النّار) وتویەتی: بزانە کەوا خەڵکی دابەش دەبن بۆ باوەڕدارێك، کە خودای تاكو تەنیا دەپەرستێو هاوەڵی بۆ بڕیارنادا، لەگەڵ موشریکێك کە لەگەڵ خودا شتی تریش دەپەرستی ، سەبارەت بە موشریکەکان ئەوا بەسەر پردی(صراط) دا ناڕۆن بەڵکو پێش دانانی ئەو پردە بەردەبنەوە ناو ئاگر.

پاشان هەندێك فەرمودەێ هێناوەتەوە لەوانە فەرمودەی (أبی سعید الخدری) کە لە(صحیحین)ە پاشان وتویەتی: ئەم فەرمودەیە ئاشکرای ئەوە دەکا، کە ئەوەی جگە

---

(١) لەراستیدا تەنها زانای پایەبەرز (ابن رجب) باسی لەومەسەلەیە نەکردووە بەڵکو زانایانی تریش وەك (ابن القيم) و (ابن تيميه) باسیان لێوە کردووە بەڵام بۆی هەیە دانەر ئاگای لێ نەبێت و نەگەڕابێتەوە بەشێوەیەکی ورد بۆ قسەی زانایانی پێش (ابن رجب) خودا ڕازی بێت لەهەموومان (وەرگێڕ).

لەخوا بپەرستێ وەکو مەسیحو عوزیر ئەوا بەموشریك دادەنرێ با ئەهلی کیتابیش بێ پێش ئەوەی (صراط) دانرێ دەکەونە ناو ئاگر.

بت پەرستو رۆژو مانگ پەرستەکانیش و جگە لەوانەش، کە موشریکن ئەوا هەر کۆمەڵێك لەوانە بەدوای ئەو خوایەی دەکەوێ کە لەدونیا پەرستویەتی و پێکەوە دەچنە نێو ئاگر، قورئانیش بەڵگە لەسەر ئەو مانایە دەدات ، کە خوای گەورە لەبارەی فیرعەون فەرمویەتی: ﴿يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾﴾ لە ڕۆژی قیامەتیشدا فیرعەون پێش قەوم و شوێنکەوتووانی دەکەوێت و ئینجا دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخ، ئای چەند خراپە ئەو چوونە ژوورەوەیە و ئەو شوێنەی دەچنە ناوی.

سەبارەت بەوانەی ئەهلی کیتابن، بەڵام مەسیحو عوزەیریان پەرستووە ئەوانە لەگەڵ ئەو میللەتانەی پێغەمبەریان بۆ هاتووە ئەوا دوادەکەون پاشان دەخرێنە ناو ئاگر. هود: ٩٨

لەفەرمودەیەکی پێغەمبەریشدا هاتووە کەوا، ((ئەوەی مەسیحی پەرستووە ئەوا شەیتانێك خۆی دێنێتە سەر وینەی مەسیحو دوای دەکەوێ هەروا ئەو کەسەی عوزێریشی پەرستووە)).

* لەفەرمودەی (صور)یشدا هاتووە، کە ((فریشتەیەك خۆی دێنێتە سەر وێنەی مەسیحو فریشتەیەکیش خۆی دێنێتە سەر وێنەی عوزێر، لەپاش ئەوە تەنها خواپەرستەکان لەو ئوممەتەو غەیری ئەو ئوممەتە دەمێننەوە، جا چ ڕاست گۆبوو بێ چ دووروو، پاشان دووڕووەکان لەباوەڕدارەکان جیاواز دەکرێنەوە، بەوەی کە ناتوانن سەجدە ببەن، هەروا جیادەکرێنەوە بەو ڕووناکیەی بە باوەڕداران دەدرێت)) والله تعالی أعلم.

## ماناو لێکدانەوەی ئایەتی

### (وأن منكم إلا واردها)

هەندێك زانا مانای (ورود)یان وا لێکداوەتەوە، کە چوونە ناو ئاگرە، ئەمەش وتەی (ابن عباس)ە بەڵگەشی وتەی خوای گەورەیە لەبارەی فیرعەون، کە فەرمویەتی: ﴿ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ ۖ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ ﴾ لە ڕۆژی قیامەتیشدا فیرعەون پێش قەوم و شوێنکەوتووانی دەکەوێت و ئینجا دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخ، ئای چەند خراپە ئەو چوونە ژوورەوەیە و ئەو شوێنەی دەچنە ناوی. هود: ٩٨لەگەڵ ئەو ئایەتەش: ﴿ لَوْ كَانَ هَـٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةً مَّا وَرَدُوهَا ۖ وَكُلٌّ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾ (پاشان پێیان دەوترێت) بێگومان ئێوە و ئەو شتانەی لە جیاتی خوا دەتانپەرست سووتەمەنی دۆزەخن و سەلکە بزوتی ئاگرن، دەبێت هەر بچنە ناوی و هەمیشە تێیدان. الأنبياء: ٩٩ لەگەڵ ئەو ئایەتەش:﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ ﴾تاوانبارو گوناهکارانیش بەپەلەو بەتینویەتی ڕابێچ دەکەین بۆ ناو دۆزەخ.

(مسلم الاعور) لە(مجاهد) ریوایەتی کردووە، کە وشەی (واردها) لەئایەتی (وإن منكم إلا واردها) ڕاڤە کردووە بەچوونە نێو ئاگری. مريم: ٨٦

هەندێك زاناش وشەی (ورود)یان بە پەڕینەوە لە(صراط) دا لێد داوەتەوە، (ابن أبی العز) وتویەتی: (مُفسر)ەکان ڕاجیان لەبارەی لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی وشوی (ورود) لەهەموو ڕایەکان بەهێزتر ئەوەیە، کە پەڕینەوەیە لەسەر پردی( صراط) خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ مريم: ٧٢

(أم مبشر الانصاريه) گوێی لەپێغەمبەر بوو(ﷺ) –لەلای (حفصة) فەرمووی: (إن شاء الله ئەوەی لەژێر دارەکە بەیعەتی پێدام ناچێتە نێو ئاگر)). وتی: بەڵکو دەچی ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش (ﷺ) سەرزەنشتی کرد. (حفصە) وتی: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ﴾مریم: ٧١ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : خوای گەورە دەفەرمویّ:﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾مریم: ٧٢

پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی کرد، کە بەسەر ئاگر تێپەڕبوون مانای ئەوە نیە دەبیّ هەر بچێتە ناویو رزگاربونیش لەشەڕێك مانای ئەوە نیە، کە توشی بووە، ئەو کەسەی دوژمنەکەی لەدوایتی و دەیەویّ لەناوی ببات بەڵام بۆی نەکرا ئەوا دەوتریّ: خودا رزگاری کرد لەدەستیان بۆیە خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿ وَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَاهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ ﴾ کاتێکیش فەرمانی ئێمە هات (کە بڕیاری تیاچوونی هۆزی عاد بوو) و ئەوە هود و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵ ئەودا بوون ڕزگاریشمان کردن بەهۆی بەزەیی و لێبوردەیی خۆمانەوە لە سزایەکی زۆر قورس و گران. هود: ٥٨

هەروا دەفەرمویّ: ﴿ فَلَمَّا جَاءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا صَالِحًا وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَمِنْ خِزْيِ يَوْمِئِذٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ ﴾جا کاتێك فەرمانی ئێمە هات و بڕیاردرا لەکاتی دیاری کراودا و ئەوە ێالح و ئەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیدا ڕزگارمان کردن بە میهرەبانی و بەزەیی خۆمان، لە سەرشۆڕیی ئەو ڕۆژەش پەناماندان، بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆی خاوەنی هێزە و باڵادەستە. هود: ٦٦ خۆ سزاشیان بەر نەکەوت، بەڵام بەر ئەوانی تر کەوت، ئەگەر خوای گەورە هۆکارەکانی رزگاربوونی بۆ ئەمانە فەراهەم نەکردبایە ئەوا ئەوەی توشی ئەوان بوو توشی ئەوانەش دەبوو. جا

مەسەلەی تێپەڕبونیش بەسەر ئاگرد هەر بەم شێوەیە، بەسەر پردی (صراط) دادەڕۆن پاشان خودا پارێزگارەکان رزگار دەکاو ستەم کارەکانیش دەکەونە ناوی، پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆنی کردۆتەوە ، کەوا دوو چوونە ناو ئاگر هەیە، یەکەم: جوو گاوەرکان، کە چوونیان بۆ ناو ئاگر هیچ گومانی تێدا نیە، خوای گەورە لەبارەی فیرعەون فەرمویەتی :﴿يَقۡدُمُ قَوۡمَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَأَوۡرَدَهُمُ ٱلنَّارَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡوِرۡدُ ٱلۡمَوۡرُودُ ﴿٩٨﴾﴾ لە ڕۆژی قیامەتیشدا فیرعەون پێش قەوم و شوێنکەوتووانی دەکەوێت و ئینجا دەیانباتە ناو ئاگری دۆزەخ، ئای چەند خراپە ئەو چوونە ژوورەوەیە و ئەو شوێنەی دەچنە ناوی. هود: ٩٨

دووەمیش: پەڕینەوەی خواپەرستەکانە لەسەر پردی (صراط) بەو شێوەیەی، کەلەفەرمودەکانی پێشوو باسی لێوەکراوە.والله تعالى أعلم.

پێشەوا (قرطبي) فەرمویەتی: ئێستا بیربکەرەوە، کە چیت بەسەر دێت کاتێك پردی (صراط) دەبینیو، پاشان لەژێرەوەی (صراط) چاوت دەکەوێ بە دۆزەخ، پاشان گوێت لە لۆمەو گرمەی ئاگر بوو،داواشت لێکراوە، کە بەسەریدا بڕۆیت، لەگەڵ پەشێوی حالتو دڵە خورپەتو پێ لەرزینو، بارگرانیت بەو گوناهانەی، کە ڕێگرە بەسەر زەوی پانو پۆڕ دابڕۆی چ جای ئەو پردە باریکە، دەبێ حاڵت چۆن بێ ئەگەر پێیەکت دا ناسەری هەستت بە تیژیو باریکی ئەو پردە کردو ، پەشۆکای لەوەی پێیەکەی ترت لەسەر دابنێی.

خەڵکیش هەموو لەدەوروبەرت دەترسنو پەشۆکاونو، زەبانیەکانی دۆزەخ قوڵابیان تێدەگرنو تۆش سەیریان دەکەی، کە چۆن سەراو پێش دەکەونە ناو ئاگر، ئای لەو دیمەنە ترسناكو ناخۆشە، کە پەڕینەوە لەسەری چەند ناخۆشو تەسكو دژوارە.

شاعیریش وتویەتی:

إذا مَدَّ الصراط على جحيم　　تصولُ على العصاة وتستطيل

فقومٌ في الجحيم لهم ثبور　　وقوم في الجنان لهم مقيلُ

وبانَ الحق وانكمش المغطى　　وطال الويل واتضل العويلُ

## مشتو مڕو دەمەقاڵێ نێوان ئەهلی ئاگر

کاتێك کافرەکان، ئەو سزایە دەبینن، کە بۆیان ئامادەکراوە، ئەوا بێ ئومێد دەبن لەدۆستو خۆشەویستەکانی دونیایان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۢ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾دۆستان و برادەران هەر هەموو لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن، هەموو ڕقیان لە یەك دەبێتەوە، جگە لەو کەسانەی کە لەسەر بنچینەی تەقواو خواناسین کۆ بوونەتەوە و برایەتییان بەرپا کردووە.

لەو کاتەدا ئەهلی ئاگر دەکەونە مشتو مڕو دەمە قاڵی لەگەڵ یەکتر، عابیدەکان لەگەڵ خواکانیانو، کۆیلە لەگەڵ گەورەکەیو، بێ هێزو کەم دەرامەتەکان لەگەڵ دەوڵەمەندەکانو، مرۆڤ لەگەڵ شەیتانەکەی، بەڵکو کافر هەتا لەگەڵ ئەندامەکانی لەشیدا دەبێتە مشتو مڕو دەمەقاڵێیان. الزخرف: ٦٧

### (١) دەمەقاڵێ لەنێوان بەندەکانو خواکانیان:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَوۡ أَنَّ

لَنَا كَرَّةً فَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾﴾ دۆزەخیش بۆ گومڕاو سەرلێشێواوەکان دەرخراوە... (٩١) پێشیان دەوترێ: لە کوێن ئەوانەی دەتانپەرست؟... (٩٢) لە جیاتی خوا، ئایا یارمەتی ئێوەیان پێ دەدرێت یان فریای خۆیان دەکەون ؟ (٩٣) ئینجا هەموویان بە پاڵەپەستۆو توندو تیژییەوە، بتەکان و گومڕاکان بەسەر ڕوودا فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە (٩٤) (هاوڕێ لەگەڵ) هەر هەموو سەربازان و دەست و پێوەندی شەیتاندا (٩٥) (بت پەرستان: بە بتەکان و پەرستراوەکانیان) دەڵێن: بە ڕق و کینەوە، لە کاتێکدا کە ئاژاوەو کێشە دەگێڕن لە دۆزەخدا... (٩٦) سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەژیاین... (٩٧) کاتێك کە ئێوەمان دەبردە ڕیزی پەروەردگاری جیهانیانەوە و یەکسانمان دەکردن لەگەڵیدا... (٩٨) ئێمە کەس گومڕای نەکردین تەنها گوناهکار و تاوانبارەکان نەبێت... (٩٩) کەواتە ئێمە هیچ تکاکارێکمان بۆ نییە... (١٠٠) یاخود هاوڕێیەکی دلسۆز هەوڵێکمان بۆ بدات، یان دڵخۆشیمان بداتەوە... (١٠١) جا خۆزگە جارێکی تر مۆڵەتمان بدرایە و (بگەڕاینەوە بۆ دنیا) و بە هۆی ئەوەوە بچینە ڕیزی ئیماندارانەوە. الشعراء: ٩١ - ١٠٣

سەبارەت بەو پیاوە چاکانەی پەرستراون و ئاگایان لەمە نەبووە، یان بەبێ ڕەزامەندی خۆیان پەرستراون، وەك فریشتەو پیاوە باشەکان، ئەوانە بەرائەت لەو کەسانە دەکەن، هەروەك خوای گەورە ڕوونی دەکاتەوەو دەفەرموێ:﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَائِكَةِ أَهَٰؤُلَاءِ إِيَّاكُمْ كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُوا سُبْحَانَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم ۖ بَلْ كَانُوا يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ ۖ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾﴾ ڕۆژێك دێت کە هەموان کۆدەکرێنەوە (ئەوسا خوا بە فریشتەکان دەفەرموێت: (بەڕاست)، ئەوانە ئێوەیان دەپەرست؟! (٤٠) (لە وەڵامدا) دەڵێن: پاکیی و ستایش بۆ تۆ (ئەی پەروەردگار) تۆ

یارو یاوەری ئێمەی نەك ئەوان، بەڵكو ئەوانە پەرییان دەپەرست، زۆربەیان باوەڕیان پێیان هەبوو (باوەڕیان بە جادووگەرو دەجالەكان هەبوو). سبأ: ٤٠ - ٤١

هەروەها عیسای كوڕی مەریەم لەرۆژی دوایی بەرائەت لەو كەسانە دەكا، كە كردیانە خوداو پەرستیان: خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۚ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ۖ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ ﴾ كاتێكیش خوا (هەر لە قیامەتدا) فەرمووی: ئەی عیسای كوڕی مەریەم، ئایا ئەوەتۆ بەخەڵكیت وتوە: منیش و دایكیشم بە دوو خوا دابنێن لە خوار خوای پەروەردگارەوە؟ عیسا لە وەڵامدا وتی: پاكی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نیە من شتێك بڵێم بۆ خۆم كە مافی من نەبێت؟! (چۆن حەق بەخۆم دەدەم شتی وا بێت بە زارمدا؟!) خۆ ئەگەر شتی وام وتبێت ئەوە بەڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نیە، چونكە تۆ دەزانیت بەهەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی كە لە دەریای علم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونكە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانی. المائدة: ١١٦ — ١١٧

## (٢)دەمەقاڵێ دەست و پێوەندەكان لەگەڵ سەركردە گومڕاكانیان:

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾

مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ
كُنتُمۡ تَأۡتُونَنَا عَنِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمۡ تَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭۖ بَلۡ
كُنتُمۡ قَوۡمٗا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيۡنَا قَوۡلُ رَبِّنَآۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغۡوَيۡنَٰكُمۡ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمۡ
يَوۡمَئِذٖ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَآ
إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ جا بێگومان تەنها داچڵەکاندن و تێخوڕین و دەنگێکی بەهێزە دەستبەجێ هەموویان هەستاون و تەماشا دەکەن. (١٩) ئەوسا دەڵێن: ئەی هاوار، ئاخ و ئۆف بۆ ئێمە، ئەمە ئیتر ڕۆژی قیامەت و لێپرسینەوەیە. (٢٠) ئینجا بەهەڕەشەوە پێیان دەوترێت ئەمە ڕۆژی جیاکردنەوەیە کە ئێوە بڕواتان پێی نەبوو، بەدرۆتان دەزانی. (٢١) خوای گەورە فەرماندەدا بە فریشتەکان هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە، خۆیان و هاوسەرانیان، خۆیان و هاوشێوەیان و ئەو شتانەش کە دەیانپەرست..... (٢٢) لەجیاتی خوا، ئینجا ڕێنماییان بکەن بۆ ڕێگەی دۆزەخ چونکە بێ باوەڕ و تاوانبارن. (٢٣) لەکاتی ڕاپێچ کردنیاندا فەرمان دەدرێت: ئادەی بیانوەستێنن، بێگومان ئەوان پرسیار لێکراون. (٢٤)پێیان دەوترێت: ئەوە چیتانە بۆ پشتی یەکتر ناگرن، بۆ بەرگری لە یەك ناکەن؟!.. (٢٥) نەخێر، تازهکار لە لار ترازاوه ئەمڕۆ هەموویان تەسلیمن و بێ دەسەڵاتن. (٢٦) ئا لەو کاتەدا کە دەوەستێنرێن، یەخەی یەکدەگرن و ڕوو بە ڕووی یەك بە توندی قسە دەکەن و پرسیار لە یەك دەکەن و یەکتری تاوانبار دەکەن. (٢٧) ژێر دەستەکان بە ئاغاکانیان دەڵێن: بێگومان ئێوە هەمیشە لای ڕاستتان لێگرتبووین (هەوڵتان دەدا ئێمە بخەڵەتێنن بەدرۆ بە زۆر). (٢٨) ئەوانیش لەوەڵامیاندا دەڵێن: نەخێر،وا نیە، ئێوە هەر خۆتان ئیماندار نەبوون!! (٢٩) خۆ ئێمە هیچ زۆر و دەسەڵاتێکمان بە سەرتاندا نەبوو، دەستمان نەدەڕۆشت بەسەرتاندا، ئێوە هەر خۆتان لە سنوور دەرچوو بوون. (٣٠) ئیتر خۆ

چارەمان نیە دەبێت بڕیاردادەی پەروەردگارمان بەسەرماندا پیادە بکرێت، دەبێت سزای (بێ ئیمانی و تاوانباری) خۆمان بچێژین. (٣١) لە وەلامیاندا دەڵێن: ڕاستە، ئێمە ئێوەمان گومڕا کردبوو، بەلام خۆیشمان هەر گومڕاو سەر لێشێواو بووین. (٣٢) ئەو ڕۆژە بەڕاستی هەموویان لە سزاو ئازاردا هاوبەشن، هەروەك لە دنیادا هاوکار بوون. (٣٣) ئێمە بێگومان ئاوا دەکەین بە گوناهکار و تاوانباران. (٣٤) ئەوانە کاتی خۆی کە پێیان دەوترا: هیچ خوایەك نیە جگە لە (الله) سەریان بادەدا و فوویان دەکردە خۆیان و فیزیان دەکرد... الصافات: ١٩ — ٣٥

## (٣) دەمەقاڵێی خەڵکە سادەکان لەگەڵ پادشاو ئەمیرەکان:

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعًا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ قَالُواْ لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡۖ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ ﴿٢١﴾ ﴾ إبراهيم: ٢١ (ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت) هەمووان لەبەردەم دەسەلاتی خوادا دەردەکەون، ئینجا لاوازو بێ دەسەلاتەکان (ئەوانەی کوێرانە شوێن ملهوڕو ستەمکاران کەوتبوون) دەڵێن: بەوانەی کە خۆیان بەزل و گەورە دانابوو، بێگومان خۆ ئێمە شوێن ئێوە کەوتبووین ! (ئێمە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئێوە بووین!) جا ئایا ئێوە ئەمڕۆ ناتوانن هەوڵێك بدەن تائەندازەیەك سزای خوا لەسەرمان کەم ببێتەوە، لەوەلامیاندا وتیان: ئەگەر خوا هیدایەتی ئێمەی بدایە، ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان دەدا، (ئەڵبەت ڕوون و ئاشکرایە کەئەوانە بە دەسەلاتدارو بێ دەسەلاتیانەوە لە دنیادا نەك هیدایەتیان نەدەویست بەڵکو دژی دەوەستان و پیلانیان دەگێڕا، ئیتر چۆن خوای گەورە هیدایەتی ئەو جۆرە کەسانە دەدات، خۆ هیدایەت بەزۆر نیە) ئێستەش بۆ ئێمە

چوونیەکە، هاوارو ئاهو ناڵە بکەین، یان دان بەخۆدا بگرین، چارمان نیە و ڕزگار بوونمان ئەستەمە.

پاش کۆتایی هاتنی ئەم دەمەقاڵێیانە سەرکردەی کوفرو گومڕایی ئیبلیسی نەفرەتی بەدیار دەکەوێ‌و وتارێك بۆ دەستو پێوەندەکانی پێش کەش دەکات، خوای گەورە باسی ئەو دیمەنەمان بۆ دەکات کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِيَّ ۖ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ إبراهيم: ٢٢ (کاتێ هەمووشت تەواو دەبێت بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە و دۆزەخیەکان دەخرێنە دۆزەخەوە) شەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قسەو (ڕوو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پێ ڕاگەیاندبوون منیش بەڵێنی درۆو نادروستم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست و وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەلاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناسی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە، بێ بیرکردنەوە بەقسەتان کردم، ئەمڕۆ) من ناتوانم بەهاناو هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبوو بەشەرێك و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن.

لەشوێنێكی تریش لەقورئان خوای گەورە باسی مشتو مڕی خەڵكە سادەكانمان بۆ دەكات لەگەڵ خۆ بەزل زانەكان، كە دەفەرموێ:﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوٓاْ أَنَحْنُ صَدَدْنَٰكُمْ عَنِ ٱلْهُدَىٰ بَعْدَ إِذْ جَآءَكُم ۖ بَلْ كُنتُم مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ بَلْ مَكْرُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ إِذْ تَأْمُرُونَنَآ أَن نَّكْفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجْعَلَ لَهُۥٓ أَندَادًا ۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ وَجَعَلْنَا ٱلْأَغْلَٰلَ فِىٓ أَعْنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾سبأ: ٣١ – ٣٣ ئەوانەی كە بێبڕوان دەڵێن: هەرگیز باوەڕ بەم قورئانەو بەو (كتێبانەش) ناكەین كە پێش ئەم (ڕەوانە كراوە)، خۆ ئەگەر دەبینی (لە ڕۆژی قیامەتدا) چۆن ستەمكاران وەستێنراون لەبەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا قسە دەڵێن بە یەكترو (یەكتری تاوانبار دەكەن)، لاوازكراوەكان بە زۆردارو دەسەڵاتدارەكان دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە باوەڕدار دەبووین. (٣١) دەسەڵاتدارو زۆردارەكانیش بەلاوازكراوو ژێردەستەكان دەڵێن: بۆچی ئێمە ڕێگەی هیدایەتمان لێ‌بەستبوون و نەماندەهێشت دوای ئەوەی كە بۆتان هاتبوو؟! نا، وا نیە، خۆتان تاوانبارو تاوانكارن. (٣٢) (دووبارە) لاوازكراو ژێردەستەكان بە زۆردارو دەسەڵاتدارەكان دەڵێن: نا، وانیە، بەڵكو پیلان و نەخشەی شەوانە ڕۆژ بوو كە فەرمانتان پیادەداین كە بڕوامان بە خوا نەبێ و (شوێنی ڕێگەو ڕێبازی نەكەوین)، هاوەڵی بۆ بڕیار بدەین، (پاشان هەموان) پەشیمانی لە دەرونیاندا دەشارنەوە (بەتایبەتی كاتێك كە) ئەو سزاو تۆڵەیان بینی كە بۆیان

ئامادەیە، (ئەوسا ئیتر) کۆت و زنجیرمان کردە گەردنی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، مەگەر پاداشتیان لەبری کارو کردوەکانیان نیە؟!.

## (٤) دەمەقاڵێ نێوان کافرو شەیتانەکەی:

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾ ﴾ق: ٢٣ – ٢٩ فریشتەی هاوەڵ و چاودێری ڕوو بەپەروەردگار دەڵێت: هەرچی کاروکردەوەی ئەم ئادەمی یە هەیە هەمووی ئەوەتەلای من و یاداشت و تۆمارم کردووە. (٢٣) (دوای لێپرسینەوە، خوا فەرمان دەدات بەدوو فریشتەکە) هەرچی کافرو بێ باوەڕێکی سەرکەش و بوغزن هەیە فرێی بدەنەناو ئاگری دۆزەخەوە (٢٤) ئەوەی کەهەمیشە بەتوندی قەدەغەی هەموو خێرو چاکەیەکی دەکرد، مافی خەڵکی پێشێل دەکرد، خۆی بەگومان بوو، خەڵکیشی دەخستەگومانەوە.... (٢٥) ئەوەبوو کەهاوەڵ و شەریکی بۆ خوا بەڕەوا دەزانی کەواتەئێوە هەردووکتان ئەو ئادەمی یە فڕێ بدەنەناو سزای سەختەوە. (٢٦) هاوەڵە شەیتانەکەشی پاکانەدەکات و دەڵێت: پەروەردگارا، خۆ من لەخشتەم نەبردووە، من سەرکەشم نەکردووە، خۆی تاوانبارە، بەڵام خۆی لەنێو گومڕایی و سەرلێشێواویەکی دووردا نقووم بوو بوو (٢٧) (جا ئەوکاتەی شەیتان و ئادەمیزاد لای خوادا دەبێتە کێشەیان، خوا بێ دەنگیان دەکات) دەفەرموێت: شەڕە دەمێ لەلای مندا مەکەن، بەڕاستی من پێشتر هەڕەشەی هاتنی ئەم ڕۆژەم خستبووەبەرچاوتان و، پێم ڕاگەیاندبوون (٢٨) ئیتر قسەو بڕیاری من ناگۆڕێت و هەڵناوەشێتەوە من هێچ کات ستەمکاریش نیم لەبەندەکانم .

## (٥)دەمەقاڵێ نێوان مرۆڤ و ئەندامەكانی:

خوای گەورە فەرمویەتی :﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَـٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾ وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ فصلت: ١٩ – ٢١ ڕۆژێك دێت دوژمنانی خوا تێكڕا كۆ دەكرێنەوە و كێش دەكرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ، بەرو دوایان پاڵەپەستۆیانە. (١٩) هەتا كاتێك دەگەنە ئاستی ئاگرەكە گوێیان و چاوەكانیان و پێستەكانیان شایەتیان لەسەر دەدات كە چ كارو كردەوەیەكی نادروست و خراپیان ئەنجام دەدا. (٢٠) ئەوسا بەغەمبارییەوە بەپێستی خۆیان دەڵێن: بۆچی شایەتیتان لەسەردااین خۆ زەرەرتانە؟ لە وەڵامدا دەڵێن، ئەو خوایە ئێمەی هێناوەتە گوفتار كە دەتوانێت هەموو شتێك بهێنێتە قسە و گفتوگۆ، هەر ئەو زاتەشە كە یەكەمجار بەدیهێناون و هەر بۆلای ئەویش دەبرێنەوە (بێگومان كارێكی ئاسانە بۆخوا چونكە ئادەمیزاد جۆرەها ئامێری هێناوەتە قسە، دەم و زمان و لێویشیان نیە!).

## (٦) دەمەقاڵێ نێوان جەستەو ڕۆح:

ابن مندة لەكیتابی روح لە ابن عباس دەگێڕێتەوە ، كە وتویەتی: خەڵكی لەگەڵ یەكتر لەرۆژی قیامەت دەبێتە دەمەقالیان هەتا روح لەگەڵ جەستە دەمەقالی دەكاتو، پێی دەڵێ تۆ وات كرد جەستەش وەڵام دەداتەوە و دەڵێ:بەڵكو فەرمانەكە تۆ دەرت كردو كارەكە تۆ رازندتەوە.

جا خوای گەورە فریشتەیەك دەنێرێ بۆ ئەوەی حوكمیان لەنێواندا دا بكاتو پێیان دەڵێ: نمونەی ئێوە وەك نمونەی پیاوێكی چاوساغ و پیاوێكی كوێر وایە بچنە ناو

باخچەیەك ، چاوساغەکە بە کوێرەکە دەڵێ: من وا لێرەو لەوێ چەند بەروبوومێك دەبینم بەڵام ناتوانم بیانگەمێ، کوێرەکە پێی دەڵێ: سواری پشتم بە ئەویش سواری پشتی دەبێتو دەگاتە بەروبوومەکە، ئایا کامەیان تاوانبارە؟ دەڵێن: هەردوکیان، فریشتەکە پێیان دەڵێ: ئێوە خۆتان حکومتان لەسەر خۆتان دا. مەبەست لەمەدا ئەوەیە کە جەستە بۆ رۆح وەك سوارگەیەك وایەو، سواری پشتی دەبێت.

## (٧) بێ ئومێد بوونی کافرەکانو گەورەکانیان:

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَـٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾﴾ غافر: ١٠ بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕن بوون لە قیامەتدا بانگیان لێ دەکرێت کە ڕق و خەشم و قینی خوا زۆر زیاترە لە ڕق و خەشم و قینیان دژ بەیەکتر، چونکە کاتی خۆی بانگ دەکران بۆ ئیمان و باوەڕ کەچی ڕێبازی کوفرتان بەرنەدا و لەسەری بەردەوام دەبوون.

بەڵکو هەموو ئەو دۆستو برادارنەی لەدونیا خۆشەویستیان بووینە بێ ئومێد دەبن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾﴾ ژفصلت: ٢٩له قیامەتدا ئەوانەی بێ باوەڕ بوون وتیان: پەروەردگارا، ئەو دوو دەستەیەمان نیشان بدە لە پەری و ئادەمیزاد کە گومڕایان کردین بیانخەینە ژێر پێمانەوە، تا هەر لە ژێرەوە بن. (٢٩)

# هاژوانی کافرەکان بۆ لای ئاگر

دەقانێکی زۆر هاتوون ، کە نیشان دەدەن چۆن کافرەکان و ئەوانەی دەیانپەرستن راپێچ دەکرێن بۆ لای ئاگر.

● **وێنەی یەکەم:** کافرەکان وەك رانە مەڕ و گاڕانی رەشەوڵاغ راپێچ دەکرێن‌و بە توندی دەهاژورێن‌و هات‌و هاواریان بەسەردا دەکرێت وەك ئەوەی شوان بەمەڕەکانی دەکات‌و گاوان بەرەشە وڵاغەکانی دەکات: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾﴾ الزمر: ٧١ ئەوسا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، راپێچ دەکرێن بەرەو دۆزەخ دەستە دەستە و تاقم تاقم دەگوێزرێنەوە، تا کاتێك دەگەنە بەر قاپیەکانی، (هەموو مۆڵدەخۆن لەبەردەمیدا، دوای ماوەیەك) بۆیان دەکرێتەوە، فریشتەی بەرپرس و سەرپەرشتیار سەرزەنشتیان دەکات و پێیان دەڵێت: باشە، مەگەر پێغەمبەران لە خۆتان ڕەوانە نەکرابوو بۆتان کە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆتان بەسەردا بخوێنێتەوە، وە یاداوەریتان بکات و داتان بچڵەکێنێت لە گەیشتنی ئەم ڕۆژە؟! بەدەم ئاخوداخ و ناڵەوە دەڵێن: بەڵێ، بەڵام تازە، بەڵێ، سوودی نیە و بڕیاری سزاو ئازار دراوە بەسەر کافر و بێ بڕواکاندا. هەروا دەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾﴾ فصلت: ١٩ ڕۆژێك دێت دوژمنانی خوا تێکرا کۆ دەکرێنەوە و کێش دەکرێن بەرەو ئاگری دۆزەخ، بەرو دوایان پاڵەپەستۆیانە.

مانای وشەی (یوزعون) یانی زەبانیەی دۆزەخ کۆیان دەکاتەوە، هەروەکو کە مرۆڤ مەڕو ماڵات کۆدەکاتەوە.

● **وێنەی دووەم:** کافرەکان لەسەر دەمو چاو ڕاپێچ دەکرێن، نەك وەکو لەدونیا لەسەر دووپێیان دەڕۆیشتن ، خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ ﴾الفرقان: ٣٤

ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ الفرقان: ٣٤ ئەو تاوانبارانەی (دژایەتی بەرنامەی خوا دەکەن)، لەسەر ڕووخسارییان کێش دەکرێن بۆ دۆزەخ و تیایدا کۆدەکرێنەوە، ئا ئەوانە ناخۆشترین جێگەیان هەیە، چونکە گومڕاترین ڕێبازیان کاتی خۆی گرتبووە بەر. ﴾ ئایە چۆن کافر لەسەر دەمو چاوی ڕاپێچ دەکرێ؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو توانویەتی لەسەر دوو پێیان بیڕوێنێ ئایا ناتوانێ لەسەر دەمو چاو بیانڕوێنێ)) (متفق علیه).

لەگەڵ ئەوەی کافرەکان بەم شێوە قێزەوەنە لەسەر دەمو چاویان ڕاپێچ دەکرێن ئەوا کوێرەنەو نابینن‌و لاڵن‌و ناتوانن قسە بکەن‌و کەڕیش نابیستن، خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ﴾الإسراء: ٩٧ ئەو کەسەش خوا ڕێنموویی بکات و (شایستە بێت) ئەوە ئیتر هیدایەت دراوەو ڕێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش کە سەرگەردانی بکات، ئەوە هەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت جگە لەو زاتە کە پشتیوانی بکات و ڕزگاری بکات و فریای بکەوێت، لە ڕۆژی قیامەتیشدا (ئەو جۆرە کەسانە) لەسەر ڕوو کۆدەکەینەوەو

لەکاتێکدا کوێرو لاڵ و کەڕن، ئەوانە شوێنیان ناو ئاگری دۆزەخە، هەر کاتێك بڵێسەی کوژایەوە، بڵێسەی زیاد دەکەینەوە بۆیان.﴾

● **وێنەی سێیەم:** ئەوان لەگەل خوایە ساختەکانیان و لەگەڵ دەستو پێوەندەکانیان راپێچ دەکرێن، خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾﴾الصافات: ٢٢ – ٢٣ خوای گەورە فەرماندەدا بە فریشتەکان هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە، خۆیان و هاوسەرانیان، خۆیان و هاوشێوەیان و ئەو شتانەش کە دەیانپەرست..... (٢٢) لەجیاتی خوا، ئینجا ڕێنماییان بکەن بۆ ڕێگەی دۆزەخ چونکە بێ باوەڕ و تاوانبارن.﴾

● **وێنەی چوارەم:** ئەوان لەگەڵ ئەوەی بەم جۆرە دزێوو ناشرینە حەشر دەکرێن ئەوا بێ توانانە و زەلیلو ریسواو سەرشۆڕن: خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾﴾ آل عمران: ١٢ (ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) بڵێ بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە: سەرئەنجام تێکدەشکێن و ژێردەست دەخرێن (لە دنیادا، لە ڕۆژی دوایشدا) کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەخ کە ناخۆشترین جێگەیە.﴾

● **وێنەی پێنجەم:** گوێچکەکانیان پڕ دەبێ لەدەنگو گرمو هۆڕی دۆزەخ جا دڵەکانیان پڕ ترس‌و بیم دەبی. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِذَا رَأَتْهُم مِّن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ سَمِعُوا۟ لَهَا تَغَيُّظًا وَزَفِيرًا ﴿١٢﴾﴾الفرقان: ١٢ کاتێك هەر لە دوورەوە ئەو ئاگرە بڵێسەدارە خوانەناسان دەبینێت، دەنگی خەشم و قین و هەناسەی داخ لە دڵی دەبیستن.

● **وێنەی شەشەم:** کاتێك ئاگر دەبینن پەشیمان دەبنەوەو ئاوات دەخوازن بگەڕێنەوە دونیا بۆ ئەوەی ئیمان بێنن، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾الأنعام: ٢٧ ئەگەر ئەوانە ببینی (لە قیامەتدا) لەسەر لێواری دۆزەخ ڕاوەستێنراون (بەدەم حەسرەت و ئاهوناڵەوە) جا دەڵێن: خۆزگە جارێکی تر بیانگێڕاینایەتەوە بۆ دنیاو (لەم سەرئەنجامە شوومە ڕزگارمان دەبوو) ئەوسا هەرگیز نیشانەو بەڵگەو ئایەتەکانی خوامان بەدرۆ نەدەزانی و، باوەڕی بەتینمان پێی دەبوو... ﴾ بەڵام تازە ڕۆییو ناتوانن لەئاگر قوتاریان ببێ، خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا ﴿٥٣﴾ الكهف: ٥٣ (ئا لەو گێر خواردنەدا) تاوانباران دۆزەخ دەبینن و دڵنیان بێگومان دەچنە ناوی و تێکەڵی دەبن، هیچ پەناگاو کەلێنێکیش نیە کە لێی دەربازبن. ﴾

● **وێنەی حەوتەم:** پاش ئەوەی خوای گەورە زۆر تورە دەبێ ئەوا بەشێوەیەکی زۆر ناشرینو قێزەوەن فڕێدەدرێنە ناو ئاگر، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَلَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ النحل: ٢٩ کەواتە لە دەروازەکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە و بۆ هەمیشەیی و نەبڕاوەش تیادا بن، ئای کە جێگەو ڕێگەی خۆ بەزل زانەکان ناخۆش و نا لەبارو ناسۆرە. ﴾ کە سیش لەمرۆڤو جنۆکەکان لەئاگر قوتاریان نابێ تەنها پارێزگارەکان نەبێ ئەوانەی بڕوایان بە خواهێناوەو پێغەمبەرەکانیان بەراست زانیوەو شوێنی پەیامەکانیان کەوتوون کە لەلایەن خواوە بۆیان هاتووە، خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَحۡشُرَنَّهُمۡ

﴿وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحۡضِرَنَّهُمۡ حَوۡلَ جَهَنَّمَ جِثِيّٗا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمۡ أَشَدُّ
عَلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ عِتِيّٗا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحۡنُ أَعۡلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمۡ أَوۡلَىٰ بِهَا صِلِيّٗا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمۡ إِلَّا وَارِدُهَاۚ كَانَ
عَلَىٰ رَبِّكَ حَتۡمٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيّٗا ﴿٧٢﴾﴾ مريم: ٦٨ — ٧٢ سوێند بە پەروەردگارت خوانەناسان و شەیتانەکان کۆ دەکەینەوە، پاشان هەموویان بە دەوری دۆزەخدا بەچۆکدا دەهێنین و (دەیانخەینە ناوی). (٦٨) لەوەودوا لە هەر گرۆ و دەستەیەك، ئەوانە دەردەکێشین کە زۆر یاخی بوون لە خوای میهرەبان (دژایەتی دین و بەرنامەکەیان دەکرد). (٦٩) پاشان زۆرچاك ئاگادارین بەوەی کەکێ لەوانە لەپێشترو شایستەترە بەوەی کە زوو بخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە (تا ببرژێت تیایدا). (٧٠) ئێوە (خەڵکینە) کەستان نی یە تێپەڕ نەکات بەسەر دۆزەخدا، (ئیمانداران بۆ ئەوەی زیاتر قەدری بەهەشت و ڕەحمەتی خوا بزانن، کافران بۆ ئەوەی بکەونە ناوی) ئەم پێشهاتە بڕیاردراوە هەر جێبەجێ دەکرێت. (٧١) لەوەودوا ئەوانە ڕزگار دەکەین کە پارێزکارو خواناس بوون، ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا بەچۆکدا دەهێنین. ❁

# هەمە چەشنی سزا لەنێو ئاگر

بزانە کەوا ئەهلی ئاگر هەریەکە بە جۆرێك لەجۆرەکانی سزا پاداشت وەردەگریٚ، لەهەموویان سوکتر ئەوەیە، کە دوو پۆلیە ئاگر لەبن پێیەکانی دادەنریٚ دەماغی لەگەڵ دەکوڵیٚو، واش دەزانیٚ کەوا لەهەمویان سزاکەی توندتر و بەئێش ترە – خوا بمان پارێزیٚ –جا ئێستا باسی گرنگترین ئەو جۆرە سزایانە دەکەین، کە لەکیتابی (التخویف من النار)ی ئیبن رەجەبم وەرگرتووە بەدەست کاریو کورت کردنەوە.

**(١)الصهرُ:**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾﴾الحج: ١٩ – ٢٠ ئەمانە دوودەستەی دژبەیەکن (ئیمانداران و بیٚ باوەڕان) کردیانە کێشە لەبارەی پەروەردگاریانەوە (لە زات و سیفات و قەزاو قەدەری و... هتد): جا ئەوانەیان کە بیٚ باوەڕ بوون پارچە پۆشاك لە ئاگر بڕراوە بەباڵایان، ئاوی زۆر لەکولٚ لەسەرویانەوە دەکرێت بەسەریاندا (لە دەرئەنجامی سەر سەختی و سەرکەشییاندا). (١٩) ئەو ئاوە لەکوڵە هەرچی لەناو سکیاندا هەیە بەپێستەکانەوە دەیتوێنێتەوە. ﴾

موجاهید لەبارەی ئایەتی: ﴿يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴾فەرمویەتی: واتە بەو ئاگرە ئەتوێنرێنەوە.

عطاء الخراسانی وتویەتی: هەناویان بەو ئاگرە ئەتاوێنرێتەوە وەکو ئەوەی بەز ئەتاوێتەوە.

پێغەمبەر (ﷺ): فەرموویەتی ((ئاوی کوڵای بەسەر سەریان دادەکرێ، هەتا دەگاتە هەناویانو پارچە پارچەی دەکاتو لەپێیەکانی دێتەدەرێ، ئەمەش، کە توانەوەیە پاشان دووبارە وەکو جارانی لێدەکەنەوە)) حدیث حسن (صحیح الترغیب والترهیب).

زۆربەی زانایانی سەلەف لەبارەی ئایەتی : ﴿ خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ﴾الدخان: ٤٧ فەرمویانە لەسەر (أبو جهل) هاتۆتە خوار.

پێشەوا ئەوزاعی وتویەتی: لەرۆژی دواییدا ئەبو جەهل دێننو کونێکی لەسەری دەکەن پاشان دەولکێك لەئاوی کوڵاو دێننو دەیکەنە ناو کونەکەو، پاشان پێی دەڵێن: بچێژە: ئەی ئەو کەسەی لەدونیا خاوەن پلەو پایەو رێز بوون.

موجاهیدو عطاء الخراسانی: لەبارەی ئایەتی: ﴿ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ ﴾الرحمن: ٣٥ وتویانە نوحاس ئەو سفرەیە ئەتاوێنرێتەوەو بەسەر سەریان دادەکرێو پێی سزادەدرێن.

**(٢)تەفسیری ئایەتی:** ﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴾

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴿٧﴾ ﴾الهمزة: ٤ - ٧

محمد بن كعب القُرَظي لەبارەی ئایەتی: ﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴾ وتویەتی : ئاگر لەشی دەخوا هەتا دەگاتە دڵی، کە گەیشتە دڵی دووبارە وەك جاران دروست دەکرێتەوە.

ثابت البنانی ئەو ئایەتەی خوێندەوەو پاشان وتی: ئاگر لەشیان بە زیندویی دەسوتێنێ هەتا دڵیان پاشان لەبەر ئێشی سزاکە دەست دەکەنە گریان.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ٢٧ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ٢٨ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ٢٩﴾المدثر: ٢٧ - ٢٩

صالح بن حيان لە (ابن بريدة) ريوايەتی كردووە و وتويەتی: تەفسيری ئايەتی : ﴿لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ﴾ماناكەی ئەوەيە، كە ئاگر ئێسكو گۆشتو مێشكيان دەخواو هيچی ناهێڵتەوەو وازيان لیٚ ناهێنیٚ.

سدی وتويەتی: هيچ پێستيان پێوە ناهێڵیو، وازيان لیٚ ناهێنیٚو هەر سزايان دەدات.

أبو سنان وتويەتی: ئاگر هەر وازيان لیٚ ناهێنیٚ ئەگەر دووبارەش دروست بكرێنەوە.

أبو زرين لەتەفسيری ئايەتی: ﴿لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ﴾ وتويەتی: ئاگر پڕ دەداتە دەمو چاوی هەتا وەك شەوە ڕەش ڕەش دەبیٚ.

قتادة وتويەتی: ﴿لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ﴾ واتە : پێستی هەموو دەسوتێنیٚ.

هەروەها لەبارەی ئايەتی : ﴿كَلَّآۖ إِنَّهَا لَظَىٰ ١٥ نَزَّاعَةٗ لِّلشَّوَىٰ ١٦﴾المعارج: ١٥ - ١٦ وتويەتی: ئەو ئاگرە هەموو لەشيان دەسوتێنیٚ تەنها دڵيان نەبیٚ.

إبن زيد وتويەتی: ئەو ئاگرە ئێسكەكانيان ئەشكێنیٚو، پاشان سەر لەنویٚ دروست دەكرێنەوەو پێستەكەشيان دەگۆڕدریٚ بە پێستێكی نویٚ.

ابن مهاجر لە موجاهيد ريوايەت دەكات، كە لەبارەی ئايەتی: ﴿نَزَّاعَةٗ لِّلشَّوَىٰ﴾ وتويەتی: ئەو ئاگرە پێستيان دادەماڵێنیٚو گۆشت لەئێسقان جيا دەكاتەوە.

**(٣) راکێشان لەسەر دەم‌و چاو:**

یەکێکی تر بەو جۆرە سزایانەی دەیچێژن راکێشانیانە لەسەر دەم‌و چاو، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِى ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا۟ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ القمر: ٤٧ - ٤٨ بەڕاستی تاوانبارو تاوانکاران لەگومڕایی و شێتیەکی زۆردا ڕۆچوون (٤٧) ڕۆژێك دێت کەلەسەر ڕوویان ڕادەکێشرێن لەناو ئاگری دۆزەخدا، پێیان دەوترێت: دەبچێژن تالآوی دۆزەخ ﴾هەروەها فەرمویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ غافر: ٧٠ – ٧٢ ئەوانەی کە باوەڕیان نی یە بە قورئان و بەو بەرنامە و ڕێبازەی کە بە پێغەمبەرەکانماندا ڕەوانەمان کردووە، ئەوانە لە ئاییندەدا دەزانن چیان بەسەر دێت و خۆیان دەبیننەوە... (٧٠) کاتێك کۆت و زنجیرەکان دەکرێنە گەردنیان و ڕادەکێشرێن... (٧١) بۆ ناو ئاوی زۆر گەرم، پاشان ئاگریان پێ خۆش دەکرێت و دەبنە سووتەمەنی بۆی...﴾

قتادة وتویەتی: جارێك لەناو ئاگر رادەکێشرێن‌و جارێکی تریش لەناو ئاوی کوڵاو.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ يَوْمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمْ فِى ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيْتَنَآ أَطَعْنَا ٱللَّهَ وَأَطَعْنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ الأحزاب: ٦٦ ڕۆژێك دێت ڕوخساریان ئەم دیودیوی پێدەکرێت لەناو ئاگردا (تا چاك ببرژێن و بسوتێن) (بەدەم ئاهو ناڵەوە دەڵێن): ئای خۆزگە فەرمانبەرداری خوا بووینایە، گوێڕایەڵی پێغەمبەر بووینایە. ﴾

کعب وتویەتی: خوای گەورە دەفەرموێتە ئیمامی ستەمکار ﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلْجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾﴾ الحاقة: ٣٠ – ٣١ جا لەناو ئاگر لەسەر دەمو چاوی رادەکێشرێ هەتا گۆشتو ئێسقان و مێشکی پەرشو بڵاودەبێتەوە.

ثابت أبو زید القیسی وتویەتی: وابزانم ابن عباس لەبارەی ئایەتی: ﴿إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ غافر ٧١–٧٢، کاتێك کۆت و زنجیرەکان دەکرێنە گەردنیان و ڕادەکێشرێن... (٧١) بۆ ناو ئاوی زۆر گەرم، پاشان ئاگریان پێ خۆش دەکرێت و دەبنە سووتەمەنی بۆی...﴾ ئەو ئاگرە هەموو شتێکی لەشی بگرە لەپێستو گۆشتو دەمارو ڕێگە هەتا هەمووی لەلای گۆزینگی کۆدەبێتەوە وەك لاشەیەکی لێ دێت، کەبە ئەندازەی درێژیەکەیەتی، درێژیەکەشی شەست گەزە، پاشان بە پێستێکی نوێ دادەپۆشرێو، پاشان رادەکێشرێتە ناو ئاوی کوڵاو.

**(٤)سزادان بە هەڵکشان بۆ سەرەوە سەرەوەی ئاگر پاشان فڕێ دەدرێنە ناوی:**

هەندێك لەکافرەکان سزا دەدرێن بەوەی دەیهێننە سەرەوە سەرەوەی ئاگر پاشان لەوێ تێی هەردەدەنەوە ناو ئاگر ، هەندێکیشیان داوایان لێ دەکرێ بەسەر چیایەکی ناو ئاگر بکەونو پاشان خۆیان فڕێ بدەنە خوارەوە.

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾﴾المدثر: ١٧

قتادة دەڵێ: (صعود) بەردێکە لەدۆزەخ کافرەکان لەسەر دەمو چاو لەسەری رادەکێشرێن.

أبو هريرە – خوا لێی رازی بێت – وتویەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویی: ((ئەوەی خۆی بە پارچە ئاسنێك بکوژێ ئەوا لەناو ئاگری دۆزەخ بەو پارچە ئاسنە

لەسكی خۆی دەدا ، ئەوەی ژەهر بخواتەوەو خۆی پیێ بكوژێ ئەوا لەناو ئاگری دۆزەخ ئەو ژەهرە نۆش دەكاو هەر هەتا ئەبەد لەناویدا ئەمێننەوە، ئەوەی لەسەر شاخێكیش خۆی فرێبداتە خوارەوە ئەوا دەكەوێتە ناو دۆزەخو هەتا هەتایە لەناویدا ئەمینێتەوە)) (متفق علیه).

ابن مسعود – خوای لیێ رازی بێت – وتویەتی: ((كوشتن لەپێناوی خوا هەموو گوناه لادەبات تەنها ئەمانەت نەبیێ)) پاشان وتی: ((یەكێك لەرۆژی قیامەتدا دێنن، ئەگەر لەپێناوی خوا كوژرا بێت پێی دەڵێن: ئەمانەكەت جیێ بەجیێ بكە، دەڵیێ: ئەی پەروەردگارم چۆن جیێ بەجێی بكەم لەكاتێك لەدونیا نەماوە. پێی دەڵێن: بیبەن بۆ هاویە، ئەوانیش دەیبەن بۆ هاویەو، لەویێ ئەمانەتەكەی وەكو خۆی پیێ نیشان دەدریێ و ئەویش دەیناسیتەوەو لەدوی دەڕواو هەتا دەیگاتیێو پاشان لەسەر شانی دادەنیێ، هەتا كاتێك وادەزانی دەرچووە ئەمانەتەكەی لەسەرشان دەكەوێتە خوارو ئەویش هەتا هەتایە شوێنی دەكەویێ)) پاشان وتی: (نوێژ ئەمانەتە، دەست نوێژ ئەمانەتە، كێشان ئەمانەتە، پێوان ئەمانەتە)) چەند شتێكی تریشی هەژماركرد، پاشان وتی: ((لەهەموویان گرنگتر راسپاردەكانن)). (زاذان) راوی فەرمودەكە وتی: هاتمە لای براء ی كوڕی عازەب و پێم وت: چ دەڵێی دەربارەی وتەی ابن مسعود كە ئەوهاو ئەوهای وت. وتی: راستی وتوە، ئایە گوێت لەفەرمایشتی خوای پەروەردگار نەبووە، كە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾ ﴾النساء: ٥٨ (رواه البيهقي مرفوعاً ورواه بمعناه هو وغيره مرفوعا، والموقوف أشبه. (حديث حسن)

**(٥) سزادان بەسوڕانەوە لەناو ئاگر:**

هەیە لەناو ئاگر ریخۆڵەکەکانی لەدوی دەخشیّو دەسوڕێتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) عەمری کوڕی لوحەی بینیوە لەناو ئاگر ریخەلۆکەکانی لەدەوری دەخشا. ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریسە وتویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو فەرمووی: ((پیاوێك لەرۆژی قیامەتدا دێنن‌و دەیهاوێنە ناو ئاگر، جا ریخۆڵەکانی دێنە دەرەوە و ژێر پێی دەکەون وەك گویّ درێژ بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوەو ریخۆڵەکانی گێر دەخوات ، دۆزەخیەکان لێی کۆدەبنەوەو پێی دەڵێن: فلان! تۆ چی دەکەیت لێرە؟ ئەی تۆفەرمانت بە چاکە پیّ نەدەکردین و رێگریت لیّ نەدەکردین لەخراپە؟، لەوەڵامدا دەڵیّ: بەڵیّ، بەڵام فەرمانم پێدەکردن بە چاکە بەڵام خۆم وام نەدەکرد ، رێگریم دەکردن لەخراپە بەڵام خۆم وام دەکرد))(متفق علیه).

أبو مثنى الاملوكي: وتویەتی: لەناو ئاگر کەسانێك هەنە بە چەند ناعورێکی ئاگرین دەبەسترێنەوە، جا ناعورەکان دەیانسوڕێنەوەو هیچ مۆڵەتیان نادات پشویەك بدەن.

**(٦) سزادان بە فرێدانە ناو شوێنێکی تەسك:**

هەندێك لەدۆزەخیەکان فریّ دەدرێنە ناو شوێنێکی تەسك، کە ناتوانن هیچ جولەیەك بکەن، خوای گەورە فەرمویەتی ﴿وَإِذَآ أُلْقُواْ مِنْهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوْاْ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴿١٣﴾ الفرقان: ١٣ هەرکاتێك ئەوانە بە کۆت و زنجیرەوە فریّ دەدرێنە ناو شوێنێکی تەنگەبەرەوە لە دۆزەخدا، داوای مەرگ و تیاچوون دەکەن و مردن بە ئاوات دەخوازن لەویّ.﴾

کەعب وتویەتی: لەدۆزەخ چەند تەندورێك هەیە، کە لە دمکی سەری رمێکی ئێوە تەسك ترە پاشان کەسانێك بە هۆی کردەوکانیان دەکرێنە ناوی.

ابن مسعود وتویەتی: کاتێك ئەوانەی هەتا هەتایە لەنێو ئاگر دەمێننەوە، دەکرێنە ناو چەند تابوتێکی ئاگرین، کە بزماری ئاگری تێدایە، پاشان ئەو تابوتانە دەکرێنە ناو چەند تابوتێکی تری ئاگرین، پاشان فڕێ دەدرێنە ناو ئاگری دۆزەخ، کەوا دەزانن بەس ئەوان لەناو ئاگر سزادەدرێن پاشان ابن مسعود ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَهُمْ فِيهَا لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾﴾ الأنبياء: ١٠٠ ئەوانە" بەهەناسەی قورس و لرخەلرخ ئاهو ناڵەوە (ژیانی سەختی تیایدا دەبەنەسەر) و مژدە و هیواو قسەیەکی خۆش نابیستن.﴾

## (٧) سزادان بە دەردو نەخۆشی:

بزانە کەوا لەدۆزەخ حەفتا دەرد هەیە، ئەهلی ئاگر بە جۆرێك لەو دەردانە دەناڵێنن، (شَفيٌّ بن ماتع) وتویەتی: هەر دەردێك قەبارەی وەك بەشێك لەبەشەکانی دۆزەخە.

ئەعمەش لەموجاهید ریوایەت دەکات ، کە وتویەتی: ئەهلی ئاگر توشی نەخۆشی خوران دەبن، جا خۆیان دەخورێنن هەتا ئێسکیان بە دەردەکەوێ و دەڵێن: دەبێ بە چ کردەوەیەك توشی ئەو نەحۆشە هاتبین؟پێیان دەوترێ: بەهۆی ئەوەی لەدونیا ئەزیەتو ئازاری موسڵمانانتان دەدا.

## (٨) سزادان بە بۆنی بۆگەنو ناخۆش:

باوکی غەزوان بن جریر وتویەتی: باسی فاحیشە کرا لەلای عەلی کوڕی ئەبو تالیب: وتی دەزانن چ زینایەك لەلای خوا گەورەیە؟ وتیان: ئەی ئەمیری بڕواداران زینا هەمووی گەورەیە، وتی: دەزانم زینا هەمووی گەورەیە، بەڵام هەواڵتان دەدەمێ بە گەورەترین زینا لەلای پەروەردگار، ئەویش ئەو زینایەیە، کە پیاوێکی موسوڵمان لەگەڵ ئافرەتی پیاوێکی موسوڵمان دەیکاو بەم جۆرە دەبێتە زیناکەرو ، ئافرەتی پیاوێکی موسوڵمان فاسید دەکات، پاشان وتی: پێمان گەیشتووە کە بۆنێك بەرەڵا دەکرێت بۆ ناو خەڵکو

دەچێتە هەموو کونەوە خەریکە هەناسەی خەڵك رابوەستێ، یەکێك بانگ دەکا بەجۆرێك هەموو گوێیان لێ دەبێو دەڵێ: دەزانن ئەو بۆنە ناخۆشە چییە، ، کە ئەزیەتی دان؟ دەڵێن: سوێند بە خوا نازانین چیە، پێیان دەڵێن: ئەوە بۆنی فەرجی زیناکەرەکانە ، کە بەزینایەوە چووینە لای پەروەردگار و تۆبەیان لێ نەکردووە.

**(٩)سزادان بە مردن، مردنیش نیە:**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأۡتِيهِ ٱلۡمَوۡتُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٖۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٞ ﴿١٧﴾ إبراهيم: ١٧ جا ئەو کێم و زووخاوە قوم قوم بەناچاری دەخواتەوە و بەئاسانی بۆی قوت نادرێت، مەرگیش لە هەموو لایەکەوە هێرشی بۆ دەهێنێت، کەچی ناشمرێت، لەوەودواش سزاو ئازاری هەمەجۆرو ناخۆش و گران یەخەی بەرنادات. ﴾ واتە: مردن لەهەموو شوێنێك بۆی دێ هەتا لەبن هەر تاڵە موەك لەجەستەکەی. ضحاك وتویەتی: هەتا لەبن پەنجەی گەورەی پێیەکانی واتا مردن بە هەموو ئێش ژانی بۆ دێو ئەویش ئەو ئەزیەتو ئازارە دەچێژێ و بەڵام نامرێو نەفسەکەی گیر دەخواو ناگەڕێتەوە شوێنی خۆیو هەر بەم ئەزیەتو ئازارە دەمینێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿١٣﴾ الأعلى: ١٣ لەوەودوا نە ئەوەیە بمرێت و (ڕزگاری بێت، نە ئەوەشە کە) ژیانێکی ئاسایی بەسەر بەرێت. ﴾

ئەوزاعی لەبیلالی کوڕی سەعد ریوایەتی کردوەو وتویەتی: لەرۆژی قیامەتدا ئاگر هاوار دەکاو دەڵێ: ئەی ئاگر بسوتێنە...ئەی ئاگر ببرژێنە...ئەی ئاگر سۆریان کەوە...ئەی ئاگر بیان خۆو مەیان کوژە.

**(١٠) سزادان بە هەڵبڕوزانی دەم و چاو:**

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ المؤمنون: ١٠٤

قرطبي وتویەتی: وشەی (تنفخُ) هەر مانای وشەی (تَلفَحُ) دەدات خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾ الأنبياء: ٤٦ بەڵام وشەی (تَلفَحُ) بەهێزترە، وتراوە: لفحتْهُ النّارُ والسّمومُ بحَرِها واتە: ئاگر سوتاندی و هەڵی پروزاند، ولَفحتُهُ بالسيف لفحة: واتە: بەشمشێر لێم دا بەڵام بەسەبری.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ ابن عبّاس وتویەتی: كالحون: واتە: دەمو چاویان گرژ دەبێت. ئەهلی زمانی عەرەبیش وتویانە الكلوح: واتە: ئەو كەسەی ددانەكانی سەرەوەی بە دیار دەكەوێ كاتێك لێوی هەردەكشێ.

ابن مسعود وتویەتی: ئەوانە لەناو ئاگر لێوەكانیان هەڵدەكشێ و ددانەكانیان دیار دەكەوێ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی لەبارەی ئایەتی ﴿وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾ (ئاگر دەیبرژێنێ جا لێوی سەرەوەی هەڵدەكشێ هەتا دێتە نیوەی سەری و لچی خوارەوەشی شۆڕ دەبێتەوە هەتا دەگاتە ناوكی) رواه الترمذي، قال الشيخ الألباني حديث ضعيف.

**(١١) سزای بەردەوام:**

بزانە کەوا سزای کافرەکان لەناو ئاگر بەردەوامەو هیچ کات لەسەریان ناپچڕێو سوک ناکرێ،

خوای گەورە فەرمویەتی :﴿إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾﴾ الزخرف: ٧٤ - ٧٥ بەڕاستی تاوانبار و تاوانکاران لەناو ئازار و سزای دۆزەخدا بەهەمیشەیی دەمێننەوە. (٧٤) ئازارو سزا لە سەریان کەم ناکرێتەوە، لە کاتێکدا هەمووشیان تیایدا نائومێد و بێ هیوان. ﴾

هەروا فەرمویەتی :﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾﴾ فاطر: ٣٦ لەو لاشەوە ئەوانەی کە کافرو بێ باوەڕ بوون، دۆزەخ بۆیان ئامادەیە، بڕیاری لەناو چوونیان نادرێت، تا بمرن و ڕزگاریان ببێت!! تەنانەت بەشێك لە سزاکەش لەسەریان کەم ناکرێتەوە، ئا بەو شێوەیە هەموو کافرو بێ باوەڕە سەرسەختەکان سزا دەدرێن و تۆڵەیان لێ دەستێنین . ﴾

هەروا فەرمویەتی:﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾﴾ البقرة: ٨٦ ئەوانە، ئەوانەن کە ژیانی دنیایان کڕی و گۆڕیویانەتەوە بە ژیانی (بەهەشت)و دوارۆژ، لەبەر ئەوە سزایان لەسەر کەم ناکرێتەوەو ئەوانە هەرگیز یارمەتی نادرێن و سەرناخرێن. ﴾

هەروا فەرمویەتی :﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِى ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۚ قَالُوا۟

﴿فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴿٥٠﴾ غافر: ٤٩ - ٥٠ ئینجا ئەوانەی کە لەناو ئاگری دۆزەخدان بە فریشتەکانی کارگێری دۆزەخ دەڵێن: داوا لە پەروەردگارتان بکەن" تەنها ڕۆژێك سزاو ئازارمان لەسەر کەم بکاتەوە.ئەوانیش لە وەڵامی داخوازیەکەیاندا دەڵێن: باشە، مەگەر پێغەمبەرەکانتان بە بەڵگەو نیشانەی ڕوون و ئاشکراوە، ڕەوانە نەکرابوون بۆتان؟ هەمووان بەیەکدەنگ دەڵێن: بەڵێ، ڕاستە، ئینجا فریشتەکان دەڵێن: دەی کەوابوو هەر داوابکەن وبپاڕێنەوە، بێگومان داخوازی و پاڕانەوەی کافران بەهیچ ناچێت، تازە هیچ نرخێکی نیەو گیرا نابێت.﴾

أحمد بن أبی الحراری وتویەتی: گوێم لە اسحاق کوڕی إبراهیم بوو لەسەر مینبەری دیمەشق وتی: هەر کات ژمێرێك تێپەڕ ببێ بەسەر بەهەشتیەك ئەوا زیاتر لەو نازو نیعمەتانەی خوا دەچێژێ، کە پێشتر نەی دەزانی، هەر کات ژمێرێکیش بەسەر ئەهلی ئاگر دا تێپەڕی بەجۆرێك لەجۆرەکانی سزا سزا دەدرێ، کەلەمەو پێش نەیدەزانی، خوای گەورە فەرمویەتی:﴿فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾﴾النبأ: ٣٠

مهدی بن میمون وتویەتی: گوێم لە حسن بن دینار بوو پرسیاری لەحسن کرد لەبارەی کە چ ئایەتێك لەهەموو ئایەتەکان قورسترە لەسەر ئەهلی ئاگر؟ وتی لەأبا برزە پرسیارم کرد وتی: قورسترین ئایەت لەسەریان ئەو ئایەتەیە، کە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾﴾النبأ: ٣٠

مجاهد وتویەتی: پێم گەیشتووە، کە پشوی ئەهلی ئاگر بە ئەندازەی ئەوەیە کە یەکێك دەستی لەسەر کەلەکەی خۆی دانابێ, خودا بمان پارێزی لەو ئاگرە.

**(١٢) گەورەترین سزای ئەهلی ئاگر نەدیتنی خوای گەورەیە:**

بزانە کەوا گەورەترین سزای ئەهلی ئاگر نەدیتنی خواو دوورکەوتنەوەیە لەخوا، هەروەك کە رەزامەندی خوا بۆ ئەهلی بەهەشت گەورەترین نیعمەتی بەهەشتیەکانەو دیتنی خوای پەروەردگارە، کە خۆیان پێیان نیشان دەدات. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّا إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا الْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ المطففين: ١٤ - ١٧ نەخێر، وانیە (ئەو نەفامانە تێناگەن و داناچڵەکێن) بەڵکو دڵیان ژەنگی هێناوەو چڵکی گوناه دایپۆشیوە لە سەرەنجامی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد. (١٤) نەخێر، رزگاربوونیان نیە، چونکە بەڕاستی ئەو ڕۆژە بەربەست هەیە لەنێوان تاوانباران و پەروەردگاریاندا و بێ بەش دەبن لەبینینی ئەو زاتە. (١٥) لەوەودوا بێگومان دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە. (١٦) پاشان پێیان دەوترێت: ئائەمە ئەو شوێنەیە کە بڕواتان پێی نەبوو بەڕاستتان نەدەزانی. ﴾ خوای گەورە لەو چەند ئایەتانەدا سێ جۆرە سزای باس کردووە: یەکەم: نەدیتنی خوا ، دووەم: بردنیان بۆ دۆزەخ، سێ یەم: سەرزەنشت کردنیان بەوەی لەدونیا رۆژی دواییان بەدرۆ دەخستەوە، پاشان وەسفی کردوونە بەوەی دڵیان ژەنگ دایپۆشیوە بەهۆی گوناهو تاوان، کە دڵیانی رەش کردووەو بەهۆی ئەوەوە لەدونیا خوایان نەدەناسیو ریزو حورمەتیان نەدەگرت، جا چۆن لەدونیا دڵەکانیان مەحروم بوو لەباوەڕهێنان بە خوا ئەوهاش لەرۆژی دوایی بێ بەش دەبن لەدیتنی خوا.

لەفەرمودەی صهیب و جگە لەویشدا هاتووە، کە جعفر بن سلیمان گوێی لە أبا عمران الجوینی بووەو وتویەتی: ئەگەر خودای گەورە تەماشای هەر مرۆڤێك بکات

رەحمی پێدەکات، خۆ ئەگەر تەماشای ئەهلی ئاگریش بکات ئەوا رەحمیان پێ دەکات بەڵام بڕیاری داوە هەرگیز تەماشایان نەکات.

لەفەرمودەی (أبو هريرة)شدا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((سێ کەس لەرۆژی دواییدا خودا نایان دوێنێ‌و، پاکانەیان بۆ ناکاتو، تەماشایان ناکاتو، سزایەکی زۆر بە ئێشیان بۆ ئامادەکراوە: پیرێکی زیناکەرو، پادشایەکی درۆزنو، هەژارێکی بە فیزو خۆبەگەورەگر)). حديث صحيح رواه الامام مسلم.

چەند سزایەکی تر هەیە بۆ ئەهلی ئاگر، کە خودا لەدونیا بۆ بەندەکانی ئاشکرا نەکردووە. والله أعلم.

هەندێك سزای تریش، کە باسم نەکردووە چونکە پێشتر لەسەرەتای ئەو کیتابە لەوەسفی ئەهلی ئاگردا باسم کردووە.

# دۆزەخیەكان
# الجهنميون

دۆزەخیەكان كێنە؟ ئەمە پرسیارێكە زۆر كەس دەیكا، وەڵامی ئەم پرسیارە لەفەرمودەیەكی پێغەمبەری خوادا (ﷺ)هاتووە، كە باسی گوزەرانیان دەكاتو باسی چارەنوسیان دەكات، كە بەرەو كوێ دەچن.

بەكورت بڕیەكی زۆر دەڵێین: ئەوانە دەستەیەكن لەئەهلی ئیمان بە هۆی گوناهە گەورەكانو بچوكەكانیان دەچنە نێو ئاگرەوە، موشریكانیش پێیان دەڵێن: باوەڕەكەتان چ قازانجێكی پێ گەیاندن؟ ئەگەر باوەڕەكەتان سودی هەبوایە بۆتان ئەوا بە هۆی تاوانەكانتان نەدەخرانە نێو ئاگرەوە، ئێمە دەستەی كافرانینو ئێوەش دەستەی سەرپێچیكاران لەیەك شوێندا كۆبوینەوەو سزادەدرێین؟

بێ گومان، كە ئەوان ئەو قسەیە دەكەن ئەوا لەبێ ئاگاییانە بەگوزەرانی ئیماندارە سەرپێچیكارەكان، سزادانی ئەوان لەچەندیەتیو چۆنیەتیدا لەهی كافراندا جیاوازە، سزادانی باوەڕداران بۆ تەئدیبو پاك كردنەوەیتیان..جا كاتێك خوای گەورە بۆیان توڕەدەبێ، چونكە ئەهلی باوەڕن و ئەگەرچییش هەندێك تاوانیان ئەنجامداوە، ئەوا فەرمان دەدا كەس لەناو ئاگر نەمێنێ ئەوەی وتویەتی (لا اله الا الله)و دانیشی داناوە بەپێغەمبەرایەتی محمد(ﷺ). جا دەردەهێندرێن، كە سوتاونو بوینە رەژوو تەنها دەمو چاویان نەبێ چونكە ئەوان لەناو ئاگر چاویان تێك ناچێتو، دەمو چاویان رەش نابێت، جا دەهێنرێنە لای رووبارێكی نزیك دەرگای بەهەشتو لەناو ئەو رووبارە خۆیان دەشۆنو، هەرچی چەشتویانە لەسزاو ئازارو میحنەت هەمووی لەسەریان لادەچێو لەبیری دەكەن، پاشان دەچنە نێو بەهەشتو، فریشتەیەك پێیان دەڵێ: هەر خۆشبنو دڵو دەروونو ناوەڕۆكتان بە ئیمان خۆش بێو ئاوەدان بێو رواڵەتیشتان لەئاگر پاك

کرایەوەو بڕۆنە بەهەشتەو هەتا هەتایە لەنێوی دا بمێننەوە...جا ناودەبرێن بە ئەو دۆزەخیانەی لەبەهەشتدان، پاشان داوا دەکەن لەخودای گەورە ئەو ناوەیان لەسەر لابدات چونکە شەرم دەیانگرێت لەناونانیان بەم ناوە.

جا خوای گەورە دوعاکەیان گیرا دەکاتو هەرگیز بەم ناوە بانگ ناکرێن ،کە دەرچوون لەنێو ئاگر کافرەکان دەڵێن: بریا موسوڵمان بوینایە، هەروەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ۝٢ ﴾ الحجر: ٢ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون (لە ئایندەیەکی نزیکدا) ئاواتەخواز دەبن کە خۆزگە موسڵمان بوونایە، خۆزگە ئیماندار بوونایە.﴾

کافرەکان خوازیاری ئەوە دەکەن موسوڵمان بونایە بۆ ئەوەی وەك ئەو موسڵمانانە رزگاریان ببوایە لە ئاگر.

● ئەبو موسای ئەشعەری، لەپێغەمبەری خوا گێڕاوەتەوە: ((ئەگەر ئەهلی ئاگر لەناو ئاگر کۆبوونەوەو هەندێکیش لەئەهلی قیبلە ئەوەی خوا بیەوێ لەگەڵیاندا دەبێ، جا کافرەکان دەڵێنە موسڵمانەکان: ئایا ئێوە موسڵمان نەبوون؟ دەڵێن: بەڵێ، دەڵێن: ئیسلام بونتان چ سودێکی پێ گەیاندن لەکاتێك وا پێکەوە لەیەك شوێن داین؟ دەڵێن: چەند گوناهێکمان کردبوو بەو هۆیەوە چارەنوسمان هاتە شوێنە.

جا خوای گەورە ئەوەی وتیان گوێی لێ بوو، فەرمانی کرد ئەوەی ئەهلی قیبلەیە بکرێنە دەرەوە، جا کەکافرەکان ئەو دیمەنە دەبینن، دەڵێن: بریا ئێمەش موسوڵمان باین بۆ ئەوەی وەك ئەوانە دەربهاتباین)).

پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ كَانُواْ مُسْلِمِينَ ۝٢ ﴾الحجر: ٢ (أخرجه النسائی فی السنن الکبری من حدیث جابر نحوه باسناد صحیح).

●علی کوڕی ئەبو تالیب وتویەتی پێغەمبەری خوا فەرموی: ((تکا دەکەم بۆ ئوممەتەکەم هەتا خوای گەورە بانگم دەکاتو دەفەرموێ: محمد ئایە رازی بووی؟ منیش دەڵێم: بەڵێ پەروەردگارم رازی بووم)) رواه الطبراني والبزار وهو حديث بشواهده.

●أنس وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((تکاو شەفاعەتی من بۆ ئەو کەسانەیە، کە لەئوممەتەکەم گوناهە گەورەکانیان ئەجامداوە)) رواه أبو داود والبزار والطبراني وابن حبان فى صحيحه وهو حديث (صحيح).

●عبدالله کوڕی عومەر لەپێغەمبەر (ﷺ) ریوایەت دەکات، کە فەرمویەتی: ((سەرپشك کرام لەنێوان شەفاعەتو لەنێوان ئەوەی کە نیوەی ئوممەتەکەم بچنە نێو بەهەشت جا شەفاعەتم هەڵبژارد چونکە گشتگیرترو باشترە، بەڵام خۆ ئەم شەفاعەتە بۆ بڕوادارە پێشوەکان نیە بەڵکو بۆ گوناهبارەکانە ئەوانەی خۆیان بە گوناه پیس کردووە)) (رواه أحمد وهو حديث حسن صحيح).

●أبو هريرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((...هەتا ، کە خوای گەورە لەدادوەری بویەوە لەنێوان بەندەکانو، ویستی بە رحمەتی خۆی رەحم بە کەسانێك بکات لەئەهلی ئاگر ،فەرمانی دەرکرد بۆ فریشتەکان ، کەوا ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا بڕیارنەداوە دەریان بێنن لەناو ئاگر، ئەوانەی کە خوا دەیەوێ رەحمیان پێ بکات ، ئەوانەی دەیان وت: لا اله الا الله، جا – فریشتەکان – بە شوێنەواری سوجدە[1]

(١) ئەم فەرمودەیە بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەوانەی نوێژ نەکەر بەکافر دادەنێن، چونکە فریشتەکان ئەوانە دەناسنەوە بەشوینەواری سوجدە، ، سوجدەش واتە نوێژ، هەر لەو فەرمودەیە ئاماژەیەکی گرنگی تێدایە لەنێوان عەقیدەی لا اله الا الله ونوێژکردن، چونکە خوای گەورە پێان دەفەرموێ: ئەوانە دەربێنن، کە گوتیتیان لا اله الا الله، جا فریشتەکان تەنها بە شوێنەواری سوجدە ئەوانە دەناسنەوە، کەواتە یەکێك لەمەرجەکانی لا اله الا الله نوێژکردنەو بەبێ نوێژکردن وتنی لا اله الا الله هیچ سودی نیە بۆ خاوەنەکەیو لەرۆژی دواییدا هیچ بە کەلکی نایەتو لەدونیاشدا بە موسڵمان لەقەلەم نادرێ والله أعلم (وەرگێڕ).

دەیانناسنەوە، کە ئاگر هەموو شوێنێکی مرۆڤ دەخوات و دەیسوتێنێ تەنها شوێنەواری سوجدە نەبێ، کە لەسەر ئاگر حەرام کراوە ئەم شوێنەواری سوجدەیە بخوات، جا لەنێو ئاگر دەردەهێنرێن، کە بووینە رەژوو، ئاوی حەیاتیان بەسەردادەکرێ، جا دەڕوێنەوەو شین دەبن وەك ئەوەی دەنك لەدەو قوڕی نزیك ئاودا دەڕوێ)) حدیث صحیح انظر الحدیث المرقم (٧٠٣٣) فی صحیح الجامع.

●أبو سعید الخدری وتویەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((خوای گەورە ئەهلی بەهەشت دەخاتە نێو بەهەشتەوەو، ئەمەش هەر بەرەحمەتی خۆی ئەوەی بیەوێ دەیخاتە نێوی، ئەهلی ئاگریش دەخاتە نێو ئاگر، پاشان دەفەرموێ: بڕۆن بڕوانن ئەوەی بە ئەندازەی تۆز خەردەلێك باوەڕی هەیە دەری بهێنن، جا دەردەهێنرێن، کە وەك رەژویان لێ هاتووەو، فڕێ دەدرێنە ناو رووباری حەیات یان حەیا، جا شین دەبنەوەو زیندوو دەبنەوە وەك چۆن دەنك لەتەنیشت ئاوەوە دەڕوێ، نابینن، کە چۆن دێتە دەر بە رەنگێکی زەردی لوول خواردوو)) (رواه مسلم.

●ئەبو سەعیدی خودری فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سەبارەت بە ئەهلی ئاگر ئەوا نە دەژین‌و نە دەمرن لەنێوانیاندان ، بەڵام هەندێك بە هۆی تاوانەکانیان توشی ئاگر دەبن، جا ئاگر دەیانمرێنێ هەتا وەك رەژویان لێ دێت، مۆڵەت دەدرێت بەوەی تکایان بۆ بکرێ، پاشان یەك یەکە چوار پەلیان دەگرن‌و بڵاو دەکرێنەوە سەر لێواری رووباری بەهەشت، پاشان دەوترێ ئەی ئەهلی بەهەشت ئاویان پێدا بکەن، جا وەك چۆن رووەکی (حبة) لەنزیك ئاودا دەڕوێ ئەوانیش ئەوها دەڕوێن‌و شین دەبنەوە.

هەر ئەم فەرمودەیە لەریوایەتێکی موسلیمدا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((..بەرێ دەکەوم بۆ لای پەروەردگارم و مۆڵەتی لێ وەردەگرم، ئەویش مۆڵەتم پێ دەدات‌و، منیش لەپێش دەستیدا رادەوەستم، بە جۆرێك سوپاس‌و ستایشی، دەکەم کە ئێستا ناتوانم بیکەم، ئەوکات خوا ئیلهامی دڵم دەکات، پاشان سوجدەی بۆ دەبەم، جا پێم دەڵێن: ئەی محمد سەرت بەرز بکەرەوەو، چ داواکاریەکت

هەیە بیلێ‌و تکا بکەو تکاکەت وەرئەگیرێ، جا دەڵێم: ئەی پەروەردگارم ئوممەتەکەم...ئوممەتەکەم، دەوترێ: راپەڕە، ئەوەی بای دەنکە گەنمێك یان جۆێك باوەڕی هەیە دەری بێنە، منیش رادەپەڕم و وادەکەم.

پاشان دەگەڕێمەوە لای پەروەردگارم و بەو سوپاس‌و ستایشە سوپاس‌و ستایشی دەکەم‌و پاشان سوجدەی بۆ دەبەم، پێم دەڵێن: ئەی محمد سەرت بەرزبکەوە، بڵێ: گوێت بۆ گیراوە و داوا بکە بۆت جێ بەجێ دەکرێ‌و تکا بکەو تکاکەت وەردەگیرێ. منیش دەڵێم:ئوممەتەکەم..ئوممەتەکەم. پێم دەڵێن: راپەڕە ئەوەی بای تۆزقالە خەردەلێك باوەڕی هەیە بڕۆ دەری بێنە. منیش رادەپەڕم‌و وادەکەم. پاشان دەگەڕێمەوە لای پەروەردگارم‌و بەو سوپاس‌و ستایشە سوپاس‌و ستایشی دەکەم‌و، پاشان سوجدەی بۆ دەبەم، پێم دەڵێن: ئەی محمد سەرت بەرزبکەوەو، بڵێ گوێت بۆ گیراوەو داوا بکەو بۆت جێ بەجێ دەبێ‌و تکا بکە تکاکەت وەردەگیرێ، منیش دەڵێم: ئومەتەکەم..ئومەتەکەم..پێم دەڵێن: راپەڕە ئەوەی کەمتر کەمتر لەتۆزقالە خەردەلێك باوەڕی هەیە دەری بێنە لەنێو ئاگر، منیش رادەپەڕم‌و وادەکەم.

لەریوایەتێکی تری موسلیمدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: پاشان بۆ جاری چوارەم دەگەڕێمەوە لای پەروەردگارم بەم جۆرە سوپاس‌و ستایشە سوپاس‌و ستایشی دەکەم، پاشان سوجدەی بۆ دەبەم، پێم دەوترێ:ئەی محمد سەرت بەرزبکەوەو، بڵێ گوێت بۆ گیراوەو داوا بکەو داواکەت جێ بەجێ دەکرێ‌و تکا بکەو تکاکەت وەردەگیرێ. منیش دەڵێم: ئەی پەروەردگارم مۆڵەتم بدە ئەوەی وتبیتی لا اله الا الله دەری بێنم لەناو ئاگرێ دەفەرموێ: ئەوە بۆ تۆ نیە، یان وتی: ئەم کارە بۆ تۆ نیە – بەڵام، سوێند بەگەورەیی خۆم ئەوەی وتبێتی لا اله الا الله دەری دێنم) حدیث صحیح.

# مانەوە لەنێو ئاگر بێ مردنو لەناوچوون

●أبی سعید الخدری وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((مردن لەسەر شێوەی بەرانێکی رەنگ رەشو سپی دێنن جا یەکێك بانگ دەکات و دەڵێ: ئەی ئەهلی بەهەشت ئەوانیش ملیان درێژدەکەن بۆ ئەوەی بڕوانن، جا دەڕوانن، دەوترێ: ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، کە پێشتر هەموو بینیویانە، پاشان بانگ دەرێك بانگ دەکاتو دەڵێ: ئەی ئەهلی ئاگر ئەوانیش ملیان درێژ دەکەن بۆ ئەوەی بڕوانن، جا دەڕوانن، دەوترێ: ئەمە دەناسن؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەوە مردنە، کە پێشتر هەموو بینیویانە، جا لەنێوان بەهەشت و ئاگر سەردەبڕدرێو ، پاشان دەوترێ: ئەی ئەهلی بەهەشت بمێننەوە لەناو ئەو بەهەشتە بێ ئەوەی بمرنو، ئەی ئەهلی ئاگر ، بمێننەوە لەناو ئاگر بێ ئەوەی بمرن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾﴾مریم: ٣٩ ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ستەمکاران ئاگادار بکە لە ڕۆژی ئاهو ناڵە و پەشیمانی کاتێك کار لە کار ترازاوە، لەکاتێکدا ئەوانە لە غەفڵەتدان و باوەڕ ناهێنن. رواه البخاری ومسلم والنسائی.

# هەر کاتێك پێستیان سوتاو برژا:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَـٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ ﴾ النساء: ٥٦ بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، لە ئایندەدا دەیانسوتێنین بەئاگری دۆزەخ، هەموو جارێك پێستیان داوەشاو سووتاو هەڵقرچا، پێستی تر دەکەین بەبەریاندا، بۆ ئەوەی بە چاکی سزاو ئازار بچەژن، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام بالأدەستە و (دەتوانێت تۆڵە لە خوانەناسان بسەنێت)، دانایە (کە مۆڵەتیان دەدات بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی دینداری). ﴾

پێشەوا طبری لەبارەی :﴿ كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم ﴾دا وتویەتی: هەر کاتێك بە هۆی ئاگرەوە پێستەکانیان سوتاو برژا ئەوا ﴿بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا ﴾ بەرگ پۆشیان دەکەین بە پیستێکی تر، جگە لەو پێستەی کە برژاوە،

لەحەسەن ریوایەت کراوە، کە لەبارەی : ﴿ كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَـٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا ﴾ وتویەتی لەرۆژێکدا حەفتا هەزار جار ئاوا پێستیان دەسوتێنیٚ، ئەستوری پێستی کافریش چل هەنگاوە، نازانم هەر خواش دەزانی بەم هەنگاوانە.

●ئەبوهورەیرە وتویەتی پێغەمبەر خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نێوانی هەردوو شانی کافر لەنێو ئاگر ماوەی سیٚ رۆژە رێیە بۆ سوارچاکێکی خێرا)) رواه البخاری.

●هەر ئەبوهورەیرە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ددانی کافر لەنێو ئاگردا هەندی چیای ئوحد گەورە دەبیٚ، رانیشان بە قەد چیای (بیضاء) قەبەو ئەستور دەبیٚ، جێگاشی لەناو ئاگر وەك نێوانی (قدید)و (مکە) وایە، گەورەیی لاشەشی چلو دوو هەنگاوە بە هەنگاوی ((جبّار)) )) {حدیث صحیح}.

جا بزانین زانست چی وتوه دەربارەی کاری پێست، کە قورئان لەبارەیەوە وتویەتی، کە شوێنی هەست کردنی ئازارو ئەشکەنجەیە، لەراستیدا گرنگ ترین کار، کە بە پێست راسپێردراوە بریتیە لەهەست کردن بە هەموو شێوەکانی بگرە لەدەست لێدانو هەست کردن بە گەرمیو ساردیو ئازار. لەدەرەوەی پێستدا چەند خاڵێك هەیە پێی دەڵێن خاڵی هەست کردن، کەلەو خاڵانەوە سەری موەکان دەست پێدەکات، کە رێکە لەگەڵ کۆتایی لیفە عەصەبیەکان، ئەو خالانەش لەسانتیمەترێکی چوارگۆشە دا جیاوازە ئەمەش بە پێی شوێنی پارچەکە لەوەرگرتنی هەستداو زۆریشی لەسەرە پەنجەکان کۆبوویتەوە، جا هەست لەو خاڵانەوە دەست پێ دەکات بۆ لیمفەکان، جا ئەلیافەکان هەتا چەقی جوملەی عەصەبی مەرکەزی هەست بەوانە دەکاتو لێی دەکۆڵێتەوە.

ئەمەش لەقورئاندا زۆر بە روونی باسی لێوە کراوە، کە تەنها پێست لەبەشەکانی تری لەش سەرچاوەی ئازارە، ئایە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامێری تەشریحی تایبەتی هەبووە بۆ ئەوەی ئەو حەقیقەتە زانستی یە بزانێ؟ یان ئەمە ئایەتێکە لەئایەتەکانی خوای گەورە و شاهێدی دەدا کەوا قورئان وتەی خوای پەروەردگارە.

●شێخ عبدالمجید الزندانی وتویەتی: خەڵکی پێشتر وایان دەزانی لەشی مرۆڤ هەمووی هەستیارە لەهەر شوێنێکی بدەی ئازار دەکێشێ، لەسەری بدەی ئازار دەکێشێ، لەچاوەکانی بدەی ئازار دەکێشێ، وایان دەزانی، کە لەش هەمووی هەستیارە بۆ ئازار هەتا، کە عیلمی تەشریح پێش کەوت و راستیەکی زانستی سەلماندو وتی: نەخێر هەموو لەش هەستیار نیە، بەڵکو پێست سەرچاوەی ئازارە..بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر دەرزیەك بێنینو لەلەشی مرۆڤێکی ببەینە خوار ئەوا پاش ئەوەی لەپێستەکە دەچێتە خوار هیچی تر ئازاری نابێت هەرچەند بچێتە خوارەوە، پاشان

لەژێر وردبین ئەمەیان تەشریح کردو بینیان دەمارەکان کۆبوینەوەو چەقیان بەستووە لەناو پێستو بینیان دەمارەکانی هەست کردن هەمە جۆرن لەوانە:

هەیانە بەدەست لێدان هەستی پێ دەکرێو، هەیانە بەپاڵەپەستۆخستنە سەر هەستی پێ دەکرێو، هەیانە بە گەرمی هەستی پێدەکرێو، هەیانە بە ساردی هەستی پێ دەکرێ. جا تێبینیان کرد دەمارەکانی هەست کردن بە گەرمیو ساردی تەنها لەپێستدا هەیە، جا ئەگەر لەرۆژی دوایی کافرەکان هاوێشترانە ناو ئاگری دۆزەخ مەسەلەکە چی بەسەردێتو دەبێ چۆن بێ؟

کافرەکان هیچ بەڵگەو نیشانەیەکیان نیە ئەو مەسەلەیان بۆ روون بکاتەوە لێرەدا گرفتێك بۆ ئەهلی ئیمان دروست دەبێت بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەهلی کوفرو ئیلحادو دەڵێن: ئێوە بە ئاگر دەمان ترسێنن! ئاگر لەرۆژی قیامەتدا پێستەکەمان دەخواتو دەبرژێنێو ئیتر لەپاشان دەحەسێینەوە بەڵام وەڵام لەلایەن پەروەردگارەوە دێت و ئەو نهێنیە ئاشکرا دەکاتو کافران دەم کوت دەکاتو توشی ترسو بیمێکی زۆریان دەکاتو دەفەرموێ:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوۡفَ نُصۡلِيهِمۡ نَارٗا كُلَّمَا نَضِجَتۡ جُلُودُهُم بَدَّلۡنَٰهُمۡ جُلُودًا غَيۡرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿٥٦﴾ النساء: ٥٦ بەڕاستی ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەت و فەرمانەکانی ئێمە، لە ئایندەدا دەیانسوتێنین بەئاگری دۆزەخ، هەموو جارێك پێستیان داوەشاو سووتاو هەڵقرچا، پێستی تر دەکەین بەبەریاندا، بۆ ئەوەی بە چاکی سزاو ئازار بچەژن، بەڕاستی خوا هەمیشەو بەردەوام باڵادەستە و (دەتوانێت تۆڵە لە خوانەناسان بسەنێت)، دانایە (کە مۆڵەتیان دەدات بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی دینداری)﴾

جا ئەگەر پەروەردگارمان هەواڵمان پێ بدات بەوەی کەوا ئەو پێستە دەگۆڕێت بە پێستێکی نوێ بۆ ئەوەی ئێشو نزار بچێژین، جا کە هەواڵی داینێ بەوەی گەدە ئازار

دەکێشێ بەهۆی خواردنەوەی گەرم ئەوا وە نەبێ بە گۆڕینی گەدەیەکی تر بێ لەجیاتی یەکەم بۆ ئەوەی سزا بچێژێ نەخێر، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَـٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَـٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَـٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّـٰرِبِينَ وَأَنْهَـٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَـٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ محمد: ١٥ وێنەی ئەو بەهەشتەی کەبەڵێن دراوەبدرێت بەخواناس و پارێزکاران، ئەمەیە: چەندەها ڕووباری لەئاوی سازگارو تام و نەگۆڕاوی تێدایە، هەروەها چەندەها ڕووباری شیر کەتامی تێك نەچووە، هەروەها چەندەها ڕوبار لەشەرابی تام خۆش و بۆنخۆش، (کەلەخواردنەوەی بێزار نابن و لەبەر چاویان ناکەوێت) بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە، چەندەها ڕوبار لەهەنگوینی پاڵفتەو بێگەرد، هەروەها بۆیان هەیە لەو بەهەشتەدا لەهەموو جۆرە بەرو و بووم و میوەیەکی جوان و بەتام و بۆنخۆش، هاوکات لەگەڵ لێخۆشبوون و خۆشەویستی پەروەردگاریاندا، ئایا ئەو بەختەوەرانەوەکو ئەو کەسانەوان کەلەناو ئاگری دۆزەخدا نەمرن و ئاوی لەکوڵ دەکرێت بەگەروویاندا، کەریخۆڵەکانیان پارچەپارچەو تۆی تۆی دەکات ؟! ﴾ بۆ لێرەدا وشەی (قطع أمعاءهم) بە کارهاتووە؟ زانستی ئەم سەردەمە سەلماندویەتی کەوا دەماری هەست کردن بە گەرمیو ساردی لەریخولەکاندانیە، بەڵکو تەنها پارچە پارچە دەبنو دەکەونە ناو سك، ئەمەش بە ئێشترینو سەخت ترین سزایە کاتێك خۆراکێك دەکەوێتە ناو هەناو ئەوا نەخۆش هەست بە ئازارێکی زۆر دەکات وەکو ئەوەی بە خەنجەر لێی درابێ..جا قورئان باسی ئەوەی کردووە، کە بەسەر پێست دادێتو باسی هەناویشی کردووە کە چی بەسەر دێ، بێ گومان ئەو وەسفە وردە تەنها لەلایەن یەکێکەوەیە، کە نهێنی پێکهاتەی پێستو نهێنی پێکهاتەی هەناو دەزانێ. (من كتاب العلم طريق الايمان للزنداني).

# دوایین کەس کە لەئاگر دێتەدەرەوە

● (عبدالله)ی کوڕی (مسعود) خوا لێی رازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: ((من دەزانم دوایین کەس، کەلەئاگر دەردەهێنرێ‌و دوایین کەسیش، کە دەبردرێتە بەهەشت. پیاوێك لەئاگر دێتە دەرەوە به کاگۆڵە دەڕوا. خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بچۆ بڕۆرە بەهەشتەوە. ئەویش دەچێت بەڵام وامەزندە دەکات پڕە. جا دەگەڕێتەوەو دەڵێت: پەروەردگارم بینیم پڕبوو.

خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بچۆ بڕۆرە بەهەشتەوەو دە ئەوەندەی دونیاش بۆ تۆ بێ.

دەڵێ: ئایا گاڵتەم لەگەڵ دەکەی یان (پێم رادەبوێری) لەکاتێك تۆ پادشای؟

دەڵێ: بینیم پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێکەنی هەتا ددانەکانی بەدیارکەوت. دەڵێت: جا وتیان: ئەوە کەمترین مەنزلگای ئەهلی بەهەشتە. (رواه مسلم).

# رۆژوو مانگ

● عن أنس رضي الله عنه قال: قال النبی (ﷺ): ((إنَّ الشمس والقمر ثوران عقيران فی النّار)) (رواه الطياليسي وأبو يعلى وهو صحيح)

پێشەوا (المناوی) لە(فيض القدير) دا وتویەتی: (ثوران) واتە مانگ‌و رۆژ دەگۆڕدرێن بۆ دوو گا ، ریوایەتێکیتریش هەیە به (ن) لەباتی (ث) بەڵام ئەمە تەصحیفە، (المدینی)یش لە(غريب الحديث) دا وتویەتی: کاتێك وەسفیان کراوە بەوەی مەلەوانی دەکەن‌و دەسوڕێنەوە هەروەکو: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾الأنبياء: ٣٣ جا هەر شتێك بپەرستریٚ

جگە لەخوای گەورە مەگەر ئەوەی خوا هیدایەتی داوە، ئەوا دەکەوێتە ناو ئاگرو سزای ئەو کەسانەی پێ دەدرێ کە پەرستویانن‌و بەردەوامیش پێکەوەن وەکو ئەوەی دووگا پێکەوەبن‌و لێك دانەبڕێن.

قرطبي وتويەتی: علی وابن عبّاس وتویانە: پێکەوە دەکرێنە ناو دۆزەخ، چونکە جگە لەخوا ئەو دووانە پەرستراون‌و، ئاگریش ئەم دووانە ئازار نادات چونکە ئەمانە بێ گیانن، بەڵکو کە ئەمە دەکرێ ئەوا بۆ زیاتر دەم کوت کردنی کافرانە.

هەندێکیش دەڵێن: کە ئەوها پێکەوە کۆدەبنەوەو لێك دانابڕێن ئەوا نزیکیانە لەخەڵك، کە بەمە لەگەرمان ئارەقەیەکی زۆر دەکەن جا ماناکەی وەکو ئەوە وایە کە گەرمیەکەیان کۆبکرێتەوە لەسەر ئەهلی مەحشەر.

هەندێکیش دەڵێن: کە ڕۆژوو مانگ کۆدەکرێنەوە، واتە چی تر شەوو ڕۆژ بە دوای یەکدا نایەن.

جا بۆی هەیە تێنەگەیشتویەك بڵێ: گوناهی ڕۆژو مانگ چی یە هەتا سزا بدرێن؟

جا با ئەو تێنەگەیشتوە بزانێ کەوا مانەوەیان لەناو دۆزەخ بۆ ئەوە نیە سزا بدرێن، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەهلی ئاگری پێ سزا بدرێ.

# بەشی چوارەم

# ئەو كردەوانەی دەتباتە ناو ئاگری دۆزەخ

ئەگەر پرسیارمان كرد لەو كردەوانەی كەوا بەرەو ئاگری دۆزەخت دەبات ئەوا وەڵامەكە لەكیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەوە دێت، ئەو كردەوانەی بریتین لەو گوناهە گەورانەی كەوا خوای گەورە هەڕەشەی كردووە لەبكەرەكانیو سزایەكی بە ئێشیان دەدات، بەڵام سەبارەت بە گوناهە بچوكەكان ئەوا خوای گەورە لێیان خۆش دەبێ ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ النساء: ٣١ ئەگەر خۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی قەدەغە كراوە لێتان، ئەوە لە گوناهەكانی ترتان چاوپۆشی دەكەین و دەتانخەینە جێیەكی خۆش و سازگارو ڕێزدارەوە (كە بەهەشتی بەرینە)﴾ بێ گومان گەورەترین گوناه لەگوناهە گەورەكان هاوەڵ بڕیاردانە بۆ خوای تاكو تەنیا، چونكە خوا هەرگیز قبولی نیە هاوەڵی بۆ پەیدا بكرێ و قەتیش لەمە خۆش نابێت، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ النساء: ١١٦ بەڕاستی خوا خۆش نابێت لەوە هاوەڵ و شەریكی بۆ بڕیار بدرێت و جگە لەو (هاوبەش دانانە) لە گوناهانی تر بۆ هەر كەس بیەوێت و شایستە بێت و (پەشیمان بێت) خۆش دەبێت، جا ئەوەی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بەڕاستی گومڕا بووە بەگومڕاییەكی زۆر دوور.﴾ پاشان كۆمەڵێكی تر هەن كە بە ئەهلی شیرك دەچنو لەوان دانابڕێن ئەویش نیفاقە — خوا بمان پارێزێ — لەراستیدا خوای گەورە هەڕەشەی لەمونافیقان كردووە بەوەی

هەتا هەتایی لەنێو ئاگر دەمێننەوە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ النساء: ١٤٥ بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان و هەرگیز بۆ ئەوان پشتیوانێکت دەست ناکەوێت﴾ جا ئەم دوو جۆرە، کە کوفرو نیفاقە ئەوا خاوەنەکانیان بە هەتا هەتایی لەنێو ئاگر دەمێننەوە، هەڵگەڕانەوەش لەئیسلام هەر دەچێتە ژێر حوکمی کوفر، بەڵام سەبارەت بەوەی دەمینێتەوە لەگوناهە گەورەکان، ئەوا ئەگەر بکەرەکەی بەحەڵاڵیان نەزانێ ئەوا هەتا هەتایی لەنێو ئاگردا نامینێتەوە، ئەمەش کە جمهوری زانایان بڕیاریان لەسەر داوە.

لەم بابەتەدا زۆر سودم وەرگرتووە لەکیتابی (الكبائر للذهبي) وەکیتابی (الزواجر للهيثمي) بۆ ئەوەی گوناهە گەورەکان باس بکەم بۆ ئەوەی موسوڵمان هەوڵ بدا دووربکەوێتەوە ئەوەندەی لەتوانای دا هەیە، بۆ ئەوەی خۆیو دینەکەی بپارێزێ و رزگاری بێت لەئاگری دۆزەخ. جا منیش لەو کتێبەدا ئەو گوناهە گەورانەم کورت کردۆتەوە، ئەوەی دەشیەوێ فراوانتر بیان زانێ ئەوا بابگەڕێتەوە سەر کتابێکی ترم بە ناوی (الكبائر)چونکە لەوێ درێژەم پێداونو، هەرلەسەر رێڕەوی فەقیهو فەرموودەگێرەوەکان و(فقهاء ) گوناهە گەورەکانم روون کردۆتەوە، داوا لەخوای گەورە دەکەم شیازم پاك بکاو لێمی وەرگرتبێت. والله الموفق للصواب وبه المستعان وعليه التكلان و لا حول ولا قوه إلا بالله العلى العظيم.

# پێناسەی گوناهی گەورە (الكبيره)

زانایان رایان جیاوازە لەبارەی پێناسەی (کبیرة) کە خۆی دەبینێتەوە لەچەند رایەکی جیاواز، کە ئێرە جێی باس کردنی نی یە. بەڵام لەهەموی بەناوبانگ تر ، کە وتراوە لەپێناسەی (کبیرة) ئەمانەی خوارەوەیە:

–وتراوە: (کبیرة) ئەوەیە حەددێکی شەرعی لەسەر هاتبێ.

–وتراوە(کبیرة)لەقورئانو سونەتەوە هەرەشەیەکی توندکرا بێ لەبەکەرەکەی.

–وتراوە:هەر گوناهێك لەدونیا حەددێکی لەسەر دروست ببێو لەدوارۆژیش هەرەشەی لێ کرابێ.

–وتراوە: هەر گوناهێك خوای گەورە نەهی لێ کردبێت ئەوا گوناهی گەورەیە.

–وتراوە:هەر گوناهێك لەعنەتی لێ کرابێ یان غەزەبی لێ گیرابێ یان تیایدا هەڕەشەی بە ئاگر لێ کرابێ.

ئەو پێناسەیەی ئاخیر چەند زانایەکی موسوڵمان پەسەندیان کردووە و هەڵیان بژاردووە لەسەر هەموو پێناسەکانی تری (کبیرة).

(ابن حجر ) وتویەتی: باشترین پێناسە هی (قرطبي)یە کە لە کیتابی (المفهم) دا وتویەتی: هەر گوناهێك بە دەقی قورئان یان سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) یان ئیجماعی زانایان بە گەورە ناوی هاتبێ، یان هەوڵدرابێ کەوا سزایەکی بە ئێشو توندی لەسەرە یان حەددێکی شەرعی لەسەرهاتبێ یان هەڕەشەیەکی گەورەی لێ کرابێ ئەوا بە گوناهی گەورە لەقەلەم دەدرێو گوناهێکی گەورەیە.

هەر (ابن حجر) وتویەتی: هەر لەسەر ئەمە پێویستە بەدواداگەڕان بکرێ لەسەر ئەو گوناهانەی لەقورئان و فەرمودە صەحیح و حەسەنەکان هەڕەشەی لێ کراوە، یان لەعنەتی لەسەر هاتووە یان بە فیسق لەقەلەم دراوە، هەروا دەبێ ئەوانەش بدرێنە پاڵ

ئەمەوە کە لەقورئان و فەرموده صەحیح و حەسەنەکان ناوی بە (کبیرة) هاتووە، جا کە ئاوا کرا ئەوا دەتوانرێ بژمێردرێو ژمارەی بزانرێ.

هەر بە پێی ئەو جیاوازیەی پێشو لەمەڕ پێناسەی (کبیرة) ئەوا زانایان لەشتێکی تریش رایان جیاوازە ئەویش دیاری کردنی ژمارەی گوناهە گەورەکانە، جا ئەو کەسەی تەنها ئەوە بە (کبیرة) دەزانێ کە دەقی لەسەر هاتووە ئەوا دەڵێ ژمارەیان حەوت گوناهە یان نۆ، کە ئەمە لەچەند فەرمودەیەکی صەحیح دا هاتووە، ئەوەی بە پێناسەیەکی فراوانتریش ڕوانیە مەسەلەکە ئەوا دەڵێ ژمارەیان زیاترە، (ابن عباس) فەرمویەتی: زیاتر گوناهە گەورەکان لەهەفتا نزیك ترن نەك لەحەوت.

(سعید)ی کوڕی (جبیر) گەورەترین قوتابی (ابن عباس) وتویەتی: ژمارەیان نزیکە لەحەوت سەد ئەمەش بەپێی جۆرو شێوازەکانی –والله تعالى أعلم– پاشان ئەو فەرمودانەی، کە بە ئاشکرا گوناهی گەورەیان باس کردووە، ئەوا دوو جۆرن:

لەوانە، کە تێیدا هاتووە، کە گوناهێکی گەورەیە، یان (أكبر الكبائر)ە یان (أعظم الذنوب)ە، یان خاوەنەکەی فەوتاوەو بە هیلاك چووە، یان لەعنەت یان غەزەب یان هەڕەشەیەکی توندی لەسەر هاتووە.

**نمونە لەجۆری یەکەم** وەکو ئەو فەرمودەیەی کە (بخاری)و (مسلم) گێڕایتیانەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر)) ثلاثاً، قلنا: بلى يا رسول الله، قال: ((الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وكان متكئاً فجلس فقال: ألا وقول الزور وشهاده الزور)) فما زال يكررها حتى قُلنا ليتَهُ سَكَتْ..

هەروەها لەفەرمودەیەکی تر، کە هەر (بخاری)و (مسلم) ریوایەتیان کردووە ، وتیانە پێغەمبەر (ﷺ)أي الذنب أعظم؟ قال: ((أن تجعل لله نداً وهو خلقك)) قال: قُلتُ له: إنَّ ذلك لعظيم. قال: قُلتُ:ثُمَّ أي؟: قال: ((ثُمَّ أن تَقْتُلَ وَلَدَك مخافة أن يَطعَمَ معكَ)) قال: قُلتُ: ثُمأي؟ قال: ((أن تزنى حليله جارك)).

هەروەها فەرمودەیەكی تریشیان ریوایەت كردووە، كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((من الكبائر شتم الرجل والديه)) قالوا: يا رسول الله، وَهَل يشتُمُ الرجُلُ والديه؟ قال: نعم، يَسبُّ أبا الرَّجُلِ فيسبُّ أباه، ويَسُبُّ أُمَّهُ)).

جۆری دووەم:

ئیمامی موسلیم جگە لەو فەرمودەیەكیان لەپێغەمبەر (ﷺ) ریوایەت كردووە، كە فەرمویەتی: ((ثلاثة لا يكلمهم اللهُ يوم القيامة ولا ينظر إليهم ولا يزكيهم ولهُم عذاب أليم)) قال: فقرأها رسول الله (ﷺ) ثلاث مرات، قال أبو ذر: خابوا وخسروا من هم يا رسول الله؟ قال: (المُسبِلُ إزاره، والمنانُ والمنفق سلْعَتَهُ بالحَلفِ الكاذب)) رواه مسلم.

لەفەرمودەیەكی تریش پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی ((لا يدخُلُ الجنه قتات)) متفق عليه.

جا ئەی بری موسڵمانم بزانە، كەوا خوای گەورە ئاگاداری بەندەكانی كردۆتەوە لەگوناهو تاوانەكان، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾الزخرف: ٥٥ مانای آسفونا واتە: تورەیان كردین. هەروەها لەئایەتەكی تریش دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ ﴾الأعراف: ١٦٦ هەروەها دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ ﴾النساء: ١٢٣ بۆیە كەس سنورەكانی خوای گەورە نابەزێنێ مەگەر خراپەكارێكی مەغرور نەبێ، كەسیش لەسەر ئەو سنور بەزاندنە بەردەوام نابێ مەگەر فاجیرێكی بێ چارە نەبێ، كەسیش لەسەر ئەو حاڵە نامرێ مەگەر بەدبەختێكی سەركەش نەبێ، خودا بە گەورەیی خۆی بمان پارێزێ لەو سەرەنجامە.

ئەگەریش بمانەوێ سەلامەت بین لەهەموو ئەوانە، ئەوا با گوێ بگرین لەبۆ وتەی ئەو کەسەی فەرمویەتی: قەت مەڕوانە بچوکی تاوانەکان، بەڵکو بڕوانە گەورەیی ئەو کەسەی سەرپێچیت کردووە.

(حسن) فەرمویەتی: واز لەگوناه هێنان سوکترە لەتەوبە کردن.

(محمد بن کعب القرظي) وتویەتی: لەهەموو عیبادەتێك خۆشەویستر لای خودای گەورە واز هێنانە لەگوناهەکان ئەمەش فەرمودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) پشت راستی دەکاتەوە، کە فەرمویەتی: ((ما نهيتكم عنهُ فاجْتنبوهُ، وماأمَرتُكُمْ بهِ فافعلوا منِه ما استطعتم)) رواه مسلم.

**ئێستاش بە کورتی باسی هەندێك لەگوناهە گەورەکان دەکەین و دەیانژمێرین.**

## ١- کوفرو، هاوەڵ دانان بۆ خوا

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ النساء: ٤٨ بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە. ﴾

خوای گەورەی فەرمویەتی:﴿ وَإِذۡ قَالَ لُقۡمَٰنُ لِٱبۡنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾ لقمان: ١٣ بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە. ﴾

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾ المائدة: ٧٢ سوێند بەخوا بەڕاستی، ئەوانە بێ باوەڕ بوون کە وتیان: خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە (بەمەرجێك) مەسیح وتوویەتی: ئەی نەوەی ئیسرائیل، ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە و دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردووە و شوێن و جێگاو

سەرەنجامی ئاگرە، ئەوسا ئەوستەمكارانە هیچ جۆرە پشتیوانێكیان نی یە (كەس ناتوانێت فریایان بكەوێت). ﴾

لەفەرمودەیەكی صەحیحی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هاتووە، كە فەرمویەتی: ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر))؟((الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وكان متكئاً فجلس فقال: ألا وقول الزور ألا وشهاده الزور)) فما زال يكررها حتى قُلنا ليتَهُ سكَت)).

## ٢- مەرایی یان ریابازی

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ الماعون: ٦ ئەوانەی كە ڕیا بازن و بە ڕووكەش نوێژ دەكەن و دەیانەوێت خۆیان دەربخەن و (ئیمانداران بخەڵەتێنن). ﴾

هەروەها فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٤٢﴾ النساء: ١٤٢.

بەڕاستی دووڕووەكان (وا دەزانن) فێڵ لە خوا دەكەن (لەكاتێكدا) ئەو زاتە فێڵەكانیان پووچ دەكاتەوە (نازانن كە دیار و نادیار، لای خوا ڕوون و ئاشكرایە)، هەر كاتێكیش (بۆ ڕیاو ڕووپامایی) هەڵدەستن بۆ نوێژ، زۆر بەلەش گرانیی و تەمەڵیی هەڵدەستن، ئەوانە ڕیایی و ڕوپامایی بۆ خەڵكی دەكەن، زۆر كەم یادی خوا دەكەن. ﴾

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: ((مَن سَمَّعَ سَمَّعَ الله به، وَمَن يرائي يرائي الله به)). متفق عليه. مانای (سَمَّعَ)واتە: كردەوەكەی خۆی ئاشكرا كرد بۆ ئەوەی خەڵك پێی بزانێ. (سَمَّعَ الله به): واتە خوا لەرۆژی قیامەتدا ئابڕوی دەبا، (يُرائي) واتە: ئەو كەسەی كردەوەی چاكە دەكاو بۆ ئەوەی لەلایەن خەڵكەوە بەگەورە بگێڕێ. (راء ى الله به): واتە: لەناو هەموو خەڵك دا ئابڕوی دەبا و دەتكێنێ.

## ٣-کوشتنی یەکێك بە ناهەق:

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾ النساء: ٩٣ هەر کەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیمانداریك بکوژێت (بەحەلالی بزانێت)، ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، نەمرە تیایدا، هەروەها خوا لێی تورە بووە و نەفرینی لێکردووە و سزایەکی گەورە و بێ سنووری بۆ ئامادە کردووە ﴾

(ابن کثیر) وتویەتی: ئەوە هەرەشەیەکی توندو بەڵێنێکی جەخت کراوە بۆ ئەو کەسەی ئەو تاوانە گەورەیە ئەنجام دەدات، چونکە لەچەندین ئایەتی تر ئەم گوناهە لەدوای هاوەڵ دانان بۆ خوا باسی لێوە کراوە.

هەروەکو دەفەرموێ:﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ الفرقان: ٦٨ هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە توشی سزا و ئازارو ڕیسوایی دەبێت. ﴾

جا ئایەت و فەرمودەی زۆر هەن لەسەر ئەم تاوانە، لەو فەرمودانەی لە(الصحیحین) دا هاتووە فەرمودەی( ابن مسعود)ە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمویەتی: ((یەکەم لەشت لەرۆژی قیامەتدا قەزاوەتی لەبارەیەوە دەکرێ خوێنە)).

هەروەها فەرمودەیەکی (ترمذي) ریوایەتی کردووە کە ((پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەگەر ئەهلی زەوی‌و ئاسمان بەشداری بکەن لەکوشتنی باوەڕدارێك ئەوا خوای گەورە هەمویان پێکەوە داوێتە ناو ئاگر)) (حدیث صحیح).

(عبدالله)ی کوڕی (مسعود) لەپێغەمبەرەوە رایوایەتی کردووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((پیاوێك دێت کە دەستی پیاوێکی تری گرتووەو دەڵێ: پەروەردگارم ئەمە منی کوشت، خوای گەورەش پێی دەڵێ: بۆ کوشتت؟ دەڵێ: کوشتم لەپێناوی ئەوەی گەورەیی‌و شکۆمەندی بۆ تۆ بێ ، دەڵێ دەفەرموێت: جا هەر ئەمە بۆ منە، پیاوێکی تریش دێت، کە دەستی پیاوێکی تری گرتووەو دەڵێ: ئەوە منی کوشت، خوای گەورە پێی دەفەرموێ: بۆ کوشتت؟ بۆ ئەوەی گەورەیی و شکۆمەندی بۆ فلانە کەس بێت، دەفەرموێ: ئەوە بۆ ئەو نیە، جا گوناهەکەی هەڵدەگرێ)) (رواه النسائي وأحمد وهو حديث صحيح).

## ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت:

خۆ کوشتن حەرامە، بەڵکو یەکێکە لەتاوانە گەورەکان، کە خاوەنەکەی خوا سزای دەدات.. عن أبي هريره رضي الله عنه قال: قال رسول الله (ﷺ): ((من قتل نفسة بحديدة فحديدته في يده يتوجأ بها في بطنه في نار جهنم خالداً فيها أبداً ومن شرب سَمّاً فقتل نفسه فهو يتحسّاه في نار جهنم خالداً مخلداً فيها أبداً، ومن تردّى وهو يتردى في نار جهنم[1] خالداً مخلداً فيها أبداً ))[2] متفق عليه.

---

(1) خالدا مخلدا فيها أبدا: زانایانی ئەهلی سوننە فەرمویانە هیچ کەسێك بە هۆی گوناهەوە بە هەتا هەتایی لەنێو ئاگردا نامینێتەوە لەموسڵمانان ئەگەر لەسەر وشەی یەکتاپەرستی (لا اله الا الله) مردبێ ، بەڵکو مانای فەرمودەکە ئەوهایە، کە ماوەیەکی دووروو درێژ لەنێویدا دەمینێتەوە و دواتر، کە پاك بویەوە دەردەهێنرێ و دەبردرێتە بەهەشت . والله أعلم ..وەرگێڕ.

(2) الحافظ ابن حجر وتویەتی: ئەمە بەڵگەی موعتەزیلەکانە ، کە پشتیان پێ بەستووە، کە دەڵێن ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خاوەن گوناهەکان بە هەتا هەتایی لەنێو ئاگر دا دەمینێتەوە.

((هەر کەسێك بەپارچە ئاسنێك خۆی بکوژێ ئەوا لەرۆژی قیامەتدا پارچە ئاسنەکەی لەدەستدایە و لەزگی خۆی دەدات و هەتا هەتا هەیی لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە، هەر یەکێکیش ژەهر بخواتەوەو خۆی پێ کوشت ئەوا لەرۆژی قیامەتدا قوم دوای قوم دەی خواتەوەو بە هەتا هەتایی لەناو دۆزەخدا دەمینێتەوە، هەر یەکێکیکش لەشاخێك خۆی بهاوێتە خوارەوەو مرد ئەوا لەرۆژی قیامەتدا دەکەوێتە ناو ئاگر بە هەتا هەتایی لەنێویدا دەمینێتەوە)).

## ٤ـسیحر

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ﴾

شەیتان هیچ ئامانجێکی نیە لەفێرکردنی سیحر بۆ مرۆڤ تەنها ئەوەیە شیرك بۆ خوا بڕیاربدا. خوای گەورە لەبارەی هاروت و مارو فەرمویەتی: ﴿وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ البقرة: ١٠٢ جا جووەکان (وازیان لە کتێبی خوا ـ تەورات ـ هێناو) شوێنی ئەوە کەوتن، کە شەیتانەکان دەیانخوێندەوە دەربارەی دەسەلأت و حکومەتی سولەیمان، (ئاشکرایە کە) هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافربوون و خەڵکیان فێری سیحرو جادوو دەکرد، هەروەها مەردومیان

فێری ئەوە دەكرد كە بۆ هاروت و ماروت دابەزی بوو (كە دوو فریشتە بوون) لە بابل (مەبەستیشیان تێگەیاندنی خەڵكی بوو لە سیحرو جادوو). ئەوانیش كەسیان فێری هیچ شتێك نەدەكرد تا پێیان نەوتایە: ئەم كارەی ئێمە بۆ تاقی كردنەوەیەو خۆت كافر مەكە (كەچی هەندێك هەر كۆڵیان نەداو) لەو فریشتانەوە شتی وافێر دەبوون كە ژن و مێردی پێ لە یەك جوودا بكەن، (هەر چەندە) ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زیانێك بە كەس بگەیەنن، مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، ئەو خەڵكە سەرگەردانە هەمیشە فێری شتێك دەبن كە زیانیان لێدەداو سوودی نیە بۆیان، بێگومان دەشزانن ئەوەی كاڵای وای كڕی بێت و شتی وافێر ببێت لەو دونیا هیچ بەهرەیەكی دەست ناكەوێت، (بەڕاستی) ئەو شتەی ئەوان خۆیان پێ فرۆشتووە و كەوتونەتە داوییەوە شتێكی زۆر ناپەسەندە ئەگەر بزانن و تێبگەن (چونكە سیحرو جادوو چەواشە كاریە و كارێكی نادروستە). ﴾

جا خەڵكێكی زۆر لەوانەی گومڕابوینە و نەزانن ئەوا وا دەزانن، كە سیحر تەنها حەرامە و نازانن كە كوفرە ، جا دەچنە ناو عیلمی (السیماء[1]) كە ئەوەش تەواوی سیحرە، خۆش ویستنی پیاویش بۆ ئافرەتێك و رق لێ بوونەوەی سیحرە، یان بگرە ئەمە و چەندین وشەی نامۆو بێ مانا و نادیار، كە زۆرینەی شیرك و گومڕاییە. (من كتاب الكبائر للذهبي).

---

(١) علم السيماء : عیلمێكە، كە دەوترێ بۆ ئەو جۆرە سیحرەی : گە حەقیقەتی نیە ، پوختەكەشی دروست كردنی چەند شتێكی خەیالیە، كە لەواقیعدا بوونی نیە ، یان جاری وا وێنەیە هەیە لەهەوادا . ناوەكەشی (السیما ء) : كە لەزمانی عیبرانیەوە كراوەتە عەرەبی.

## ٥- نەكردنی نوێژ (ترك الصلاة)

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـًٔا ﴿٦٠﴾ ﴾مريم: ٦٠ جگە لەوانەی كە تەوبە دەكەن و باوەڕی دامەزراو دەهێنن و كارو كردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوە و هیچ جۆرە ستەمێكیان لیٚ ناكرێت. ﴾

● (ابن مسعود) وتویەتی: مانای ( أضاعوها) ئەوە نیە، كە بەگشتی نەیانكردووە بەڵكو مانای ئەوەیە لەكاتی خۆی دوایان خستووە.

● (سعید بن المسیب) خوا لێی رازی بێت — وتویەتی: ماناكەی ئەوەیە نوێژی نیوەڕۆ ناكا هەتا كاتی نوێژی عەسر نێت، نوێژی عەسریش ناكات هەتا كاتی نوێژی مەغریب نێت، نوێژی مەغریبیش ناكا هەتا كاتی نوێژی عیشا نێت، نوێژی عیشاش ناكات هەتا كاتی نوێژی بەیانی نێت، نوێژی بەیانی ناكا هەتا ڕۆژ هەڵنێت، جا هەر یەكێك مردو بەردەوام لەسەر ئەوە بوو تۆبەی نەكرد، ئەوا خوای گەورە هەڕەشەی لێكردووە بە دۆڵێك كە ناوی (ویل)ە، كە زۆر قووڵەو خواردنەكەشی زۆر پیسە.

خوای گەورە لەئایەتەكی تردا دەفەرمویٚ: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ﴾الماعون: ٤.
مانای (غافلون)یش واتا ئاگایان لیٚ نیەو كەم تەرخەمن لەئاستیدا.

هەندێكیش وتویانە (ویل) واتە توندیو بە ئێشی سزا، یان وتویانە: دۆڵێكە لەدۆزەخ ئەگەر هەموو چیاكانی دونیای تیٚ بكەی ئەوا لەگەرمیان دەتاوێنەوە، ئەوەش جێگای ئەو كەسانەیە، كە كەمتەرخەمی دەنوێنن لەئاست نوێژەكانیانو لەكاتی دیاری كراوی خۆیدا دوای دەخەن مەگەر ئەو كەسەی بگەڕێتەوەو تۆبە بكاو پەشیمان بێتەوە.

● (مصعب)–خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: وتم بە باوكم: بابە ئایا ناڕوانیە وتەی خوای گەورە : ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾الماعون: ٥ جا كێ هەیە لەبیری نەچێ‌و قسەی لەگەڵ نەفسی خۆی نەكا لەناو نوێژدا؟ وتی: ماناكەی ئەوە نیە، بەڵكو بە فیڕۆدانی كاتە بەهۆی سەرقاڵی بوونی بە شتی پڕوپووچ هەتا كاتەكەی دەڕوا. (رواه أبو يعلى باسناد حسن).

●پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی یەك نوێژی بڕواو بفەوتێ ئەوا وەكو ئەوە وایە ماڵ‌و منالی فەوتادابێ‌و لەدەستدابێ)) رواه ابن حبان حديث صحيح.

● (أبو هريره) خوا لێی رازی بێت – فەرمودەیەك لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) ریوایەت دەكات و دەڵێت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای هەندێك كەسدا رۆیشت سەریان بەبەرد دەشكێنراو پاشان وەكو خۆی لێ دەهاتەوەو ئەو سزایە ئەوها بەردەوام لەسەریان بوو بێ ئەوەی پشویەك بخۆن وتم: ((جبريل ئەوانە كێنە؟ وتی: ئەوانە لەش گران بوون لەمەڕ نوێژە فەرزەكان)) حديث حسن قال الهيثمي في المجمع فيه تابعيه مجهول.

خوای گەورە لەئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٩﴾ المنافقون: ٩ ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، هەوڵ بدەن نە ماڵ و سامانتان، نە ڕۆڵەكانتان، نەبنە هۆی ئەوەی كە لەیادی خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو كەمتەرخەمی و بێ ئاگاتان بكەن، جا هەركەس لە یادی خوا كەم تەرخەمی بكات، ئا ئەوانە هەر خۆیان خەسارەتمەندو زەرەرمەندن. ﴾ موفەسیرەكان وتویانە: مەبەست بە زیكری خوا لەم ئایەتە دا پێنج نوێژەكانە، جا هەر كەسێك ماڵەكەی یان كڕین‌و فرۆشتنەكەی یان منالەكانی سەرقاڵیان كرد لەنوێژكردن لەكاتی خۆیدا ئەوا –پەنا بە خوا– لەخەسارەت مەندەكانە.

● (أبوهريرە) وتويەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((یەکەم جار لەکردەوەکان لەڕۆژی قیامەتدا بەندە لەسەر نوێژ حیسابی لەگەڵدا دەکرێ، ئەگەر دەرچوو ئەوا رزگاری بووەو سەرکەوتوو بووە، ئەگەریش دەر نەچوو ئەوا خەسارەتمەند بووە، ئەگەریش لەنوێژە فەرزەکانی شتێك کەمو کوڕی تێکەوتبێ، خوای گەورە دەفەرموێ: بڕوانن بزانن بەندەکەم هیچ نوێژی سوننەتی هەیە، جا ئەوەی کەمو کوڕی هەیە لەفەرزەکان پێی تەواو دەکرێ، دوایی کردەوەکانی تریشی هەر ئەوها)).

## ٦- نەدانی زەکات:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم ۖ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ ۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٨٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٨٠ واگومان نەبەن ئەوانەی کە بەخیلی و ڕەزیلی دەکەن، لەو نازو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیوون، نابەخشن، کارێکی چاکە بۆیان، نەخێر ئەوە کارێکی خراپ و نادروستە بۆیان، چونکە ئەو شتانەی کە نەیاندەبەخشی لە ڕۆژی قیامەتدا دەست دەنێتە بینیان و دەبنە کۆت لە گەردنیاندا، (بێگومان) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر خوا خاوەنیانەو خوا ئاگایە بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئێوە ئەنجامی دەدەن. ﴾ هەروەها فەرمویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ ﴾فصلت: ٧

بزانە: کەوا زەکات روکنێکە لەروکنەکانی ئیسلام، جا هەر یەکێك زەکاتی کەوتە سەر و ئەو هەقەی خوای دەرنەکرد ئەوا لەبارەیەوە هەرەشەیەکی توند هاتووە.

(ابو هريره) خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموی: ((هەر یەکێك خاوەنی زێڕو زیو بێت و ئەو حەقەی دەکەوێتە سەریان لێی دەر نەکا ئەوا کاتێك رۆژی قیامەت داهات لاتەنیشتەکان‌و نێوچەوان‌و پشتی پێ داغ دەکرێ، هەر کاتێکیش سارد بویەوە دووبارە بۆی داغ دەکرێتەوە لەرۆژێك کە ئەندازەکەی پەنجا هەزار ساڵە، هەتا خوای گەورە لەحوکم کردنی نێوان خەڵکیدا تەواو دەبێت، ئەو کات یان چارەنوسەکەی بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخ)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی وشتر؟ فەرموی: ((هەر خاوەن حوشترێکیش ئەو حەقەی دەکەوێتە سەری لێی دەرنەکا.

## ٧- شکاندنی رۆژێك لەمانگی رەمەزان بەبێ عوزر

●خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿ أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ البقرة: ١٨٤چەند رۆژێکی ژمێرراوی دیاریکراو (کە مانگی رەمەزانە) خۆ ئەگەر کەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو با بە ئەندازەی ئەو رۆژانەی بۆی نەگیراوە لە رۆژانێکی تردا بیانگێڕێتەوەو ئەوانەش کە بە زەحمەت دەتوانن بەرۆژوو بن (وەکو پیرەمێردو نەخۆشە بەردەوامەکان) ئەوە با ژەمێك خواردن ببەخشن بە هەژارێك، ئەوەی زیاتر ببەخشێت ئەوە باشترە بۆی، بێگومان ئەگەر بەرۆژوو بن چاکترەو پاداشتی زۆرترە ئەگەر بزانن و (بتوانن). ﴾

● (أبو هريره) فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((هەر یەکێك رۆژێك لەمانگی رەمەزان بەرۆژوو نەبێت بەبێ عوزر یان نەخۆشی ئەوا ئەگەر هەموو ئەو ساڵە بگرێتەوە ناتوانێ ئەو رۆژە پڕ بکاتەوە)) رواه الترمذي واللفظ له وابو داود والنسائي، وابن ماجة، وابن خزيمة في صحيحه، والبيهقي كلهم عن رواية ابن المطوس، وقيل أبي المطوس عن أبية عن أبي هريرة وذكر البخاري تعليقا غير مجزوم، ، فقال: ويذكر عن أبي هريرة رفعه (( من أفطر يوما من رمضان من غير عذر ولا مرض لم يقضه صوم الدهر وإن صامه)) ضعيف.

وقال الترمذي: لا نعرفه إلا من هذا الزجه، زسمعت محمدا: يعني البخري يقول: ابو المطوس اسمه يزيد بن المطوس، ولا أعرف له غير هذا الحديث انتهى. وقال البخاري ايضا: لا أدري سنمع أبوه من أبي هريرة أم لا؟، وقال بان حبان: لا يجوز الاحتجاج بما انفرد به والله أعلم.

(من غير رخصة) مبارك فوری له(تحفة الاحوذي) دا وتویەتی: وەك سەفەر (ولا مرض) واتە نەخۆشیەك نەتوانێ لەگەڵیدا بەرۆژو بیت، ئەمەش لە عطفي عامه لەسەر خاص (لم يقض عنه صوم الدهر كله) ئەمە زیاتر بۆ جەخت کردنەوەیە (وإن صامه) واتە: ئەگەر هەمووشی بەرۆژوو بیت.

طیبي وتویەتی: ناگاتە خێرو پاداشتی ئەو رۆژە فەرزە بە گرتنی رۆژووە سوننەتەکان ئەگەر چی ئەو بەگرتنەوەی یەك رۆژ واجیبەکەی لەسەر لادەچێت، ئەمەش بە مانای زیادەڕۆیی‌و توند کردنە، بۆیە جەختی کردۆتەوە بە بێژەی (وإن صامه)). (ابن الملك ) وتویەتی: رای ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەیە ، کە رۆژ لەباتی ئەو رۆژەی خواردویەتی بیگرێتەوە، (ابن جعفر) وتویەتی: رواڵەتی فەرمودەکە ئەوەها مانا دەدات، کە ئەگەر هەموو ئەو ساڵە بەرۆژو بێت بە نیەتی پڕکردنەوەی ئەو رۆژەی لەرەمەزان خواردویەتی ئەوا پڕی ناکاتەوە، ئەمەش رای (علی)و (ابن مسعود)ە،

زۆربەی زانایانیش لەسەر ئەو رایەن کە ئەو رۆژەی خواردویەتی ئەگەر کاتەکەی درێژ خایەن بوبێو ئەو رۆژەی کە دەیگرێتەوە کاتەکەی کورت خایەن بێت ئەوا دروستە، هەروەکو ئەمە لە(المرقاة) دا باس کراوە. والله تعالی أعلم.

## ٨- نەچوونە ماڵی خوا

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ آل عمران: ٩٧

لەو ماڵەدا (کەعبە) نیشانەو بەڵگەی زۆر و ئاشکرا هەیە، کە یەکێکیان شوێنی تایبەتی خواپەرستیی ئیبراهیمە، هەروەها ئەوەی بچێتە ناوی پێویستە ئەمین و ئاسودەبێت، لە هەموو دەستدرێژیەك، جا خوای گەورەش بڕیاریداوە لەسەر خەڵکی حەج و سەردانی (بیت الحرام) بکەن بە تەنها ئەوانەی کە توانای (دارایی و تەندروستیان) هەیە، جا ئەوەی کە باوەڕی نەهێناوە، ئەوە با بزانێت بەڕاستی خوا بێ نیازە لە هەموو خەڵکان (پێویستی بە چاکە و پەرستنی کەس نیە). ﴾ لەپێغەمبەر (ﷺ) ریوایەت کراوە، کە فەرمویەتی: ((ئەوەی ئیشەکی زانراوو دیار رێی لێ نەگرێ حەجْ بکا یان نەخۆشیەکی رێگر، یان زەبرو زەنگی کاربەدەستێکی ستەمکار، لەگەر ئەوە نەچوو بۆ حەج، ئەوا با بە ئارەزووی خۆی چ لەسەر دینی جولەکەکان یان دینی نەصرانیەکان بمرێ)) {ضعیف، رواه البیهقي ، وفي إسناده شریك بن عبدالله عن لیث بن أبي سلیم، وکلاهما ضعیف}.

## ٩-خراپە کردن لەگەڵ دایكو باوك:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾ الإسراء: ٢٣ - ٢٤

پەروەردگاری تۆ بڕیاریداوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاریداوە چاکەکاریش بن لەگەڵ دایك و باوکتاندا، هەر کاتێك یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لە دەست مەکەو (هەرگیز) پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، بەردەوامیش قسەو گفتو گۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت. (٢٣) باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخەو ملکەچ بە بۆیان، نزا بکەو بڵێ: پەروەردگارا ڕەحمیان پێ بکەو میهرەبان بە بۆیان، هەروەکو چۆن ئەوان ڕەحمیان بە من کردوو و منیان پەروەردە کردووە بە بچووکی و مندالی. ﴾ واتە: کاتێك پیربوونو بەساڵادا چوون قسەیەکیان پێ مەڵێ هەست بە نیگەرانی بکەن ،بەڵکو پێویستە خۆت تەرخان بکەی بۆ خزمەت کردنیان، چۆن ئەوان پێشتر خۆیان تەرخان کردبوو بۆ خزمەت کردنت، دەبێ قسەی نەرمو شیرینیان لەگەڵدا بکەی چاکەو گەورەییش هەر بۆ ئەوانە، چۆن وەکو یەك لەکاتێك ئەوان ئێشو ئازاری تۆیان هەڵدەگرت و بەهیوای مانت بوون تۆش ئەگەر ئێشو ئازاری ئەوانت هەڵگرت بە هیوای ئەوەی زوو بمرن.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾﴾ لقمان: ١٤

(لێرەدا خوا ئامۆژگاریەكان لە دەمی لوقمان دەفەرموێت): ئێمە فەرمانمانداوە بە ئادەمیزاد بە چاك ڕەفتاری لەگەڵ دایك و باوكیدا، دایكی بە ئێش و ئازارو لاوازی و بێتاقەتیەكی زۆرەوە، (بە پێستی سكی نۆ مانگ) هەڵی گرتووە، بڕینەوەشی لە دوای دوو ساڵە، فەرمانمان پێدا كە ئەی ئینسان سوپاسگوزاری منیش و دایك و باوكیشت بە، دڵنیابن كە گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە.﴿ جا بڕوانە ڕەحمەتی خوا بڕژێت بەسەرتدا چۆن خوای گەورە شوكرانەی دایكو باوكی لەدوای شوكری خۆی باس كردووە.

یەكێك لەشوكرەكانی خوا ئەوەیە منالٚ شوكری دایكو باوكی بكا هەتا كردەوەكانی وەربگیرێ.

● عن أبي بكرة قال: قال رسول الله (ﷺ) ((ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ – ثلاثاً – قلنا: بلى يا رسول الله ، قال: ((الاشلاراك بالله، وعقوق الوالدين)) وكان متكئاً فجلس، فقال: ((ألا وقول الزور وشهادة الزور) فما زال يكررها قلنا ليته سكت[1].

((پێتان بڵێم گوناهە گەورەكان چنە؟)) سێ جاران. وتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((هاوەڵ دانان بۆ خواو، خراپەكردن لەگەڵ دایكو باوك)) پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاڵی دابۆوە بەڵام دانیشت ئەنجا فەرمووی ((درۆكردنو شاهێدی دان بە ناهەق)) هەر ئەمەی دووبارە دەكردەوە هەتا وتمان خوازیارین كڕ بێتەوە.

---

(١) متفق عليه. (الكبائر) كۆی (كبيرە)يە، ئەویش هەر كارێكی خراپە شەرع قەدەغەی كردبێت و هەڕەشەی توندی لەبكەرەكەی كردبێت و كردنی بە گەورە دانا بێت (عقوق) هەر كارێكە، كە دایكو باوك زۆر پێی دڵ گرانو نیگەران بن، بنچینەی (عقوق، ) لە(عق) هاتوە، كە بە مانای پچڕان دێت، (چونكە عاق) پەیوەندی نێوان خۆییو دایكو باوكی دەپچڕێنێت (زور) واتە درۆ ناڕەوا.

● لەریوایەتێکدا هاتووە  کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((گەورەترین گوناه ئەوەیە پیاو لەعنەت بکا لەدایكو باوکی !)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن پیاو لەعنەت لەدایكو باوکی دەکا؟! فەرمووی: ((جوێن بە بابیٚ یەکێك دەدا ئەویش جوێن بەبابی دەداتەوە، جوێن بە دایکی دەدا، ئەویش جوێن بە دایکی دەداتەوە)). متفق علیه.

## ١٠-وازهێنان و سەردانی نەکردنی خزمو کەس:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ النساء: ١

ئەی خەڵکینە لە خەشم و ناڕەزایی ئەو پەروەردگارەتان خۆ بپارێزن کە ئێوەی لە تاکە نەفسێك دروست کردووە، هەر لەو نەفسەش هاوسەرەکەی بەدی هێناو لەو دووانە پیاوان و ژنانی زۆری خستۆتەوە و بڵاوکردەوە، هەروەها لەو خوایە بترسن کە لە یەکتر داوا دەکەن بەناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بکەن)چونکە بەڕاستی خوا (هەمیشە و بەردەوام) چاودێرە بەسەرتانەوە. ﴿(تسأولون به) ئەوەی بە خوا داوا لەیەکتر دەکەن و دەڵێن: توخوا ئەو کارە بکە، بۆ ئەوەی هانی بدا لەسەر کارەکە، (الأرحام) کۆی (رَحِیم)ە کە ئەوانەن بە هۆی نەسەبەوە بووینە خزم.

(رقیبا) واتە چاودێرە بەسەر کردەوەو گوزەرانتان و پاداشتان لەسەر دەداتەوە.

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ ﴿٢٣﴾ محمد: ٢٢ - ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لەغەزا پشت هەڵبکەن یاخود دەسەڵاتتان کەوتەدەست، تۆوی ئاژاوەو فەساد و تاوان لەزەویدا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لەناوی بەرن ؟! (٢٢) ئەو جۆرە کەسانەئەوانەن کەخوا نەفرینی لێ کردوون و کەڕی کردوون کوێرایی هێناوە بەسەر چاویاندا (ڕاستیەکان نابینن) ٢٣﴾

● لە(صحیحین) دا هاتووە، لەفەرمودەی (محمد بن جبیر بن مطعم) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ)).

سفیان وتویەتی ئەم فەرمودەیە لەریوایەتێکی تردا هاتووە بە بێژەی ((ناچێتە بەهەشت ئەوەی صیلەی رەحم بپچڕێنێ)).

● وعن أبی هریرە (رضي الله عنه) قال: أن رجلا قال: یا رسول الله أن لي قرابة أصلهم ویقطعونني، وأحسن إلیهم ویسیئون إلي، وأحلم عنهم ویجهلون علي، فقال: ((لئن کنت کما قلت، فکأنما تسفهم الملّ، لا یزال معك من الله ظهیر علیهم ما دمت علی ذلك)) رواه مسلم.

(ابو هریرە) وتویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من چەند خزمێکم هەیە سەردانیان دەکەم بەڵام ئەوان سەردانم ناکەن، چاکەیان لەگەڵ دەکەم ئەوان خراپەم لەگەڵ دەکەن، قسەی نەرمو نیانیان لەگەڵ دەکەم ئەوان بە نەفامی لەگەڵمدا هەڵسو کەوت دەکەن، فەرمووی: ((ئەگەر ئەوەی دەیڵێی ئەوها بێت ، ئەوا تۆ لمی گەرمیان دەرخوارد دەدەی ، تۆ بەردەوام خوا پشتگیریت دەکات هەتا لەسەر ئەمە بەردەوام بی)).

پێشەوا (نووی) خوا لێی ڕازی بێت: فەرمویەتی: (الملّ) واتە: لمی گەرم یانی تۆ لمی گەرمیان دەرخوارد دەدەی ئەوەش تەشبیهە بەوەی بخۆری لمی گەرم توشی ئێش و ئازار دێ ئەوانیش ئەوەها توشی گوناه دەبن، ئەو کەسە چاکەکارەش هیچی لەسەر نیە ، بەڵام ئەوان گوناهێکی یەکجار زۆریان دەگاتێ بەوەی کەم تەرخەمی دەکەن لەحەقی ئەو کەسەو ئازاری پێدەگەیەنن. والله تعالى أعلم.

## ١١-زینا:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ الإسراء: ٣٢

هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە. ﴾ خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَـٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ الفرقان: ٦٨ - ٧٠

هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە خوایەکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بە حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات، ئەوە توشی سزا و ئازارو ڕیسوایی دەبێت. (٦٨) لە قیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرابەر دەکرێت وبە زەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر. (٦٩) مەگەر ئەو

کەسەی تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت وکار وکردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کار و کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، چونکە هەمیشە و بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (بەرامبەر خەڵکی بە گشتی و ئەو جۆرە کەسانە بە تایبەتی). ﴾ خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢﴾ النور: ٢ سەد قامچی لەهەریەك لە ئافرەت و پیاوی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە ڕۆژی دوایی هێناوە، با دەستەیەکیش لە ئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن. ﴾

زانایان دەفەرموون:ئەوە سزای پیاوی زیناکەرەو ژنی زیناکەرە ئەگەر هاتوو پیاوەکە ژنی نەهێنابوو ژنەکەش مێردی نەکردبوو، بەڵام ئەگەر هاتوو پیاوەکە ژنی هێنابوو ژنەکەش مێردی کردبوو ئەوجا ئەو کارەیان کرد ئەوا بەردباران دەکرێن هەتا مردن، هەروەکو ئەم ڕەجم کردنە لەسوننەتی پێغەمبەری خوا دا (ﷺ) هەیەو جێگیرە، ئەگەریش لەدونیا حەددیان لێ دەرنەکرا و مردن بە بێ تەوبە کردن ئەوا لەناو ئاگر بە قامچی ئاگرین سزا دەدرێن (الكبائر للذهبي).

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: (ئەگەر پیاوێك زینای کرد ئەوا ئیمان لە لەشی دەچێتە دەرو وەك سەیوانێك دێتە سەر سەری ، ئەگەریش وازی هێنا ئیمانەکە بۆی دێتەوە) (حديث صحيح رواه ابو داود).

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەم شەو دوو پیاوم بینی و هاتنە لامو منیان برد بۆ لای زەویەکی پیرۆز)) فەرمودەکەی باس کردو هەتا کە وتی: ((ڕۆیشتین بۆ لای کونێك وەك تەندور وابوو سەرەوەی تەسك بوو، ژێرەکەشی فراوان بوو ئاگری لەبن دابوو، ئەگەر بەرز ببایەوە ئەوانیش بەرزدەبوونەوە هەتا خەریك بوو بێنە دەرەوە،

ئەگەریش هێور ببایەوە دەکەوتنەوە ناوی، چەند پیاوو ئافرەتێکی رووتی تێدا بوو...))
{رواه البخاری}.

## ١٢- نێربازی (اللواط)

خوای گەورە لەکیتابەکەی خۆی لەچەند جێگایەك باسی گەلی لوطي بۆ کردینە لەوانە: ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ هود: ٨٢ - ٨٣جا کاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرە و ژوور کرد و بە قوڕی سوورەوە کراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەرد بارانمان کرد. (٨٢) هەموو ئەو بەردانە دیاری کراو بوون، لە لایەن پەروەردگارتەوە (کە بدات بەسەر تەوقە سەری کێدا) ئەم کارەسات و ئەم بەرد بارانەش وەنەبێت زۆر دوور بێت لە ستەمکارانەوە (لە هەموو سەردەمێکدا، کاتێك ڕۆدەچن لە تاوانکاریدا). ﴾

(من سجیل) بەمانای قوڕێك دێت سور کرابێتەوە وەك جەڕەو کوپە. (منضود) واتە یەك لەدوای یەك.

(مسومة) واتە: نیشانەکراو بە نیشانەیەك، کە پێی دەناسرێتەوە ئەو بەردە هی دونیا نیە.

(عند ربك) واتە لەو خەزێنانەی کە هیچ شتێك بەبێ پرسی نابردرێ. (وما هي من الظالمين ببعيد) واتە: لەستەمکارانی ئەو ئوممەتە دوور نیە ئەگەر وەکو ئەوانیان کرد.

- (جابر) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویی: ((ئەوەی لێی دەترسم ئەوەیە ئوممەتەکەم فێری کاری گەلی لوط بن)) (حسنه الترمذي ورواه ابن ماجه).

● (ابن عباس) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((مەلعونە ئەوکەسەی خۆی باوێتە سەر گیاندارێك ، مەلعونە ئەو کەسەی کاری گەلی لوط دەکات)) (حدیث حسن صحیح، رواه احمد وغیره).

(ابن عباس) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((هەر کەسێکتان بینی کاری گەلی لوط ئەنجام دەدا ئەوا فاعیل و مەفعولەکە بکوژن) (رواه الترمذي، وابن ماجه).

## ١٣-سوو (الربا)

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾ البقرة: ٢٧٥ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوکەوت ناکەن و ڕاست نابنەوە (لە گۆڕدا) مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت (هەر لە دنیادا سروشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە (لە حاڵێکدا): خوا کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردوەو سووی حەرام کردووە، جا ئەوەی ئامۆژگاری پەروەردگاری پێگەیشت و وازی هێنا، ئەوەی دەستی کەوتووە، بۆ خۆی، کاری (لە لێ پرسینەوەشی) دەکەوێتە لای خوا، بەلاّم ئەوەی دەست بکاتەوەبەسوو خۆریی، ئا ئەوانە جێنشینی ناو ئاگری دۆزەخن و ژیانی هەمیشەیی تیادا دەبەنەسەر.﴾

● (قتادە) وتویەتی: بخۆری ڕیبا وەك كەسێكی شێت زیندوو دەكرێتەوە، ئەوەش نیشانەیەكە بۆ بخۆرانی ڕیبا لەو شوێنەدا. (أخرجه الطبري بسند صحيح عن قتادە بنحوە).

● (ابن مسعود ) وتویەتی: (پێغەمبەری خوا لەعنەتی لەبخۆرانی ڕیباو وەكیلەكانی كردووە) (رواه مسلم والترمذي).

(آكل الربا) واتە: ئەوانەی ڕیبا وەردەگرن ئەگەر چی با نەشی خۆن، بۆیەش باسی خواردن كراوە چونكە گەورەترین سودە هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ (موكلە) واتە ئەو كەسەی ڕیبا دەداتە خەڵك ئەگەر چی نەشی خوارد، تایبەت كردنی خواردنیش بۆ ئەوەیە چونكە هەر ئەوە باوە. والله تعالى أعلم.

## ١٤-خواردنی ماڵی هەتیوو ستەم كردن لێیان:

بەڕاستی خوای گەورە خواردنی ماڵی هەتیوی حەرام كردووە و هەڕەشەیەكی توندیشی لەبخۆرانی كردووە، چونكە هەتیو بێجگە لەخوای تاكو تەنیا هیچ سەرپەرشتی كارێكی نیە.

بۆیە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ۝١٠﴾ النساء: ١٠ بەڕاستی ئەوانەی كە ماڵی هەتیووان بە ناحەق و ستەم دەخۆن، بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لە سكیاندا، لە قیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.﴾

(طبري) وتویەتی: ئەم ئایەتە لەسەر پیاوێكی هۆزی (غطفان) هاتۆتە خوار ناوی (مرثد بن زید) بوو، ماڵی برازاكەی پێ سپێردرا، كە هەتیو بوو ئەویش خواردی، خوای

گەورەش ئەم ئایەتەی لەسەر دابەزاند، (مقاتل بن حيان ) وتویەتی: زانایان فەرمویان: ئەو ئایەتە ئەو سەرپەرشتی کارانە دەگرێتەوە ئەوانەی لەماڵی هەتیو دەخۆن، کە ڕەوا نیەو حەرامە بیخۆن.

(ابن زيد) وتویەتی: لەبارەی ئەو کافرانە هاتۆتە خوار کە ئافرەتو بچوکیان بە میرات گر دادەنا.

## ١٥-درۆکردن

بزانە کەوا درۆکردن چەند جۆرێکی هەیە لەهەمویان ترسناکترو توندتر درۆکردنە بەدەم خواو پێغەمبەرەکەی ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ الزمر: ٦٠ جا ڕۆژی قیامەت دەبینیت، ئەوانەی درۆیان بەناوی خواوە دەکرد (شتی ناڕەوایان تێکەڵی دین دەکرد) ڕووخساریان ڕەش و تاریکە، مەگەر شوێن و جێگە بۆ ئەو خۆ بە زل زان و لووت بەرزانە لە ئاگری دۆزەخدا نی یە؟! ﴾

(حسن) فەرمویەتی: ئەوانە ئەو کەسانەن، کە دەڵێن: ئەگەر بمانەوێ ئەنجامی دەدەینو، ئەگەریش بمانەوێ ئەنجامی نادەین.

(ابن الجوزي) لەتەفسیرەکەی خۆی وتویەتی: هەندێك لەزانایان وای بۆچوونە کەوا درۆ کردن بە دەم خواو پێغەمبەرەکەی کوفرەو مرۆڤ دەباتە دەرەوە لەئیسلام، بێگومان درۆکردن بە دەم خواو پێغەمبەرەکەی لەحەلال کردنی حەرامێكو حەرام کردنی حەلالێك کوفرێکی ئاشکراو تەواوە، بەڵام خیلاف لەوەدا هەیە ئەگەر هاتوو لەخوار ئەوە بوو.

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((درۆیەك بە دەم منەوە وەك درۆی یەكێكیان نیە لەسەر كەسێك، ئەوەی بە ئەنقەست درۆ بە دەم منەوە بكات با جێگای خۆی خۆش بكات لەنێو ئاگر)) (متفق علیه).

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((بەراستی راستگۆیی سەردەكێشێ بۆ چاكە، چاكەش سەردەكێشێ بۆ بەهەشت. پیاوێك ئەگەر هەر راست گۆ بوو ئەوا لەلای خوای پەروەردگار ناوی بە راستگۆیی لەقەڵەم دەدرێ، درۆش سەردەكێشێ بۆ خراپە، خراپەش سەردەكێشێ بۆ ناو ئاگر، پیاوێك درۆ دەكات هەتا لەلای خوار گەورە بە درۆزن لەقەڵەم دەدرێ)) (متفق علیه)؟

## ١٦- هەڵاتن لەجەنگ

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ الأنفال: ١٦ هەركەس لەو ڕۆژەدا ڕابكاتە دواوە و پشتیان تێبكات ئەوە بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خوادا گەڕاوەتەوە و سەرئەنجام جێ و ڕێگەی دۆزەخە كە ناخۆشترین جێگە و سەرئەنجامە مەگەر مەبەستی بەكارهێنانی هونەری جەنگ بێت یاخود مەبەستی شوێن گۆڕین و جێ گۆڕین و جێ گۆڕكێ بێت بۆ لای دەستەیەكی تر. ﴾

بزانە كەوا هەڵاتن لەجەنگ بەدەقی قورئانی پیرۆز و ئیجماعی زۆربەی زانایان گوناهێكی گەورەی لەناوبەرە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: ((خۆتان لەحەوت گوناهە لەناوبەرەكان بپارێزن)) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم گوناهانە چنە؟ فەرموی: ((هاوەڵ دانان بۆ خوا، سیحر، كوشتنی یەكێك بە ناحەق، خواردنی ماڵی هەتیو، خواردنی ریبا، هەڵاتن لەجەنگ)). (متفق علیه).

ئەم گوناهە گەورەیەش كەفارەتەكەی تەوبەكردنە.

## ١٧-خیانەت كردنی ئیمام لەگەڵەكەی و ستەم لێكردنیان:

بێ گومان خیانەت كردن و فێڵ كردن بەشێوەیەكی گشتی حەرامە بەڵام خیانەت كردنو ستەم كردنی كاربەدەستان لەگەڵەكەیان گوناهەكەی گەورە ترو توندترە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾ الشورى: ٤٢ بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن كە ستەم لە خەڵكی دەكەن و دەستدرێژی دەكەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە...﴾ هەروا فەرمویەتی ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱنتَصَرُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ ۗ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾ ﴾ الشعراء: ٢٢٧جگە لەوانەیان كە باوەڕیان هێناوە و كردەوە چاكەكانیان ئەنجامداوە و یادی خوایان زۆر كردووە، (بەو توانابییەی كە هەیانە) پشتیوانیان كردووە لەو ئیماندارانەی كە ستەمیان لێكراوە، سەرئەنجام ئەوانەی ستەمیان كردووە دەزانن كە بەچۆن تێكشكاویەك دەگەڕێنەوە بۆ لای خواو چۆن ژێرەو ژوور دەبن و تیادەچن.﴾

● عم معقل بن يسار (رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: (( ما من عبد يسترعيه الله رعيه، يموت يوم يموت و غاش لرعيته إلا حرّم الله عليه الجنه))(١).

((هەر بەندەیەك خوای گەورە كاروباری گەلێكی بخاتە ژێر دەستی، جا كاتێك مردنی دەگاتێ خیانەتی لەگەڵەكەی كردبێ ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەكا)).

---

(١) متفق عليه. (يسترعيه الله) واتە كاروباری گەلێكی پێ بسپێرێ بەوەی جڵەوی حوكمیان بگرێتە دەستو رەچاوی بەرژەوەندیان بكات. (غاش) واتە: خیانەتكار. (لرعيته) واتە گەلەكەی. (يموت يوم يموت) مەبەست لێرەدا ئەو كاتەیە كە دەمرێو گیانی دەكێشرێ چونكە لەو كاتەدا تەوبە قبول نابێ، بەڵام تەوبەكار ئەو هەڕەشەیەی لەسەر جێ بەجێ نابێ (إلا حرم الله عليه الجنه) واتە ئەگەر ئەم خیانەتە بە حەلال بزانێ یان لەگەڵ پێشینە یەكەمەكان ناچێتە بەهەشت، ئەو ئاگاداریە لەخیانەت كردنی گەل ئەوەش دەگرێتەوە ئەگەر ئیمام هەڵنەستا بە تۆڵە سەندنەوە لەستەمكاران و بەربەرچ دانەوەی دوژمن و پاراستنی شەریعەت و بەرپەرچ دانەوەی بیدعەچیەكان ئەوا ئەو كات هەر ئەم هەڕەشەیە دەیگرێتەوە چونكە ئەمانە دەچێتە ناو گوناهە گەورەكان، كە لەبەهەشت دووردەخاتەوە (يوم يموت) سودێكی تری هەیە ، ئەویش تۆبە كردن پێش ئەمە سودی هەیە. والله اعلم.

## ١٨-خۆ بەزل زانینو کەیف بە خۆهاتن:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْتَكْبِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾ النحل: ٢٣

هەروا فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾﴾ لقمان: ١٨ هەورەها ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵكی و (لووت بەرز مەبە و بەچاوی سووك سەیریان مەكە)، بەسەر زەویدا بەناز و فیزەوە مەڕۆ، بەڕاستی خوا ئەو كەسانەی خۆش ناوێت كە خۆهەڵكێش و فەخر فرۆش و فیزاوین. ﴾

هەروا فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾﴾ الإسراء ٣٧ هەروەها بەسەر زەویدا بەكەش و فش و لە خۆبایی بوونەوە مەڕۆ، چونكە تۆ هەرگیز ناتوانیت زەوی كوناودەر بكەیت، ناشگەیتە بەرزی چیاكان (ئیتر ئەم كەشخەو شانازیەت لەچی یە؟ ﴾

● عن أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) قال الله عز وجل: ((العز إزاري، والكبرياء ردائي فمن ينازعني عذبته)) رواه مسلم.

((سەروەری و گەورەیی پۆشاكی منن ئەوەی بیەوێ بۆ خۆی ببات سزای دەدەم)).

پێشەوا (المناوی) لە(فیض القدیر) دا وتویەتی: قال الله تعالى: الكبرياء ردائي والعظمة إزاري : واتە ئەمە سیفەتێكی تایبەت بە خۆمە، جگە لەخۆم بۆ كەسی تر شیاو نیە، جا ئەو كەسەی بۆ خۆی ببا ئەوا دژایەتی سیفەتێكی منی كردووە، جا ئەگەر خۆ بەزل زانین لەسەر بەندەكانی ڕەوا نەبێ تەنها خۆی نەبێ ئەو كات خۆ بە زل زانین لەسەر بەندەكانی زولمێكە لەو، ئەمە غەزالی باسی لێوە كردووە (الكلاباذي) وتویەتی: (الرداء ) گوزارشتە لەجوانیو قەشەنگی، بەڵام (الازار) گوزارشتە لەداپۆشین، واتە وەكو

ئەوەیە فەرموبێتی: گەورەیی هەر شایەنە بە من و هەر لەخۆم دێ. (فمن نازعنی واحدا منهما) واتە ئەوەی بۆ خۆیان رابکێشێ (قذفتە) واتە: فرێی دەدەم، لەریوایەتێکی تریش هاتووە، دەیهاوێمە ناو ئاگر، چونکە ئەم دوو سیفاتە هەر شایەنە بە خودای گەورە کە هیچ شتێك بەوناچێ.

هەر ئەم فەرمودەیە ئاگاداریەك و هەرەشەیەکی توندمان لێ دەکات لەخۆ بەزل زانین، کە یەکێك لەبەڵاو نەهامەتیەکانی بێ بەش بوونە لەهەق‌و کوێر بوونی دڵە لە تێگەیشتن لەئایەتەکانی خواو مایەی تورەبوون‌و مەقتە لەلایەن خواوە. والله تعالى أعلم.

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((نا چێتە بەهەشت ئەوەی بای تۆزقالێك خۆ بە زل زانینی لەناو دڵی دا هەبێت )) پیاوێك وتی: ئەگەر پیاوێك بیەوێ پۆشاك و نەعلەکانی جوان بێت ، فەرمووی: ((خوا جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت، خۆ بەزل زانین واتە رەت کردنەوەی هەق و بەکەم زانینی خەڵك)) رواه مسلم.

## ١٩- شایەتی دان بە درۆ

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ ﴾ الحج: ٣٠

(جەج ئەوەبوو کە باسکرا) جا ئەوەی کە سنوورەکانی خوا بپارێزێت و بەگەورە دایانبنێت و رێزی لێ بگرێت، بێگومان ئەوە چاکترە لای پەروەردگاری (بێ پاداشت نیە)... گۆشتی مەڕو بزن و گاو و وشتر بۆتان حەڵاڵە جگە لەوانەی کە بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە و قەدەغەکراوە (کە لە سوورەتی ڕلمائدە دا باسکرا)، جا لەبەرئەوە

خۆتان لە پەرستنی بتە ناپوخت و بێ نرخەکان بپارێزن، هەروەها لەگوفتاری درۆو قسەی هەڵبەستراو خۆتان دووربگرن. ﴾ هەروا فەرمویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغْوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ الفرقان: ٧٢ (بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەشن کە شایەتی ناحەق نادەن، هەرگیز لە شوێنێکدا ئامادە نابن کە شایەتی ناحەقی تێدا ئەنجام دەدرێت و یان درۆی تێدا دەکرێت، کاتێکیش بە لای گەمە و گاڵە و چەپۆکانی نەفاماندا تێدەپەڕن، بە هێمنی و لەسەرخۆیی و سەربەرزیەوە تێدەپەڕن. ﴾

● پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((پێتان بڵێم گوناهە گەورەکان چنە؟ سێ جاران – وتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ، فەرموی ((هاوەڵ دانان بۆ خوا، خراپە کردن لەگەڵ دایك و باوك)) پێغەمبەر (ﷺ) پاڵی دابۆوە بەڵام دانیشت فەرمووی: ((درۆکردن و شاهێدی دان بە ناهەق)) هەر ئەمەی دووبارە دەکردەوە خوازیار بووین کرپێتەوە. (متفق علیه).

## ٢٠-خواردنەوەی ئارەق و حەشیشە:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ المائدة: ٩٠ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج حەرام و حەڵاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەرپیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن (لە هەردوو جیهاندا). ﴾

(الخمر) لەزمانی عەرەبیدا بەو خواردنەویە دەوترێ کە لەترێ دروست دەکرێت و سەرخۆشت دەکات، بۆیە ئەوها ناونراوە چونکە عەقل ناهێڵێ‌و تێکی دەدات، حەقیقەتی (خمر) ئەوەیە لەترێ دروست بکرێ نەك لەشتی تر.

بەڵام (خمر) لەشەرعدا بە هەر شتێك دەوترێ سەرخۆشت بکا جا چ کەم بێ یان زۆر، لەترێ دروست کرا یان خورما یان گەنم یان جۆ یان لەشتی تر. ئەمەش بەبەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە فەرمویەتی: ((کل مسکر خمر، وکل خمر حرام)) رواه مسلم. ((هەموو سەرخۆش کەرێك ئارەقە ، هەموو ئارەقێکیش حەرامە)).

● ئەسمای کچی یەزید گوێی لەپێغەمبەری خوا بووە، کەفەرمویەتی: ((ئەوەی ئارەق بخواتەوە خوا چل رۆژان لێی رازی نابێت ئەگەر مرد ئەوا بە کافری دەمرێت، ئەگەریش تەوبەی کرد خودا تەوبەکەی لێ وەردەگرێت، ئەگەریش گەڕاوە، حەقە لەسەر خوا قوڕی خەبالی دەرخوارد بدا)) وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) قوڕی خەبال چییە؟ فەرمووی: ((کێم و خیزاوی ئەهلی ئاگرە)).

(صحیح لغیره دون قوله (فان مات مات کافرا) وهذا اسناد ضعیف لضعف شهر بن حوشب وابن خیثم، وهو عبدالله بن عثمان، مختلف فیه، رواه احمد والطبراني في الکبیر).

پێشەوا (الذهبي) لەکتێبی (الکبائر) دا وتویەتی: ئەو حەشیشەیەی لەپەلکی داری (القنَّب) دروست دەکرێ ئەوا وەکو ئارەق حەرامەو دەبێ بخۆرەکەی حەددی لێ دەربکرێ وەکو ئارەق خۆر، چونکە ئەمە لەئارەق پیسترەو عەقڵو میزاج بە یەکجاری تێك دەدات هەتا پیاو وا لێدەکات ببێتە گەوادو خاوەن قۆچ، ئارەقیش لەرویەکی تر پیس ترە بەوەی دەبێتە هۆی شەڕو دووبەرەکی و هەردووکیشیان رێگرن لەزیکری خواو نوێژکردن.

## ٢١-قومارو مەیسیر

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ المائدة: ٩٠ - ٩١ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە دڵنیابن كە عەرەق و قومارو گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی كە خەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج حەرام و حەلاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەرپیسن و لەكاروكردەوەی شەیتانن، كەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن (لە هەردوو جیهاندا). (٩٠) بەڕاستی شەیتان هەر دەیەوێت لە ڕێگەی عەرەق و قومارەوە دوژمنایەتی و بوغزو كینە بخاتە نێوانتانەوە و لەیادكردنی خوا و ناوە پیرۆزەكانی وێڵتان بكات، هەروەها سست و تەمەڵتان بكات لە ئەنجامدانی نوێژەكان بە شێنەیی، ئایا ئیتر بەس نیە؟ ئایا كۆڵ نادەن؟! (جا هەر كە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، جاڕ درا بە ناو شاری مەدینەدا كە عەرەق حەرام كراوە، ئەوسا ئیمانداران قەڕابە و گۆزە و دیزە و هەرچی عەرەقی تیادا بوو ڕشتیانە كۆلان).

(المیسر): قومارکردنی عەرەبەكانە بە زار یان هەر قومارێكی تر . ﴾

ماناكەی: لەرووی شەرعەوە ئەوەندە جیاوازیەی نیە لەرووی زمانەوە.

(ابن حجر المكی) وتویەتی: (المیسر) قومارکردنە جا هەر جۆرێكی بێت، (المحلی)ش وتویەتی: وێنەی قوماری حەرام ئەوەیە، كە لەگومان دابێت لەوەی قازانج دەكا یان زەرەر.

(مالك) وتويەتی: (الميسر) دوو جۆری هەیە، مەیسری رابواردن، لەگەڵ مەیسری قومار، نمونە لەجۆری مەیسری رابواردن وەك زارو شەترەنج و هەموو مەلاهیەكان، مەیسری قوماریش وەكو ئەوەی مرۆڤ خۆی باوێتە مەترسی. ئەم رایە هی (ابن تیمیە)شە. زانایان بە یەكدەنگی هەموو جۆرە مەیسرێكیان حەرام كردووە هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾ المائدة: ٩٠

قومارچیش ئەوەی بە دەستی دەكەوێ ماڵێكی پیسەو دەكەوێتە بازنەی حەرام، پێویستە مرۆڤ خۆی ماڵی پیس رزگار بكا بەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەكەی یان بەسەر هەژاران دابەشی بكات.

## یاری كردن بە وەرەقە

لەوڵاتانی شام یاری كردن بە ورەقە بە (الشدّە) بەناوبانگە زانایان ئەمەشیان حەرام كردووە، هۆیەكەشی ئەوەیە چونكە سەردەكێشێ بۆ مەیسری حەرام و هەروا كاتی مرۆڤ بە فیڕۆ دەدا بەوەی لەتاعەتی خوا سەرفی نەكا، هەروەها گەورەترین هۆكاریشە بۆ ئەوەی مرۆڤ سەرقاڵ بكا لەمەڕ یادی خواو نوێژ، تەمەنی مرۆڤیش مرۆڤ لێی بەرپرسیارە...ئەگەر چی با هەر ئەوها بیكاتو لەنوێژكردن سەرقاڵی نەكا.

لەفەتوایەكانی لێژنەی زانایانی (بلد الحرام) دا لەلا(١٢٥١) پرسیار كراوە ئایا یاری كردن بە وەرەقە ئەگەر هاتوو لەنوێژت نەكاو لەسەر پارە نەبێ ئایە حەرامە یان نا؟

لەوەڵامدا وتویانە یاری كردن بە وەرەقە دروست نیە با لەسەر پارەش نەبێ چونكە بە زۆری هۆكارە بۆ سەرقاڵ بوون لەمەڕ نوێژو یادی خوا، ئەگەر چی با گومانیشی وابێ، كە ئەمە رێگر نیە لەمەڕ نوێژكردن و یادی خوا، پاشان هۆكاریشە بۆ مەیسری

حەرام   خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾المائدة: ٩٠

## ٢٢- بوختان کردن لە ئافرەتی داوێن پاك

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٢٣﴾ النور: ٢٣ ئەوانەی کە خاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچبەران لە پێناوی خوا نەدەن (لەبەر ئەوەی بەشداربوون لە وتنی بوختانەکەدا)، دەبا لێبووردەبن، دەبا چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.﴾

هەروا فەرمویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤﴾ النور: ٤ ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخیەکاندان.﴾

پێشەوا (الذهبي) لەبارەی مانای (قذف) وتویەتی: خوای گەورە لەم ئایەتەدا رونی کردۆتەوە ئەوەی ئافرەتێکی داوێن پاکی تۆمەتبار کرد بە زیناکردن ئەوا لەدونیاو ئاخیرەت لەعنەتی لێ کراوەو سزایەکی بە ئێشیشی بۆ هەیە و دەبێ هەشتا قامچیشی

لێ بدرێو به شاهێدیش قەبول ناکرێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆمەتبارکردنی ئافرەتێکی داوێن پاکی به زینا کردن بەیەکێك لەهەره گوناهه گەورەکان داناوه.

(قذف)یش ئەوەی بڵێی: هەی زیناکەر یان قەحپه یان بڵێیه مێردی هەی مێرد قەحپه یان بڵێیته کوڕەکەی هەی بیژی یان کوڕی قەحپەی یان بڵێیته کچەکەی هەی کچی قەحپه یان بڵێیت: هەی بیژی ، چونکه وشەی قەحپه بۆ زینا به کاردەهێنرێ.

## ٢٣-دزین و خیانەت کردن لەغەنیمە(الغلول)

(الغلول) واته: دزینی غەنیمەت، یان دزینی (بیت المال)ی موسڵمانان یان دزینی پارەی زەکات ..خوای گەوره فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾﴾الأنفال: ٥٨

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ ۚ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦١﴾ آل عمران: ١٦١ (هەندێك گومانیان برد که پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) له دابەشکردنی دەسکەوتدا نادادیی دەکات) بێگومان بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووه که نادادی و خیانەت بکات، هەر کەس ناحەقی و نادادی بکات له ڕۆژی قیامەتدا نادادیەکەی (یەخەی پێ دەگرێت و) بەکۆڵیەوەیەتی، لەوەودوا پاداشتی هەر کەسێك بەگوێرەی کردەوەکانی دەدرێتەوه و ئەوانه ستەمیان لێناکرێت.﴾

● عن أبی هریره (رضي الله عنه) قال: قام النبی (ﷺ) فذکر الغلول فعظمه وعظم أمره، وقال: ((لا ألفينَّ أحدكم يوم القيامة على رقبته شاة لها ثغاء، على رقبته فرس له حمحمة، يقول: يا رسول اللع اغثني، فأقول: لا أملك لك شيئا قد أبلغتُكَ، وعلى رقبته بعيْر له رُغاء يقول: يا رسول الله أغثني، فأقول: لا املك لك شيئا، قد أبلغتك، وعلى

رقبته صامت، يقول: يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئا، قد أبلغتك، أو على رقبته رقاع تخفق، فيقول: يا رسول الله أغثني، فأقول: لا أملك لك شيئا، قد أبلغتك.(متفق عليه)[1].

(أبو هريرە) – خوا لێی ڕازی بێت – وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لەناومان هەڵساو باسی لە(غلول) کرد، کە زۆر بە توندو سەختی باسی لێوە کردو کارەکەی بە گەورە دانا، فەرمووی: ((لەڕۆژی قیامەتدا یەکێك بەرخەکی لەگەردەنی دایە و دەباڕێ، ئەسپێکی لەگەردەنی دایە دەحیلێنی، دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فریام کەوە، پێی دەڵێم: ناتوانم هیچت بۆ بکەم، پێشتر پێم ڕاگەیاندبووی، لەگەردەنیدا وشترێك هەیە دەنگی لێوە دێت، دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فریام کەوە، پێی دەڵێم: ناتوانم هیچت بۆ بکەم، پێشتر پێم ڕاگەیاندبووی، لەگەردەنیدا زێڕو زیو هەیە، دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فریام کەوە، پێی دەڵێم: ناتوانم هیچت بۆ بکەم، پێشتر پێم ڕاگەیاندبووی، یان لەگەردەنیدا چەند وەرەقەیەك هەیە دەجولێتەوە، دەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فریام کەوە، پێی دەڵێم: ناتوانم هیچت بۆ بکەم، پێشتر پێم ڕاگەیاندبووی)).

(عمر)ی کوڕی (خطاب) خوا لێی ڕازی بێت، وتویەتی: لەڕۆژی خەیبەر چەند کەسێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هاتن وتیان: فلانە کەس شەهیدە، فلانە کەس شەهیدە، هەتا کە باسی پیاوێکیان کرد وتیان: فلانیش شەهیدە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

---

(١) (فذكر الغلول) باسی لەحوکمی (الغلول) کرد. (عظم أمره) واتە: هەڕەشەی توندی لەبکەرەکەی کرد. (لا ألفين) واتە: بەدی ناکەم یان نابینمەوە. (ثغاء) دەنگی مەڕە. (حمحمة) دەنگی ئەسپە ئەگەر عەلەف بوێ، (لا أملك لك شيئا) واتە ناتوانم داوای لێخۆشبونت بۆ بکەم و تکات بۆ بکەم چونکەئەمانە لەدەست خودای گەورەیە (رغاء) دەنگی وشترە (صامت) زێڕو زیو یان هاوشێوەیان (رقاع) پەڕ، وەرەقە. (تخفق) دەجولێ.

((نەخێر وانیە من بینیم لەناو ئاگر بە هۆی ئەوەی جوبەیەك یان عەبایەكی دزی بوو لەغەنیمەت)) (متفق علیه).

## ٢٤-دزی كردن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالًا مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ المائدة: ٣٨دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی كاری ناڕەواياندا ئەمەش تۆڵەیەكە لە لایەن خواوە، خوا بالآدەست و دانایە (لە بڕیاردانی ئەو سزایەدا، ئەڵبەتە ئەم سزایە لە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا جێبەجێ دەكرێت، كە: هەموو كەسێك ژیانی مسۆگەرە و هەمووان دەستی یارمەتی بۆ یەكتر درێژ دەكەن، هەروەها لە سالآنی گرانیدا دەست نابڕدرێت). ﴾

زانایان فەرمویانە:دەستی دزی كەر لەمەچەكەوە دەبردرێ، ئەگەر جاری دووەمیش دزی كردەوە ئەوا پێی چەپی دەبڕدرێ، ئەگەر بۆ جاری سێیەم دزی كردەوە ئەوا دەستی چەپی دەبڕدرێ، ئەگەر بۆ جاری چوارەم دزی كردەوە ئەوا پێی راستی دەبڕدرێ، ئەگەر جارێكی تریش دزی كردەوە ئەوا تەمێ دەكرێ، هەندێكیش وتویانە دەكوژرێ.

* دروس نیە كەس لێی خۆش بێ چ لەلایەن ئەو كەسەی دزی لێ كراوە یان لەلایەن حاكم، هەروا دروستیش نیە سزایەكی سوكتری بۆ دابنرێ، یان سزایەكەی دوابخرێ یان بەتاڵ بكرێتەوە.

پێویستە دەستی دزی كەر پاش بڕین      نەوەك بمرێ.

(ابو هريره) خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) دزی کەرێکیان هێنایە لای، کە پارچە قوماشێکی دزی بوو، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمە دزی کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (وانازانم دزی کردبێ)) دزی کەرەکە وتی ((ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵکو دزیم کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: برۆن دەستی ببڕن پاشان خوێنەکەی بوەستێنن، پاشان دەستیان بڕیو هێنایانە لای پێغەمبەر (ﷺ) ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((تۆبە بکەو بگەڕێوە لای خوا)) وتی: ئەوە تۆبەم کردو گەڕامەوە لای خوا، فەرمووی: ((خوا تەوبەکەی وەرگرت)) (رواه الدارقطني والحاكم وهو حديث حسن).

## ٢٥-رێگری

رێگری لەگوناهە گەورەکانەو بەیەکدەنگی زانایان حەددی لەسەرە، قورئانی پیرۆز بە دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەی لەقەڵەمی داون و بە گەندەڵ کردن لەسەر زەوی دایناون و سزایەکەشیانی زۆر توند کردووە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾ المائدة: ٣٣بێگومان پاداشتی ئەوانەی کە دەنجێگن و دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەسادو بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە: (ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە) دەبێت بکوژرێن، (ئەوانەش کەخەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە) دەبێت لە خاچ بدرێن، (ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن) دەست و قاچێکیان بەپێچەوانەوە ببڕدرێت، (ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت) ئەوە دوور بخرێنەوە لە

ولاَت، ئەوسزایە خەجالەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لەدنیادا، لەقیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆهەیە. ﴾

پێغەمبەری خواش (ﷺ) رەتی کردۆتەوە ئەوانە موسوڵمان بن هەروەکو دەفەرموێ: ((ئەوەی چەك لەدژی ئێمە هەڵبگرێ لەئێمە نیە)) (متفق علیە).

پێغەمبەر (ﷺ) لەو فەرمودەیەدا روونی دەکاتەوە، کە ئەوانە لەسەر رێگای ئێمە نیە، چونکە حەقی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان ئەوەیە سەری بێخیو بەرگری لێبکات، نەوەك بە هەڵ گرتنی چەك لەدژی بیترسێنو بیەوێ بیکوژێ. ئەمەش ئەو کاتە ئەوهایە ئەگەر ئەمە بە حەلال نەزانێ، بەلاّم ئەگەر بە حەلالی زانی ئەوا کافر دەبێت بە هۆی حەلال کردنی نەوەك بەهۆی خودی چەك هەڵگرتنەکە.

زۆربەی سەلەف پێیان باش بووە ئەو فەرمودەیەی لەبارەیان هاتووە تەئویل نەکرێ بۆ ئەوەی ئەو کارە قێزەوەنە زیاتر ریسوا بکات. (سفیان) کوڕی (عیینە) قەدەغەی ئەو کەسانەی دەکرد کە ئەو فەرمودەیان تەئویل دەکرد و دەیوت: ماناکەی ئەوەیە لەسەر رێگای ئێمە نینەو، وای دەبینی باشترە وەکو خۆی دەست کاری نەکرێو و تەئویل نەکرێ.

ئەو هەڕەشەیە ئەو کەسانە ناگرێتەوە کە لەسەر هەقن و شەڕ لەگەڵ رێگرەکان دەکەن، یەڵکو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە رێگرن و یەکەم جار ئەوانە ستەمیان کردیەو شەڕیان دەست پێکردووە. (تحفة الاحوذي).

زۆربەی زانایان ڕایان وایە دەبێ رێگر حەددی لێ دەربکرێ فەرمودەی (عرنیین)یش بەڵگەیە لەسەر ئەم رایە، کە کۆمەڵێك لەهۆزی (عکل) هاتنە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتیان: چەند نێردراوێکمان بۆ رەوانە بکە، فەرمووی: ((جارێ ئێوە برۆنە لای وشترەکانی پێغەمبەر)) ئەوانیش هاتن شیرو میزی وشترەکانیان خواردەوە هەتا

تەندروستیان بەرەو باشی چوو قەڵەویش بوون، دواتر هەڵسان بە کوشتنی شوانەکەو وشترەکانیشیان برد، هەواڵەکە درا بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، ئەویش چەند کەسانێکی بە شوێندا ناردن، هێشتا رۆژ مابوو هەتا دۆزیانەوەو هێنایانن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا چەند بزمارێك سور بکرێتەوەو چاویان پێ داخ بکرێ، هەروەها دەستو پێیەکانیشی برین، بێ ئەوەی خوێنیان لێ رابگرێ، پاشان فڕێیان دانە بیابان هەتا لەتینواتیان مردن.

(أبو قلابه) وتویەتی: ئەوانە دزیان کردو کوشتاریان کردو دژایەتی پێغەمبەرەکەشیان کرد.

## ٢٦-سوێند بە درۆ خواردن بە ئەنقەست (اليمين الغموس)

(اليمين الغموس) ئەو سوێندەیە، کە بەدرۆ دەخورێ، بۆیەش ناوی لێنراوە (غموس) چونکە کەسی سوێند خۆر لەگوناه دەباتە خوارێ‌و غەرقی گوناهی دەکات. ئەم گوناهەش لەگوناهە گەورەکانە پەنا بە خوا.

یان لەبارەیەوە وتراوە: ئەو سوێندە درۆیینەیە، کە سوێند خۆر مالی یەکێکی تر بۆ خۆی دادەبڕێ، بۆیەش ناونراوە (غموس) چونکە خاوەنەکەی لەگوناهو ئاگر دەباتە خوارێ، صیغەی (فعول)یش بۆ زۆرییە.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٧﴾ آل عمران: بەڕاستی ئەوانەی کە پەیمانی خواو سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن (لە پلەو پایەی دنیایی، پارەوپول و سامان،

ئەڵبەتە هەرچەندە بێت هەرکەمە) ئەوانە لە دوارۆژدا هیچ بەشێکیان نابێت (لە سۆزو میهرەبانی خوا)، هەروەها لە ڕۆژی قیامەتدا خوا نایاندوێنێت و تەماشایان ناکات (لە چڵك و پیسی گوناهـ) خاوێنیان ناکات و سزای پڕ ئێش و ئازاریش بۆیان ئامادەیە.﴾

● (عبدالله بن عمرو) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((گوناهە گەورەکان: هاوەڵ دانان بۆ خوا و خراپە کردن لەگەڵ دایكو باوك و کوشتنی یەکێك و سوێند بە درۆ خواردنە))

## ٢٧-دەست درێژی کردنو ستەم

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِي رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ إبراهيم: ٤٢ - ٤٥ (ئەی پێغەمبەر ێلی الله علیه وسلم) واگومان مەبە کە خوا بێ ئاگایە لەو کاروکردەوەیەی ستەمکاران دەیکەن، بەڕاستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانیان تیایدا ئەبڵەق دەبن (جاری وایش هەیە هەر لە دنیادا ستەمکاران ڕیسوا دەکات و تۆڵەیان لێدەسێنێت). (٤٢) (ئەی پێغەمبەر ێلی الله علیه وسلم) واگومان مەبە کە خوا بێ ئاگایە لەو کاروکردەوەیەی ستەمکاران دەیکەن، بەڕاستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژبە پەلە و شپرزەییەوە دێن، سەریان بەرز کردۆتەوە و لە ترس و

سامناکی ئەو ڕۆژەدا چاویان ناتروکێت، دڵە ڕاوکێیانەو دڵ و دەروونیان بەتاڵە و هیچ حاڵی نین. (٤٣) ئەی محمد ﷺ خەڵك بترسێنە و بێداریان بکەرەوە لەو ڕۆژەی کە سزاو ئازار یەخەیان پێ دەگرێت، جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن: پەروەردگارا بۆ ماوەیەکی کەم و نزیك مۆڵەتمان بدا (بمانگێڕەوە بۆ دنیا) تا بە دەم بانگەوازەکەتەوە بچین و شوێنی پێغەمبەران بکەین، (بەڵام تازە کار لەکار ترازاوەو گەڕانەوە ئەستەمە، بۆیە پێیان دەوترێت) مەگەر کاتی خۆی سوێندتان نەدەخوارد کە دنیا بەردەوامەو ئێوە تیاچوونتان نابێت؟!. (٤٤) ئێوە کاتی خۆیشی نیشتەجێ بوون لە ماڵ و حاڵ و شوێنی ئەوانەدا کە ستەمیان لە خۆیان کردو (ڕێگەی ئیمان و خواناسیان نەگرت) بۆتان دەرکەوت کە چیمان پێکردن و چیمان بەسەر هێنان و نموونە و باسی زۆرمان بۆ هێناونەتەوە (دەربارەی سەرئەنجامیان). ﴾

هەروا فەرمویەتی:﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ یونس: ٤٥ ڕۆژێك دێت خوا هەر هەمووانیان کۆدەکاتەوە، وا هەست دەکەن تەنها سەعاتێك لە ڕۆژیان پێچووە (خزمان و ناسیاوان) هەمووان یەکتر دەناسنەوە، بێگومان ئەوانەی کە بڕوایان نەبوو بە ئامادە بوونی بەردەم دادگای خوا، خەسارەت مەندی و زەرەرمەندیەکی زۆر ڕویان تێدەکات، بەڕاستی ئەوانە هیدایەت وەرگر نەبوون. ﴾

● وعن أبي هريره (رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ)فيما يروي عن الله تبارك وتعالى أنه قال: ((يا عبادي إني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرما فلا تظالموا...))[١] رواه مسلم.

((بەندەكانم من ستەمم حەرام كردووە لەسەر خۆمو لەسەر ئێوەشم حەرام كردووە جا ستەم لەيەكتر مەكەن...)

●وعن جابر (رضي الله عنه) أن رسول الله (ﷺ) قال: ((اتقوا الظلم، فإن الظلم ظلمات يوم القيامة))[٢]. (رواه مسلم)

((خۆتان دووربگرنو بپارێزن لەستەم، چونكە ستەم كردن دەبێتە تاريكايى لەرۆژى قيامەتدا)).

---

(١) پێشەوا (المناوي) لە (الفيض القدير) دا وتويەتى: ((إني حرمت الظلم) واتە:ياساغم كردووەو رێم لىٚ گرتووە. (الظلم على نفسي) واتە بەرزترو گەورەترم لەوەى ئەوە بكەم چونكە چ دەست درێژى و چ ستەمٚ هەلكوتانە سەر حەق و مالى خەلكە ئەمەشم لەحەقى خۆم حەرام كردووە، ئەمەشى كەلەپێشدا باسى كردووە وەكو رىٚ خۆشكردنێك بۆ ئەوەى (وجعلته بينكم محرما) واتە بڕيارم داوە لەسەر ياساغ كردنى لەنێوانتاندا. (فلا تظالموا) بنچينەى ئەم وشەيە (تتظالموا)وە واتە با كەس ستەم لەكەس نەكات، خوداش هەر تۆلە لەستەم كار دەسەنێتەوە بۆ ستەم لێكراو. والله تعالى أعلم.

(٢) (فان الظلم ظلمات) قاضي وتويەتى : وتراوە وەك خۆى ماناى بۆ لێك دەدرێتەوە بەوەى ئەو ستەمە دەبێتە تاريكايى بۆ خاوەنەكەيىو لەرۆژى قيامەتدا ناتوانێت بە هيچ رێگايەك دابڕوا، كاتێك كە رووناكى موسلْمانان بەر دەستو پێيان رووناك دەكاتەوە. دەشكرىٚ ماناى بۆ لێك بدرێتەوە بە زەحمەتيەكانى رۆژى قيامەت يان بۆى هەيە بە سزاو ناخۆشيش لێك بدرێتەوە. والله تعالى أعلم.

## ٢٨- خواردنی ماڵی حەرام

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ البقرة: ١٨٨ نەكەن ماڵ و دارایی یەكتر لە نێوانتاندا بە ناحەق بخۆن (وەك بەرتیل و سوو، یان داگیركردن و فرووفێڵ...) نەكەن هەندێكی بدەن بەكاربەدەستان بۆ ئەوەی هەندێك ماڵی خەڵكی بخۆن لە ڕێگەی ناحەق و گوناهەوە، لە كاتێكدا خۆشتان دەزانن كە ئەو كارە ڕەوا نیە. ﴾

واتە: مالی یەكتر بە ناحەق مەخۆن. (ابن عباس) فەرمویەتی: واتە خواردنی ماڵی خەڵكی بەهۆی سوێند خواردنی بە درۆ، كە بە هۆی ئەم سوێند خواردنە درۆیینە مالی براكەی خۆت بە ناهەق دەبات ، خواردنی ماڵی خەڵكیش بە ناهەق دوو جۆری هەیە:

یەكەم: خواردنی ماڵی خەڵك بە هۆی ستەم كردن لێیان وەك داگیركردنو خیانەت و دزی كردن.

دووەم: خواردنی ماڵی خەڵك بە هۆی یاری كردن، وەك یاری كردن بە قومارو هاوشێوەی. (الكبائر للذهبي).

● (كعب)ی كوڕی (عجرة) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەی (كعب)ی كوڕی (عجرة) گۆشتو خوێنت لەحەرام پێك هاتبێ ناچێتە بەهەشتو هەر ئاگر شایەنیەتی، ئەی (كعب)ی كوڕی (عجرة) خەڵك بەیانیان بە دوو جۆر دەردەچن یەكێكیان دەردەچێ بۆ ئەوەی نەفسی خۆی ڕزگار بكا، یەكێكیشیان دەردەچێ بۆ ئەوەی بیهاوێتە ناو تاوانو گوناهو بیفەوتێنێ)) (رواه ابن حبان وهو حديث صحيح).

● پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەو لاشەیەی بە حەرام پێگەیشتووە ناچێتە بەهەشت)) (رواه ابو يعلى والبزار والطبراني في الأوسط والبيهقي وهو حديث صحيح لغيره).

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەیماڵێك لەحەرام پەیدا بكاو دوایی بەخشیە نزیكەكانی یان كردیە خێر یان لەپێناوی خوا سەرفی كرد، ئەوا هەمووی پێكەوە كۆدەكرێتەوە و فرێدەدرێتە ناو دۆزەخ) (رواه ابو داود فى المراسيل وهو حديث حسن لغيره).

● خەولەی ئەنصاری وتویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) فەرمویەتی: ((هەندێك پیاو بەبێ حەق ماڵی خوا سەرف دەكەن، ئەوانە لەرۆژی قیامەتدا ئاگریان بۆ هەیە)) (رواه البخاری).

## ٢٩- قازی و دادوەری خراپ

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ المائدة: ٤٤ بەڕاستی ئێمە كاتێك تەوراتمان ناردە خوارەوە ڕێنموویی تیادا بوو (بۆ هەموو خێرو چاكەیەك)، نوور و ڕووناكیش بوو (لەناو تاریكایی یەكاندا)، ئەو پێغەمبەرانەی كە هەمیشە ملكەچ و فەرمانبەردار بوون حوكمی ئەوانەیان پێدەكرد كە ببونە جولەكە، هەروەها زانا پەروەردگار ناسەكانیان و زانا شەرع ناسەكانیشیان، حوكمیان دەكرد بەوەی داوایان

لێکرابوو بیپارێزن، کە ئەویش کتێبی خوا (تەوراتە)، هەروەها شایەتیش بوون لەسەری (کەواتە ئەی زانایانی جولەکە، ئەی ئیمانداران) لە خەڵکی مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن، ئایەت و فەرمانەکانی من بەنرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر نرخەکە هەموو دنیاش بێت هەر کەمە) جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا دایبەزاندووە، ئائەوانە بێ باوەڕن.﴾

هەروا فەرمویەتی: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ المائدة: لە تەوراتدا پێویستمان کردووە لەسەریان کە بەڕاستی هەر کەسێك کەسێك بکوژێت دەبێت بکوژرێتەوە و چاوی یەکێك کوێر بکات، دەبێت چاوی کوێر بکرێتەوە و لووتی یەکێك عەیبدار بکات دەبێت لووتی عەیبدار بکرێتەوە و گوێی یەکێك ببڕێت دەبێت گوێی ببڕدرێتەوە و ددانی یەکێك بشکێنێت دەبێت ددانی بشکێنرێتەوەو برین و زامەکانیش هەروەها تۆڵەیان بەگوێرەی خۆی بۆ دەسەنرێتەوە، جائەوەی لە تاوانبار خۆش ببێت، ئەو چاوپۆشی و لێخۆشبوونە دەبێتە کەفارەتی گوناهانی، بێگومان ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندوە، ئائەوانە هەر ستەمکارن.﴾

هەروا فەرمویەتی:﴿ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ المائدة: ٤٧ دەبا شوێنکەوتووانی ئینجیل بەو ڕێنموویی و ئامۆژگاریانە هەڵسوکەوت بکەن کە خوا لە ئینجیلدا دایبەزاندوە (گرنگترینیان

شوێنکەوتنی ئاینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامە) ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا دایبەزاندوە، جا ئا ئەوانە ناپاك و تاوانبارو لە سنوور دەرچوون. ﴾

● پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((داوەرکان سیانن یەکێکیان لەبەهەشتەو دووانەکەی تریان لەئاگرن، ئەوەی لەبەهەشتە پیاوێکە هەق‌و راستی ئەزانێ‌و لەنێوان خەڵکی قەزاوەتی پێدەکات، پیاوێکیش هەق‌و راستی ئەزانێ بەڵام فرۆفێڵ‌و ستەم لەدەرکردنی فەرمانەکە دەکات ئەوە لەئاگرە، پیاوێکیش بە نەفامی قەزاوەت لەنێوان خەڵکیدا دەکات ئەوەش لەئاگرە)).

(رواه ابو ادود والترمذي و ابن ماجه وهو حديث صحيح لغيره).

● (ابو هريرة) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((ئەوەی داوای قەزاوەتی کرد لەنێوان موسڵمانان هەتا پێی گەیشت و دواتر ستەمەکەی زاڵ بووە سەر دادگەریەکەی ئەوا ئاگر شایەنیەتی)) (رواه ابو داود).

● (عبدالله) ی کوڕی (مسعود) لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) دەگێڕیتەوە، کە فەرموویەتی: ((لەرۆژی قیامەتدا قازی دەهێنن هەتا لەسەر لێواری دۆزەخی دادەنێن، ئەگەر بکەوێتە ناو دۆزەخ ئەوا حەفتا پاییزی پێدەچێ)) (رواه ابن ماجه والبزار واللفظ له).

## ٣٠-رەشوە

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٨﴾ البقرة: ١٨٨نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر لە نێوانتاندا بە ناحەق بخۆن (وەك بەرتیل و سوو، یان داگیرکردن و فرۆفێڵ...) نەکەن هەندێکی بدەن بەکاربەدەستان بۆ ئەوەی هەندێك ماڵی خەڵکی

بخۆن لە ڕێگەی ناحەق و گوناهەوە، لە کاتێکدا خۆشتان دەزانن کە ئەو کارە ڕەوا نیە﴾

واتە: ماڵەکانی خۆتان مەدەنە کاربەدەستەکان بۆ ئەوەی ماڵی خەڵکی تر، کە هی خۆتان نیە بۆ ئێوەی حەلال بکەن لەکاتێکدا دەزانن، کە ئەمە حەرامە.

ڕەشوەش بە دەقی قورئانی پیرۆز حەرامە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ﴿٤٢﴾ المائدة: ٤٢ ئەو (جولەکانە) زۆر بە دڵ گەرمی گوێ بۆ درۆ دەگرن و کەسایەتیان ناپوختەو زۆر حەرام خۆر و سوو خۆرن،﴾ ئەوانەش ئەو جولەکانە بوون، کە ڕەشوەی حەرامیان دەخوارد.

بە فەرمودەی پێغەمبەریش (ﷺ) حەرامە هەروەکو دەفەرموێ: ((خوای گەورە نەفرەتی لەڕەشوەدەرو ڕەشوە خۆر کردووە)) (رواه ابو داود والترمذي وقال حديث حسن صحيح وابن ماجه).

## ٣١-خۆ بەیەکتر چواندن چ نێر بۆ مێ چ مێ بۆ نێر:

برای موسڵمانم بزانە کەوا هەر کاتێك پۆشاکێك تایبەت بوو بە یەکێك لەو دوو ڕەگەزە ئەوا ڕەگەزەکەی تر دروست نیە لەبەری بکات، ئەگەر پۆشاك تەسك بێت دیسان دروست نیە نە بۆ پیاوان نە بۆ ئافرەتان لەبەری بکەن چونکە ئەمە فیتنە دروست دەکات و دەبێتە مایەی سەرەنج دان.

ئەو پۆشاکە تەسکانە حەرامە لەسەر ئافرەتان لەبەری بکەن بە تایبەت ئەگەر لەماڵەوە دەرچوون و کەوتنە بەرچاوی پیاوان، چونکە ئەمە فیتنە دێنێتە کایەوە.

هەروا نابێ پیاوانیش لەبەری بکەن ئەگەر هاتوو ئەندامەکانی بەدرخست، جا لەسەر ئەمە نابێ بفرۆشرێو بدورێو هەروا نابێ هاوردیش بکرێ.

بەڵام ئەگەر ئافرەت لەماڵی خۆی بۆ پیاوی خۆی لەبەری کرد ئەوا دروستە، بەڵکو ئەمە کارێکی باشەو بۆ ئەوەی خۆیی و مێردەکەی بپارێزێ.

بەڵام ئەگەر لەناو کوچەو کۆڵانەکان ئەم پۆشاکانەی لەبەر کرد ئەوا یەکێکە لەو گوناهە گەورانەی، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی لێکردووە.

● (ابن عبّاس) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی لەو پیاوانە کردووە، کە خۆیان بە ئافرەتان دەچوێنن و هەروا نەفرەتی لەو ئافرەتانەش کردووە کە خۆیان بە پیاوان دەچوێنن)) (رواه البخاري).

● (أبوه هريره) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی لەو پیاوە کردووە پۆشاکی ئافرەت لەبەر بکات و نەفرەتیشی لەو ئافرەتە کردووە پۆشاکی پیاوان لەبەر بکات)) (رواه أبو داود باسناد صحيح).

## ٣٢- گەوادو بێ ئابڕو

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ النور: پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات، (هاوسەرێتی پیاوان و ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا)، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرامکراوە.﴾

(الديوث) واتە پیاو رازی بێت خانەوادەکەی زینا بکەنو دەنگیان لەگەڵدا نەکات یان پێی خۆش بێت.

پێشەوا (الذهبي) لەکتێبی (الکبائر)دا وتویەتی: ئەوەی هەست بکا خێزانەکەی زینا دەکات بەڵام فەرامۆشی دەکات لەبەر خۆشەویستی بۆی یان قەرزاریەتی و ناتوانێ قەرزەکەی بداتەوە، یان مارەییەکەی ناتوانێ بیدات، یان منداڵی بچوکی لێ هەنە ترسی هەیە کێشەکەیان بچێتە لای قازی و هەریەکە بەشی خۆی بوێ، هەر کەسێ غیرەتی نەبێ هیچ خێری پێوە نیە، داوا لەخوای گەورە دەکەین لەهەموو بەڵاو میحنەتێك بە دوورمان بگرێ، چونکە هەر ئەو تواناداره بەسەر هەموو کارێکدا.

دەڵێم: سەبارەت بە گەوادیش: ئەوە ئەو کەسەیە ببێتە دەڵاڵی داوێن پیسەکان جگە لەمەحرەمەکانی لەبڕی پارەیەك – خوا بمان پارێزێ – جا حالی گەوادو (دیوث) یەك شتە.

● (ابن عمر) خوا لەخۆیو باوکی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((سێ کەس ناچنە بەهەشت ئەو کەسەی خراپە لەگەڵ دایكو باوکی دەکات، بێ ئابڕو، ئەو ئافرەتەی کە خۆی بە پیاوان دەچوێنێ)) (رواه النسائي والبزار وهو حديث صحيح).

## ٣٣-مارە بەجاش (المحلل والمحلل له)

ژن هێنان لەجۆری (تحليل) ژن هێنانەکی کاتیە، وێنەکەشی ئەوەیە پیاوێك ئافرەتێکی تەڵاقدراو بێنێ بۆ ئەوەی بدرێتە مێردی یەکەمی نەوەك بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بژی هەروەکو ئامانج لەژن هێنان لەگەڵ یەکبوونەو پێکەوە ژیانە، زۆربەی زانایان ئەم جۆرە ژن هێنانەیان بە حەرام زانیوە.

● (ابن مسعود) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەفرەتی لە(المحلل)[1] و(المحلل لە)[2] کردووە)) (رواه احمد والنسائي، والترمذي وقال هذا حديث حسن صحيح).

● (عمر) خوای لێی رازی بێت وتویەتی: ((ئەگەر (محلل) و (محلل لە) بێننە لام ئەوا هەردوکیان رەجم دەکەم)) کوڕەکەی پرسیاری لێکرد لەبارەی ئەمە ئەویش فەرمووی: ((چونکە هەردووکیان زینا کەرن)) (رواه ابن المنذر وابن أبي شيبة وعبدالرزاق وهذا اسناد رجاله ثقات إلا إنّ الأعمش لم يبين سماعه).

ئەو فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی، کە (زواج التحليل) گرێ بەستێکی بەتاڵو پوچەو یەکێکە لەگوناهە گەورەکان، کە بکەرەکەی نەفرەتی لێکراوە، جا یەکسانە ئەگەر مارە بەجاشەکە باس کرابێ لەکاتی مارەکردنەکەیان باس نەکرابێ.

(ابن القيم) لە(زاد المعاد) دا وتویەتی: هیچ جیاوازی نیە لەنێوان ئەهلی مەدینەو ئەهلی حەدیس و فەقیهەکانیان ئەگەر ئەمە بە گوفتار بە مەرج دانرا یان بە رێککەوتن و مەبەست، چونکە ویستو مەبەست لەگرێ بەستەکاندا لەلای ئەوان موعتەبەرەو کردەوەکانیش بە نیەتن، ئەو مەرجەی هەردوو کەسی گرێ بەست لەسەری رێکەوتوونە وەك گوفتار وایە لەلای ئەوان، بەڵام بێژەکان خۆ مەبەست لە خودی خۆیان نیە بەڵکو بۆ ئەو مانایەیە، کە دەلالەتی لەسەر دەدەن، جا ئەگەر ماناو مەبەستەکان بە دەرکەوتن ئەوا بێژەکان هیچ حیسابیان بۆ ناکرێ چونکە تەنها هۆکارێکن ئێستاش ئامانجەکانی هاتۆتە دی بۆیە حوکمەکان لەسەری جێ بەجێ دەبێ.

(١) (المحلل) : ئەو کەسەیە ژنە تەڵاقدراوەکە مارە دەکا.

(٢) والمحلل لە) : ئەو کەسەیە کە دەیەوێ ژنە تەڵاقدراوەکەی خۆی بە مارە بە جاش بێنێتەوە.

*(عقبە)ی كوڕی (عامر) خوا لێی ڕازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ((پێتان بڵێم (التيس المستعار)[1] چیە؟ وتیان بەڵێ، فەرمووی: ((ئەو كەسە (مُحلِّل)[2]، خوا نەفرەتی لە(مُحلِّل)و (مُحلل لە) كردووە). (رواه ابن ماجه وحسَّنه الالباني).

## ٣٤-خۆ نەپاراستن لەمیز

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤﴾المدثر: ٤

بزانە خۆپاراستن لەمیزو پۆخلی پێویستە، چونكە ئەمە لابردنی پیسایەكە كە بەری ئەندامێك لەئەندامەكانی لەش كەوتووە، لابردنی پیسایش لەسەر پۆشاكو شوێن و جەستە پێویستە، لەلای زۆربەی زانایانیش خۆ پاكژكردنەوە پێش دەست نوێژ پێویستە.

جا ئەو كەسەی لەبیری كرد خۆی پاك بكاتەوە لەكاتی چوونە سەر ئاو پێش ئەوەی دەست نوێژ هەڵبگرێ ئەوە با لەدەستی چەپیدا پارچە پەڕۆیەك لول بداو خۆی پێ پاك بكاتەوە ، ئەوەش لەلای ئەو كەسانەی كەوا دەبینن، كە دەست لێدانی هەردوو عەورەت دەست نوێژ دەشكێنێ، ئەنجامدانی خۆ پاك كردنەوەكەش بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

١-پێویستە موسوڵمان زەكەری خۆی بە تاڵ بكات لەمیز بە ڕێگایەكی تایبەت، لەبەر فەرمودەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە فەرمویەتی: ((خۆتان لەمیز بپارێزن، چونكە زۆربەی سزای قەبر لەسەر ئەمەیە) (أخرجه الدارقطني وصحح ارساله).

---

(١) التيس المستعار: واتە تەگەی خوازراو . وەرگێڕ.

(٢) (المُحلل) واتە: تەگەی خوازراو. وەرگێڕ.

هەروا لەبەر ئەم فەرمودەیەش ((ئەگەر یەكێكتان میزی كرد ئەوا با زەكەری خۆی سێ جاران راتەكێنێ)). (رواه أحمد وفيه ضعف).

واباشە راتەكاندنی زەكەر بەرەو سەرەوە بێ بۆ ئەوەی پرۆشكە میز بەری نەكەوێ.

راتەكاندنو گوشینو پال كەوتن لەسەر پێی چەپو رۆیشتنو راوەستان ئەوانە هەمووی یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی زەكەر هیچ میزی تێدا نەمێنێ.

٢- پێویستە بەدەستی چەپ خۆی پاك بكاتەوە، نەوەك بە دەستی راست مەگەر بۆ حالەتی پێویست نەبێ، چونكە دەستی راست تایبەت كراوە بۆ كردنی هەموو ئیشێكی پاك، وەك خواردن و خواردنەوە و نوسین و شتی هاوشێوەیان.

٣-ئەگەر لەسەر ئاوهەڵسا با شەرواڵەكەی تەڕ بكا نەوەك هەست بەوەی بكا هەندێك لەپرۆشكە میزی بەركەوتووە چونكە وەسوەسە موسوڵمان تووشی شۆكو نیگەرانی دەكا، پێغەمبەریش (ﷺ) قەدەغەی كردووە ڕوبچین لەوەسوەسەو فەرمانیشی كردووە بە هۆی یەقین گومان و وەسوەسە بڕەوێنێتەوە. وەسوەسەش كەمایەتیە لە عەقلو كەم و كوڕیە لەدین.

● (ابن عبّاس) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلای دوو قەبردا تێپەڕی و فەرمووی: ((ئەمانە وائێستا سزا دەدرێن، لەسەر شتەكی ئەوەندە گەورە سزا نادرێن، سەبارەت بە یەكێكیان لەنێوان خەڵكی قسەی دەهێناو دەبرد سەبارەت بەوەی تریشیان خۆی لەمیزی خۆی نەدەپاراست) وتی: داوای پەلكە دارخورمایەكی كردو كردیە دوو كەرت، پاشان یەكێكیانی لەسەر قەبرێك چاندو ئەوی تریشیانی لەسەر قەبرێك، پاشان فەرمووی: ((هەتا وشك نەبن ئەوا سزایان لەسەر كەم دەكەنەوە)) متفق عليه.

## ٣٥-شاردنەوەی عیلم

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡتُمُونَ مَآ أَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلۡهُدَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِي ٱلۡكِتَٰبِ أُوْلَٰٓئِكَ يَلۡعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلۡعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ البقرة: ١٥٩ بەڕاستی ئەوانەی کە بەرنامە و ڕێنموویيەکانی ئاشکرای ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێدەکات و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێدەکەن... ﴾

پێشەوا (قرطبي) لەبارەی ئەم ئایەتەوە وتویەتی:خوای گەورە هەواڵیداوە ئەو کەسەی هەر شتێك لەوەی خوا ناردویەتیە خوار بیشارێتەوە ئەوا مەلعونە. خیلافیش هەیە لەوەی ئەوانە کێنە. هەندێك دەڵێن مەبەست پێیان زانایانی جولەکەو فەلەنە ئەوانەی پێغەمبەرایەتی (محمد) یان شاردەوە جولەکەش فەرمانی ڕەجمیان شاردەوە.

هەندێکیش دەڵێن: مەبەستی پێی شاردنەوەی هەر حەقێکە، جا کەوا بێ ئەمە گشتیە بۆ هەر کەسێك بیەوێ عیلمی دینی خوا بشارێتەوە، کە پێویستی بە بڵاوکردنەوە هەیە، والله تعالى أعلم.

● (أبوهريرە) خوا لێی ڕازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی پرسیاری عیلمێکی لێکرا و شاردیەوە ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا بەلغاوی ئاگرین لغاو دەکرێ)) (رواه ابو داود والترمذي وحسنه وهو صحيح).

● لەریوایەتی (ابن ماجە)شدا هاتووە ، کە (هەر کەسێك عیلمێکی دەزانیو شاردیەوە ئەوا لەڕۆژی قیامەتدا، کە دێت بە لغاوی ئاگرین لغاو کراوە)) (حديث صحيح لغيرە).

● (أبو هريره) خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی عیلمێك فێر بێ بۆ ئەوەی شتێك لەدونیای بەچنگ بکەوێ ئەوا لەرۆژی قیامەتدا بۆنی بەهەشت ناکات)) (رواه ابو داود وابن ماجه وهو حديث صحيح لغيره).

● (کعب)ی کوڕی (مالك) وتویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) فەرمووی: ((ئەوەی عیلم فێر بێ بۆ ئەوەی موناقەشەی پێ بکات لەگەڵ زانایان یان دەمە قاڵێ پێ بکات لەگەڵ نەفامەکان و بیەوێ خەڵك بۆ خۆی رابکێشێ ئەوا خوای گەورە دەیباتە ناو ئاگر)) (رواه الترمذي وقال، حديث غريب، وهو حديث صحيح لغيره).

## ٣٦-خیانەت کردن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾﴾يوسف: ٥٢

واتە: خوای گەورە ئەو کەسە موفق ناکات ئەگەر خیانەت لەئەمانەتەکەی بکات، واتە: لەکۆتایی دا بێ بەش دەبێت لەهیدایەت. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَخُونُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓا۟ أَمَـٰنَـٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ الأنفال: ٢٧﴾ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: خیانەت مەکەن لە خواو لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) (بەوەی کەم تەرخەمیتان لە فەرمانبەرداریاندا)، هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەت و سپاردەکانتان کە پێتان دەسپێردرێت، لەکاتێکدا کە ئێوە دەزانن (ئەو کارەتان خیانەتە). ﴾

(ابن كثير) وتویەتی: خیانەت گوناهە بچوکەکان وگوناهە گەورەکان دەگرێتەوە، (ابن عبّاس) لەبارەی ئایەتی ﴿وتخونوا أماناتكم﴾ وتویەتی: ئەمانەت ئەو کردەوانەن،

کە خوای گەورە راسپاردەی بەندەکانی کردووە بیپارێزن، واتە فەرزەکان، وتویەتی: (لا تخونوا) واتە: هەڵیمەوەشێننەوە، لەریوایەتێکی تریش وتویەتی: (لا تخونوا الله والرسول) واتە بە وزاهێنان لەسوننتەکەیو سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی.

(سدّی) وتویەتی: ئەگەر خیانەتیان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی ئەوا خیانەتەکیان لەئەمانەتەکەیان کردووە، هەروا وتویەتی: ئەوانە قسەیان لەپێغەمبەر (ﷺ) گوێ لێ دەبوو پاشان بڵاویان دەکردەوە هەتا دەگەیشتە موشریکەکان.

(ابن زید) یش وتویەتی: قەدەغەی کردونە لەوەی خیانەت بکەن لەخواو پێغەمبەرەکەی وەك ئەوەی مونافیقەکان ئەنجامیاندا.

پێشەوا (طبري) وتویەتی: خوای گەورە دەفەرموێتە ئەو باوەڕدارانەی بڕوایان بە خواو پێغەمبەر هێناوە لەهاوەڵەکانی پێغەمبەر: ئەی ئەو کەسانەی خواو پێغەمبەرتان بەراست زانی خیانەت لەخواو پێغەبەرەکەی مەکەن، خیانەتەکەشیان لەخواو پێغەمبەرەکەی بەم جۆرەی بوو، کە هەندێکیان لەلای پێغەمبەرو هاوەڵان خۆی بە باوەڕدار نیشان دەدا،بەڵام لەناخەوە کوفرو خیانەت و فێڵی شاردبۆوە، موشریکەکانیان ئاگادار دەکرد لەو هەواڵانەی کە لەلایەن شاراوە بوو عەیبو کەمو کوڕیان بڵاو دەکردەوە.

● (أبو هریرە) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((نیشانەی مونافیق سیانن: ئەگەر قسەی کرد درۆی بکا، ئەگەر بەڵێنی دا نەیهێنایە جێ، ئەگەر راسپاردەیەکیشی پێ سپێردرا خیانەتی لێکرد)) (متفق علیه).

● (عبدالله)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عاص) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((چوار شت ئەگەر هەر یەکێك لەئێوە لێی بێتە دی دەبێتە مونافیقەکی تەواو، ئەگەر یەکێکیش یەك خەصڵەتی لێ هاتە دی ئەوا خەصلەتەکی مونافیقی لێ هاتۆتە دی هەتا وازی لێ نەهێنێ: ئەگەر راسپاردەیەکی پێ سپێردرا خیانەتی لێ بکا،

ئەگەر قسەی کرد درۆی بکا، ئەگەر پەیمانی دا هەڵیبوەشێنێتەوە، ئەگەریش دوژمنداری کرد لەسنوور دەربچێ)) (متفق علیه).

## ٣٧-منەت کردن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٦٤ البقرة: ٢٦٤ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن خێرو پاداشتی چاکەکانتان پووچ بکەنەوە بە منەت نان و دڵ ئازاردانی (هەژاران)، وەکو ئەو کەسەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر چاوی خەڵکی ببەخشێت بۆ ڕیاکاریی و خۆنواندن و ئیمان و باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی نەبێت، جا نموونەی ئەو جۆرە کەسانە وەك بەردێکی ساف وایە کە خۆڵێکی بە سەرەوە بێت، لەوەودوا بارانێکی لێزمە ببارێت بەسەریداو هیچی بەسەرەوە نەهێڵێت و بەرەق و تەقی بەجێی بهێڵێت و حەقیقەتی دەربکەوێت، (ئینجا ئەو جۆرە ڕیابازو بێ باوەڕ منەتنەرانە) هیچ جۆرە بەهرەیەك لەو بەخشینەیان بەدەست ناهێنن، بێگومان خوای گەورە ڕێنموویی قەومی بێ باوەڕو کافران ناکات. ﴾

خوای گەورە ئەو کەسەی منەت دەکا لەخێرەکەی بەوەی دەیبەخشێ بۆمەرایی‌و ریابازی نەوەك بۆ خوا ئەوا بەو کافرەی شوبهاندووە کە خێر دەکا بۆ ئەوەی پێی بڵێن فلانە کەس سەخیەو دەست بڵاوە.

خوای گەورە نمونەی ئەو کەسەی منەت دەکات لەو خێرەی بەو بەردەی چواندووە، کە خۆڵی کەوتۆتە سەر، جا بینەر وادەزانێ ئەو زەویە زەویەکی بەپیت‌و بەرەکەتە، بەڵام ئەگەر بارانی لێ دا ئەوا خۆڵەکە لادەچێ و تەنها بەردە رەقەکە دەمینێتەوە، جا

حالی ریابازان و منەت کارانیش هەر وایە، چونکە ریابازی منەت لەرۆژی قیامەتدا وا دەکەن نیەتەکەیان بەدیار بکەوێ وەك ئەو بارانەی بەردەکەی بەدیار خست.

بۆیە خوای گەورە خێرکەرەکانی هانداوەو کە لەخێرکردنەکەیان منەت نەکەنو نەبنە مایەی نارەحەتی و فەرمویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ البقرة: ٢٦٢ئەوانەی ماڵ و داراییان دەبەخشن لە رێگەی خوادا، بەدوای ئەوەی بەخشیوویانە هیچ جۆرە منەتێك نانێن و هیچ جۆرە ئازارێك ناگەیەنن، (ئەوانە) تەنها پاداشتیان لای پەروەردگاریانە، هیچ ترس و بیمیان لەسەرنیە (لە کەم و کووڕیی پاداشت و تەنگانەی قیامەت)، غەم و پەژارەش ڕوویان تێ ناکات. ﴾جیاوازیش لەنێوان زانایان نیە، کە منەت کردن لەخێرکردن پاداشت ناهێڵێو بێ بەشی دەکات.

(قرطبي) وتویەتی: خوای گەورە گوزارشتی لەبارەی ئەوانەوە کردووە بەوەی لێیان قەبول ناکاو بێ بەش دەبن لەپاداشت.

(الشربيني) وتویەتی: منەت کردن لەخێرکردن دا حەرامەو پاداشت ناهێڵێ ئەمەش بە دەقی ئایەتو بە دەقی ئەو فەرمودەیەش کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((سێ کەس لەرۆژی قیامەت خودا قسەیان لەگەڵ دا ناکاتو تەماشایان ناکات و پاکیان ناکاتەوە لەگوناهو سزایەکی بەئێشیان بۆ هەیە )) پێغەمبەر (ﷺ) سێ جاران ئەمەی خوێندەوە. (أبو ذر) وتی: بێ بەشو خەسارەت مەند بن ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرموی: ((ئەو کەسەی پۆشاکی درێژ لەبەر دەکات، منەت کار، ئەوەی بە سوێندی درۆ برەوو رەواج بە کەلو پەلەکەی دەدات)) (رواه مسلم).

(البهوتي) وتویەتی: ئەمە یەکێکە لەگوناهە گەورەکان و بێ بەش دەبێ لەئەجرو پاداشت. والله تعالى أعلم.

## ٣٨-سیخوری کردن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا۟ ﴿١٢﴾﴾الحجرات: ١٢

(ابن الجوزی) وتویەتی: (أبو زید) و (حسن) و(ضحاك) و(ابن سیرین) بە پێتی (حاء ) یان خوێندوتەوە، (أبو عبیده)ش وتویەتی: (تجسس) و(تحسس) بەیەك مانا دێن ئەویش گەڕانە لەدواو جاسوسیش یەکێکە لەو مانایە. (یحیی ابن کثیر)یش وتویەتی (تجسس) گەڕانە لەدوای عەورەتی خەڵك بەڵام (تحسس) گوێ گرتنە لەوتەی خەڵك.

موفەسیرەکانیش وتویانە (تجسس) گەڕانە لەدوای کەمو کوڕی موسڵمانان، ماناکەشی ئەوەیە با کەستان لەدوای کەمو کوڕی براکەی نەگەڕێ پاش ئەوەی خوای گەورە داپۆشتوە.

بە(ابن مسعود) وترا: ئەوە (ولید)ی کوڕی (عقبە)یە وا ئارەق لەریشیدا دەتکێتەوە، وتی: ئێمە (تجسس)مان لێ حەرام کراوە ئەگەر شتێکمان بینیو بەدی کرد ئەوا وەری دەگرین.

هەندێکیش دەڵێن: (تحسس) گشتی ترە چونکە دەکەوێتە ناو چاو تێ برین، لەکتێبی (عون المعبود) دا لەشەرحی نەوەوی (ولا تجسسوا) وتراوە، کە شت داوامەکەنو لەدوای مەگەڕێن بەهۆی هەستەکان وەك چاو تێ برین.

● (ابن عبّاس) خوای لێی رازی بێت لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) گێڕاویتەوە کە فەرمویەتی: ((ئەوەی گوێ را بگرێت لەقسەی خەڵکێك کە پێیان ناخۆش بێ گوێیان لێ رابگرێ ئەوا رەصاصی تواوەی لەگوێ دەکرێ لەرۆژی قیامەتدا)) (رواه البخاری وغیره).

جا گویٚ گرتن بۆ قسەی خەڵك قەدەغە كراوە –مەگەر لەچەند حاڵەتێكدا نەبێت – سنورشكێنیش پێویستە تەمبیٚ بكریٚ، گویٚ گرتنیش بێجگە لەو چەند حالەتەی رێگەی پێدراوە ئەوا خاوەنەكەی شایەنی تەمبیٚ كردنە. والله تعالى أعلم.

## ٣٩- نەمیمی كردن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾ القلم: ١٠ - ١١

نەمیمەت: هەوڵ دانە بۆ ئەوەی خەڵك بكەونە ناو فیتنە، لەفەرمودەیەكی (صحیح)شدا هاتووە، كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئایا دەزانن (العَضَهُ) چییە؟ گواستنەوەی قسەیە لەهەندێك خەڵكەوە بۆ خەڵكانی تر بەمەبەستی تێكدانی نێوانیان)) (رواه البیهقی).

(أبو حامد الغزالی) وتویەتی: بە زۆری نەمیمەت بەكاردیٚ لەگواستنەوەی قسەی خەڵك بەوەی بڵیٚ: فلانە كەس لەبارەی تۆوە ئاوا دەڵیٚ، هەر تایبەتیش نیە بەمە، بەڵكو پێناسەكەی هەموو شتێك دەگرێتەوە كە كەشف بكریٚو پێی ناخۆش بیٚ كەشف بكریٚ ، جا كەشف كردنەكەش بە وتە بێت یان بە نوسین یان بە نیشانە یان ئاماژەكردن یان هیتر یەكسانیشە چ وتە بوو یان كردار یان كەمو كورییەك بوو یان هیتر، جا حەقیقەتی نەمیمەت بڵاوكردنەوەی نهێنیە و لادانی ئەو پەردەیەیە كەوا نیگەرانی دێنێتە كایەوە بە كەشف كردنی.

پێویستە لەسەر مرۆڤ كڕ بیٚ لەهەموو ئەو شتانەی دەیانبینیٚ لەكاروباری خەڵكدا مەگەر چەند حاڵەتێك نەبیٚ، كە گێڕانەوەی سوود ببەخشیٚ بە موسڵمانان یان بەڵایەك بگێڕێتەوە.

نەمیمەتیش حەرامەو یەکێکە لەگوناهە گەورەکان، چونکە دەبێتەهۆی لادانی پەردەو ، خۆشەویستی هەڵدەگرێو دوژمنایەتی برەو پێدەدا و کۆمەڵ لێك هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەمانەش هەمووی بەیەکدەنگی حەرامن، چونکە هۆکارێکە بۆ تێکدانی نێوان خەڵك ، خوداش قەت لەگەڵ تێکدان نیەو تێکدانی خۆش ناوێت. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((پێتان بڵێم شتێك، کە باشتر بێت لەپلەی رۆژوو نوێژ، وتیان: بەڵێ، فەرمووی: ((چاك کردنی نێوان خەڵکی، چونکە تێکدانی نێوان خەڵکی تراشێنە)) (رواه ابو داود والترمذي وهو حديث صحيح).

لەریواتێکی تریش پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((ئەوە تراشێنە، ناڵێم موو دەتراشێ، بەڵکو دین دەتراشێ)).

● (حذيفة) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((نەممام ناچێتە بەهەشت)) (رواه البخاري ومسلم)).

## ٤٠-لەعنەت کردن لەخەڵك

(اللعن) لەزمانی عەرەبیدا مانای دەرکردنو دوورکەوتنەوە لەکاری باش دەگەیەنێ، هەروەها بە مانای خوێنیش دێت وتراوە: لَعَنَهُ لعنا ولاعَنَهُ ملاعنةً ولعاناً وتلاعنوا، ئەگەر هەندێکیان لەعنەتیان لەهەندێك کرد.

لەشەرعیشدا بە مانای دوور خستنەوە دێت لەرەحمەتی خوا.

● (سلمه بن الاكوع) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: ئێمە ئەگەر پیاوێکمان بینیبایە لەعنەتی لەبراکەی بکردبایە ئەوا وامان دەزانی گوناهێکی گەورەی ئەنجامداوە. (رواه الطبراني باسناد جيد).

(أبو زيد بن ثابت الانصاري) کە یەکێکە لەوانەی پەیمانی ریزوان بەشداری کردووە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((ئەوەی جگە لەمیللەتی ئیسلام بە درۆ

سوێند بخوات ئەوه چۆنی وتووه هەر وایە، ئەوەی خۆشی كوشت بە شتێك ئەوه هەر بەو شتە لەرۆژی قیامەتدا سزا دەدرێ، ئەو كەسەش نەزری لەسەر نیە لەو شتەی خاوەنی نیە، لەعنەت كردنی بڕواداریش وەك كوشتنیەتی)) (رواه البخاري ومسلم))[1].

دروستە خاوەن گوناهەكان لەعنەتیان لێ بكرێ بێ ئەوەی كەس دەست نیشان بكرێ.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾﴾هود: ١٨

هەروا فەرمویەتی:﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾الأعراف: ٤٤

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمویەتی: ((لەعنەتی خوا لەو كەسەی پرچی دەست كرد لەسەری دەنێو ئەوەش بۆی دەكا))

هەروا فەرمویەتی: ((لەعنەتی خوا لەبخۆری (ربا)

هەروەها فەرمویەتی: ((لەعنەتی خوا لەوێنە كێشەكان)).

(١) (من حلف بملة) (الملة): بە مانای دین و شەریعەت دێت، كە لەم بێژەیە نەكیرەیە لەسیاقی شەرتدا، بۆیە هەموو میللەتێك دەگرێتەوە، وەك جولەكەو فەلەو دەهریەكان و جگە لەوانەش (كاذبا) بەدرۆ سوێند بخوات. (فهو كما قال) (ابن حجر) لە(فتح الباري) وتویەتی: ئەم وتەیە زیاتر بۆ هەرەشە كرجنە لەوەعید نەوەك لەحوكم، وەكو ئەوەیە وتبێتی ئەو كەسە شایەنی ئەو سزایەیە كە ئەوانە بیروڕایان وابووە، هاوشێوەشی وەك (ئەوەی نوێژ نەكا كافرە) واتە سزایەكەی وەكو سزای ئەو كەسەی كوفری كرد بێت. (لعن المؤمن كقتله) واتە لەگوناهدا جا لەعنەت كردنی وەك ئەوەیە كوشتبێتی. (الطيبي) وتویەتی: لەتەحریم كردن وسزادان دا، والله تعالى أعلم.

## ٤١- غەدر کردن و بەجێ نەهێنانی پەیمان

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ ﴿١﴾﴾المائدة: ١

هەروا فەرمویەتی: ﴿وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٤﴾﴾ الإسراء: ٣٤

(الغدر) لەزامنی عەرەبیدا: هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەو هەڵنەستانە بە جێ بەجێ کردنی، وغدر بە غدراً من باب ضرب.

مانای لەزاراوەداو مانای لەزماندا هیچ جیاوازیەکیان نیە.

● (عبدالله) کوڕی (عمرو)ی کوڕی (عاص) خوا لەخۆیو باوکی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((چوار شت ئەگەر لەهەر کەسێکدا بێتەدی دەبێتە مونافیقەکی تەواو، ئەوەی سیفەتێکیشی لیێ بێتەدی ئەوا سیفەتێکی لەنیفاق لیێ هاتۆتە دی هەتا وازی لیێ نەهێنیێ: ئەگەر ئەمانەتێکی پیێ سپێردار خیانەتی لیێ بکات، ئەگەر قسەی کرد درۆ بکا، ئەگەر پەیمانی دا نەیهێنێتە دی، ئەگەر کەوتە موناقەشەوە لەحەق لابداو سنور ببەزێنیێ)) ((رواه البخاري ومسلم)).

زانایانیش غەدریان بە حەرام زانیوە چونکە نیشانەیەکە لەنیشانەکانی نیفاقو هەروا یەکێکە لەگوناهە گەورەکان، بەتایبەت، کە ئەگەر کەسی غەدر کار لەکاربەدەستەکان بێت، چونکە زەرەری غەدری ئەو کاربەدەستە خەڵکێکی زۆری پێی گرفتار دەبیێ، وتراوێشە کار بەدەست پێویستی بە غەدرکردن نیە چونکە دەتوانیێ بە جێی بهێنیێ. زانایان بۆ حەرام کردنی غەدر هەر پشتیان بەم فەرمودەیەی ( عبدالله)ی کوڕی (عمرو)و چەند بەڵگەیەکی تر بەستووە.

● (ابن مسعود)و (ابن عمر)و ( أنس) خوا لێیان رازی بێت وتویانە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ( هەر غەدر کارێك لەرۆژی قیامەتدا ئاڵایەکی هەیە دەوترێ: ئەمە غەدری فلانە کەسە)) (متفق علیه)).

## ٤٢- بە راست زانینی فالْ چیو ئەستێرە ناس

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُمْ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٢٢٢﴾ يُلْقُونَ ٱلسَّمْعَ وَأَكْثَرُهُمْ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ ﴾ الشعراء: ٢٢١ – ئایا پێتان بڵێم کە شەیتانەکان دادەبەزنە سەر کێ؟ (٢٢١) دادەبەزنە سەر هەموو کەسێکی بوختانچی و تاوانبار و گوناهکار.(٢٢٢) شەیتانەکان گوێ هەڵدەخەن بۆ هەواڵی ئاسمان و زۆربەشیان درۆزنن.

(الکهانة) لەزمانی عەرەبیدا لە کهن یکهن کهانة هاتووە: ئەگەر فالْ چی هەواڵی غەیبی پێدا. (کاهن) فاڵچی ئەو کەسەیە کە هەواڵی دوارۆژ وەردەگرێ لەکائیناتو بانگەشەی زانینی نهێنیەکانو غەیب دەکات. عەرەب بەو پیاوەی ئەو کارانە دەکات پێی دەڵێن کاهین، هەروا ئەو ناوە بەسەر ئەو کەسەش دادەدەن کە عیلمێکی چڕو پڕی هەبێت.

هەندێکیش ئەستێرەناسو پزیشك ناوەدەنێن کاهین، مانای لەزاراوەشدا هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ مانا زمانەوانیەکەی.

سەبارەت بە زانستی (تنجیم)یش: ئەوە زانستێکە بە هۆی پێك هاتە فەلەکیەکان رووداوە سوفلیەکانی پێ دەناسرێ، جا بە پێی ئەم پێناسەیە جۆرێکە لەجادوگەری و فاڵچیەتی:

پەنهانو نادیار هەر خوای گەورە دەیانزانێ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾ الأنعام: هەر ئەو زاتە ئاسمانەکان و زەوی لەسەر بنچینەو بناغەی حەق و ڕاستی

دروست کردووە، هەر ڕۆژێك هەر کاتێك فەرمان (بە نەمان و لەناوچوونی بدات) بێ دواکەوتن پێش دێت، فەرمان و گوفتاری ئەوزاتە هەمیشە ڕاست و بەجێیە و ئەنجامدراوە، لەو ڕۆژەی فوو دەکرێت بە (ێور)دا دەسەڵات تەنها بۆ خوایە، هەر ئەو زانای نهێنی و ئاشکرایە، هەر ئەویش خوایەکی دانا و ئاگایە (بە هەموو بەدیهێنراوەکانی). ﴾

پێغەمبەریش (ﷺ) پەناهن‌و نادیار نازانێ مەگەر ئەوەی خوای گەورە پێی رابگەیەنێ و بۆی دیار بخا، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨﴾ الأعراف: ١٨٨ ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: کە من ناتوانم هیچ قازانج یان زەرەرێك بەخۆم بگەیەنم مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆخۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێك نیم تەنیا ترسێنەرێك (بۆ یاخیەکان) و مژدەدەریشم بۆ کەسانێك کە باوەڕ دەهێنن. ﴾ هەروا فەرمویەتی:﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ٢٧﴾ الجن: ٢٦ - ٢٧ ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لە نهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات. (٢٦) مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خوا خۆی ڕازی بێت (بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت)، ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەرو پشتەوە (تا پەری و شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پێ بەرن) . ﴾.

جنۆکەش پەنهان‌و نادیار نازانن، ئەگەر بیانزانیبایە لەو سزا بەئێشە نەدەمانەوە، سولەیمان پێغەمبەر –علیه السلام – لەماڵی خۆی بە ڕاوەستاوی مرد و ساڵێکیش بەم

شێوەیە مایەوە، لەگەڵ ئەوەی جنۆکە نەیانزانی و بەردەوام فەرمانبەری فەرمانەکانیان دەکرد، دواتر خوای گەورە پاش ساڵێك مێرولەیەکی نارد بۆ ئەوەی گۆچانەکەی بخوات کە خۆی پاڵدابووە سەری جا کەوتە خوارێ، ئەو کات جنۆکە زانیان مردووە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾ سبأ: ١٤ کاتێ کە بڕیاری مردنی (سولەیمانماندا، پەرییەکان نەیانزانی کە مردووە)، تا مۆرانە گۆچانەکەی کلۆر کرد، کاتێ کە کەوت ئەوسا پەرییەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر غەیب زان و نهێنیزان بوونانیە ئاوا لە کارو فرمانی ناخۆشدا بەردەوام نەدەبوون، (هەر کە زانیان سولەیمان وەفاتی کردووە دەستیان لە کار هەڵدەگرت). ﴾

زانایانیش یەکدەنگن لەوەی، کە جادوگەریو فاڵچیەتی بەمەبەستی کەسایەتیو پارە پەیداکردن پارەیەکی حەرامە چونکە پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەی لەو ماڵە کردووە لەرێگای فالچیتیەوە بە دەست بهێنرێ، چونکە ماڵێکی حەرامەو لەرێگایەکی ناپەسندەوە هاتووە وەك کرێی ئافرەتی زینا کەر.

هەروا زانایان یەکدەنگن لەوەی، کە حەرامە پرسیارکردن لەفالچی سەبارەت بە زانینی ڕووداوەکان، بەراست زانینیشی لەوانەی دەیڵێ کوفرە.

فالچیەتیش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بانگەشەی عیلمی غەیب دەکەن، کە عیلمێکە خوای گەورە هەر بە خۆی دەیزانێ.

بەراستی ئیسلام هەموو جۆرەکانی فالچیەتیو جادوگەری بەتاڵ کردۆتەوەو مومارەسەی کردنیشی یاساغ کردووە و بڕیاریشی داوە، کە پەنهان ونادیار تەنها خوای

گەورە دەیانزانیٚ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾ النمل: ٦٥(ئەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) پێیان) بڵیٚ: جگە لە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هیچیان ئاگادارینین لە پەنهان و شاراوەکان، هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە...﴾

خوای گەورە بۆچوونەکانی فالچیەتی بەردۆخستەوە، کە بانگەشەی ئەوە دەکەن شەیتانەکان لەئاسمانەوە خەبەریان بۆ دەهێنن ، دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ الشعراء: ٢١١ - ٢١٢ شتی وا بەوان ناکرێت و هەرگیز ناتوانن بە کاری وا هەستن. (٢١١) بێگومان ئەو شەیتانانە لە بیستنی وەحی و فەرمانەکانی خوا کە ڕادەگەیەنرێت بە فریشتەکان دوور و بەرکەنارن.﴾

زانایان فەرمویانە: جادوگەر یان فاڵچی بە بانگەشەکردنی بۆ عیلمی غەیب کافر دەبیٚ، چونکە ئەمە دژاو دژی دەقی قورئانە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ فَإِنَّهُۥ يَسۡلُكُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ رَصَدٗا ﴿٢٧﴾ الجن: ٢٦ - ٢٧ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لە نهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات. (٢٦) مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خوا خۆی ڕازی بێت (بەوەی هەندیٚ نهێنی بزانێت)، ئەو کاتە فریشتە دەکاتە پاسەوانی لە بەرو پشتەوە (تا پەری و شەیتانەکان نەتوانن زەفەری پیٚ بەرن)﴾

واتە: عالیمی غەیب هەر خودایە و کەس ناتوانیٚ شارەزایان بیٚ و بیان بینی مەگەر ئەوەی خوای گەورە ڕێگای پیٚ بدات و بۆی ئاشکرا بکات.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی بچێتە لای کاهینێك و ئەوانەی دەیانڵێ بە ڕاستی بزانێ ئەوە کوفری بەو شتە کردووە، کە بۆ (محمد) دابەزیوە)) (رواه البزار باسناد جید، وقال الالبانی هو حدیث صحیح لغیره).

هەروەها دەفەرموێ: ((ئەوەی بچێتە لای عەرافێك[1] لەبارەی شتێك پرسیاری لێ بکات و پاشان بە ڕاستی بزانێ، ئەوا چل ڕۆژان نوێژی لێ وەرناگیرێ)).

## ٤٣-بە گوێ نەکردنی ئافرەت بۆ پیاوەکەی (نشوز المرأه علی زوجها)

زانایان سەبارەت بە مانای (نشوز) وتویانە: هەڵنەستانی ئافرەتە سەبارەت بە بەجێهێنانی ئەرکەکانی بۆ پیاوەکەی وەك : خۆ جوان کردن بۆی یان خۆنەشوشتن یان دەرچون لەماڵەکەی بە بێ مۆڵەتی پیاوەکەی یان ڕێگە بداتە یەکێك بێتە ماڵەکەی کە پێی ناخۆش بێت ،یان نەیەتە سەر جێگاکەی کاتێك داوای دەکا یان هەر شتێکی تر کە پەیوەندی بە پەیوەندی نێوانیاندا هەیە، ئەمە شتێکە هیچ جیاوازی نیە لەنێوان شەرع زانان.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ٣٤﴾ النساء: ٣٤پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر هاوسەرەکانیانەوە، ئەمەش بەهۆی ڕێزو زیادە ئەرکێکەوە کە خوا داویەتی بەهەندێك بەسەر هەندێکی تردا (سەرەرای ئەوەی کە)پیاوان لەماڵ و سامانیان خەرج دەکەن (لە پێناوی ئاسوودەیی و

---

[1] (عرّاف) جۆرێکە لەجۆرەکانی کاهین و جادوگەر ئەو کەسەیە کە بانگەشەی زانینی شتە دزراوەکان دەکات.

خۆشگوزەرانی ئافرەتاندا)، لەولاشەوە ئافرەتانی ژیرو دیندارو گونجاو هەمیشە گوێڕایەڵی مێردەکانیانن، نهێنی نێوان خۆیان و مێردەکانیان دەپارێزن (بەتایبەت ئەو نهێنیانەی خوا دەیەوێت پارێزراو بن) بەهۆی ئەوەی کە خوا مافەکانی ئەوانی پاراستووە، ئەو ئافرەتانەش ئێوە دەترسن سەرکەشی وسەرپێچی بکەن سەرەتا ئامۆژگاریان بکەن، (ئەگەر سوودی نەبوو) لەناو جێدا پشتیان تێبکەن، (ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو) لێیان بدەن (بەمەرجێك لێدانەکە لە دەم و چاو نەبێت و ئاسەوار بەجێنەهێڵێت)، ئەگەر بەم هۆیانەوە لە لادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێمەکەن و ڕێگەی تر مەگرنەبەر (بۆ ئازاردانیان) بێگومان خوا بەرزو بڵندو گەورەیە، (ئەگەر ستەمیان لێبکەن تۆڵەتان لێدەسێنێت). ﴾

(الذهبي) وتویەتی: (الواحدی) لەبارەی (النشوز) وتویەتی: سەرپێچی کردنی مێردە بەوەی دەمەقاڵێ لەگەڵدا بکاتو خۆی لەسەر هەڵبکێشێ. (عطاء)یش وتویەتی: ئەوەیە، کە ژن خۆی بۆن خۆش بکا بۆی بەڵام خۆی نەداتە بەر دەستی جا (فعظوهن) واتە ئامۆژگاریان بکەن بە کیتابی خواو فەرمانەکانی خوای گەورەیان بە یاد بخەنەوە.

﴿واهجروهن في المضاجع﴾ (ابن عبّاس) وتویەتی: ماناکەی ئەوەیە پشتی تێ بکات لەسەر جێگاو قسەی لەگەڵدا نەکات. (شعبی) و (مجاهد)یش وتویانە: ماناکەی ئەوەیە نەیەتە سەر جێگای‌و لەگەڵیدا کۆنەبێتەوەو قسەی لەگەڵدا نەکات. (واضربوهن) لێدانێك هیچ شوێنێکی بریندار نەکاتو لەکەداری نەکات. (ابن عبّاس) وتویەتی: لێدانێك وەك چەپەرۆکێك وابێت پیاویش پێویستە لەکاتی بە گوێ نەکردنی ئافرەتەکەی، بۆی بە پێی ئەم ئایەتە مامەڵەی لەگەڵدا کاتو سنوور نەبەزێنێ. (فإن أطعنکم) واتە ئەگەر گەڕانەوە بۆ مل کەچی پیاو (فلا تبغوا علیهن سبیلا) (ابن عبّاس) وتویەتی: یانی چی تر هەنجەتیان پێ مەگرن‌و لەگەڵیان بە هەنجەت مەبن.

● (أبو هريره) خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: پیغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((ئەگەر پیاو ئافرەتەکەی بانگ کرد بۆ سەرجێی بەڵام نەهات و بەم هۆیەوە لێی تورە بوو ئەوا هەتاکو بەیانی فریشتەکان لەعنەتی لێدەکەن)) (رواه البخاری).

● (عطاء بن دینار الهذلي ) خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((سێ کەس خوای گەورە نوێژیان قەبول ناکات و بەرز ناکرێتەوە بۆ ئاسمان و لەسەریان تێ ناپەرێ: پیاوێك پێش نوێژی بکات بۆ خەڵکێك لەهەمان کاتدا پێیان ناخۆش بێت، پیاوێکیش سەربەخۆ بێ ئەوەی کەس پێی بڵێ نوێژ لەسەر مردووەك بکات، ئافرەتێکیش پیاوەکەی بەشەو بانگی کردە سەر جێ بەڵام نەچوو)) (رواه ابن خزیمه فی صحیحه هکذا امرسلا). (حدیث صحیح لغوه)

## ٤٤- وێنەگرتن

(التصویر) لەزمانی عەرەبیدا بە مانای وێنەیەك دێت (صورة الشیء ) مانای ئەو دەدات، کە لەشتی تر جیای دەکاتەوە. لەفەرمودەی (ابن عمر) دا هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) ناوی لەدەم و چاو ناوە (صورة) دەفەرموێ: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی کرد لە(صورة) بدرێ، یان قەدەغەی کرد دەمو چاو نیشانە بکرێ بە داغ کردن)) (رواه البخاری).

(تصویر) بەمانای باس کردنی وێنەیەکیش دێت، وەك ئەوەی سیفەتی باس بکات وتراوە (صورت لفلان الامر) یانی وەسفم بۆی کرد.

(تصویر) بە مانای دروست کردنی (تمثال)یش دێت: واتە: ئەو شتەی وەك شتێکی تر دروست دەکرێت بە هەمان روخسارو سیما، جا یەکسانە وێنەکە بەرجەستە بێ یان

بەرجەستە نەبێ یان وەك زانایان دەفەرمون: خاوەن سێبەر بێ یان خاوەن سێبەر نەبێ.

مەبەستیش بە وێنەی بەرجەستە كراو ئەوەیە سێ دووری هەبێ واتە قەبارەی هەبێت بەوەی ئەندامەكانی دەرپەڕیو بێ‌و بتوانرێ دەستی لێ بدرێ‌و تەماشا بكرێ.

سەبارەت بەو وێنانەی، كە بەرجەستە نیەو سێبەری نیە ئەوا پێی دەڵێن رووتەخت یان خاوەن دوو دووری بێت. كە ئەندامەكانی تەنها دەبینرێ و دەستی لێ نادرێ‌و دەرپەڕیو نیە وەك ئەو وێنەیەی لەسەر كاغەز دەكێشرێ یان لەسەر قوماش یان لەسەر رووتەختە لووس‌و سافەكان جا (تصویر) و (صورة) لەزاراوەی فوقەهادا وەك ئەوەیە كە زانایانی زمان بۆی چوونە.

(صورة) بە مانای (تصویر)ش دێت‌و كۆیەكەشی (تصاویر)ە ئەمەش لەفەرمودەی (عائشە) خوا لێی رازی بێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) قەدەغەی لێ كردووە وەك دەفەرموێ ((ئەم پەردەیە لابە چونكە وێنەكانی لەنوێژدا دێنە پێش چاوم)) (رواه البخاري وأحمد).

(عائشە) —خوا لێی رازی بێت — وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەفەرێك هاتەوە،منیش كۆسپەكەی پێش دەرگام بەرگ كردبوو بەپەردەیەك، كەوێنەی تێدابوو، كاتێك پێغەمبەر خوا ئەمەی بینی رەنگی دەم‌و چاوی گۆڕاو فەرمووی (ئەی عائیشە توندترین سزا لەلایەن خوا لەرۆژی قیامەتدا بۆ ئەوكەسانەیە كەلەچاو دروست كراوەكانی خوا دەكەنەوە) دەڵێت: جا كردمانە دوو پارچەو، دوو بالیفمان لێ دروست كرد (متفق علیه).

(ابن عمر) — خوا لەخۆی‌و باوكی رازی بێت — وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((بەراستی ئەوانەی ئەو وێنانە دروست دەكەن ئەوا لەرۆژی قیامەتدا سزا دەدرێن و پێیان دەوترێ: ئەوەی دروستتان كردووە زیندوی بكەنەوە)) (متفق علیه).

## 45- دەم و چاو رنینەوەو شین و یەخە دڕان

(النياح والنياحة) ماناکەی لەزمانی عەرەبیدا گریانێکی بە دەنگە لەسەر مردوو.

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر گریان لەسەر مردوو تەنها فرمێسك ڕژاندن بێتو بە دەنگ نەبێت ئەوا دروستە. جا چ پێش مردن بێت یان پاش مردن، هەروەها ئەو گریانە بە دەنگەی کە دەردەچێو ناتوانرێ ڕێگەی لێ بگیرێ یان دڵ تەنگی. هەروەها زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی، کە حەرامە بە دەنگی گەورە باس لەچاکەکانی مردوو بکرێ، مەگەر هەندێك لە(حنابلة)کان نەبێ کە ڕێگەیان پێداوە.

هەروەها زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە شینو دەمو چاو رنانەوە و یەخە دڕاندنو شتی هاوشێوەی ئەوانە حەرامن، بەڵام حەنەفیەکان ئەمەیان بە کەراهەتی تەحریمی لەقەڵەم داوە، جا کەوابێ لەنێوان زانایاندا لەم بارەیەوە هیچ جیاوازییەك لەئارادا نیە.

●عن ابن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) (ليس منّا من ضرب الخدود، وشق الجيوب، ودعا بدعوة الجاهلية)[1] (رواه البخاري ومسلم).

((ئەو کەسەی لە دەم و چاوی دەدات و یەخە دەدڕێنێت و بانگەشەی نەفامی دەکات لەئێمە نیە)).

---

(1) (ليس منا) واتە لەسەر سوننەتی ئێمە نی یە، بەڵام ماناکەی ئەوە نیە لەدین دەرچووە بەڵام کە بەم بێژەیە گوزارشتی لەبارەی کراوە ئەوا زیاتر بۆ سەرکۆنەکردنو تاوان بارکردنە بۆ ئەوانەی دەکەونە ناو ئەو جۆرە گوناهانەوە، هەروەکو، کە باوك دەڵێتە کوڕەکەی کاتێك لۆمەی دەکات: تۆ لەمن نی و منیش لەتۆ نیمە.واتە تۆ لەسەر ڕێگای من نی. وتراویشە ماناکەی ئەوەیە کە لەسەر دینە کامیلەکەی ئێمە نی یە، واتە لەفەرعێك لەفەرعەکانی دین دەرچوە، لەگەڵ مانی بنچینەکەی باوەڕەکەی (من شق الجيوب) واتە یەخەدران هەتا خوارێ ئەمەش وەك ناڕازی بونێك (وضرب الخدود) واتە روومەت یان کوڵمە ، بۆیەش باس لەکوڵمە کراوە چونکە لێدان زیاتر بەر ئەوێ دەکەوێ بەڵام لێدان لەشوێنەکانی دەم و چاو هەر دەچێتە ناو فەرمودەکە. (ودعا بدعوة الجاهلية) واتە نەفامیەت بنوێنێو بانگەشەی بۆ بکات.

## ٤٦-ئەزیەت دانی جیران و خەڵکی تر

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ والجار ذي القربى ﴾ واتە جیرانی نزیك کە دوو حەقی لەسەرتە حەقی جیرانەتی و حەقی خزمایەتی. ﴿والجار الجنب ﴾ واتە ئەو جیرانە بێگانەیەی کە هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی نیە لەنێوانتان.

پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکی راستی خۆی گرنگی جیرانەتی بە دیار خستووە، کە دەفەرموێ ((بەردەوام جبریل –علیه السلام– ئامۆژگاری دەکردم لەبارەی جیران هەتا وام زانی میرات دەگرن)) (متفق علیه).

هەروا پێغەمبەر (ﷺ) روونی کردۆتەوە کەوا باشترین جیران ئەوەیە لەگەڵ جیرانەکەی باش بێت هەروەکو دەفەرموێ: ((باشترین برادەر لەلای خوای گەورە ئەوەیە لەگەڵ برادەرەکەی باش بێ، باشترین جیرانیش ئەوەیە لەلای خوای گەورە کە لەگەڵ جیرانەکەی باش بێت)) (رواه الترمذي وهو حديث صحيح).

هەر بەندەیەکیش باوەردارێکی تەواو نیە هەتا جیرانەکەی دڵنیا نەبێت و سەلامەت نەبێت لەشەڕو خراپەی، جا حورمەتی جیران گەورەیەو هەر باوەڕدارە دەتوانی بی پارێزێو ئاگای لێ بێ، هەر پیاو خراپیشە کە کەم تەرخەمی لەئاست دەنوێنێو گوێی پێ نادا.

(حسن البصری) وتویەتی: لەگەڵ جیران باش بوون ئەوە نیە ئەزیەتی نەدەی، بەڵکو لەگەڵ جیران باش بوون ئەوەیە ئارام بگری لەسەر ئەزیەتی ئەو جیرانە.

● (أبو هريرة) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((وەڵلاهی ئیمانی نیە، وەڵلاهی ئیمانی نیە، وەڵلاهی ئیمانی نیە)) وتمان ئەی پێغەمبەری خوا کێ؟ فەرموی: ((ئەو کەسەی جیرانەکەی ئەمین نیە لەشەڕو خراپەی)) (رواه البخاری ومسلم ).

لەریوایەتی (مسلم)یشدا هاتووە: ((ناچێتە بە هەشت ئەو کەسەی جیرانەکەی ئەمین نیە لەشەڕو خراپەی)).

*(أبو هريرة) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: ((پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((خوای گەورە فەرمویەتی (ئەوەی دژایەتی دۆستێکی من بکات ئەوا ئیعلانی شەڕی لەگەڵ دەکەم)) (رواه البخاری).

● (أبی شریح خویلد بن عمرو الخزاعی) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((خودایە من حەقی هەردوو بیّ دەسەڵاتان هەتیوو ئافرەت ئەوەی پێشێلیان دەکات ئەوا ریسوای دەکەم قەدەغەی دەکەم)) (حدیث حسن رواه النسائی باسناد جید).

● (مصعب بن سعد بن أبی وقاص رضي الله عنهما) وتویەتی: سەعد وای دەبینی کەوا لەخوارەوەی خۆی گەورەترە و حەقی بەسەریانەوە هەیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی: ((ئێوە ئەگەر سەرکەون ئەوا سەرکەوتنەکەتان بە هۆی کەم دەرامەتاکانو بیّ هێزەکانەوەیە))(رواه البخاری هکذا مرسلا ووصله غیره).

## ٤٧-لەبەرکردنی حەریرو زێڕ بۆ پیاوان

بزانە کەوا لەبەر کردنی زێڕو حەریر بۆ پیاوان حەرامە، با پەردەیەکیش هەبێت لەنێوانیان ، مەگەر ئەو کەسەی پێویستی پیّ هەبیّ وەك ئەوەی نەخۆشی خورشتی هەیە حەریر لەبەر دەکا، (علی) کوڕی (أبو طالب) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەستی دایە پارچەیەك حەریرو لەلای راستی داناو دەستی دایە پارچە

زێڕێکیش لەلای چەپی دانا پاشان فەرمووی: ((ئەم دووانە حەرامن لەسەر نێرینەی ئوممەتەکەم))[1](رواه أبو داود باسناد جيد).

زێڕ پۆلیە ئاگرێکە لەدۆزەخ

● (ابن عبّاس) خوا لەخۆیی‌و باوکی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی زێڕی لەدەستی پیاوێك بینی، جا یەکسەر لەدەستی کردەوە و فڕێی دا و فەرمووی ((یەکێکتان دەیەوێ پۆلیەك ئاگر لەدەستی خۆی بکا!)) دواتر وترا بەم پیاوە پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) رۆیی: ئەنگوستیلەکەت هەڵگرەوەو سودی لێ ببێنە.

وتی: نەخێر وەڵلاهی شتێك پێغەمبەری خوا فڕێی بدا من هەڵی ناگرمەوە. (رواه البخاري ومسلم).

## ٤٨-سەرپێچی کردنی بەندە (عبد)

(الاباق) لەزمانی عەرەبیدا: سەرچاوگەکەی (أبق)یە، کە بە مانای (هَرَبَ) هەڵات دێت. کە ئەمەش تایبەتە بە مرۆڤ جا چ بەندە بوو یان ئازاد.

لەزاراوەشدا: سەرپێچی کردنی بەندەیە بۆ گەورەکەی، ئەم کارەش بە یەکدەنگی زانایان حەرامە، چونکە کەم و کورییەکە لەبەندەیە، (ابن حجر الهيثمي) – خوای لێ رازیٍ بێت – لەگەڵ (ذهبي) بە گوناهی گەورەیان لەقەڵەم داوە، لەبارەشیەوە چەندە فەرمودەیەك هاتووە، کە قەدەغەی دەکات، لەوانە:

---

[1] لەبەر کردنی زێڕو حەریر بۆ پیاوان حەرامە، هەروەها حەرامیشە بەکارهێنانی ئەو قاپو قاچاغانەی لەزێڕو زیو دروست دەکرێن بەڵام کڕین و فرۆشتنیان حەلالە بۆ هەموان . والله تعالى أعلم.

عن (جرير)ی کوڕی (عبدالله) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((هەر بەندەیەك هەڵاتو سەرپێچی گەورەکەی کرد ئەوا بەری دەبی لەزیممەتی خوا)) (رواه مسلم).

لەفەرمودەیەکی تریش فەرمویەتی: ((ئەگەر بەندە هەڵاتو سەرپێچی گەورەکەی کرد ئەوا نوێژی قەبول نابیٚ)) (رواه مسلم).

لەریوایەتێکی تریش دا هاتووە، کە ((ئەوا کافر دەبێت)). لەریوایەتێکی تری (مسلم)دا هاتووە: ((هەر بەندەیەك لەگەورەکەی رای کرد و سەرپێچی کرد ئەوا کافر دەبێت هەتا نەگەرێتەوە لای )).

## ٤٩-سەربرین بۆ غەیری خوا

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴿١٢١﴾ الأنعام: لەو ئاژەڵە سەر براوانەش مەخۆن کە ناوی خوا لەکاتی سەر برینیاندا نەبراوە﴾

بزانە کەوا لەکاتی سەربرین دا دەبیٚ بە ناوی خوا دەست پیٚ بکریٚ و بۆ خواش بیٚ. بەڵام ئەگەر وانەبوو ناوی جگە لەخوای لەسەر هێنرا وەکو بڵیٚ: بە ناوی مەسیح یان عەذرا ئەوا خواردنی حەلال نیە.

● (علی) خوا لێی رازی بێت – لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)- ریوایەت دەکات کە فەرمویەتی: ((لەعنەتی خوا لەو کەسەی، کە بۆ غەیری خوا سەردەبڕیٚ)) (رواه مسلم).

لەعنەتیش: ماناکەی دەرکردن و دوورکەوتنەوەیە لەرەحمەتی خوا.

## ٥٠-ئەو کەسەی بە ئەنقەست خۆی ناداتە پاڵ باوکی

بزانە کەوا لەو گوناهە گەورانەی شەرع قەدەغەی کردووە ئەوەیە، کە یەکێك خۆی بداتە پاڵ جگە لەباوکی چونکە ئەمە خراپەو خراپەکاریەکی زۆر دەنێتەوە دەبێتە گۆرینی ئەوەی خوا دایناوە، ئەم گوناهە ئەو کەسەش دەگرێتەوە کە کوڕێك هی خۆی نەبێت بەڵام بەدرۆو فێڵ کردن بیکاتە هی خۆی. (أبو هريرة) خوا لێی رازی بێت - لەپێغەمبەری خوا - (ﷺ) ریوایەت دەکات، کە فەرمویەتی: ((لەباوکتان لامەدەن و رەتی مەکەنەوە، ئەو کەسەی لەباوکی خۆی لادەدات و رەتی دەکاتەوە، ئەوا کوفرە))[1] (رواه البخاري ومسلم).

ئەو کوفرەیەی لەو فەرمودەیەدا هاتووە دوو لێکدانەوەی هەیە:

کە پێشەوا (نووی) باسی لێوە کردووە، یەکێکیان: بۆ ئەو کەسەیە کە ئەم کارە بە حەلال بزانێ. دووەم: ئەوە کوفرەی نیعمەتو چاکەیە لەمەڕ حەقی خواو حەقی باوکی، مەبەست پێی ئەو کوفرە نیە، کە لەئیسلام پێی دەچێتە دەر.

هەروەها حوکمی ئەوەش ئەوە دەگرێتەوە، کە کوڕێکی خۆی رەت کاتەوەو لەکاتێکدا بشزانێ، بەڵگەی ئەمەش فەرمودەیەکە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((هەر ئافرەتێك منداڵێك پەیدا بکا، کە هی ئەو قەومە نەبێ ئەوا لەدین و رەحمەتی خوا چویتە دەرو خواش نایباتە بەهەشت، هەر پیاوێکیش کوڕێکی رەت کاتەوە لەکاتێك ئەو تەماشای دەکرد ئەوا خوای گەورە خۆی پێی نیشان نادات و لەسەر سەری ئەوەل و ئاخیر ریسوای دەکا)) (رواه أبو داود وفيه ضعف).

---

(١) کوفر: واتە کوفری ئەو نیعمەتەی کە باوکی لەسەریەتی، جا ئەم کارە بە کاری ئەهلی کوفر دەچێت، بەڵام ئەگەر ئەمە بە حەلال بزانێ ئەوا پەنا بەخوا لەئیسلام دەچێتە دەر.

## ٥١- دەمە قاڵێ و دژایەتی كردن

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ البقرة: ٢٠٤ - ٢٠٥ هەندێ كەس هەن قسەو گوفتارو دەم پاراوییان لە بارەی ژیانی ئەم دنیایەوە سەرسامت دەكات، خوایش بە شایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەكسانن، لە كاتێكدا ئەو سەرسەختترین كەسە لە هەموو جۆرە دوژمنایەتیەكدا. (٢٠٤) هەر كاتێك ئەو جۆرە كەسە پشتی هەڵكردو دەسەلاتی پەیدا كرد" هەوڵ و كۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بكات و خراپە بڕوێنێت و كشتوكاڵ لەناو ببات و پاكتاو كردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت. هەندێ كەس هەن قسەو گوفتارو دەم پاراوییان لە بارەی ژیانی ئەم دنیایەوە سەرسامت دەكات، خوایش بە شایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەكسانن، لە كاتێكدا ئەو سەرسەختترین كەسە لە هەموو جۆرە دوژمنایەتیەكدا. (٢٠٤) هەر كاتێك ئەو جۆرە كەسە پشتی هەڵكردو دەسەلاتی پەیدا كرد" هەوڵ و كۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بكات و خراپە بڕوێنێت و كشتوكاڵ لەناو ببات و پاكتاو كردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپە و تاوانی ناوێت. ﴾

(ذهبي) وتویەتی: لەو بێژانەی كەوا زەم كراوە بریتین لە( المراء ، والجدل، والخصومة).

پێشەوا (غزال)یش وتویەتی: (المراء ) واتە تانەو تەشەردان لەقسە بۆ ئەوەی عەیبێكی لێ بەدیار بخات ئەمەش تەنها بۆ ئەوەی خاوەنەكەی بشكێنێتەوەو فەزلی خۆی بەدەربخا.

لەبارەی (الجدال)یش وتویەتی: ئەمە بە دەرخستنی مەزهەبەکانە.

(خصومة)تیش قسەکردنە بە توندی بۆ ئەوەی حەقێکی خۆی پێ وەربگرێتەوە جاری وا هەیە ئیبتیدائیەو جاری واش هەیە ئیعتیرازیە، (مراء )یش هەر ئیعتیرازیە. ئەوە قسەی پێشەوا غەزالیە.

پێشەوا (نووی)یش وتویەتی: بزانە کەوا (الجدال) جاری وا هەیە هەقەو، جاری واش هەیە باطیلە، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ١٢٥﴾النحل: ١٢٥ هەروا فەرمویەتی: ﴿مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ٤﴾غافر: ٤

هەر لەدرێژەی باسەکەیدا وتویەتی ئەگەر جیدالەکە بۆ روونکردنەوەی حەق بوو ئەوا جیدالێکی باشەو مەدح کراوە بەڵام ئەگەر جیدالەکە بۆ رەت کردنەوەی هەق بوو یان جیدالێك بوو بە بێ عیلم ئەوا باش نیەو زەم کراوە، جا بە پێی ئەم روون کردنەوەیە دەقە هاتوەکان وەردەگیرێن و هەڵدەگیرین لەمەڕ رێ پێدان و رێ پێنەدانی، (مجادلة) و(جدال)یش یەك مانایان هەیە.

هەندێکیش وتویانە: هیچ شتێکم نەبینیوە دین لابەرێ یان پیاوەتی کەم بکاتەوە یان دڵ سەرقاڵ بکات (خصومە) نەبێ.

## ٥٢- گرتنەوەو قەدەغەکردنی پاشماوەی ئاو

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ٣٠﴾الملك: ٣٠

● (أبو هريرة) خوای لێ رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((پاشماوەی ئاو مەگرنەوە کە رێ دەگرێت لەوەی گژوگیا شین ببێ)) (متفق علیە).

ئەم فەرمودەیە مانای ئەوەیە، کە ئەگەر مرۆڤێك بیرێك لەبیابانێك لێ بدات ، لەچوار چێوەی ئەو بیرە گژوگیا هەبێت و هیچ جۆرە ئاوێکی تریش لەم شوێنەدا نەبێ ئەویش لێ نەگرێ چ مرۆڤ چ گیانلەبەران سوود لەم ئاوو ئەم گژوگیایەی دەوروبەری وەربگرن.

● (أبو هريرە) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((سێ کەس خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا ناکات لەرۆژی دوایی و تەماشایان ناکات و پاکانەشیان بۆ ناکات وسزایەکی بەئێشیشیان بۆ هەیە: پیاوێك لەبیابانێکە ئاو لە رێبواران دەگرێتەوە، پیاوێکیش لەپاش عەسر بەڵێن دەدا بە پیاوێك کە شتێکی پێ بفرۆشێ بەڵام دواتر بەڵێنەکەی ناباتە سەر، پیاوێکیش بەیعەت دەداتە ئیمامێك بۆ دونیا ئەگەر بەخششی دا پێی بە وەفا دەبێ بەڵام ئەگەر نەیدا پێی بێ وەفا دەردەچێ)) (رواه البخاري ومسلم).

## ٥٣ـ کەم کردنی پێوان و تەرازوو

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ۝١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ۝٣ أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ ۝٤ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ۝٥ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٦﴾ المطففين: ١ - هاوارو ئاهو ناڵە بۆ تەرازووبازەکان، بۆ ئەوانەی کە لەکێشان و پێواندا لەکڕین و فرۆشتندا تەرازوو بازی و فێڵ دەکەن (یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵکیدا ڕاست ناڵێن). (١) ئەوانەی کاتێك شت لە خەڵکی دەکڕن بە تەواوی، بە زیادەوە لێیان وەردەگرن. (٢) بەڵام کاتێك شتیان بۆ دەپێون یان دەکێشن لێی دەدزنەوە و کەمیان دەدەنێ و فێڵیان لێدەکەن. (٣) ئایا ئەوانە گومان نابەن کە بەڕاستی زیندوو دەکرێنەوە (تا سەرئەنجامی خیانەت و فێڵیان وەربگرن).

(٤) بۆ ڕۆژێکی زۆر سامناك و ترسناك و گەورە. (٥) ئەو ڕۆژەی کە هەموو خەڵکی بە پێوە دەوەستن لەبەردەم دەسەلاتی پەروەردگاری جیهانیاندا. ﴾

● (ابن عبّاس) خوا لێیان رازی بێت وتویەتی: کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی نا مەدینە ئەوا خەڵکەکەی لەهەموو کەس خراپتر بوون لەپێوان و تەرازوو جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (ویل للمطففین) جا پاش ئەمە بە باشی پێوانەیان کردو تەرازویان بێ کەم و زیاد بە کارهێنا)) (رواه ابن ماجه وابن حبّان فی صحیحه والبیهقی وهو حدیث حسن وصححه بعضهم).

## ٥٤-دڵنیابوون لەمەکرو فێڵی خوا

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ أَفَأَمِنُوا۟ مَكْرَ ٱللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴿٩٩﴾ الأعراف: ٩٩جا ئایا دڵنیاو بێباك بوون لە نەخشەو پلانی خوا (لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ یان لەسەر ئاستی حوکمەت و گەلان)؟! جا کەس بێباك نابێت لە نەخشە و پلانی خوا جگە لە قەومی خەسارەتمەندان نەبێت. ﴾

● (عقبە) کوڕی (عامر) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بینیت خوا بەسەر بەندەکەی خۆی هەرچی پێی خۆشە دەیداتێ لەگەڵ ئەوەی ئەو هەر لەسەر تاوان و گوناهە ئەوە بزانە کە ئەمە هەڵخەڵەتانە پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە: )) (حدیث حسن صحیح).

واتە: بێ بەشن لەرزگاربوون هەرخێرێکی چاوەڕوان کراو. هەر سەر شۆڕیو زەلیلیان بۆ هەیە بە هۆی هەڵخەڵەتانیان بەو نیعمەتانەی دەباریە سەریان لەگەڵ ئەوەی ئەوان هەر منجڕتر دەبوونو زیاتر پشتیان لەهەق دەکردو بەردەوام بوون لەسەر تاوان گوناه.

هەندێك لەپیاوە باشەكانی پێشوو وتویانە ئەگەر بانگكرا هەموو خەڵك بچێتە بەهەشت تەنها یەك پیاو نەبێ ئەوا دەترسم من ئەو پیاوە بم.

(عبدالرحمن)ی كوڕی (مهدی) وتویەتی: كاتێك (سفیان)ی (ثوری) لەسەرە مەرگدا بوو گریا، پیاوێك پێی وت ئەی باوكی (عبدالله) لەبەر زۆری گوناهەكانت دەگریێ؟ ئەویش سەری بەرز كردەوەو شتێكی لەزەوی هەڵگرتەوەو وتی: سوێند بە خوا گوناهەكانم پێ كەمترە لەمە ، بەڵام من دەترسم پێش ئەوەی بمرم ئیمان لەدەست بدەم.

(عبدالله) كوڕی (أحمد بن حنبل) وتویەتی: كاتێك باوكم هاتە گیان سپاردن لەلای دانیشتم و لەدەستیشم پارچە پەڕۆیەك هەبوو بۆ ئەوەی هەردوو شەویلاكی پێ ببەستم، جا ناوە ناوە لەخۆ دەچوو لەپاشان بە ئاگا دەهاتەوەو دەیوت: هێشتان نا، منیش وتم: ئەی باوكە ئەمە چی بوو لەو كاتەدا وتت؟

وتی: كوڕەكەم ئەتزانی چم وت؟ وتم: نەخێر، وتی: شەیتان لەتەنیشتم راوەستابوو دەیوت: ئەی ئەحمەد تازە تۆ دەرچویو رزگارت بوو لەدەستی من، منیش دەم وت: نەخێر هێشتا نا هەتا نەمرم لەدەستی تۆ رزگارم نابێ[1].

(١) جێگیری‌و خۆڕاگری پێشەوای ئەهلی سوننە ئیمام ئەحمەد (خوالێی رازی بێت لەسەرە) مەرگو راوەستانی لەدژی پیلانەكانی شەیتان تەرجەمەیە بۆ ئەو ئایەتەكەی خوای گەورە فەرموویەتی (یثبت الله الذین امنوا بالقول الثابت في الحیاة الدنیا وفي الاخرة).
هەر باوەڕدارێك لەسەر عەقیدەی ئەهلی سوننە بێت‌و گوێڕایەڵی فەرمانەكانی خوا بكات‌و لەقەدەغەكراوەكانی بگەڕێتەوەو نەیكات، ئەوا قەت شەیتان لەسەرە مەرگدا ناتوانی لەخشتەی ببات‌و خوای گەورەش پێ قایم‌و پێ گیری دەكات‌و لەسەر وشەی یەكتا پەرستی (لا اله الا الله) دیمرێنێ.
(وەرگێر)

## ٥٥- بێ ئومێد بوون لەرەحمەتی خوا

بێ ئومێد بوون لەبەدەست کەوتنی هەندێك شت دروستە بەڵکو بێ ئومێدی لەبەدەست کەوتنی هەندێك شتی دوور، دڵو دەروون هۆگر دەکاتەوە لەوەی کە ئەستەمە بە دەستی بکەوێ. (سعد)ی کوڕی (ابی الوقاص) وتویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی: (بێ ئومێد بە لەوەی لەناو دەستی خەڵك دایە، ئاگاداری چڵێسیش بە، چونکە فەقیرو هەژاریە ، کە نوێژیشت کرد وابزانە ئەوە داویین نوێژتە، ئاگاداری ئەو شتەش بو کە عوزری بۆ دەدۆرزیتەوە)) (رواه الحاكم والبيهقى فى الزهد)[١].

بەڵام بۆ موسڵمان نیە بێ ئومێد بێ لەرەحمەتی خوا. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٨﴾ يونس: ٧٨(فیرعەون و دارو دەستەی) وتیان: باشە تۆ بۆ ئەوە هاتوویت کە وێڵمان بکەیت لەو بیروباوەڕو بەرنامەیەی کە باوو باپیرانمان لەسەری بوون و لەوانەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە؟ (ئایا بەم ڕێبازە) دەتانەوێت دەسەڵاتداری و گەورەیی بۆ خۆتان لەسەر زەویدا بەدەست بهێنن؟! ئێمە بڕواتان پێ ناکەین! ! ﴾

هەندێك نمونەی بێ ئومێدی ئەوەیە کە مرۆڤ بێ ئومێد بێ لەرزق و رۆزی جا بەهۆی ئەوەوە لێ نەگەڕێ منالی ببێ یان بێ ئومێدی نەخۆش لەچاك بوونەوە، یان بێ ئومێدی تاوانبار لە لێ خۆشبونی خودا.

جا بێ ئومێدی لەرەحمەتی خوا قەدەغە کراوە، زانایان لەگوناهە گەورەکان هەژماریان کردووە. (ابن حجر المكى) وتویەتی: بەبەڵگەی ئەم ئایەتە زانایان بێ

---

(١) حديث ضعيف : انظر: ضعيف الترغيب والترهيب.

ئومێدی لەرحمەتی خوایان بە گوناهی گەورە لەقەڵەم داوە: ﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾﴾ یوسف: ٨٧ چونکە بەڕاستی کەس نائومێد نابێت لە سۆزو میهرەبانی خوا جگە لە کەسانی خوانەناس و بێ باوەڕ. ﴾ هەروا ئەو ئایەتەش: ﴿ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾﴾ الحجر: ئیبراهیم وتی: ئایا کێ نائومێد دەبێت لە ڕەحمەت و بەخششەکانی پەروەردگاری، مەگەر کەسانێك کە گومڕاو سەرگەردانن.

## ٥٦-قۆرخ کردن (الاحتکار)

(الاحتکار) لەزمانی عەرەبیدا بە مانای: گرتنەوەو قەدەغەکردنی خواردەمەنی دێت بەمەبەستی گران بوونی نرخی، کە ناوەکەی (حُکر)ی. مالیکەکانیش پێناسەیان کردووە بەوەی چاودێری کردنی بازارە بەمەبەستی گران بوونی نرخەکان.

شافیعیەکانیش پێناسەیان کردووە بەوەی: کڕینی خواردەمەنیە لەکاتی گران بوونی، پاشان گرتنەوەو قەدەغەکردنیەتی پاشان فرۆشتنیەتی بە پارەیەکی زۆر بەمەبەستی تەنگ هەڵچنین بە خەڵك. حەنبەلیەکانیش پێناسەیان کردووە بەوەی: کڕینی خواردەمەنیو حەبس کردنیەتی بەمەبەستی گران بوونی نرخی.

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی قۆرخ کردن بەو بەستەرانەی کە هەر یەکێکیان هێنایتیەوە ئەوە حەرامە، چونکە زەرەرێکی زۆر بە خەڵك دەگەیەنێو، تەنگیان پێ هەڵدەچنێ.

دەربڕینی زانایان جیاوازە لەگوزارشت کردن لەم شتە حەرامە، زۆرینەیان بە حەرامیان داناوە بەڵگەشیان ئەم ئایەتەیە ، کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُرِدْ

فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ الحج: جا ئەوەی بیەوێت بەهۆی یاخی بوون و لادانەوە ستەم بکات، ئەوە سزایەکی بە ئازاری پێ دەچێژین. ﴾

خاوەنی کیتابی (الاختيار) وا لەو ئایەتە گەیشتووە، کە ئەمە بنچینەی ئەو بەڵگانەیە لەحەرام کردنی قۆرخ کردن.

(قرطبي)یش لەتەفسیری ئەو ئایەتەدا وتویەتی، کەوا (أبو داود) لە(يعلى بن اميه) ریوایەتی کردووە ئەویش لەپێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: ((حەبس کردن ئیحتیکار کردنی خواردەمەنی لەحەرەم ئیلحاد کردنە تیایدا)) (حديث ضعيف).

## ٥٧-زەرەر گەیاندن بە وەسیەت

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ النساء: ١٢ ئەمانە هەمووی دوای وەسیەتێك کە دەکرێت، دانەوەی قەرز، لەکاتێکدا ئەو وەسیەتە زیانبەخش نەبێت بەمیراتگران، ئەمانە هەر هەمووی بڕیار و فرمانن لەلایەن خوای گەورەوە و ئەو خوایە زانا و بە حیلم و حەوسەڵەیە. ﴾

وەصیەت لەزمانی عەرەبیدا بە مانای ئامۆژگاری کردن دێت لەکردنی شتێك یان نەکردنی، بەڵام لەلای فەقیهەکان پێناسەیەکی تری هەیە، کە گونجاوو هاوکاتە لەگەڵ ئەحکامەکانی لەشەرعدا، جا پێناسەی لەلای ئەوان: رەفتار کردنێکە وا دەخوازێ حەقێك دیار بکا لەوەسیەت کار بۆ وەسیەت گر.

بنچینەش لەوەسیەت کردندا پەسندو حەلالە، بەڵام هەندێك جار چەند شتێك وای لێ دەکەن سوننەت بێ هەندێکیش وای لێ دەکەن واجیب بێ هەندێکیش وای لێ دەکەن مە کروه بێ و هەندێکیش وای لێ دەکەن حەرام بێ، جا بەو هەڵو مەرجانەی ئەو

ئەحكامانە لەخۆیان دەگرێ زانایان قسەیان لەسەر كردووە.

● (ابن عبّاس) وتویەتی: (زەرەر گەیاندن بە وەسیەت لەگوناهە گەورەكانە) (رواه الدارقطني والنسائي. صحيح موقوف، ورفعه وهم).

–زەرەر گەیاندن بە وەسیەت هەندێك جار بەم شێوەیەیە كە هەندێك میرات گر تایبەتمەند بكات بە چەند شتێكی زیاتر لەو حەقەی خوای گەورە بۆی دیاری كردوون جا بەم هۆیەوە میرات گرەكان هەموویان زەرەر مەند دەبن، بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((خوای گەورە بەشی هەموو خاوەن حەقێكی داوە ، نابێ وەسیەت بكرێ بۆ میرات گر)) (حديث صحيح رواه أحمد).

–جاری واش هەیە وەسیەت دەكا بۆ بێگانەیەك زیاتر لەسێ یەكێك جا بەم هۆیەوە بەشی میراتگرەكان كەم دەكا، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((سێ یەك، سێ یەكیش زۆرە)) جا هەر كاتێك وەسیەت كرا بە زیاتر لەسێ یەكێك ئەوا جێ بەجێ ناكرێ مەگەر بە مۆڵەتی میرات گرەكان نەبێ (برگەكانی ئەو لێكۆڵینەوە لەكتێبی (الفقه الواضح)م وەرگرتووە بە دەست كاریەوە).

## ٥٨–جنێو دان بە یەكێك لەهاوەڵان

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾ التوبة: خوای میهرەبان لەوانەی كە پێشكەوتن و یەكەم كەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت كردنی ئیسلامدا لەكاروانی كۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی كە بە ڕێكوپێكی شوێنیان كەوتوون، ڕازی بووەو ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەكانی بەهەشتی بۆ ئامادە كردوون كە چەندەها ڕووبار بە بەردەم كۆشكەكانی و بەژێر درەختەكانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ

هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەر كەوتنێكی زۆر گەورەیە. ﴾

(ابن حمدان الحنبلی) وتویەتی: رێزگرتنو خۆشەویستی هاوەڵان پێویستە لەسەر هەموو كەسێك ، دەست هەڵگرتنیش لەوەی لەنێوانیان روویان داوە، جا بە هەر شێوەیەك بێت لەنوسین و خوێندنەوەو گوێ گرتنو گوێ لێبوون، هەروا وازهێنان لەرق لێ بونەوەو زەم كردنیانو، دیتنەوەی عوزر بۆیان بەوەی، كە ئەوان ئەوەی كردویانە ئەوا بە ئیجتیهادێكی رێ پێدراو كردویانە كە هیچ كاتێك كوفرو فیسق بەخۆیەوە هەڵناگرێ، بەڵكو پاداشتیش دەدرێنەوە لەسەری، چونكە ئیجتیهادەكەیان رێ پێدراوو لەجێی خۆی بووە. والله تعالی أعلم.

● (ابن عبّاس) خوا لێیان رازی بێت وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئەوەی جوێن بە هاوەڵەكانی من بدات ئەوا لەعنەتی خواو فریشتەكانو هەموو خەڵكی لەسەر بێت))[1] (حدیث حسن، رواه الطبراني ڤ الكبير).

---

(١) پێشەوا محمد صالح العیمین (خوای لێ خۆش بێ) فەرمویەتی ئەوەی جنێو بەهاوەڵانی پێغەمبەر بدات (صلی الله علیه وسلم) ئەوا كافر دەبێت وەكو شیعەی دوانزە ئیمام چونكە جنێودان بەهاوەڵات وا دەخوازێ كەئەوانە داگەرو راست گۆ نەبن ئەم ئایینەش هەر لەرێگەی ئەوانەوە هاتووە، جا تانەو تەشەردان لەهاوەڵان تانەوە تەشەر دانە لەخودی قورئانو ئیسلام ئەو كەسەی تانەو تەشەر لەقورئان بدات ئەوا كافر دەبێت.

# بەشی پێنجەم

# ئەوانەی مژدەیان پێدراوە بە ئاگر

## ١- ئیبلیسی نەفرەت لێکراو

### ● شەیتان کێیە؟

(الشیاطین) کۆی (شیطان)ە صیغەکەشی (فیعال)ە کە لە(شَطَنَ) هاتوە کە بە مانای دوورکەوتنەوە لەخێر دێت، یان لەو گوریسە درێژەوە هاتووە وەك بڵێی شەڕو شۆڕێکی درێژو پان و پۆڕی هەیە.ئەمە لەسەر رای ئەوانەی کە پیتی (ن) بە بنچینە دادەنێن لەوشەی شەیتان ، هەندێکیش دەڵێن: (شیطان) لەسەر صیغەی (فعلان)و لە(شاط یشیط) هاتووە کە ماناکەی لەناوچوو یان سوتا ئەوەش لەسەر رای ئەو کەسانەی کەوا دەبینن پیتی (ن) زیادە.

(الازهری) وتویەتی: رای یەکەم زۆرترە، کە ماناکەی بە شێوەیەکی گشتی واتە سەرپێچیکەرو پڕ شەڕو بە حیلە و حەواڵەو فێڵ، یان رووچوو لەپێ درێژی و نوقم بوون لەتاوان. هەر یەکێکیش سەرپێچی کەر بێ لەجنۆکەو مرۆڤ و گیانلەبەر پێی دەوترێ شەیتان. جا لەنێوان جنۆکەو شەیتانان گشتاندنو تایبەتاندنی وەجهی هەیە.

ئەوەی زۆر سەرپێچیکەرو یاخی بێت لەشەیتانەکان پێی دەوترێ عفریت. عفریتیش: کەسێکی پیسو خراپو فێڵبازە ، جنۆکەش کاتێك پێی دەوترێت عفریت، کە بگاتە ئەو پەڕی کوفرو ستەم و یاخی بوون.

(أبو عمر بن عبدالبرّ)وتویەتی: جنۆکە لەلای ئەهلی کەلام و زمان چەند پلەو پایەکیان هەیە.ئەگەر بە تەنها باسی جنۆکەیان کرد ئەوا دەڵێن (جنّی) ئەگەر

مەبەستیشیان پێی ئەوە بێ کە لەگەڵ خەڵك دایە و دەژی پێی دەڵێن (عمّار) کۆیەکەشی (عامر)، ئەگەر مەبەستیشیان پێی ئەوە بێ کە خۆی بە منداڵان نیشان دەدا پێی دەڵێن (أرواح) ئەگەریش زۆر پیس و دزێوو خراپ بوو پێی دەڵێن (شیطان) ئەگەریش لەوە خراپتر بوو ئەوە (مارد)ە ئەگەریش هێزی لەوە زیاتر بوو خراپتر بوو پێی دەڵێن: عفریت کۆیەکەشی عەفاریتە گەورەی هەموو جنۆکانیش ئیبلیسە. خوای گەورە فەرمویەتی ﴿ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓۗ ﴿٥٠﴾ ﴾ الكهف: ٥٠ (الموسوعه الفقهيه الكويتيه).

●(إبليس) وەزنەکەی (إفعيل)ە، لە(الابلاس) داتاشراوە کە ماناکەی بێ ئومێد بوونە لەرەحمەتی خوا. تەصریفیش ناکرێ چونکە ناسراوەو هیچ هاوشێوەیەکیشی نیە لەناوەکان بۆیە بە ناوێکی ئەعجەمی شوبهێنراوە. (أبو عبيدة)و جگە لەویش وتویانە وتراوە: ئیبلیس ئەعجەمیەو هیچ داتاشینێکی نیە بۆی لەبەر ئەعجەمیەکەو ناسراویەکەی تەصریف نەکراوە. (ابن جرير).

● (ابن عبّاس) وتویەتی: خودا ئیبلیسی لەهەموو خێرێك داماڵیو کردیە شەیتانێکی نەفرەتی کراوو دەرکراو ئەمەش وەك پاداشتێك بۆ سەرپێچیەکەی (ابن جرير).

●هەر (ابن عباس) وتویەتی: پێشتر ئیبلیس یەکێك بوو لەئەهلی گەڕەکی فریشتەکان پێیان دەوترا جنۆکە، لەئاگری سەمووم دروست کرابوون. ناوەکەشی (الحارث) بوو یەکێك بوو لەخازینی بەهەشت ، فریشتەکانیش لەڕووناکی دروست کراون جنۆکەش لەقورئان باس کراون لەئاگری ماریج دروست کراون، کە زمانی ئەو ئاگرەیە، کە کاتێك دادەگیرسێ لەتەنیشتەکانی دێتە دەرێ. (ابن جرير).

● (ابن عباس) خوا لێیان رازی بێت – وتویەتی: ئیبلیس پێش ئەوەی لەناو فریشتەکان ئەو گوناهە بکات ناوی عەزازیل بووەو، یەکێك بووە لەدانیشتوانی سەر

زەوی‌و یەكێك بووە كە لەناو فریشتەكان لەهەموویان زاناتر بووە، هەر ئەمەش بوو وای لێ كرد خۆی بە گەورە بزانێ، یەكێك بوو لەو گەڕەكانەی پێی دەوترا (حنّا).

● (ابن عباس) خوا لێی رازی بێت – وتویەتی: لەناو فریشتەكان تیرەیەك هەیە پێیان دەوترێ جین، ئیبلیسیش یەكێك بوو لەوانە، كە ئیشی دەكرد لەنێوان زەوی‌و ئاسمان جا سەرپێچی كرد، خواس گەورەش گۆڕی‌و كردی بە شەیتانێكی نەفرەت لێكراو.(ابن جرير)

● (حسن) وتویەتی: ئیبلیس هەرگیز ساتێك چیە لەفریشتەكان نەبووە بەڵكو باوكی جنۆكانە هەروەكو، كە ئادەم باوكی مرۆڤانە. (ابن جرير).

رای راستریش – والله أعلم – هەروەكو ، كە (ابن زيد) وتویەتی: كە ئیبلیس باوكی جنۆكانە، هەروەكو ئادەم باوكی مرۆڤانە. بەڵگەی ئەو كەسەی ئەم وتەیەشی وتوە ئەوەیە، كە خوای گەورە لەكیتابەكەی خۆی هەواڵی داوە، كە ئیبلیسی لە(نار السموم) دروست كردووە یان لە(مارج من نار) دروست كردووە، باسی فریشتەكانیشی نەكردووە كە دروستی كردبن لەیەكێك لەمانە خوای گەورە هەواڵی داوە لەبارەی ئیبلیس كە لەجنۆكەكانە. جا ڕەوا نیە كەسێك بیان گێڕێتەوە بە پێچەوانەی ئەوەی خوا فەرمویەتی. دەڵێن: ئیبلیس وەچەو نەوەی هەیە، فریشتەكانیش نەوەیان نابێ‌و منداڵیان نابێ. (ابن جرير).

## بەڵام عیلم بەبێ عەمەل سودی چیە؟

نەخێر سەدجار نەخێر بەڵكو ئەو عیلمە دەبێتە حوججە لەرۆژی قیامەت لەسەر خاوەنەكەی، جا هەر لێرەوە فەرمانی خوایی دەرچوو بۆی‌و دەری كردو نەفرەتی لێكرد، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ الحجر: ٣٤ - ٣٥(چونكە لە فەرمانی من سەرپێچیت كرد،

دەبێت لەم شوێنە نەمێنیت، كە بەهەشتە یان ئاسمان) كەواتە دەرچۆ لێرە چونكە بەڕاستی تۆ نەفرین لێكراویت. (٣٤) بەڕاستی نەفرینی خوات بەردەوام لەسەرە هەتا ڕۆژی دوایی. ﴾

پاشان ئیبلیس بەهۆی خۆ بەگەورە زانینی لەسوجدە بردن بۆ ئادەم دەركرا لەبەهەشت و ئادەمی كردە جێ نشینی پێش ئەوەی ئیبلیس دابەزێتە سەر زەوی، گوێتان لێ نەبووە خوای گەورە چی فەرمووە: ﴿ وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ البقرة: ٣٥ - ٣٦ئینجا وتمان: ئەی ئادەم خۆت و هاوسەرت لەم بەهەشتەدا ژیان بەرنەسەرو نیشتەجێ بن لەهەر كوێ حەزدەكەن بخۆن و بخۆنەوە بەتێرو تەسەلی، بەڵام نزیكی ئەم درەختە مەكەون (درەختێكی دیاری كراو بۆ تاقی كردنەوە لێیان قەدەغە كرا) ئەگینا دەچنە ڕیزی ستەمكارانەوە. (٣٥) شەیتان (فرسەتی لێهێنان) و لە خشتەی بردن (وای لێكردن لە بەرو بوومی درەختە قەدەغە كراوەكە بخۆن) و لەو شوێنە (خۆش و پڕ لە نازو نیعمەتە) بەدەركردنی دان، ئەوسا پێمان وتن: (مادەم سەرپێچیتان كرد ئیتر لێرە جێتان نابێتەوە)، دەبێت دابەزنە خوارەوە بۆ سەر زەوی، جا (لەوێ) هەندێكتان دوژمنی هەندێكتانن (شەیتان دوژمنی ئێوەیە و بەردەوام هەوڵ دەدات دوژمنایەتی لە نێوانتاندا بەرپا بكات)، تاماوەیەكی دیاری كراو نیشتەجێ دەبن لەزەویداو لە نازو نیعمەتەكان سوود وەردەگرن و بەهرەوەر دەبن. ﴾

لێرەدا روون دەبێتەوە کەوا ئیبلیس پاش ئەوەی نەفرەتی لێکراو گەورەیی خۆی بەدەرخستو ئادەم و حەوای لەتاعەتی خوا لادا، چونکە سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ ئادەم پاش ئەوەی بوو، کە خوا روحی فو تێکرد، جا لەو کاتەدا ئیبلیس قایل نەبوو سوجدەی بۆ ببات، هەر لەو کاتەشەوە لەعنەتی خوا بەری کەوت. (ابن جریر).

بەم جۆرە دوژمنایەتی لەنێوان شەیتان و ئادەم قوڵ بوویەوە بۆیە شەیتان بیری لەتۆڵەکردنەوە کردەوە لەخۆیو نەوەکەیو هەڵسا بە دانانی پلانێکی پیس و نگریس هەروەکو ، کە خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ الحجر: ٣٦ شەیتان وتی: پەروەردگارا، مۆڵەتم بدە هەتا ئەو ڕۆژەی هەمووان زیندوو دەکرێنەوە. ﴾

## بم هێڵەوە تا رۆژی قیامەت

ئیبلیس شایەن بوو بەو پاداشتە عادیلانە ئەمەش لەسەر منجریو هەڵگەڕانەوەو خۆ بەگەورە زانینی بۆیە خوای گەورە بە زەلیلیو سەرشۆڕی دەریکرد لەبەهەشت، لێرە ئیبلیسی نەفرەت لێکراو داوای لەخوای گەورە کرد بیهێڵێتەوە تا ڕۆژی قیامەت. خوای گەورەش وەڵامی دایەوەو داواکەی جێ بەجێ کرد ئەمەش بۆ حیکمەتو داناییەك، کە هەر خوای گەورە دەیزانێ، خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ ص: ٨٠ - ٨١ باشە تۆ لە مۆڵەت دراوانیت... (٨٠) تا ڕۆژو کاتی دیاریکراو. کاتی دیاری کراویش (الوقت المعلوم) ڕۆژی قیامەتە. ﴾ جا خوای حەلیم هێشتیەوە کە هەرگیز پەلە لەحوکم دان ناکات لەسەر ئەوانەی سەرپێچی دەکەن.

ئیبلیس داوای مانەوەی کرد هەتا ڕۆژی قیامەت نەك لەبەر ئەوەی پەشیمان ببێتەوە لەهەڵەکەی یان تەوبە بکاتو کەفارەتی ئەو گوناهەی بدات کە ئەنجامی دا بەڵکو بۆ ئەوە بوو، کە تۆڵە لەئادەم و نەوەکەی بکاتەوە وەك سزایەك چونکە شەیتان وای دەزانی لەبەر ئەوەی سوجدەی بۆ ئادەم نەبردوە لەبەر ئەوە خوا دەریکرد بۆیە خوای گەورە نەفرەتی لێکردو دەریکرد بەڵام نەیدەزانی لەبەر ئەوەیە کە فەرمانی خوای گەورەی شکاندووە.

پاشان، کە دڵنیابوو دەمینێتەوە هەتا ڕۆژی دوایی‌و، خواش ئارەزوەکەی جێ بەجێ کرد هەتا ڕۆژی دیاریکراو، ئەمین بوو لەمردن هەتا ڕۆژی قیامەت ئەوا دەستی بە سەرپێچی و هەڵگەڕانەوە کردو پاداشتی ئەمەی بە کوفرو توغیان دایەوە و وتی : ﴿قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ الأعراف: ١٦ - ١٧ شەیتان وتی: بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد، ئەوە سوێند بێت منیش لە ڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دادەنیشم (لایان بدەم). (١٦) پاشان سوێند بەخوا لە بەردەمیانەوە، لە پشتیانەوە، لە لای ڕاستیانەوە، لە لای چەپیانەوە، بۆیان دێم و (دنیایان لاخۆشەویست دەکەم و گومانیان دەربارەی قیامەت لادروست دەکەم) و دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاسگوزار بن.﴾

واتە: خوای گەورە بەهۆی ئەوەی حوکمی دۆڕاویت بەسەرە من دادا سوێند دەخۆم هەموو توانام بەگەڕ بخەم بۆ گومڕاکردنی نەوەی ئادەم‌و لایانبدەم لەڕێگە ڕاستەکەت، کە بۆ ئەم مەبەستە هەموو ڕێگەیەك بەکاردەهێنم، لەهەموو لایەکیشەوە بۆیان دێم و چاوەڕێی بێ ئاگاییەك دەکەم لەوان هەتا هەڵیانبخەڵەتێنم و فەسادیان بکەم‌و، وایان لێ بکەم زۆربەیان شوکرانە بژێوی تۆ نەکەن.

خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ الأعراف: لە بەهەشت دەرچۆرە دەرەوە بەسەرشۆڕی و ڕیسوایی و دەرکراوی، سوێند بە خوا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە ئێوە هەموو. ﴾

جا خوای گەورە لەرەحمەتی خۆی بێ بەشیکرد، پاش ئەوەی کە لەبەهەشت دەریکرد، جا ئیبلیس سوێندی بە گەورەیی خوا خوارد کە لە بۆسەدابێت بۆ بەندەکانی بەمەبەستی لادانیان‌و بۆ ئەم مەبەستەش هەموو ڕێگایەك بگرێتە بەرو هەموو تواناپەکیشی بەکاربێنێ، تەنها بەندە دڵسۆزەکانی نەبێ ، هەروەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾ ص: ٨٢ - ٨٣ ئینجا شەیتان وتی: سوێند بەدەسەلاتی بێ سنوورت شەرت بێت هەر هەموویان گومڕاو سەرگەردان بکەم. (٨٢) جگە لە بەندە و عەبدە دڵسۆزەکانت کە هەڵبژاردەی خۆتن (دەسەلاتی ئەوانم نیە). ﴾

بەم شێوەیە ئیبلیس جەنگەکەی دەست پێکرد لەسەر زەوی‌و کەل‌و پەلەکانیشی بۆ ئامادەکرد ، کە ئەویش بریتیە لەجوان کردن‌و ڕازاندنەوەی گوناهو تاوان بۆ مرۆڤ، چونکە مرۆڤ هەر گوناهێك بکات ئەوا هەر پشکێکی شەیتانی تیادایە لەهاندان‌و ڕازاندنەوەو جوان کردنی، جا با خەڵکی لەکەل‌و پەلەکانی شەیتان تێبفکرن‌و خۆیانی لێ بە دوور بگرن‌و بپارێزن هەر کاتێك بینیان وا شەیتان بۆیان دەڕازێنێتەوەو بۆیان خۆشەویست دەکات لەدەرونیان، پاشانیش با خۆیان بە خوا لەشەیتان بپارێزن چونکە بە وتەی خۆی ناتوانێ بەندە دڵسۆزەکان لەخشتە ببات ﴿ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾.

## وتاری ئیبلیس لەنێو ئاگر

خوای گەورە لەکیتابەکەی خۆی فەرمویەتی: ﴿ وَقَالَ ٱلشَّيْطَٰنُ لَمَّا قُضِىَ ٱلْأَمْرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ ٱلْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِىَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوْتُكُمْ فَٱسْتَجَبْتُمْ لِى ۖ فَلَا تَلُومُونِى وَلُومُوٓا۟ أَنفُسَكُم ۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَآ أَنتُم بِمُصْرِخِىَّ ۖ إِنِّى كَفَرْتُ بِمَآ أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ ۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٢﴾ إبراهيم: ٢٢ کاتیٚ هەمووشت تەواو دەبێت بەهەشتیەکان دەچنە بەهەشتەوە و دۆزەخیەکان دەخرێنە دۆزەخەوە) شەیتان (بەفەرمانی خوا) دێتە قسەو (ڕوو بە پەیڕەوانی) دەڵێت: بەڕاستی خوا بەڵێنی ڕاست و دروستی پیٚ ڕاگەیاندبوون منیش بەڵێنی درۆو نادروستم پێدان و جا توانیم گومڕاتان بکەم و لە ڕێبازی ڕاست و وێڵتان بکەم، وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەسوەسەوخەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن (بۆ خوانەناسی و تاوان) ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم، ئیتر سەرزەنشت و لۆمەی من مەکەن، بەڵکو سەرزەنشت و لۆمەی خۆتان بکەن (کە ئاوا گێلانە، بیٚ بیرکردنەوە بەقسەتان کردم، ئەمڕۆ) من ناتوانم بەهاناو هاواری ئێوەوە بێم، ئێوەش ناتوانن بە هاناو هاواری منەوە بێن، بێگومان من باوەڕم نەبوو بەوەی کە کاتی خۆی منتان کردبوو بەشەریك و هاوبەش لە پێشدا، بەڕاستی ئەمڕۆ ستەمکاران سزای زۆر بەئێش دەدرێن. ﴾

ئەمە ناونیشانی (وتاری ئیبلیسە لەنێو ئاگر) کە پێشەواو زانای بەناوبانگ (ابن کثیر) لەتەفسیرەکەیدا وتویەتی،بە مەزەندەی منیش لەو ناونیشانەدا پێویستی بە هەندێك روونکردنەوە هەیە بۆ راست کردنەوەی ئەوەی لەخولیای خوێنەردا دروست دەبێت لەچۆنیەتی ئەو وێنەیەی، کە شەیتان وتارەکەی پیٚ دەدات، زانینی ئەمە گرنگە

لەبەدیهێنانی ئەو مانا نەفسیەی بۆ خوێنەر دروست دەبێت بۆ ئەم ئایەتە گەورەیە، چونکە بیرو بۆچوونی موسوڵمان بۆ وتار بێژێك، كە لەسەر مینبەرەو، سەری بەرز راگرتووەو، سنگی دەرپەڕاندووەو، بە متمانە بە خۆی قسە دەكاتو، گڕو تینو ترسێك دەدات بەسەر مانای ئەو وشانەی دەیانبێژێو، زیاتر هێز دەبەخشێت بە بێژەكان، هەروەكو ئەمە كاری جوولەی دەستە بۆ وتاربێژ یان مامۆستایانی ئامۆژگاریكەر، ئەو مەوقیفەی ، كە شەیتان وتارەكەی تیادا دەدات هیچ جۆرێك لەو مانایانەی تێدا نیە، بەڵكو لەهەموو روێكەوە پێچەوانەیەتی.

ئەگەر كاری وتار بێژ ئەوهابێت ، كە بەردەوام وتارەكەی لەجێگەیەكی بڵندەوە ئاراستەی گوێگرانی بكات، ئەوا شەیتان لێرە لەژێرەوە وتار دەدات.

ئەگەر وتار بێژ لەسەر مینبەرەكەی بڕیار بداو ئامۆژگاری بكاو خەڵك فێر بكات، ئەوا ئیبلیس لێرە دەیەوێ خۆی بێ تاوان بكاو خۆیو خەڵكی شەرمەزارو سەرشۆڕ دەكات.

ئەگەر وتاربێژ سەری بەرز بكاتەوە بۆ ئەوەی خەڵكی ببینێ و بەرگی ترسو هێز لەبەر بێژەكانی بكات، ئەوا ئیبلیس لێرەدا وێك دێتەوەو بچوك دەبێتەوە چونكە ئەوانەی بە توڕەییەوە داوای مافە خوراوەكانیان دەكەنو داوای روونكردنەوە دەكەن ئەوا شەیتان زیاتر بچوك و سەر شۆڕ دەكەن.

ئیبلیس لە وتارەیدا گیرساوە لەپلەی ژێرەوەی ژێرەوەی دۆزەخ، كە ماڵ وێران و دۆڕاو و سەرگەردانەو، ئاگر لەهەموو لایەكەوە شالاوی بۆ دەبات و سزاو ئێش لەهەموو لایەكەوە بۆی دێت، فریشتەكانی سزاش لەهەموو كونو كەلەبەرێكەوە لێی دەدەن، هاوار هاواری دەستو پێوەندەكانیشی زیاتر ئازاری دەدەن و بەدەبەختی دەكەن، روانینیشی بۆ هەژارو نەدارەكان، كە پێشتر سوكایەتی پێدەكردنو خۆی بە گەورە دەگرت لەسەریانو ئێستاش لەبەهەشتدا پادشانە ئەوا زیاتر دڵی ئاگری تێ بەردەبێ و

زیاتر پەشیمان دەبێتەوە. بەم جۆرە پێویستە ئەم وتارە بخوێنینەوە و لێی تێبگەین ئەگینا دەکەوینە ناو هەڵەیەکی زۆر لەمەر تێگەیشتنمان بۆ ئەوی خوا فەرمویەتی.

(حسن البصری) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: ئیبلیس لەسەر مینبەرێکی ئاگر رادەوەستێ: باشە کێ بەخۆی ئەمە بۆ خۆی بڕیاردەدا؟ جا ئەوەی پێشەوا (حسن البصری) وتویەتی – والله أعلم– ئەوەیە، کە پێی خۆش بێ یان نا ئەوە بۆی دادەنێن، ئەم مانایە هیچ دژایەتیەك‌و دووریەکی تێدا نیە لەوەی روونمان کردەوە وتمان –والله الموفق للصواب– ئەو ئایەتەی باس لەوتاری شەیتان دەکات وتراوە لەقورئان لەپاش ئەوەی خوای گەورە هەواڵی بەرپرسەکان‌و سەرکردەکانمان بۆ باس دەکات کە چۆن لەئاست دەست‌و پێوەندەکانیان خۆیان بێ تاوان دەکەن‌و وەکو ئەوەی ئەوان هیچ خەتایەکیان نەکردبێ

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَبَرَزُوا لِلَّهِ جَمِيعًا فَقَالَ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنْتُمْ مُغْنُونَ عَنَّا مِنْ عَذَابِ اللَّهِ مِنْ شَيْءٍ قَالُوا لَوْ هَدَانَا اللَّهُ لَهَدَيْنَاكُمْ سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَجَزِعْنَا أَمْ صَبَرْنَا مَا لَنَا مِنْ مَحِيصٍ ﴿٢١﴾ إبراهيم: ٢١ (ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت) هەمووان لەبەردەم دەسەڵاتی خوادا دەردەکەون، ئینجا لاوازو بێ دەسەڵاتەکان (ئەوانەی کوێرانە شوێن ملهوڕو ستەمکاران کەوتبوون) دەڵێن: بەوانەی کە خۆیان بەزل و گەورە دانابوو، بێگومان خۆ ئێمە شوێن ئێوە کەوتبووین ! (ئێمە گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری ئێوە بووین!) جا ئایا ئێوە ئەمڕۆ ناتوانن هەوڵێك بدەن تائەندازەیەك سزای خوا لەسەرمان کەم ببێتەوە، لەوەڵامیاندا وتیان: ئەگەر خوا هیدایەتی ئێمەی بدایە، ئێمەش هیدایەتی ئێوەمان دەدا، (ئەڵبەت ڕوون و ئاشکرایە کەئەوانە بە دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵاتیانەوە لە دنیادا نەك هیدایەتیان نەدەویست بەڵکو دژی دەوەستان و پیلانیان دەگێڕا، ئیتر چۆن خوای گەورە

هیدایەتی ئەو جۆرە کەسانە دەدات، خۆ هیدایەت بەزۆر نیە) ئێستەش بۆ ئێمە چوونیەکە، هاوارو ئاهو ناڵە بکەین، یان دان بەخۆدا بگرین، چارمان نیە و ڕزگار بوونمان ئەستەمە. ﴾

جا گونجان لەنێوان هەردوو ئایەتدا زۆر روون وئاشکرایە بەراستی ریزبەندی هەردوو ئایەت باس لەرووداوێکی هەرە گرنگ دەکات ئەویش مەسەلەی دەستو پێوەندەکانە، کە ئەوانە هیچ بەهانەیەکیان نیە لەلای خوای گەورە بەوەی بێ هێز بوون‌و کەم ژێر بوون، چونکە ئەوان بە زەلیلی‌و خۆ بەدەستەوەدان رازی بوون‌و لەسەر مەزهەبی گەورەکانیان بوون و بەهانەیان بۆ دەهێنانەوە ئەمەش بە هانەیەکە دووبارە دەبێتەوە بە درێژایی مێژوو، کە خەڵکی بە شێوازی جیاواز جیاواز گوزارشتی لەبارەوە دەکەن بە بێژەی جیاواز دەری دەبڕن بەڵام هەمووی لەیەك مانادا خۆی دەبینێتەوە ئەویش (کنا مستضعفین في الأرض) بەڵام خوای گەورە ئەو بەهانەیەی لەدونیاو ئاخیرەت پوچەڵ کردۆتەوە، سەبارەت بە دونیا ئەوا خوای گەورە شوێن کەوتەی فیرعەونەکان و تاغوتەکانی لەگەڵ گەورەکانیان پێکەوە لەناو بردووەو، هیچ کەسێکیانی هەڵاوێر (استثناء) نەکردووە، خوای گەورە لەبارەی فیرعەون فەرمویەتی: ﴿ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ القصص: ٤٠ سەرەنجام ئێمە خۆی و سەربازان و دەست و پێوەندیمان پێچایەوە و فڕێمان دانە ناو دەریاکەوە، سەرنج بدە و تەماشا بکە و بزانە: چۆن بوو سەرئەنجامی ستەمکاران.

﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُۥ وَمَا كَانُوا۟ يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾ الأعراف: ١٣٧هەرچیش فیرعەون و قەومەکەی دروستیان دەکردو ئەو کۆشك و تەلارسازیەی کە دەیانکرد، هەر هەموویمان کاول و وێران کرد. ﴾

سەبارەت بە ڕۆژی قیامەتیش ئەوا هەم لەم ئایەتەو ئایەتەکانی تری هاو شێوەی ڕوون کراوەتەوە.

پێشەوا (ابن القيم) خوا لێی ڕازی بێت – لەکیتابەکەی (طريق الهجرتين) پلەی موکەللەفەکانی باس کردووە، لەوانە پلەی ئەو مرۆڤانەی کە وەك ئاژەڵ وانە لەوانەی تەقلیدی کافرەکان و تاغوتەکان دەکەنەوە –خوا بمان پارێزێ لەوە –.

ئایەتەکان لەو باسەوە ئاگاداری دەکەنەوە لەتەقلیدی کوێرانەو، بەکارنەهێنانی ئەو نیعمەتە گەورەیەی، کە خوای گەورە بەخشیوەتی بە مرۆڤ ئەویش، کە عەقڵو ڕوانینە..

هەروەها تیایدا لەبانگەشەکردن بۆ قەبول نەکردنی لاوازی و زەلیلی، چونکە لاوازیو زەلیلی ڕێگای کافران و گومڕایانە – پەنا بە خوا – مرۆڤ لە –زانست و ویست و مەبەست – پێك هاتووە، ئیسلامیش هاتووە ئەمانە ڕزگار بکا لەکۆتو زنجیر و ڕێگرەکان، پێشکەوتنی ئوممەتەکانیش تەنها بە پێشکەوتنی زانست و ڕزگارکردنی ویست و مەبەست دەبێت پێشەوا شافیعیش ڕاستی وتووە کاتێك مەدحی خۆی دەکا بەوەی زەلیلیو لاوازی بە کوفر لەقەلەم دەدا هەروەکو، کەلەدیوانەکەیدا هاتووە، دواکەوتنی ئوممەتەکەشمان هەر بە هۆی زەلیلیو لاوازی بووە، کە کوێرانەو نەزانانە تەقلیدی کافرانی کردۆتەوە، هەروا بە هۆی ڕووخانی ویستەکانی بە هۆی ئەو بەستەرانەی کە شەهەواتو بیروبۆچوونە پوچەڵەکان بەستویانەتەوە.

لەبارەی وتەی شەیتان (وقال الشيطان لما قضي الأمر ...)

ئەوا پێویستە بیرو بۆچونێك ڕوون بکەینەوە بۆ ئەوەی بۆ پێش وتەی شەیتان بکەویت، کە ئەویش شوێن کەوتەو بەندەکانیتی، چونکە ئەوانە لە نێوانە خۆیان ڕاوێژیان کردووەو ڕێککەوتونە لەسەر سەر زەنشت کردنی و داوا دەکەن بە ئەنجامدانی بەڵێنەکانی جا وەك شاڵاو دێن بۆداوا کردن لەشەیتان بۆ بەهانە هێنانەوە بۆ ئەو بارەی

ئەوان پێی گەیشتوونەو، یەك بە دەمی خۆیان هاوار دەكەن: ئەی شەیتان...ئەی ئیبلیس...كوانی ئەوەی بەڵێنت پێداین؟ كوا ئەوانەی بۆمانت رازاندەوەو جوانت كرد؟ كوانی سوێندەكەت لەسەر ئەوەی راست گۆیت بەرامبەر بە بەڵێنو پەیمانەكانت، ئەوان لەناو دۆزەخ هاوار دەكەن جا یان ئەوان رایان كێشاوە هەتا دایاننناوە لەسەر مینبەرێكی ئاسن...یانیش ئەو خۆی بچوك كردۆتەوەو ئەو وشانەی دركاندووە بۆ ئەوەی ئەوەندەی پێی دەكرێ زەلیلیو سەرشۆڕیەكەی بشواتەوە، بەڵام تازە كار لەكار ترازاوە و كارەكە بڕایەوە و خەڵكیش هەریەكە چویتە شوێنی خۆی: شەیتانو حیزبەكەی بۆ ناو ئاگر و حیزبی خواش بۆ بەهەشت شەیتان پێیان دەڵێ: (إن الله وعدكم وعد الحق ووعدتكم فأخلفتكم).

جا بەڵێنی شەیتان لەو ئایەتە وەكو وەسفی خوای گەورەیە لەو ئایەتە كەوا باسی كردەوەی كافرەكان دەكات خوای گەوەر دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٣٩﴾ النور: ٣٩ئەوانەی كە ڕێبازی كوفریان گرتۆتە بەر كردەوەكانیان وەك تراویلكەو سەرابێك وایە لە بیابانێكدا بریسكە بداتەوە كەسێكی تینوو وا بزانێت ئاوە (بەتاڵوكە بۆی بچێت)، هەتا كاتێك گەیشتە لای دەبینێت هیچ نیە، ئەوسا (كاتێك بەخۆی..دەزانێت ژیانی كۆتایەو قیامەت بەرپا بووە) خوایش ئامادەیە لەلایدا بە گوێرەی كردەوەی موحاسەبەی دەكات و لێی دەپرسێتەوە، خوایش بە خێرایی لێ پرسینەوە ئەنجام دەدات. ﴾

خوا بەڵێنی داوەو بەڵێنەكەشی حەقەو ، چونكە تواناداره بەڵێنەكانی بێنێتە دی و هیچ شتێكیش ناتوانی ڕێی پێ بگری ئەگەر هاتوو ویستی شتێك بكات. خودا بەڵێنی پێدان بە زیندوو بوونەوەو بەهەشتو دۆزەخ، بەوەی گوێرایەڵەكان پاداشت وەربگرنو

سەرپێچی کەرانیش سزا، هەروا بەڵێنی پێدان ئەگەر شوێنی پێغەمبەران بکەون ئەوان راستەرێ دەبن‌و رزگارتان دەبێ، بەڵێنەکەشی بەڵێنی حەق بوو بۆی هێنانە دی، منیش بەڵێنم پێدان کەوا نە زیندوو بوونەوە هەیە و نە بەهەشت و نە ئاگر و نە پاداشت‌و نە سزاو دواتریش بەڵێنەکەی کە بە ئێوەم دابوو نەم هێنایە دێ.

(فأخلفتکم) وشەیەکە، کە هیچ هیوایەکی نەهێشت لەدەرونیان دا و هەموو ئاواتەکانیان پچڕاندو، هیچ هیوایەکیان نەما، ئەگەر شەیتان هەندێك جار راستی بڵێ ئەوا ئەو راستیەی لەو شوێنەدا تەنها وێنەیەکە بۆ حەقیقەتی ئەو کارەی، کە هیچ شتێك ناتوانێ رەتی بکاتەوە کاروباری پاش‌و پێشیش هەر بۆ خوایەو هەر خوا بڕیاری لەسەر دەدا. پاشان بە چەند وشەیەکی کورت و خێرا، وەکو هەموو وتارێك خۆی لەبەرامبەریان بێ تاوان کرد و وتی ((وما کان لي علیکم من سلطان إلا أن دعوتکم فاستجبتم لي...)).

وشەی (السلطان) لێرەدا زانایان لەبارەی راڤەکردنیەوە رای جیاوازیان هەیە، زۆربەیان دەڵێن ماناکەی واتە: دەلیل و بەڵگەیە واتە: من هیچ دەلیل‌و بەڵگەیەکم بە دەستەوە نەبوو لەوەی بانگم کردن بۆ شیرك و کوفر و تاوان، بەڵکو هەر من بە تەنها کاتێك ئاڵای ئارەزووبازیم بۆ بڵند کردن ئێوەش بێ ئەوەی تێبفکرن‌و بیری لێ بکەنەوە ئەوا رووتان تێکرد، هەندێکیش لەزانایان وتویانە وشەی (السلطان) لێرەدا بە مانی هێزو دەسەڵات دێت، واتە من بەهێزو دەسەلات پاڵم بە ئێوە نەنا بۆ لای شیرك‌و کوفر بەڵکو ئێوە بە ئارەزوو سەربەستی خۆتان ئەو کارەتان کرد، دووریش نیە وشەی (السلطان) ئەمەو ئەویتریان بگرێتەوە، بەڵام وشەی (السلطان) گشتگیرترە لەمە، چونکە شەیتان دەیەوێ خۆی بدزێتەوەو خۆی بە بێ تاوان لەقەڵەم بدات و دەست‌و پێوەندەکانی تاوانبار بکات لەوەی کردویانە، بەڵام خۆی بە هەڵەی خۆی داهاتەوە لەوەی ئەنجامی دەدا (إلا أن دعوتکم) بەم شێوەیە هەموو ئەوەی پێی هەڵسابوو لەرازاندنەوەی شتی

پڕو پوچ و سەرخستنی بۆ شەڕو وەسوەسە کردنی بۆ دڵی خەڵکی ئەوا هەمووی سڕیەوە بە وشەی (دعوتکم).

ئەم وشەیەش وشەیەکی خۆ دزینەوەو بێ تاوانیە بەڵام لەهەمان کاتدا وشەیەکی دەم کوتکەرو زەلیلیو سەر شۆڕیە بۆ دەستو پێوەندەکانی، ئەمەش بێگومان دڵیان پڕ دەکات لەنەهامەتیو پەشیمان بونەوە، چونکە هەر شەیتان بوو بانگی کردنو بۆی رازاندنەوەو وەسوەسەی بۆ کردنو، بەڵێنی پێدان و سروشی بۆ کردنو بەتیرەکانی بریندار کردنو، لەرێگای هەقیش هەزار کۆسپو لەمپەری داناو، بە ئاشکراو نهێنیش لەگەڵ دڵیان بوو وەك خوێن لەناویدا دەسوڕایەوە، شەیتان لەو رۆژەی خوا لەعنەتی لێکرد وتی بە پەروەردگاری : ﴿ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ الإسراء: ٦٢ (پاشان بێ شەرمانە) وتی: پێم بڵێ" ئا ئەمەیە کە ڕێزت داوە بەسەر مندا؟! سوێند بە خوا ئەگەر دوام بخەیت تا ڕۆژی قیامەت ئەوە بێگومان هەموو نەوەکانی گومڕاو سەرگەردان دەکەم جگە لە کەمێکیان (کە دەسەلاتم بەسەریاندا نیە).﴾ خوای گەورەش پێی وت: ﴿ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾ الإسراء: ٦٣ - ٦٥ خوای پەروەردگار فەرمووی: برۆ ئەوەی شوێنی تۆ بکەوێت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پاداشتی هەموانتانە، کە پاداشتێکی مسۆگەرەو جێگەی هەمووتانی تێدا دەبێتەوە... (٦٣) برۆ چیت لە دەست دێت درێغی مەکە، هەرکەس کە توانیت (لەو بەدبەختانە) بە بانگ کردن و هاندانیان بۆ تاوانکاری،

دایانبڕە، بەهۆی لەشکری سوارەو پیادەی خۆتەوە هێرشیان بۆ بەرەو هاوبەشییان بکە لە ماڵ و سامان و منداڵ و نەوەیاندا (بەسامانی حەرام و منداڵی زۆڵ، ..هتد)، ئەوەندەش بەڵێن و ئومێدیان پێ بدە، سەریان لێ بشێوێنە، هەرچەندە بەڵێن و هاندانی شەیتان جگە لە فریودان و فێڵکردن و ساختە، شتێکی تر نیە. (٦٤) بەڕاستی بەندەکانی من (ئەی شەیتانی نەفرین لێکراو) هیچ دەسەڵاتی تۆیان لەسەر نابێت و هەوڵ و کۆششی تۆ کاریان تێ ناکات و پەروەردگاری تۆ (ئەی ئیماندار) بەسە بۆ پارێزگاری و پاراستنت. ﴾

جا بەراورد بکە لەنێوان ئەو دوو کارە: پاڵنانی شەیتان بۆ خەڵکی بە دەنگ و بانگەشەکردن بۆ کوفرو شیرك و تاوان و ، بەشداری کردنی لەماڵ ومنداڵیان و راکێشانیان بێت بە هەر جۆرێك بۆ تاوان و هەروا بەڵێنە درۆیەکانی، کە ئەویش ئەو وتەیە کە وتی: (لأحتنكن ذريته) واتە قورت قورتۆکیان دەگرم بە توندی بۆ ئەوەی بۆ لای شەڕیان ببەم، لەنێوان وتەکەی تری کە وتی(دعوتكم) دەبینی کەوا شەیتان لەهەموو شوێنەکان درۆدەکاتو مراوەغە دەکات، ئەوەی کردی کورتی کردەوەو کەمی کردەوە لەوشەیەك، بەڵام بەدیهێنانی لەسەر واقیعی سەرزەوی ئەوا پێویستی بە راڤەیەکی گەلێك زۆر هەیە.

ئا بەم شێوەیە قسە پێ وتنو سەرزەنشت کردنیان روودەدات ئێوە وەڵامی شەیتانتان داوە تەنها بەوەی بانگی کردن بەڵام ئایە ئەوان بێدەنگ بوون؟ گوێ بگرە بزانە خوای گەورە چی فەرموو لەبارەی وەڵامی دەستو پێوەندەکان پاش وتەی سەرکردەو گەورەکان: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ سبأ: ٣٢ دەسەڵاتدارو زۆردارەکانیش بەلاوازکراوو ژێردەستەکان دەڵێن: بۆچی ئێمە ڕێگەی هیدایەتمان لێبەستبوون و

نەماندەهێشت دوای ئەوەی کە بۆتان هاتبوو؟! نا، وا نیە، خۆتان تاوانبارو تاوانکارن.﴾ دەست و پێوەندەکانیش وەڵامیان دایەوە: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٣﴾ سبأ: ٣٣

(دووبارە) لاوازکراو ژێردەستەکان بە زۆردارو دەسەڵاتدارەکان دەڵێن: نا، وانیە، بەڵکو پیلان و نەخشەی شەوانە ڕۆژ بوو کە فەرمانتان پیادەداین کە بڕوامان بە خوا نەبێ و (شوێنی ڕێگەو ڕێبازی نەکەوین)، هاوەڵی بۆ بریار بدەین، (پاشان هەموان) پەشیمانی لە دەرونیاندا دەشارنەوە (بەتایبەتی کاتێك کە) ئەو سزاو تۆڵەیان بینی کە بۆیان ئامادەیە، (ئەوسا ئیتر) کۆت و زنجیرمان کردە گەردنی ئەوانەی کە بێبڕوا بوون، مەگەر پاداشتیان لەبری کارو کردوەکانیان نیە؟!.﴾ بەڵێ..مەکری شەوو رۆژ بوو ، پلانێکی درێژ خایەنو نەفەس درێژو رێك بوو بۆ هەنگاوەکانی شەیتان بۆ ئەوەی پێیان هەر بخلیسکێنێ- پەنا بە خوا – پاشان پێی وتن (فلا تلوموني ولوموا أنفسكم).

کەواتە ئەوەی ئەوانە لەهاوارکردن دایان بە گوێچکەی شەیتان ئەوەبوو ، کە لۆمەیان کرد لەسەر ئەو شتانەی بۆی رازاندبونەوە جا لۆمەکە بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەو پرسیارەی کە ئاراستەی دەکرێ ئەوەیە، کە : بۆچی لۆمەی نەکەن؟ ئایا هەر ئەو بانگی نەکردن و هەر خۆشی دانی بەمە دانەنا؟! یان ئەمە تاوانێك نیە شایانی سزا بێت یان لۆمە، بەڵێ...هیچ عوزریان نیە لەلای خوای گەورە بەوەی شوێن شەیتان کەوتونەوەو بەڵێنەکانیان بە راست داناوە و بڕوایان پێکردووە، چونکە خوای گەورە لەبارەی شەیتان هۆشداری ئاگاداری داوەتە ئێمە بەوەی کە دوژمنە. خوای گەورە

فەرمویەتی: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾﴾ الأنعام: ١٤٢ نەکەن شوێن هەنگاو و (نەخشە و پیلانەکانی) شەیتان بکەون، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکرای ئێوەیە. ﴾

پاشان دەڵێ: (ما أنا بمصرخكم وما أنتم بمصرخي)

بەم شێوەیە لەقسەکانیدا (تدرج)ی کرد هەتا گەیشتە ئەم راستیە، ئەویش: کە ناتوانی بە هانایان بێت و رزگاریان بکات، هەروەها ئەوانیش بە هەمان شێوە ناتوانن بەهانای بێن و رزگاری بکەن ، عەرەبیش دەڵێنە (نجده) و(مغیث) و (معین): (الصارخ)، (صراخ)یش واتە هاوارکردن.

(أمیه بن أبی الصلت) وتویەتی:

ولیس لكم عندی غناءٌ ولا نصر　　　ولا تجزعوا إنی لكم غیر مصرخ

واتە: بەهاناتان نایەم.

بەم شێوەیە تەنها سەرابێکی فێڵاویان دیتەوە، لەگەڵ چەند بەڵێنو پەیمانێکی درۆو پووچ، مرۆڤیش ئەوەندەی پێی دەکرێ ئەنجامی دەدا لێرەشدا شەیتان ناتوانێ خۆی رزگار بکا، جا چۆن دەتوانێ کەسانیتر رزگار بکا؟پاشان کەی شەیتان توانیتی شتێك بۆ دەستو پێوەندەکانو بەندەکاتی بکات؟! کەی راستی کردووە لەبەدیهێنانی یەك بەڵێنُ، کە بە خۆی پێی داون؟

ئای ئەو کەسە چەند بەدبەختە، کە شوێن شەیتان دەکەوێتو متمانە بە بەڵێنەکانی دەکات. لەکۆتاییدا پێیان دەڵێ: (إنی كفرت بما أشركتمونی من قبل....)

ئا ئەوە عیبادەتەکەیان بە دەم وچاویان دا دەداتەوەو هیچ نرخێکی بۆ دانەناو کوفری بە عیبادەتەکەیان کردو، خۆی کێشاوە لەوەی، کە پێشتر کردبویانە شەریك لەگەڵ خوای گەورە، کوفری بە شیرکەکەیان کرد، ئەوە دان پیانانێکە لەوەی کەوا

خوای ئەوان بووە بەڵام خوایەکی درۆو عیبادەتێکی پووچ، هەرچی بۆشیان کردوە لەگوێڕایەڵی‌و عیبادەت بە هیوای پاداشت دانەوە ئەوا وەك سەرابی ئاو بەفیڕۆ چوو.

بەم شێوەیە روون بۆوە بۆ شوێن کەوتەکانی، کە دەیانبینین هەموو دۆڵەکانیان پڕکردووەو، شەریعەت لەوەوە وەردەگرن‌و، فریشەکەیان[1] دەڕوخێنن بەهۆی سەردانواندنیان بۆی‌و ، پشتیش وەردەگێڕن،لەخواو شەریعەتەکەی و، سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) جا بۆیان روون دەبێتەوە، کە بەڵێنەکانی درۆ بوون‌و، کۆتایی پەیوەندیەکەشیان بووە لێکدابڕان‌و خۆ بێ تاوان کردن‌و خۆکێشانەوە بە جۆرێك، کە ئەو لەهیچ شوێنێك، کە پێویستیان پێیەتی ئەوا بەهانایان نایەت و رزگاریان ناکات.

بزانن، کە فەرمایشتی خوای گەورە راستەو بەڵێنەکانیشی راستن، کە هەواڵیشی پێداوین بەم گفت‌و گۆیەی نێوان شەیتان‌و شوێن کەوتوەکانی ئەوا بۆ ئەوەیە وانەو ئامۆژگاری لێوەربگرێت بۆ ئەوەی هەتا کار لەکار نەترازاوە بە خۆماندا بچینەوە، جا لەو رۆژەدا ستەم کارەکان هیچ عوزرێك‌و بە هانەیەکیان لێ وەرناگیرێ کەواتە با خەڵکی خێرا پەیوەندی لەگەڵ خوای گەورە ببەستن‌و پەیوەندی لەگەڵ شەیتان‌و سەربازەکانی بپچڕێنن‌و، گوێ لەوتەی خوای گەورە بگرن. ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ يس: ٦٠ - ٦١ئەوسا خوای گەورە گلەیی لە یاخیەکانی نەوەی ئادەم دەکات و دەفەرموێت: ئەی نەوەی ئادەم، مەگەر من پێم ڕانەگەیاندن کە شەیتان نەپەرستن، چونکە ئەو بەڕاستی دوژمنی ئاشکراتانە. (٦٠) بەڵکو تەنها من بپەرستن کە هەر ئەمەیە ڕێگەو ڕێبازی ڕاست و دروست. ﴾

وەیل بۆ ئەو کەسەی دڵیان لەئاست زیکرو یادی خوا رەقە.

---

(١) فریشك واتە (فطرة)

## ٢- قابیل

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ المائدة: ٢٧

(قرطبي) وتویەتی: ئیبلیس یەکەم کەس بوو کوفری کرد و دایهێنا قابیلیش یەکەم کەس بوو کوشتنی داهێنا، بنچینەکەشی هەمووی حەسادەت بوو.

(ابن کثیر) لەتەفسیرەکەیدا وتویەتی: خوای گەورە رێی دابوو بە ئادەم کچەکانی بداتە کوڕەکانی لەبەر پێویستی، بەڵام دەڵێن لەهەر زگێکدا کوڕێك و کچێکی دەبوو، جا کچی ئەو زگەی لەکوڕی زگەکەی تر مارە دەکرد، خوشکی هابیل ناشیرین بوو خوشکی قابیلییش جوان بوو، ویستی نەیداتە براکەی و بۆ خۆی بێ، بەڵام ئادەم رازی نەبوو وتی هەریەکتان قوربانیەك بکەن، جا ئەوەی لێی وەرگیرا بۆ ئەو دەبێ، جا لە هابیل وەرگیراو، لەقابیل وەرنەگیرا، ئەوەش، کە خوای گەورە لەکیتابەکەی خۆیدا باسی کردووە بۆ مان.

(سدي) لە(ابن عباس) و (ابن مسعود) وە دەگێڕێتەوە، کە هەر دووکیان قوربانیەکیان بۆ خوای گەورە کرد بۆ ئەوەی کێ شایەنتر بێت بەو کچە، هابیل کاوڕێکی قەڵەوی کردە قوربانی، قابیلیش دەسکە گەنمێکی کردە قوربانی، بەڵام گوڵێکی قەڵەوی تێدا بەدی کردو هەڵیوەراندو خواردی، جا ئاگر هاتە خوارەوەو قوربانیەکەی هابیلی خواردو نزیك قوربانیەکەی قابیل نەکەوت، جا توڕە بوو وتی: دەتکوژم بۆ ئەوەی خوشکم نەخوازی، هابیل وتی: ﴿إنما يتقبل الله من المتقين﴾ . (رواه ابن جرير).

برایە پیاو چاکەکەی ئەوەی خوای گەورە قوربانیەکەی لێ وەرگرت لەبەر تەقوایەکەی، کاتێك برایەکەی هەڕەشەی کوشتنی لێکرد بێ ئەوەی هیچ تاوانی هەبێت

وتی ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ ﴾المائدة: ٢٨ واتە من وەکو تۆ ناکەم بەوەی پاداشتی خراپە بە خراپە بدەمەوە و دواتر من و تۆ وەك یەك بەشدار بین لەتاوان ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە: من لە خوای بالادەست دەترسم لەوەی وەك تۆ بکەم، بەڵکو ئارام دەگرم، (ابن جریر) لە(عبدالله بن عمرو) دەگێڕێتەوە، کە وتویەتی: سوێند بەخوا پیاوە کوژراوەکە بە تواناتر بووە لەبکوژەکە بەلام ئەو دەستی نەچوە برایەکەی بۆئەوەی بیکوژێ.

﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾المائدة: ٢٩

(مجاهد) وتویەتی: واتە من دەمەوێ تاوان و خوێنەکەم بکەوێتە ئەستۆی تۆ. ئەگەر وترا چۆن هابیل تاوانی کوشتنی خۆی هاوێشتە ملی قابیل؟ لەوەلامدا دەڵێین: هابیل پێشتر دەریخست کە ئەگەر براکەی بیەوێ بیکوژێ ئەو دەستی بۆ درێژ ناکات، بەڵکو ئەگەر ئەو ویستی دەستی بۆ درێژ بکات ئەو دەستی بۆ درێژ ناکاتو گوناهەکە هەموو دەکەوێتە ئەستۆی خۆی. جا ئەو قسەیە ئامۆژگاری یە بۆی ئەگەر وەریبگرێ ئەگینا سەرکۆنەیە بۆی ئەگەر دەست هەڵبگرێ، بۆیە پێی وت: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ ﴾ واتە: گوناهی خۆم و خۆت دەبێ هەڵیبگری ﴿فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ (ابن عباس) وتویەتی: بە ئاگر ترساندی بەلام ئەو نەترساو دەستی لەو تاوانە هەڵنەگرت. ﴿ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾المائدة: ٣٠

واتە:خۆی ئەو كارەی بۆ خۆی جوان كردو رازاندەوەو دەروونەكەی هانیدا بۆئەوەی برایەكەی خۆی بكوژێ. واتە: پاش ئەو ئامۆژگاریەی كە كرا ئەو هەر دەستی هەڵنەگرت و بە پارچە ئاسنێك، كە لەدەستی بوو برایەكەی خۆی كوشت.

(سدی) وتویەتی: قابیل لەدوای برایەكەی دەگەڕا بۆ ئەوەی بیكوژێ بەڵام ئەو بۆ ناو چیاو دۆڵ رایكرد، جا رۆژێك لەرۆژان هات بینی مەڕ ئەڵەوەڕێنێ، بەردێكی بەرزكردەوەو بەسەری داداو مرد و هەر لەوێ بەجێ هێلا. (رواه ابن جرير).

هەندێك لەئەهلی كیتاب وتویانە: خنكاندیو بە قەمپار پارچە پارچەی كرد هەروەكو، كە دڕندەكان نێچیر راو دەكەن.

(ابن جرير) وتویەتی: كاتێك ویستی بیكوژێ دەستی كرد بە مل بادانی ئیبلیسیش زیندەوەرێكی هەڵگرتەوەو سەری دانیایە سەر بەردێك، پاشان بەردێكی تری هەڵگرتەوەو پێی لەسەریدا، قابیلیش تەماشای دەكرد، پاشان چۆنی بەدیكرد ئەوها بە براكەی خۆی كرد.

﴿فأصبح من الخاسرين﴾ واتە: دۆڕاوی دونیاو ئاخیرەت بوو، ئایە چ دۆڕاویەك گەورەتر لەمە.

(عبدالله)ی كوڕی (مسعود) وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویَ: ((هەر نەفسێك بە زوڵم بكوژرێ، ئەوا كوڕی یەكەمی ئادەم بەشدارە لەم تاوانەو خوێنەكەی دەكەوێتەسەری، چونك یەكەم جار ئەو كوشتنی داهێنا)) (متفق عليه).

﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ٣١﴾ المائدة: ٣١

(سدی ) وتویەتی: كاتێك هابیل مرد قابیل لەبیابان بەجێی هێشت و نەیدەزانی چۆن برایەكەی بشارێتەوە، خوای گەورە دوو قەلەرەشی برای هەناردو بووە شەڕیان یەكێكیان ئەویتریانی كوشت و، پاشان قۆرتێكی بۆ لێداو خۆڵی هاوێشتە سەر، كاتێك ئەمەی بینی وتی : ﴿يَـٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى ۖ﴾

﴿فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّـٰدِمِينَ﴾ (حسن البصری) وتویەتی: پاش ئەوەی دۆڕا پەشیمان بوویەوە. ئەمە بوو وتەی ئەهلی تەفسیر لەو چیرۆكەو، هەمووش كۆكن لەسەر ئەوەی ئەو دوو كوڕە لەپشتی ئادەمن هەروەكو، كە قورئان و سوننەت دەلالەتیان لەسەر دەدا. والله أعلم.

## ٣-كەنعانی كوڕی نوح

كاتێك خوای گەورە سروشی بۆ نوح – علیه السلام– نارد: ﴿وَأُوحِىَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ هود: (سەرەنجام) وەحی و پەیامی خوا ڕەوانەكرا بۆ نوح كە چاك بزانە بەڕاستی هەرگیز كەسی تر بڕوا ناهێنێت لە قەومەكەت جگە لەوەی كە بەڕاستی بڕوای هێناوە، كوابوو خەفەتبار مەبە بەو كردەوە ناشیرین و ناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا.﴾

لەو كاتە نوح زانی فەرمایشتی خوا هەقەو دێتە جێو لەقەومەكەی كەسی تر باوەڕ ناهێنێ و خودا خەتمی داوە لەدڵیان، جا ئارامی لێ هەڵگیراو وتی: ﴿ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ نوح: ٢٦ - ئینجا نوح وتی: پەروەردگارا هیچ كەسێك لە بێ بڕوایان

لەسەر زەویدا مەهێڵەو تۆویان ببڕە. (٢٦) چونکە بەڕاستی ئەگەر تۆ وازیان لێ بهێنیت هەرچی بەندەکانی تۆیە گومڕای دەکەن و کەسیشیان لێنابێت (لە نەوەی تازە) مەگەر خراپەکار و تاوانبار نەبێت.﴾

کاتێکیش خوای گەورە نوحی سەرخست بەسەر قەومەکەی وتی: ﴿أني مغلوب فانتصر﴾ خوای گەورەش سروشی بۆ نارد : ﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ ءَامَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۚ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾ هود: ٣٦ - ٣٧(سەرەنجام) وەحی و پەیامی خوا ڕەوانەکرا بۆ نوح کە چاك بزانە بەڕاستی هەرگیز کەسی تر بڕوا ناهێنێت لە قەومەکەت جگە لەوەی کە بەڕاستی بڕوای هێناوە، کوابوو خەفەتبار مەبە بەو کردەوە ناشیرین و ناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا. ﴾ لەو کاتە نوح – علیه السلام – دەستی کرد بە دروست کردنی کەشتیو شوێنێکی دووری لەمەنزلگایەکەی هەڵبژاردو پارچە تەختەو بزماری ئامادەکردو، زۆر بە چوستو چالاکانە کاری دەکرد ئەمەش بۆ هێنانەدی فەرمانی خوا، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هەر قوتاری نەبوو لەگاڵتە کردن بۆ خۆیو بانگەوازەکەی، هەندێکیان بەلایدا دەڕریشتنو پێیان دەوت: تۆ دوێنێ دەتوت من پێغەمبەرو پەیامبەرم، ئێستا بۆچی بویتە دارتاش، ئایا بێزار موویت لەپێغەمبەرایەتیو دەستت لێهەڵگرتوەو رووی خۆتت داوەتە دارتاشی، خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ هود: ٣٨(نوح) یش دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتیەکە، هەر جارێك تاقمێك لە هۆزەکەی بەلایدا تێدەپەرین، گاڵتەیان پێ دەکرد، (نوح) وتی ئەگەر ئێستە ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن،

ئەوە بەڕاستی ئێمەش ڕۆژێك دێت گاڵتە بە ئێوە بكەین وەك چۆن ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەكەن. ﴾

بەڵام نوح – علیه السلام – گوێیانی پێنەداو هەر بەردەوام بوو لەدانانی تەختە دارەكانو بزماری تێدەكوتی، هەتا كەشتیەكی دروست كرد لەو پارچە تەختەو بزمارانە، كە كەشتیەكی زۆر بەهێزو پتەوی دروست كردو كردیە سێ نهۆم: خواریّو سەریّو ناوەند.

پاش ئەوەی نوح – علیه السلام – لەدروست كردنی كەشیتەكە بۆوە خوای گەورە سروشی بۆ نارد، كە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴿٤٠﴾ هود: ٤٠(ئەم كێشەیە بەردەوام بوو) هەتا ئەو كاتەی بڕیارمان هات و فەرمان دەرچوو (بە لەناوبردنی بێ باوەڕەكان) و لە تەنوورە پڕ لە ئاگرەكەوە ئاو فوارەی كرد (كە ئەوە نیشانەی دەست پێكردنی تۆڵە خواییەكە بوو) ئەوسا وتمان: ئەی نوح، لە هەموو نێرو و مێیەك دووان هەڵبگرە لە كەشتیەكەداو ماڵ و خێزانت، جگە لەوانەی كە بڕیاریان لەسەر دراوە تووشی تۆڵە ببن بەهۆی بێ باوەڕیانەوە، ئەوانەش هەڵگرە كە باوەڕیان هێناوە (شایانی باسە) كەسیش بڕوای بەنوح نەكردو لەگەڵیدا نەبوو، جگە لەكەسانێكی كەم نەبێت. ﴾

هەڵچوونی تەندوور ئایەتێك بوو لەنێوان خۆیو خوای كاتێك ئەو ئایەتە بە دیار كەوت نوح بۆ لای كەشتیەكەی چوو ئەوانەشی برد، كە باوەڕیان پێ هێنابوو لەخزمو كەسو گەلەكەی، لەهەر ئاژەڵێكیش دووانی هەڵگرت، كە ژمارەی ئەوانەی هەڵیگرتن (١٣) كەس بوون ئەوانیش نوح بە خۆیو هەر سێ كوڕەكەی سام و حام و یافث لەگەڵ خێزانەكانیان و لەگەڵ شەش كەسی تریش، بەڵام كوڕەكەی تری (یام) یان هەندێك

دەڵێن کەنعان بەگەڵی نەکەوت چونکە کافر بوو کاتێك نوح – علیه السلام – لەناو کەشتیەکە جێگیر بوو ئاو لەهەموو کون‌و قوژبن‌و ئاراستەو شوێنێکەوە هات لەئاسماندا بە خوڕ هاتە خوارێ و لەزەویش دەربوو، خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ القمر: ١١ - ١٢ ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردوه (١١) هەموو زەویشمان کرد بەکانیاو و ئاومان لیّ هەڵقولاند، ئیتر ناوی ئاسمان و زەوی بەتەقدیرو ویستی خوا بەیەك گەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسەر درابوو ﴾ پاشان وتیان ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْرٜىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ﴿٤١﴾ هود: ٤١ نوح وتی: سواربن و بڕۆنە ناو کەشتیەکەوە، بەناوی خواوەیە ڕۆیشتنی و وەستانی﴾

دەمێك لەبایەکی لەسەرخۆ دەڕۆیی‌و دەمێکیش لەبایەکی توندو بەهێز، هەتا خوا هەموو کافرەکانی بەم لافاوە گەورە خنکاندو لەناوی بردن.

یەکێك لەوانەی خنکا کوڕەکەی نوح بوو، کە ناوی یام بوو، نوح –علیه السلام – لەسەر کەشتیەکەی بینی کەوتۆتە ناو شەپۆلی دەریاو دەیەویّ خۆی بەچیایەك بگرێتەوە، بۆ ئەوەی رزگاری بیّ، جا نوح – علیه السلام – بانگی کرد بۆ ئەوەی بەڵکە پەشیمان دەبێتەوەو باوەڕ دەهێنیّ‌و پێی وت: ﴿ وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَٰبُنَيَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ هود: ٤٢ کەشتیەکەش دەیبردن بەناو شەپۆلی وەك چیادا، نوح بانگی کردە کوڕەکەی (ئەوەیان کە بیّ باوەڕ بوو) لە شوێنێکی چەپەکدا گیری خوارد بوو پێی وت: ڕۆڵە گیان، لەگەڵ ئێمەدا سواربە و لەگەڵ بیّ باوەڕاندا مەبە. ﴾

کوڕم بۆ کوێ دەڕۆی؟ تۆ لەقەزاو قەدەرێکی خوا بۆ قەزاو قەدەرێکی تری خوا دەڕۆی، کوڕم وەرە باوەڕ بێنە و خۆت بهاوێژە ناو کەشتیەکە بۆ ئەوەی ڕوح و جەستەت ڕزگاری بێ لەسزای ئاگر.

بەڵام ئەم وشانە نەگەیشتە ناو ناخی دڵی و بە باوکی وت: بڕۆ کارت بە من نەبێ من:﴿قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ﴾ هود: ٤٣ کوڕەکەی وتی: پەنا ئەبەمە لای ئەو چیایەو دەمپارێزیت لەم زریان و ئاوە﴾

نوحیش پێی وت: کوڕەکەم ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ (نوح) وتی: ئەمڕۆ هیچ پەنادەرێك نیە لە تۆڵە و خەشمی خوا کەس بپارێزێت مەگەر کەسێك خوا خۆی ڕەحمی پێ بکات، ئەوسا (دوای ئەم وت و وێژە) شەپۆلی ئاو دای بەنێوانیاندا و جا چووە ڕیزی خنکاوەکانەوە.﴾

کاتێك نوح – علیه السلام – بینی وا کوڕەکەی لەپێش چاوی دەخنکێ غەمبارو نارەحەت بوو، ڕووی کردە خوای گەورە داوای لێکرد کوڕەکەی ڕزگار بکا و وتی: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾ هود: ٤٥ (پاش هێور بوونەوەی زریانەکە) نوح هاواری لە خوا کردو جا وتی: ئەی پەروەردگارم کوڕەکەم لە خێزانی من بوو، بێگومان پەیمانی تۆش ڕاستە و (کاتی خۆی فەرمووت خێزانی تۆ ڕزگارن لە تیاچوون) و تۆیش زاناترین و دادپەروەرترینی فەرمانڕەوایانیت.﴾

بەڵام خوای گەورە سروشی بۆ نارد، کە ئەی نوح ئەوە لەئەهلی تۆ نیەو شوێن میللەتی کافران کەوتووەو وەڵامی بانگەوازەکەی تۆی نەدایەوە، ئەوەی بەڵێنیشم

پێداوی رزگاریان بکەمو سەریان بخەم ئەوانەن، کە باوەڕیان بە تۆ هێناوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾﴾ الروم: ٤٧ جا ئاگاداربە لەداواکاریەك، کە عیلمت پێی نیە: ﴿إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾﴾ هود: ٤٦

لەو کاتە نوح – علیه السلام – زانی بە هۆی سۆزی بۆ کوڕەکەیو ترسان لەچارەنووسی تووشی ئەو هەڵەیەی کرد، جا رووی کردە خوای گەورەو داوای لێخۆشبونی کرد لەو هەڵەیەی ئەنجامی دا و وتی: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ ۖ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾﴾ هود: ٤٧ (ئینجا نوح) وتی: ئەی پەروەردگارم، بەڕاستی من پەنا دەگرم بۆ تۆ کە داوای شتێك بکەم زانیاریم پێی نەبێت، خۆ ئەگەر لێم خۆش نەبیت و بەزەییت پێمدا نەیەتەوە ئەوە دەچمە ڕیزی خەسارەتمەندانەوە. ﴾

سا کاتێك خوای گەورە کافرەکانی خنکاند، فەرمانی بە ئاسمان کرد لەباران بارین بوەستێو زەویش هەموو ئاوەکەی قوت دا، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ هود: ٤٤ پاشان فەرماندرا بە زەوی: ئاوەکەت با ڕۆبچێت بەناختدا، ئەی ئاسمان: تۆش با بەس بێت و باران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو، فەرمانیش بەڕێکی و تەواوی ئەنجامدرا، کەشتیەکەش لەسەر کێوە جودی (کە لە کوردستانی باکوورە) وەستاو لەنگەری گرت و وترا: دەك دووری لە بەزەیی خواو تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران.﴾ هەروا دەفەرموێ: ﴿قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ ۚ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾

هود: ٤٨ئەوسا لەلایەن خوای گەورەوە) وترا: ئەی نوح وەرە خوارەوە و دابەزە لە کەشتیەکەو لە چیای جودی بۆ دەشتایی بەبێوەیی و سەلامەتی لەلایەن ئێمەوە، بەرەکەتی زۆریش لەسەر تۆو ئەو کۆمەڵ و خەڵکانەی لەگەڵ تۆدان، خەڵکانێکی تریش لەمەو دوا دێن و لە نازو نیعمەت بەهرەوەریان دەکەین، پاشان (بەهۆی لاری و بێ بڕواییانەوە) سزای بەسۆیان تووش دەبێت لەلایەن ئێمەوە. ﴾

جا نوح – علیه السلام – بەسەلامەتی دابەزیە سەر زەوی‌و چارەنوسی باشیش هەر بۆ پارێزکاران‌و لەخوا ترسەکانە.

## ٤ - ٥ خێزانی نوح و خێزانی لوت

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱمْرَأَتَ نُوحٍ وَٱمْرَأَتَ لُوطٍ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَٰلِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا وَقِيلَ ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴿١٠﴾ التحريم: ١٠خوا نموونەی هێناوەتەوە بە ژنی نوح و لوگ بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، کە ئەو دوو ئافرەتە هاوسەری دوو بەندەی چاك و پاکی ئێمە بوون، کەچی خیانەتیان لێ کردن (باوەڕیان پێیان نەبوو، غەیبەتیان دەکردن، گاڵتەیان پێدەکردن...)، ئیتر ئەو پێغەمبەرانە فریای هاوسەرەکانیان نەکەوتن، لە قیامەتدا بەو ژنانە دەوترێت: بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە دەچنە ناوی. ﴾

(قرطبي) وتویەتی: خوای گەورە ئەم نمونەیەی هێناوە وەکو ئاگاداریەك، کە هیچ کەسێکی نزیك لەمرۆڤ لەرۆژی دواییدا بە هانای نایەت ئەگەر دین نێوانیانی لێك ترازاندو جیاواز کردەوە.

(فخانتاهما) (عكرمە) و (ضحاك) وتویانە: خیانەتەكەیان بریتی بوو لەكوفر كردن پێی.

(ابن عبّاس) وتویەتی: ئافرەتی نوح بە خەڵكی دەوت: نوح شێتە، ئافرەتی لوطیش ئەگەر لوط مێوانی بهاتبا یە خەبەری دەدا.

هەر (ابن عبّاس) وتویەتی: ئافرەتی هیچ پێغەمبەرێك خیانەتی ژنو مێردایەتی نەكردووە. ئەمەش یەكدەنگی ئەهلی تەفسیرە، كە (القشیری) باسی كردووە. بەڵكو خیانەتەكەیان لەدین بووە چونكە موشریك بوونە، هەندێكیش دەڵێن: دوو ڕوو بوونە. هەندێكیش دەڵێن: خیانەتەكەیان قسە هێنان و بردن بووە ئەگەر خوای گەورە هەر وەحیەكی بۆ بناردبان ئەوا لەناو موشریكەكان بڵاویان دەكردەوە، ئەمە (ضحاك) وتویەتی.

وتراوە: ئەگەر لوط مێوانی بهاتبایە ئاگرێكی دوكەڵاوی دەكردەوە بۆ ئەوەی قەومەكەی بزانن میوانی هاتووە.

﴿فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾ واتە لەگەڵ ئەوەی نوح و لوط—علیهما السلام — بەڕێز بوون لەلای خوای گەورە بەڵام نەیانتوانی بەكەڵكی خێزانەكانیان بێن، كاتێك سەرپێچیان كرد، ئەمەش وەك ئاگاداریەك، كە سزا بە گوێڕایەڵی و كاری چاك لادەچێ.

پاشان پێیان وترا: ﴿ٱدْخُلَا ٱلنَّارَ مَعَ ٱلدَّٰخِلِينَ ﴾والله أعلم.

## ٦-نەمرود

ڕۆژگارو ساڵێكی زۆر تێپەڕی بەسەر دەوڵەتی كلدانیەكانو پادشایەكانیش یەك لەدوای یەك دەهاتن و لەسەر عەرشەكەی دادەنیشتن، هەتا كە پادشایەك هات حوكمی كردن ناوی نەمرود بوو، پادشایەكی زیرەك و بەهێز بوو، بینی گەلەكەی بت دەپەرستن، ئەویش كۆی كردنەوەو پێیانی وت: ئەی خەڵكینە من بپەرستن، چونكە خوامە من

دەبیستم و دەبینم‌و قسە دەكەم‌و بیردەكەمەوەو هەژارەكانتان دەوڵەمەند دەكەم‌و دەوڵەمەندەكانتان هەژار دەكەم بێ دەسەڵاتەكان بەهێز دەكەم‌و بەهێزەكان بێ دەسەڵات دەكەم، هێزو دەسەڵاتیش بە دەستی منە ئەوەی سەپێچیم بكات دەیكوژم‌و ئەوەی گوێڕایەڵیم بكات بەرزی دەكەمەوە، لەمن زیاتر كەسیتر مەپەرستن چونكە لەناو دەچن ..جا گەمەی بە عەقلیان دەكردو بەهیچیانی نەدەزانی خەڵكیش لەبەر نەفامیان باوەڕیان پێكردو بەراستیان زانی...بەم جۆرە نەمرود بوو بە خوای ئەو گەلە نەفامە.
لەو ژینگەیەی كە بت پەرستی باڵی بەسەردا كێشابوو كوڕێكی بچكۆلانە بوو ناوی ابراهیم بوو لەو ژینگەیە گەش‌و نمای كردو گەورە بوو، كاتێك گەورە بوو خوای گەورە حیكمەت‌و دانایی‌و عەقلی پێداو ڕێنویی كرد بۆ حەق‌و ڕاستی‌و ، زانی كەوا خوا بێ شەریكە و تاقانەیەو هەر ئەو دروست كەری بەردو دارو ئەستێرەو گەردوونە ...ئەو دروست كەری هەموو شتێكە...بەسەر هەموو شتێكیش تواناداره.

تێگەیش كەوا ئەو بتانەی گەلەكەی دەیان پەرست جگە لەخوا ئەوا نەزیانی هەیەو نە قازانج، چونكە پێك هاتوو لەچەند بەردێكی كەڕو ناتوانن یەك وشە بدركێنن‌و كوێرن‌و ناتوانن ببینن، جا ئیبراهیم –علیه السلام– پرسیاری كرد چۆن ئەوانە ئەو بتانە دەپەرستن، كە نەزەرەریان پێدەگەیەنن‌و نەسودی بۆیان هەیە؟! لەنێوەندی ئەم تاریكیە دا ابراهیم – علیه السلام – دەستی كرد بەوەی، كە خوای گەورە فەرمانی پێكردبوو، كە بە حیكمەت و دانایی بانگەوازی بۆ لای خوای گەورە دەكرد خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ الأنبياء: ٥١ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە ژیری و هۆشمەندیمان پێشتر بە ئیبراهیم بەخشی، ئێمە چاك ئەومان دەناسی. ﴾

ابراهیم – علیه السلام – دەستی كرد بە بانگەوازكردن بۆ لای خوا و بۆ خەڵكی ڕوون كردەوە كە خوای گەورە و تاقانە هیچ شەریكی نیەو هەر خۆی خوایەكی هەقە بۆ ئەوەی بپەرستریّ و هەر ئەویش دروست كەری هەموو شتێكە، ئەو بتانەش نابیّ لەجگە لەخوا بپەرستریّ چونكە هیچی پێناكریّ نەزەرەر بدا نە قازانجیش بگەیێنی، بەڵكو چەند خوایەكی درۆنە. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ۖ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ العنكبوت: ١٦ - ١٧باسی ئیبراهیمیش بكە كە كاتی خۆی بە قەوم و هۆزی خۆی وت: تەنها خوا بپەرستن و هەر لەو بترسن، ئەو بیروباوەڕە چاك و پەسەند و خێردارترە بۆتان، ئەگەر بزانن و تێبگەن. (١٦) بەڕاستی ئەو شتانەی كە لەجیاتی خوا دەیانپەستن تەنها بت و پەیكەرن، ئێوە بوختان و شتی نابەجیّ دروست دەكەن، بێگومان ئەو شتانەی كە لەجیاتی خوا دەیانپەرستن خاوەنی هیچ ڕزق و ڕۆزیەك نین بۆ ئێوە، كەواتە هەر داوای ڕزق و ڕۆزی لە خوا بكەن، هەر ئەویش بپەرستن، هەر سوپاسگوزاری ئەو بن، بۆ لای ئەویش دەبرێنەوە. ﴾

بەڵام قەومەكەی بە گوێیان نەكردو، بەردەوام بوون لەپەرستنی بتەكان، كە بەگەورەو پیرۆزیان رادەگرتو قوربانیان بۆ دەكرد ابراهیم –علیه السلام– ویستی نیشانی كافرەكان بدات كەوا ئەو بتانە نەزەرەر دەگەیەنن و نە قازانج، پلانی تێك شكاندنی بتەكانی لەدەروونی خۆیدا شاردەوەو چاوەڕێی هەڵێكی دەكرد بۆئەوەی ئەم كارەی تێدا ئەنجام بدا، هەتا، كەوادەی جەژنیان داهاتو چوونە دەرەوە، بڕیاری دا لەگەڵیان نەچیّ، لەرۆژی دیاریكراودا داوایان لێكرد لەگەڵیان بچیّ بەڵام ئەو نەچوو وتی

من نەخۆشم! ناتوانم بێم لەگەڵتان، ئەوانیش ڕۆیشتن‌و بەجیان هێشت، ئەوان لەشارەکەی خۆیان دوورکەوتنەوە ابراهیم – علیه السلام– ڕۆیشت بۆ لای پەرستگاو بە بتەکانی وت ﴿ألا تأكلون﴾ ئەو خواردنە خەڵکی بۆتانی بەجێهیشتووە ﴿ما لكم لا تنطقون﴾ بەڵام بتەکان هەر کڕ بوون و قسەیان نەکرد. لەو کاتە ابراهیم –علیه السلام– تووڕە بوو تەورەکەی دەست دایەو دەستی کرد بەلێدانی بتەکان کە یەك لەدوای یەك تێکی دەشکاندن، تەنها گەورەی بتەکان نەبێ هیچی لێنەکردو تەورەکەی بە ملی دا شۆڕ کردەوەو پاشان چووە دەرەوە، کاتێك خەڵکی هاتن بۆ پەرستگەکەیان‌و پاش ماوەی بتەکانیان بینی جا بە واق‌و ورمانی‌و سەرسوڕمانیەوە وتیان ﴿ مَن فَعَلَ هذا بآلهتنا﴾ یەکێك لەناویان وتی: ﴿ سمعنا فتىً يذكرهم يقال له ابراهيم﴾ وتیان: بەڵێ دەیناسین ئەوە ابراهیم ی کوڕی ئازەرە! جا چەند کەسێك چوون بۆ ئەوەی ابراهیم بێنن‌و وتیان قەت نابێ بێدەنگ بین لەسەر ئەو تاوانە گەورەیە.

خەڵکی کۆبونەوە بۆئەوەی دادگاییەکەی ابراهیم ببینن‌و ئایە چ سزایەك چاوەڕێی دەکا، بێگومان کۆبوونەوەی خەڵك لەم شوێنە یەکێك بوو لەئاواتەکانی ابراهیم بۆ ئەوەی ئیقامەی حوججەیان لەسەر بکات و پوچی ئەو بتانەیان بۆ بسەلمێنێ کە دەیانپەرست، کاتێك ابراهیمیان هێنا پێیان وت ﴿أأنت فعلت هذا بآلهتنا يا ابراهيم﴾ وتی ﴿ بل فعله كبيرهم هذا فاسألوهم إن كانوا ينطقون﴾ بەڵام خۆ خەڵکی دەزانن کە ئەو بتانە بەردن‌و دەشزانن کەوا بەرد نە دەتوانێ قسە بکات‌و نە دەتوانێ گوێی لێ بێ بۆیە بە ابراهیمیان وت : ﴿ لقد علمت ما هؤلاء ينطقون﴾

ئای، کە چەند بەڵگەیەکی بەهێز بوو بۆ بەرەژەوەندی ابراهیم، کە لە بێئاگایی بە ئاگای هێنانەوەو، جا دەستیان بە لۆمەکردنی یەکتر کردو دەیان وت ئێوە ستەم

کاربوون!! خەڵکی هەمووی لەشەرمەزاریان بێدەنگ بوون، گەلی ابراهیم هەمووی نەیزانی چ بکاتو سەریان دەجولاندو بیریان دەکردەوە.

بەڵام گەلی ابراهیم ئاقلانە بیر ناکەنەوە...بەڵکو تەقلیدی گەورەکانیان دەکەنەوە لەگومڕاییو لەهەموو شتێکدا، بۆیە کاتێك پادشا فەرمانی کرد بە سوتاندنی ابراهیم هەموو بەیەك دەنگ وتیان ﴿ قَالُوا۟ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓا۟ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَـٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ الأنبیاء: ٦٨ هەندێکیان وتیان: ئیبراهیم بسوتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە شتێکتان بۆ دەکرێت. ﴾

بڕیاریاندا ابراهیم باوێنە ناو ئاگر هەتا دەمرێ، بۆیە دارێکی گەلێك زۆریان کۆکردەوە و دایان گیرساند هەتا بوو بە ئاگرێکی گەورەو ترسناك، پاشان ابراهیمیان هاوێشتە ناوێ، بەڵام خوای گەورە پاراستی و پیلانەکەیانی پوچەڵ کردەوە و فەرمانی بە ئاگر کردو فەرموی:﴿ قُلْنَا يَـٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَـٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ الأنبیاء: ٦٩خوای گەورە دەفەرموێت، ئێمەش فەرمانمان دەرکرد و) وتمان: ئەی ئاگر ساردو سەلامەت لەسەر ئیبراهیم (هەرچەندە ئاگر سوتێنەرە بەڵام بە فەرمانی خوا توانای سووتاندنی نەماو ئەگەر پەروەردگار فەرمانی بەسەلامەتی نەدایە حەزرەتی ئیبراهیم لەناو ئاگرەکەدا سەرمای دەبوو). ﴾

ئاگرەکە کوژایەوەو بێ ئەوەی ئەزیەتی ابراهیم بدات، جا خەڵکی هەمووی تووشی سەرسوڕمان هاتو، شەرمەزار بوون لەو هەڵوێستەی نواندیان دژی ابراهیمو فێڵو پیلانەکەیان گەڕایەوە سنگیان. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ الأنبیاء: ٧٠ئەوانە ویستیان پیلان بگێڕن دژی ئیبراهیم ئینجا ئێمەش ئەوانمان بە ڕەنجەڕۆترین کەس گێڕا. ﴾

نەمرودی پادشا لەم ڕووداوە گەیشت، بۆیە ناردی بە شوێنیدا ، جا کە ابراهیم هات نەمرود پرسیاری لێکرد و وتی: ئەو خودایە کێیە کە بانگەوازی بۆ لای دەکەی؟ ابراهیم

وتی: (الله) خودایەکی تاقانەو بێ شەریکە، کە دەمرێنێو دەژێینێ. نەمردویش بە گاڵتەوە وتی ﴿أنا أحيي وأميت﴾ واتە: بە ئارەزووی خۆم یەکێك بمەوێ دەیکوژمو بە ئارەزوی خۆشم ئەوەی بمەوێ دەیبورم..بەڵام خوای گەورە ویستی نەمرود شەرمەزار بکاو کەپوی لەخۆڵ بچەقێنێو درۆیەکەی ئاشکرا بکا لەسەر زمانی ابراهیم، جا پێی وت: ئەم خۆرە هەموو رۆژێ مل کەچانە، لەرۆژهەڵاتەوە هەڵدێ هەروەکو خوایەکەی ئەوهای بۆ داناوە، ئەو خوایەی کە دروست کەری هەموو شتێکە، تۆش وەك گومان دەبەی کە دەمرێنێو دەژێینێ وەرە وا بکە ئەم خۆرە لەرۆژئاوا بێنە دەرەوە، چونکە ئەو کەسەی بمرێنێو بژێینێ دەتوانی هەموو شتێك بکات، ئەگەر وات کرد ئەوا تۆ خودای بەڵام ئەگەر پێت نەکرا ئەوا تۆ دروست کراوێکی وەك هەموو دروست کراوەکانی تر کە دەستەوسانی ناتوانی هیچ شتێك بکەی.

جا لێرەدا گومڕاییو نەفامیو درۆکانی بەدەرکەوتو هیچ قسەیەکی تری نەما وەڵامی ابراهیمی پێ بداتەوە و دەوی قرماو بێ دەنگ بوو، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِى حَآجَّ إِبْرَٰهِـۧمَ فِى رَبِّهِۦٓ أَنْ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّىَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحْىِۦ وَأُمِيتُ ۖ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأْتِى بِٱلشَّمْسِ مِنَ ٱلْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ ٱلْمَغْرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ ﴾البقرة: ٢٥٨ نەمرود ترسا لەمولكو سامانەکەی بۆیە ابراهیمی دوور کردەوە لەم شوێنە.

## ٧- ئازەری باوکی ابراهیم

کاتێك ابراهیم – علیه السلام – بۆ خەڵکی روون دەکردەوە کەوا (الله) تاك و تەنیایە و هیچ هاوەڵی نیەو هەر ئەو خوایەکی راستو دروستە بۆ ئەوەی بپەرسترێ و هەر ئەو خالیقی هەموو شتێکە و ئەو بتانەش نابێ لەباتی خوا بپەرسترێ چونکە نە دەتوانێ زەرەر بگەیەنێ و نەدەتوانی قازانج بگەیەنێ، بەڵکو خوایەکی درۆیە. خوای گەورە

فەرمویەتی: ﴿ وَإِبْرَٰهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا وَتَخْلُقُونَ إِفْكًا إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُوا۟ لَهُۥٓ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾ العنكبوت: ١٦ - ١٧ئایا نەتبیستووە و نەترِوانیوەتە ئەو کەسەی دەمەقاڵەی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا لە بارەی پەروەردگاریەوە لەبەر ئەوەی خوا پاشایەتی پێبەخشی بوو، (لە جیاتی باوەرِهێنان و سوپاسگوزاری کەچی دەمە دەمێی دەکرد لەگەڵ ئیبراهیمدا)، (ئەم لووت بەرزیەشی کاتێك بوو بە هەواو فیزاوە پرسیوویەتی لە ئیبراهیم کە پەروەردگاری تۆ کێیە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: پەروەردگاری من ئەوزاتەیە کە ژیان دەبەخشێت و مردنیشی بەدەستە، (نەمروود لە وەڵامیدا) وتی: جا منیش ژیان دەبەخشم و مردنیشم بەدەستە، (ئینجا فەرمانیدا هەندێك لە نەیارانی بکوژن گوایە ئەوە دەیانمرێنێت، هەندێکیشی نەکوشت گوایە ئەوە ژیانی پێبەخشین!!)، ئەوسا ئیبراهیم وتی: بەراستی خوا خۆر لە رۆژهەڵاتەوە دەهێنێت جا (ئەگەر تۆ دەتوانیت) لە رۆژئاواوە بیهێنە، ئینجا ئەو بێ باوەرە رەنگی پەرِی و دەمکوت کراو وەڵامی نەما، بێگومان خوا هیدایەتی قەومی زاڵم و ستەمکار نادات. ﴾

جا لەنێوان ئەو کافرانە باوکی ابراهیم بوو، کە ناوی ئازەر بوو، کەلەبەرەبەیاندا دەچوو بەردی دەهێنا، پاشان دەیتراشیو دەیکردە بتو دەیفرۆشیە گەلەکەی بۆ ئەوەی بیپەرستن، لەلای ئازەریش بتێکی تایبەت هەبوو وەکو گەلەکەی دەیپەرست، ابراهیمیش دەیدیت وا باوکی بە بەیانیو ئێوارە کرنۆش بۆ بتەکان دەباتو داوای رۆزیان لێدەکات، جا ابراهیم ئەمەی زۆر پێناخۆش بوو زۆری پێ شتەکی نەنگ بوو کەوا

نزيك ترين كەس، كە باوكيەتى وا بت دەپەرستىٚ، بۆيە ئامۆژگارى كردو وتى: ﴿وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِبۡرَٰهِيمَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذۡ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعۡبُدُ مَا لَا يَسۡمَعُ وَلَا يُبۡصِرُ وَلَا يُغۡنِي عَنكَ شَيۡـٔٗا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدۡ جَآءَنِي مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَمۡ يَأۡتِكَ فَٱتَّبِعۡنِيٓ أَهۡدِكَ صِرَٰطٗا سَوِيّٗا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعۡبُدِ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلرَّحۡمَٰنِ عَصِيّٗا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيۡطَٰنِ وَلِيّٗا ﴿٤٥﴾ هەروەها لە قورئاندا باسى (گۆشەيەك لە بەسەرهاتى) ئيبراهيم بۆ ئەو خەڵكە بگێڕەوە، بەڕاستى ئەو كەسايەتيەكى ڕاستگۆ بوو، لە پێغەمبەرانيش بوو. (٤١) كاتێك بەباوكى وت: باوكى بەڕێزم ! ئەوە تۆ بۆچى شتێك دەپەرستيت كە نەگوێ بيستە، نەكەس بەرچاو ڕوون و ڕۆشنبير دەكات، نە هيچ سوودێكت پێ دەگەيەنێت. (٤٢) ئەى باوكى بەنرخم! بەڕاستى ئەو زانستى و زانياريەى كە بۆ من هاتووە، (دەربارەى دەسەلأت و تواناى بەديهێنەرى ئەم جيهانە) بێگومان بۆ تۆ نەهاتووە، كەواتە پەيڕەوى من بكە ڕێنموويیت دەكەم بۆ ڕێگە و ڕێبازێكى ڕاست و دروست. (٤٣) ئەى باوكى ئازيزم! شەيتان مەپەرستە، چونكە بەڕاستى شەيتان ياخى يە لە خواى ميهرەبان و سەركەشيى كردووە. (٤٤) ئەى باوكى بەڕێزم! بەڕاستى من دەترسم سزايەك لەلايەن خواى ميهرەبانەوە يەخەت پێ بگرێت، ئەوكاتە ئيتر دەبيتە يارو ياوەرو پشتتگيرى شەيتان.﴾ مريم ٤١ ٤٥

كاتێك ابراهيم بانگەوازەكەى خۆىو ئامۆژگاريە ڕەسەنەكانى نيشانى باوكيدا، باوكى زۆر تورە بوو هەڕەشەى لێكردو وتى: ﴿قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنۡ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ لَأَرۡجُمَنَّكَۖ وَٱهۡجُرۡنِي مَلِيّٗا ﴿٤٦﴾﴾مريم: باوكى ئيبراهيم بەسەغڵەتيەوە) وتى: بۆچى ئەى ئيبراهيم تۆ (ئەوەندە) لە خواكانى من بێزارى، بەڕاستى ئەگەر كۆڵ نەدەيت و واز

نەهێنیت (چاوپۆشیت لێ ناکەن و) بێگومان بەرد بارانت دەکەم، برۆ، ون بە لەبەرچاوم هەر نەتبینمەوە. ٤٦ ئیبراهیمیش پێی وت: ﴿ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيۡكَۖ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيّٗا ﴿٤٧﴾ وَأَعۡتَزِلُكُمۡ وَمَا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدۡعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيّٗا ﴿٤٨﴾ مريم: ٤٧ - ٤٨ ئیبراهیم وتی: سلاوت لێ بێت (وا من دەڕۆم) لەمەولا داوای لێخۆشبوون و (هیدایەتت) لە پەروەردگارم بۆ دەخوازم، چونکە ئەو زاتە زۆر منی خۆش دەوێت و ڕێزی بۆ داناوم. (٤٧) وا من دوور دەکەومەوە و کەنارگیری دەکەم، لە ئێوە و لەو شتانەی کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، من تەنها هاناو هاوار بۆ پەروەردگارم دەبەم و هەر ئەو دەپەرستم، ئومێدەوارم کە پەروەردگارم نائومێد و ڕەنجەڕۆم نەکات و دوعاو نزاو پەرستنم لێ وەربگرێت. ﴾

بەڵام ئەو تووڕەییە لەلایەن باوك لەسەر کوڕەکەی هیچ کاریگەریەکی نیە، چونکە نابێ گوێڕایەڵی دروست کراوێك بکرێت لەکاتێك ، کە ئەم گوێڕایەڵیە شکاندنی فەرمانی خوای تێدا بێ، بۆیە ابراهیم لەلای مایەوەو بەردەوام ئامۆژگاری دەکردو خوای گەورەی دەهێنایەوە یاد بەڵکە بترسێ‌و بگەڕێتەوە. جا، کاتێك ابراهیم زانی کەوا باوکی باوەڕی پێ ناهێنێ، ماڵ ئاوایی لێکردو پێی وت (سلام علیك) بە غەمگینی لەلای ڕۆیی‌و گەڕاوە بۆ لای گەلەکەی و دەستی کردەوە بە بانگەواز کردن.

کۆتایی ئازەر، بە کوفر هات خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ﴿١١٤﴾ ﴾ التوبة: ١١٤ جا دوای لێخۆش بوونی ئیبراهیم بۆ باوکی لەبەر بەڵێنێك بوو کە پێی دابوو، کاتێك بۆی دەرکەوت بەڕاستی باوکی دووژمنی

خوایە، ئیتر خۆی لێ بەری کرد، بەڕاستی ئیبراهیم زۆر بەسۆزو دڵ نەرم بوو و زۆر خاوەن حیلم بوو

لەراستیدا داوای لێخۆشبونی ابراهیم بۆ باوکی بۆ مەوعیدێك بوو، بەلأم دواتر، کەزانی هەر سەرکەشەو دوژمنایەتی خوای گەورە دەکات وازی لەدوعاکردن بۆی هێناو حاشای لێکردو وازی لێهێناو فەرمانی خوای بە گەورەتر زانی لەفەرمانی باوکی.

لەفەرمودەیەکی صەحیح دا هاتووە، کە أبوهریرة لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) ریوایەت دەکات، کە فەرمویەتی: ((ابراهیم لەرۆژی قیامەت دا چاوی بە باوکی دەکەوێ، کە لەسەر دەمو چاوی (قترة) و (غبرة) هەیە، ابراهیم پێی دەڵێ: پێم نەوتی سەرپێچیم مەکە؟،باوکی پێی دەڵێ: ئەمڕۆ سەرپێچیت ناکەم. ابراهیم دەڵێ: خوایە تۆ بەڵێنت بەمن داوە، کە لەرۆژێکدا زیندوو دەکرێنەوە خەجاڵەتم نەکەی ئایە چ خەجاڵەتیەك لەمە گەورەتر هەیە باوکم بەم جۆرە دەبینم؟خوای گەورە دەفەرموێ: من بەهەشتم حەرام کردووە لەسەر کافران پاشان دەوترێ: ئەی ابراهیم تەماشای بن پێت بکە ئەویش تەماشا دەکاو دەبینی وا کەمتیارێکی گەوزێنراو لەقوڕ لەبن پێیەکانیەتی، جا چوار پەلی دەگیرێو تێهەڵدەدرێتە ناو ئاگر)) (رواه البخاری).

## ٨- قداری کوڕی سالف

زەوی ثەمود زەویەکی سەوزو جوان بوو ، ئەوان زیاتر توانیان لەگەلی هود ئاوەدانتری بکەن، کە تیایدا کانی و کانیاویان هەڵقوڵاندو رووباریان هەڵکەندو، باخچەو کێڵگەیەکی زۆریان دروست کردو پێیان ئاوداو، قەسرو قەلأیەکی زۆریشیان دروست کردو، لەچیاش خانویان تراشی بۆ ئەوەی لە لافاوو رەشەبا دڵنیابن‌و نەترسن، کە پێش ئەوان چەند ئومەتێکی لەناو برد، جا ثەمود وەکو عاد بوون لەدروست کردنی خانوو

بەرەو کشتوکاڵو زۆری کێڵگەو بێستان بەڵکو لەپیشەسازیشدا بە پێش ئەوان کەوتن، کە لەشاخدا ماڵی زۆر فراوانیان دروست دەکرد، لەبەردیش دا نەقشو نیگاری واقەشەنگیان دروست دەکرد، دەتگوت ئەوە بە ریشەی وێنەکێش دروست کراوە. بەرد بۆ ئەوان نەرم ببوو بۆ پێشکەوتنی عەقڵو پیشەسازیان ، بەرد لەلای ئەوان وەکو هەویری لێهاتبوو هەر شتێك بیانویستایە لێی دروست بکەن دروستیان دەکەن.

بەڵام ئەم هەموو نیعمەتەی خوا ، کە بەسەری دابارانبوون وای لێنەکردن خوا بناسنو سوپاسی بکەن، بەڵکو پێی مەغرور بوونو زیاتر رووچوون لەکوفرو توغیان، جا کاتێك کوفرانەی نیعمەتەکانی خوایان کرد گوزەرانیان گەندەڵ بوو، چونکە دەیان وت کێ لە ئێمە بەهێزترە؟ کێ ئەو کۆشکانەی هەیە ، کە ئێمە هەمانە؟ وا گومانیان برد، کە ئەوان هەرگیز نامرنو بەردەوام لەناو کۆشكو باخچەکانیان دا دەبن...گومانیان برد، کە مردن ناچێتە ناو شاخە سەختەکانیان ! ! ئەوان لەجێگایەکی بێ ترسن.

ئەوان بەردیان تراشیو بتیان لەپاڵی خوا پەرستو هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداو قوربانیان بۆ بتەکان دەکردو لەهەموو کاروبارێکیشیان داوای رەحمەتو لێخۆشبوونو تەوبەیان لێدەکردو، داوایان لێدەکرد کەوا بارانیان بۆ ببارێنێ، ئەوان زۆر لەپێشەخۆیان خراپتر بوون، بەڵێ جەستەیەکی زەبەلاحیان هەبوو بەڵام عەقلێکی زیندوو دڵێکی بینەریان نەبوو، خودا مۆری لەسەر دڵو گوێچکەکانیان دابوو، خوای گەورە بەردی بۆ ئەوان کەمۆ کردبوو بۆ ئەوەی سودی لێوەربگرن بەڵام لەبەر نەفامیان خۆیان کردبووە بەندەی.

جا خوای گەورە بۆ ثەمود هەر لە ناوەخۆیان پێغەمبەرێکی بۆ ناردن ناوی صالح بوو سەلامی خوای لێبێ، کە بۆ ئەوەی بانگەوازیو رێنموییان بکات بۆ دینو رێگا راستەکەی.

صالح – علیه السلام – هەڵسا بە دەنگێکی بەرز بانگەوازی کردو وتی: ﴿ يا قوم اعبدوا الله ما لكم من إلهٍ غيره﴾ ئەو خوایەی، کە لەخۆڵ دروستی کردوون، پاشان وای لێکردوون ئەم زەویە ئاوەدان بکەنەوە، جا پێویستە لەسەرتان بیپەرستن‌و کوفری پێنەکەن! گەلۆ بگەڕێنەوە بۆ عەقڵتان‌و داوای لێ خۆشبوون لەپەروەردگارتان بکەن لەو گوناهانەی کردوتانە، تەوبە بکەن چونکە ئەو نزیکە لەئێوەو وەڵامی ئەو کەسە دەداتەوە، کە داوای لێدەکات‌و لەهەموو گوناهانیش دەبورێ تەنها کوفرو شیرك نەبێ.

بەڵام دەوڵەمەندەکانی ثەمود گاڵتەیان بە قسەکانی کردو وتیان: ئەم صاڵحە زۆر داماوە! چۆن دەبێ ئەمە ببێتە نێردراو! ئەوە بەم بەهانەیەوە دەیەوێ ببێتە برا گەورە لەسەرمان. ئەو دەوڵەمەندانە کاتێك هەستیان کرد وا چەند کەسێك بە دەم بانگەوازەکەی صالحەوە چوونە ترسان لەپلەو پایەی خۆیان لەنێو قەومەکەیان و وتیان: ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَتۡرَفۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يَأۡكُلُ مِمَّا تَأۡكُلُونَ مِنۡهُ وَيَشۡرَبُ مِمَّا تَشۡرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنۡ أَطَعۡتُم بَشَرٗا مِّثۡلَكُمۡ إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمۡ أَنَّكُمۡ إِذَا مِتُّمۡ وَكُنتُمۡ تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخۡرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيۡهَاتَ هَيۡهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا وَمَا نَحۡنُ لَهُۥ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٣٨﴾ المؤمنون: ٣٣ ٣٨ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لە دەستەی دەسەڵاتداری قەومەکەی و بڕوایان بە پێشهاتی قیامەت و زیندوو بوونەوەو لێپرسینەوە نەبوو و لە ژیانی دنیادا لە نازو نیعمەتی زۆر بەهرەوەرمان کردبوون وتیان، ئەم پێغەمبەرە تەنها بەشەرێکە وەك ئێوە، لەو شتانە دەخوات کە ئێوە لێی دەخۆن و لەو شتانە دەخواتەوە کە ئێوە لێی دەخۆنەوە. (٣٣) جا ئەگەر ملکەچ و فەرمانبەرداری بەشەرێکی وەکو خۆتان بن، ئەوە بە ڕاستی ئیتر ئێوە خەسارەتمەندو زەرەرمەندن!! (٣٤) ئایا هەڕەشەتان

لێدەكات بەوەی كاتێك بمرن و ببنەوە بە خاك و ئێسك، ئێوە دەرئەهێنرێنەوە و زیندوو دەكرێنەوە و لە خاك دەربهێنرێنەوە؟! (٣٥) دوورە و زۆر دوورە ئەو هەڕەشەیەی كە لێتان دەكرێت بێتە دی و (زیندوو بكرێنەوە)!! (٣٦) ژیان تەنها ژیانی ئەم دنیایەمانەو هیچی تر نی یە، دەژین و دەمرین و ئێمە زیندوو ناكرێینەوە!! (٣٧) ئەم پیاوە (مەبەست پێغەمبەرەكەیانە) درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێت، ئێمەش بڕوای پێ ناكەین! ﴾

بەم شێوەیە دەوڵەمەندەكان شوێن كەوتوەكانیان تەفرەدا و هانیاندان بۆ كوفر كردن و بۆ گوێ نەگرتن لەو بانگەوازەی كە صالح – علیە السلام – دەیكرد، ئەو كافرانە بە راشكاوانە كوفریان بە صالح و ئەو هێنابووی بۆیان كردو شوێنی نەكەوتن.

كاتێك كاربەدەستەكان بینیان صالح – علیە السلام – باوەڕێكی پتەوی هەیەو ئارامیو پشو درێژیەكی زۆری هەیە، زیاتر ترسان لەوەی خەڵك ژمارەیان زیاد بكات لەباوەڕهێنان پێیو زیاتر بەهێزو دەسەلآت بن، جا لەخۆیان و ماڵو سامانو بەرژەوەندیەكانیان ترسان، هەروا لەدەوڵەتو دەسەلآتەكەشیان ترسان، بۆیە كەوتنە بیركردنەوە لەوكاروبارەی كە سەرقاڵی كردبوون و ببووە مایەی هەڕەشە بۆ هەموویان. لەكۆتایدا بیركردنەوەكەیان گەیاندنی بەوەی، كە داوای موعجیزەیەكی لێ بكەن مرۆڤەكان نەتوانن نمونەی بێننەوەو بۆ ئەوەی نیشانی شوێن كەوتەكانی بدەن، كە دەستەوسانەو بێ هێزە.

جا گەورەكانیان هاتنە لای صالح –علیە السلام– داوای موعجیزەیەكیان لێكرد وەك بەڵگەیەك بۆ راستگۆیی پێغەمبەرایەتیەكەی، كە نێردراوێكە لەلایەن خواوە هاتووە. پێیان وت: ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلۡمُسَحَّرِينَ ١٥٣ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا فَأۡتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١٥٤ ﴾ الشعراء: ١٥٣ - ١٥٤خوانەناسان وتیان: وادیارە تۆ بەڕاستی

لەوانەی کە فێڵ و جادووت لێکراوە ! ! (١٥٣) تۆ جگە لەوەی کە هەر بەشەرێکی وەك ئێمە، هیچی تر نیت، بەڵگەیەکمان نیشان بدە ئەگەر لە ڕاستگۆیانیت؟ ! ﴾

صالح – علیه السلام –وتیە گەلەکەی: چ ئایەتێکتان دەوێ؟ وتیان: ئەگەر تۆ راست دەکەی لەو بەردە رەقە وشترێکی ئاوسمان بۆ دەربێنە بۆئەوەی هەمووومان ببینین.

صالح – علیه السلام – فەرمووی: ئەگەر من ئەو کارەم کرد ئایا باوەڕم پێدەکەن کەوا من نێردراوی خوای بەهەقم؟ وتیان: بەڵێ جا لەسەر ئەمە بەڵێنو پەیمانی لێوەرگرتن، پاشان پێغەمبەری خوا صالح – علیه السلام– چوە شوێنی نوێژکردنەکەیو نوێژی کردو پاشان لەخوای گەورە پاڕایەوە ئەو داوایەی، کە گەلەکەی لێی کردبوو بۆی جێبەجێ بکات.

جا خوای گەورە فەرمانی بە بەردەکە کرد کەرت ببیٚو وشترێکیان بۆ بێنێتەدەر کە ئاوس بیٚو دە مانگ بەسەر زگەکەیدا تێپەڕ ببیٚ، هێندەی پێنەچوو هەتا بەردەکە جولاو بووە دوو کەرتو وشترێکی گەورەی زگ پڕی لێهاتە دەرێ، کە هەموو بە چاوی خۆیان بینیان.

پاشان وشترەکە بەچکەکی بوو ...وا ئەوان هەروا دەڕوانن جا لەبەرامبەر ئەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرو گەورەیە خەڵکی تووشی سەرسامی هاتن لەمەڕ ئەو توانایە گەورەیە، کە نیشانەیەکە لەسەر بوونی خوای گەورە.

بەڵام بەداخەوە لەپاش دیتنی ئەم ئایەتە گەورەیە ، ئەوان هەر بەردەوام بوون لەسەر کوفرو گومراییەکەیان و، باوەڕیان پیٚ نەهێنا تەنها پیاوێك نەبیٚ کە یەکێك بوو لەسەرکردەو گەورەکانیان.

هەر کە صالح – علیه السلام – بینی وا گەلەکەی هەر موکڕن لەسەر کوفر بە خوای گەورە پێیانی وت: گەلەکەم ئەوە وشتری خوایەو ئایەتێکە لەلایەن خواوە ! داواتان کرد

بۆی دروست کردن، ڕێز لەو وشترە بگرن و ئەزیەتی مەدەن ئەگینا تووشی سزایەکی نزیك دەبنەوە.

بزانن کەوا ئەو وشترە لەزەوی خودا دەخواو دەخواتەوەو دێتو دەچێت، هیچ لەوەڕو عەلەفی لەسەر ئێوە نیە، عەلەفو ئاو زۆرن. با ئاو ڕۆژێك بۆ وشترەکە بێت و ڕۆژێکیش بۆ مەڕو ماڵاتەکانی ئێوە بێت ، ئەوان لەسەرەتا بەوە رازی بوون ، ئەگەر نۆبەتی وشترەکە بوایە لێدەگەڕان بچێ ئاو بخاوتەوە ، ئەگەر نۆبەتی مەڕو ماڵاتەکەی ئەوانیش بوایە ئەوا دەچوون ئەو ڕۆژە ئاویان دەخواردەوە.

وشترەکە تا ماوەیەك لەناویان لەزەوی خوای دەخواردو ڕۆژێك ئاوی دەخواردو ڕۆژێك ئاوی نەدەخوارد، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا ژمارەی باوەڕداران بە پێغەمبەر صالح – علیه السلام – ڕووی لەزیاد بوون بوو...کافرەکان ترسان لەزیادبوونی ژمارەی شوێن کەوتووەکانی و ترسان لەپلەو پایەو دەسەڵاتو موڵكو سامانیان نەوەك لەکیسیان بچێ، بۆیە هەموو کۆبونەوەو پیلانێکی شەڕاویان لەدژی وشترەکە دانا.

صالح – علیه السلام – هەستی بەو پیلانە نگریسە کرد، بۆیە پێی وتن: ئەی گەلۆ بۆچی پەلە لەو سزایە دەکەن، کە چاوەڕێتان دەکات، بۆ داوای لێخۆشبوونو تەوبە لەخوای گەورە ناکەن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێبکات!!

بەڵام گەلەکەی وەڵامیان دایەوەو وتیان: ئێمە ڕەشبینین لەتۆو ئەوانەی شوێنت کەوتووە نابینی ئەوە تووشی بێ بارانی بووینە لەپاش ئەوەی تۆ هاتویو داوای پێغەمبەرایەتی دەکەی...صالح – علیه السلام – پێی وتن: ئێوە بە هۆی ئەو کوفرەی لەسەرینە بویتە مایەی هەموو دەردەسەریو نەهامەتیەك کە بەسەرتاندا هاتووە، خودا بە هۆی ئەو ناخۆشیانە تاقیتان دەکاتەوە بەڵکە بیر بکەنەوەو باوەڕ بهێنن.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ لِمَ تَسۡتَعۡجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِۖ لَوۡلَا تَسۡتَغۡفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُواْ ٱطَّيَّرۡنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَۚ قَالَ طَٰٓئِرُكُمۡ عِندَ ٱللَّهِۖ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ تُفۡتَنُونَ ﴿٤٧﴾ النمل: ٤٦ - ٤٧ يالّح پێی وتن: ئەی قەوم و كەسم بۆچی ئێوە پەلەی خراپەتانە پێش چاكە و حەز دەكەن بەلاو ناخۆشیتان بەسەر بێت، ئەی بۆچی داوای لێخۆشبوون لە خوا ناكەن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پیٚ بكرێت (خوای گەورە دەرووی زیاترتان لیٚ بكاتەوە). (٤٦) خەڵكەكە وتیان: ئێمە تووشی شووم و نەگبەتی بووین بە هۆی تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆدان، یالّح وتی: نەخێر وا نییە، نەگبەتی و شوومتان لەلایەن خواوە بۆ دێت (ئەگەر بەردەوام بن لەسەر یاخی بوونتان)، بەڵكو ئێوە قەومێكن كە تاقی دەكرێنەوە. ﴾

بەڵام ئەوان خۆیان بە زل زانیو تاغی بوونو وتیان: بۆچی مەڕو ماڵاتی ئێمە هەموو ڕۆژان ئاو نەخواتەوە. جا خەڵكەكە بێزاری خۆیان لەبەرامبەر ئەو وشترە دەبڕیو ویستیان بیكوژن.

(ابن جریر) و جگە لەویش لەئەهلی تەفسیر باسیان كردووە كەوا هۆكاری كوشتنی وشترەكە ئەوەبوو، كە ئافرەتێك لەوان ناوی عەنیزە بوو، نازناویشی دایكی عوسمان بوو، كە پیرەژنێكی كافر بوو لەهەموان زیاتر ئازاری صالحی – علیه السلام – دەدا پارەو پولێكی زۆرو چەند كچێكی جوانی هەبوو، مێردەكەشی ناوی (ذؤاب بن عمر) بوو، كە یەكێك بوو لەسەركردەكانی ئەمود، ئافرەتێكی تریش هەبوو پێی دەوترا صەدەقە، كە ئافرەتێكی خانەدانو جوان بوو ژنی پیاوێكی موسوڵمان بوو، بەڵام تەڵاقی دا، ئەم دوو ئافرەتە مەبلەغێك پارەیان ئامادەكرد بۆ ئەو كەسەی وشترەكە بكوژێ، جا صەدەقە پیاوێكی بانگ كرد پێی دەوترا(الحباب) خۆی پێشكەش كرد لەبڕی ئەوەی، كە وشترەكە بكوژێ، بەڵام بە گوێی نەكرد، ئەم جارە كوڕە مامێكی

خۆی بانگ کرد ناوی (المصدع بن المحيا) بوو رازی بوو ئەم کارە بکات، عەنیزەش پیاوێکی بانگ کرد ناوی قەداری کوڕی سالف بوو، کە پیاوێکی سوورو سپی‌و چاوشین بوو بە ژن کورت بوو، کەوا گومان دەبەن بیژی بوبێ، جا پێی وت: هەر یەکێکت بوێ لەکچەکانم دەتدەمێ بەمەرجێ وشترەکە سەربڕی، لەوکاتەدا قەداری کوڕی سالف و(المصدع بن المحيا) راپەرین‌و چەند کەسێکی تریشیان هاندا لەثەمود هەتا بوونە حەوت کەس، دواتر بوونە نۆ رەوە، ئەوانەن کە خوای گەورە لەبارەیان دەفەرموێ:﴿ وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾النمل: ٤٨

جا ئەوانە هەموو هۆزەکەیان هانداو، لەبۆسە دانیشتن بۆ وشترەکە قەداری کوڕی سالف لەژێر بەردێك خۆی حەشارداو (مصدع)یش لەژێر بەردێکی تر خۆی حەشاردا. جا کە وشترەکە بەلای (مصدع) داهات تیرەکی تێگرت‌و لەماسولکەی لاقی دا، قەداری کوڕی سالفیش گرتی‌و بە شمشێر سەری بڕی‌و وشترەکە کەوتە خوارەوە و یەك جار بۆڕاندی، بەچکەکەشی رای کردە سەر چیایەك هەتا گەیشتە ترۆپکی و لەسەر بەردێك راوەستاو جا بۆڕاندی.

کاتێك وشترەکەیان سەربڕی، هەواڵەکە گەیشتە صالح – علیه السلام – جا هاتە لایان و کاتێك وشترەکەی بینی و فەرموی: ﴿ تَمَتَّعُوا فِي دَارِكُمْ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ ﴾هود: ٦٥ لەرۆژی چوارشەم بوو وشترەکەیان کوشت، ئەم نۆ رەوەیە پیلانیان بۆ صالح پێغەمبەر – علیه السلام – دارشت بۆ ئەوەی بیکوژن و وتیان: ئەگەر راست بکات ئەوە پێشە خۆمان با لەناوی ببەین، ئەگەریش راستی نەکرد وەك وشترەکەی لێدەکەین. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾النمل: ٤٩

کاتێك عەزمیان جەزم کرد بۆ ئەوەی پیلانەکەیان جێ بەجێ بکەن بەشەو هاتن بۆ ئەوەی صالح – علیه اسلام – بکوژن، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی پاراست و ئەوانی لەدێ بەرد باران کردن و تێك و پێکی شکاندنو پێش قەومەکەی لەناوی بردن، ثەمود لەیەکەم ڕۆژی چاوەڕوانیدا کە ڕۆژی پێنج شەم بوو دەمو چاویان زەرد هەڵگەڕا، لەڕۆژی دووەمیش کە هەینی بوو، دەمو چاویان سور هەڵگەڕا، لەڕۆژی سێیەمیش کە شەممە بوو دەم و چاویان ڕەش هەڵگەڕا، کە بەیانیان کردەوە لە ڕۆژی یەك شەممە دەمو چاویان وەك قەترانی لێهاتو نەیان توانی چ بکەنو چاوەڕێی سزای خوای گەورەیان دەکرد  جا کە ڕۆژهەڵات دەنگێکی گەورە لەئاسمانەوە هاتو زەویش لەبن پێیان جولەیەکی بەهێزی کردە هەموو بوونە لاشەیەکی بێ گیانو لەیەك ساتو کاتدا هەموویان لەناو چوون ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾الأعراف: ٧٨ هیچ کەسێکیان تێدا ڕزگار نەبوو نە بچوك نە گەورە نە نێر نەمێ، لەوەچەی ثەمود تەنها صالحو ئەوانەی باوەڕیان پێهێنابوو مانەوەو ڕزگاریان بوو، تەنها پیاوێکیان نەبی (أبو رغاك) بوو کاتێك ئەو بەڵایە بەسەر قەومەکەی هات لەحەرەم بوو جا، کە هاتە دەرەوە بۆ حیل بەردێك لەئاسمانەوە هات بەسەری کەوتو لەناوی برد. والله تعالی أعلم.

لەفەرمودەیەکی صەحیحدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێ: ((ئایە باسی بێ بەخت ترینو دزێو ترین دوو پیاوتان بۆ بکەم؟)) وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرموی: ((پیاوە سۆرکەکەی پەمود کە وشترەکەی سەربڕی، ئەوەش، کەێ عەلی لێرەت دەدا)) واتە سەری ((هەتا ئێرە تەڕ دەبێ)) واتە ڕیشی. (حدیث حسن لغیره رواه احمد).

لەریوایەتێکی تری (أحمد) دا لەفەرمودەی (الاسراء ) دا هاتووە، کە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیاوێکی سوری چاوشینی پرچ لولی خۆلاوی بینی، فەرمووی: ((ئەی جبریل ئەمە کێیە؟ )) وتی: ئەوە بکوژی وشترەکەیە. (رواە احمد)[1].

## ٩- فیرعەون

خوای گەورە موساو هارونی نارد بۆ لای فیرعەونی تاغی بۆ ئەوەی بە خوا بیترسێنن، فەرمانیشی پێکردن کە بە نەرمیو لەسەرەخۆیی قسەی لەگەڵ بکەن بەڵکە بیر دەکاتەوەو دەترسێ. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ طه: ٤٣ - ٤٤ هەردووکتان بچن بۆ لای فیرعەون، چونکە بەڕاستی ئەو لە سنوور دەرچووە و لە مەرزی بەندایەتی ترازاوە.. (٤٣) هەردووکتان بەنەرمی و جوانی گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرێت، یان ترسی (سزای ئێمە) لە دەروونیدا جێ بگرێت.﴾ بەڵام فیرعەون بەردەوام بوو لەسەر کوفرو منجڕیەکەیو خۆی بەزل زانی خوداش خۆیو سەربازەکانی تووشی ڕوورەشیو سزای دونیاو ئاخیرەت کرد. خوای گەورە فەمویەتی: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلْ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهْدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلْءَايَةَ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ يَسْعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلْءَاخِرَةِ وَٱلْأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَعِبْرَةً لِّمَن يَخْشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ﴾ النازعات: ١٥ - ٢٦(ئینجا دێتە سەر باسی سەرگوزەشتەی حەزرەتی موساو دڵخۆشی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەداتەوە

(١) حديث ضعيف ضعفه الالباني في ضعيف الترهيب والترغيب.

و دەفەرموێت) ئایا بەسەرهاتی موسات پێگەیشتووە؟! (١٥) کاتێك پەروەردگاری لە دۆڵی (گوی) دا بانگی کرد و گفتوگۆی لەگەڵدا کرد و فەرمانی پێدا (١٦) بچۆ بۆ لای فیرعەون (چونکە) بەڕاستی لە سنوور دەرچووە و ستەمی بێ ئەندازەیە. (١٧) پێی بڵێ: باشە ئەوە ناکرێت دڵ و دەروون و کردارو رەفتارت پاك و جوان و پوختە بێت! (١٨) تا ڕێنموویت بکەم بۆ ناسینی پەروەردگارت، تا ترسی (سزای) ئەو زاتەت هەبێت و ستەم نەکەیت). (١٩) (دیارە فیرعەون داوای بەڵگەی کردوە) ئەویش موعجیزە گەورەکەی نیشانداوە (کە دار عاساکەیە). (٢٠) (بەلاّم) بە درۆی زانی و یاخی بوو. (٢١) لەوەودوا پشتی هەڵگردو کەوتە هەوڵ و تێکۆشان (بۆ بەرهەڵستی موسا و دژایەتی ئیمان). (٢٢) خەڵکی کۆکردەوە و بەدەنگی بەرز وتی: (٢٣) من پەروەردگاری هەرە بەرزو بڵندی ئێوەم!! (٢٤) ئەوسا خوا دووچاری سزای قیامەت و دنیای کرد. (٢٥) بەڕاستی ئا لەو بەسەرهاتەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ هەرکەسێك لە خوا بترسێت. (ئینجا دێتە سەر باسی هەندێك لە دروستکراوانی کە بەڵگەن لەسەر دەسەلاّت و گەورەیی ئەو زاتە).

کاتێك موسا - علیه السلام - پەیامەکەی گەیاندە فیرعەون‌و ئەویش باوەڕی نەهێنا، بەڵکو هەڕەشەی لەموسا کرد ، خوای گەورە فەرمانی بە موسا کرد نەوەی ئیسرائیل بەرەو لای رووبار ببات، جا کە ڕۆیشتن فیرعەون بەمەی زانی‌و سەربازەکانی خۆی کۆکردەوە بۆ ئەوەی شوێنینان بکەون، کاتێك فیرعەون نزیك بوویەوە لەو شوێنەی موسا لێی پەڕیەوە ڕێگایەکی لەناو ڕووبار دیتەوە، کە هیچ کۆسپ و لەمپەری نەبوو فەرمانی بەسەربازەکانی کرد بپەڕنەوە..هەتا کاتێك فیرعەون‌و سەربازەکانی هاتنە ناوەڕاستی ڕێگاکە، لەوکاتە بەفەرمانی خوا ئاوەکە لێکی دایەوەو فیرعەون‌و سەربازەکانی کەوتنە ناو شەپۆڵی رووبار و هەموو خنکان و لەناوچوون، فیرعەون لەسەرەمەرگیدا ووتی:﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ وَجُنُودُهُۥ بَغۡيٗا

وَعَدْوًا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ یونس: ٩٠ ئەوسا نەوەی ئیسرائیلمان بەدەریادا پەڕاندەوە، فیرعەون و سەربازانی بۆ ستەم و دەستدرێژی شوێنیان کەوتن، تا ئەو کاتەی (کە ئاوەکە چوەوە باری ئاسایی خۆی) فیرعەون خەریك بوو دەخنکا ئا لەو کاتەدا وتی: وا ئیتر باوەڕم هێنا بەوەی کە هیچ خوایەك نیە جگە لەو خوایەی کە نەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێهێناوە و من ئیتر لە موسڵمان و ملکەچانم. ﴾

بەڵام خوای گەورە تەوبەکەی لێ وەرنەگرت، چونکە تەوبە لەسەرەمەگدا وەرناگیرێت، جا خوای گەورە خنکاندی‌و لاشەکەشی فرێدایە سەر وشکانی بۆئەوەی ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ هەموو تاغوت‌و خۆ بەزل زانەکان.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ یونس: ٩٢

پێشەوا (أحمد) و (ترمذی) لە(ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((کاتێك فیرعەوت وتی: آمنت أنَّهُ لا إلهَ إلا الذي آمنت بهِ بنو إسرائیل) وتی جبریل پێی وتم: ئەی موحەممەد، ئەگەر تەماشات بکردبام هەندێك قوڕی دەریام هەڵگرتبوو بەتوندی لەدەوم دەپەستا لەترسی ئەوەی نەوەك رەحمەت بیگرێتەوە))[1].

---

([1]) ئەم فەرمودەیە بەم سەنەدە لاوازە بەڵام لەشەواهیدەکانی تری سەنەدەکەیان باشەو پیاوەکانی لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیمن. وەرگێڕ. والله أعلم.

## ١٠- هامان

هامان وەزیری فیرعەون بوو بەرپرسی هەموو کاری بیناسازی ئەندازیاری بوو لەسەردەمی فیرعەون

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰهَـٰمَـٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَـٰبَ ﴿٣٦﴾ ﴾غافر: ٣٦

ئەوەیە، کە جێگیربووە لەو کیتابانەی کەوا باسی ژیانی کەسایەتیەکانی لەدرێژایی مێژوو کردوە..

ئەو زانیاریانەی لەقورئانی پیرۆزدا هەیە لەبارەی میسری کۆنو حاکمەکانی زۆرێك لەراستیە مێژووییەکان بەدیاردێخی کە پێشتر نەدەزانرا و دیار نەبوو هەتا بەم دواییە..

هامان چەند جارێك لەقورئان ناوی هاتوەو باسی کراوە، کە یەکێك بووە لەنزیکەکانی فیرعەون، بەڵام لەتەوراتدا هاتووە کە هامان لەسەردەمی موسا نەبووە بەڵکو هامان وەزیرو خۆشەویستی پادشای فارسەکان بووە کە ناوی ئەحشۆریشە، کە یۆنانیەکان پێی دەڵێن: زرکیس، خۆ زۆر کەس تانەیان لەقورئان داوەو ویستویانە بڵێن موحەممەد (ﷺ) قورئانی لەتەورات وەرگرتووە و لەبەری گرتیتەوە، بەڵام وادەبینی جیاوازی لەنێوان قورئانو تەوراتدا هەیە لەمەڕ هەندێك چیرۆك لەوانە کەسایەتی هامان.

ناماقوڵیو ترۆیی ئەو پڕوپاگەندانـە کاتێـك نیـشان درا پـاش ئـەوەی مەتـەڵی جـادو ئەبجەدیە هیرۆغلیفیە میسریەکانیان لێك دایەوە و کردەوە پـێش دوو سـەد سـاڵ(٢٠٠)، ناوی هامان دۆزرایـەوە لەمەختوتـە کۆنـەکان، کە پـێش ئـەو دۆزینەوەیـە هـیچ شـتێك لەمێژووی فیرعەونەکان نەدەزانرا مەتەڵی هیرۆغلیفی لەساڵی ١٧٩٩ز هەڵێنراو مانای بـۆ لێك درایەوە، ئەویش بە هۆی دۆزینەوەی بەردێکی ڕێ نیشاندەرەو دەلیل، کە بۆ ساڵی ١٩٦ پێش زایین دەگەڕێتەوە، گرنگی ئەو بەردە لـەوە دەردەکـەوێ ، کـە بەسـێ زمـان

نوسراوە، زمانی هیرۆغلیفی و دیمۆقیتی و یۆنانی، كە بە یارمەتی یۆنانیەكان توانرا ئەو مەتەڵە ئاشكرا كرد بكرێ لەسەر دەستی شانلبیون، لەپاش ئەمەوە توانرا زانیاریەكی زۆر بزانرێ سەبارەت بە مێژووی فیرعەونەكان، لەمیانی تەرجەمە كردنی نەخشەیەك لەو نەخشە میسریانە ناوی هامان دۆزرایەوە، ئەو ناوە ئامـاژەی بۆ كـراوە لەتەختەیەكی شـوێنەواری (أثـري) لەمۆزەخانـەی (هـۆف) لـەڤیێننا، كـە لەكۆمـەڵێك نـەخش بۆمـانی ئاشكراكرد هامان سەرۆكی كرێكارەكانی كانە بەردی بیناسازیەكان بـووە، جـا ئـا ئـەوە ئەو نەخشانەن، كە حەقیقەتی هامانمان بۆ دەردەخەن بە پێچەوانەی ئـەوەی تـەورات و ئینجیل باسیان كردووە، هەروا وەكو بەرپەرچ دانەوەیەكی ئەو گومانە هەڵەیەی كـە بـۆ قورئانیان هەڵبەستووە، جا هامان ئەو كەسەیە، كەلەسـەردەمی موسـا لەمیـسر ژیـاوە، كە نزیك ترین كەس بووە لەفیرعەون هەروەكو، خوای گەورە لەقورئانەكەی بۆمان بـاس دەكـات و دەفـەرموێ: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى فَأَوْقِدْ لِى يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجْعَل لِّى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ القصص: ٣٨فیرعەون سەركەشانە وتی: ئەی خەڵكینە من كەسی تر شك نابەن كە شایستەبێت بەوەی خواتان بێت جگە لـە خـۆم، ئـەی هامـان تـۆ لـە گڵ خشتی سوورەوە كراوم بۆ دروست بكـە و قەڵایـەكی بـەرزو پتـەوم بـۆ بینـا بكـە بـاڵكو پیایدا سەربكەوم تـا خـوای موسـا ببیـنم هەرچـەندە مـن بەڕاسـتی بـڕوام وایـە لـە ڕیـز درۆزنەكاندایە... ! ﴾

ئەو خاڵە گرنگەی، كە لەقورئان باسكراوە ئەوەیە، كە هامان ئەو كەسەبووە، كە فیرعەون فەرمانی پێكرد تەلارێكی بۆ دروست بكات بۆ ئەوەی بگاتە خوای موسا، ئالێرە ئیعجازی قورئان بە دەردەكەوێ لەحەقیقەتی هامان كە پێشتر حەقیقەتەكەی نەدەزانرا تەنها كاتێك هێمای زمانی هیرۆغلیفیان ئاشكرا كرد بەپێچەوانەی ئەوەی كە

لەتەورات و ئینجیلدا هاتووە، كە وەزیری پادشای فارسەكان بووە. (من كتاب معجزات القرآن لهارون يحيى).

دەڵێم: ئەم راستیە ئاشكراو ڕوونە هۆكار بوو بۆ ئیسلام بوونی نووسەری فەرەنسی ناودار (مۆریس بۆكای) كە لەبارەی ئەو حەقیقەتەی نوسیوە بەشێوەیەك دڵەكان فێنك دەكاتەوە، پاش ئەوەی، كە خاڵی لەسەر پیتەكان دانا.

﴿وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ۝٧﴾ الأنفال ٧: خوایش دەیەوێت حەق و ڕاستی بەفەرمانەكانی خۆی بچەسپێنێت و كافرانیش بنەبڕ بكات و ریشەكەنیان بكات...﴾

## ١١- قارون

قارونی كوڕی یەصهوری كوڕی لاوی لەسەر وتەی زۆربەی ئەهلی عیلم كوڕە مامی موسا بووە، هەروەكو ، كە (ابن كثير) لە(البداية والنهاية) باسی كردووە. (٣٦٠/١٠).

قارون پیاوێكی مونافیق بوو، بەردەوامیش بوو لەسەری هەتا خوای گەورە لەناوی برد.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ۝٧٦﴾ القصص: ٧٦ بێگومان قارون لە قەوم و خوێشانی موسا بو كەچی (بەهۆی ماڵ و سامانیەوە) خۆی گیف دەكردەوە بە سەریاندا و فیزی بەسەردا دەكردن، ئەوەندە ماڵ و سامان و دارایيمان پێبەخشیبوو، كە بەڕاستی كلیلی گەنجینە و قاسەكانی با چەند كەسێكي بەهێز بەگرانی هەڵدەگیران، (لەكاتی لووت بەرزیەكەیدا) هەندێك ئیمانداری خزمی پێیان وت: كەشخە مەكە و لە خۆت بایی مابە بەم سامانە،

چونكە بێگومان خوا ئەو كەسانەی خۆشناوێت كە كەشخە دەكەن بەسەروەت و سامانیانەوە و لە خۆیان بایی دەبن . ﴾

قارون لەعەشیرەتی موسا بوو ، كە كوڕە مامی بوو، بەڵام باوەڕی بە موسا نەبوو، بەڵكو پیاوێكی دڵ رەق‌و خۆ بەزل زان بوو زۆریش دەوڵەمەند بوو، خوای گەورە ئەوەندەی گەنجینەی پێ دابوو، كە كلیەكانی بەچەند پیاوێكی بە هێزو بازو نەبایە هەڵنەدەگیرا، (خثیمة) وتویەتی: كلیلی خەزێنەكان قارون لەپێست دروست كرابوو، هەر كلیلێك بە ئەندازەی سەرە پەنجەیەك بوو، هەر خەزێنەیەكیش كلیلی تایبەت بە خۆی هەبوو، ئەگەر كلیلەكانی باركرابان ئەوا دەبایە شەست هێستر باری بكەن.

جا لەگەڵ ئەو هەموو نیعمەتەی خوای گەورە پێی دابوو لەباتی شوكرانە بژێری خوای گەورە بكات ئەوا لەسنوو دەرچوو سپڵە بوو، یەكێك لەكارە دزێوو خراپەكانی ئەوەبوو ئافرەتێكی بانگ دەكرد بۆ زیناو سەد دیناری دەداێی‌و پاشان پێی دەوت: برۆ بۆ فلانە گەڕەكی (بنی اسرائیل) و بڵێ موسا بانگی كردم بۆ ئیشی خراپ و سەد دیناریشی پێدام جا رۆیشت هەتا گەیشتە ئەو گەڕەكەی (بنی اسرائیل)و وتی: ئەی گەلی (بنی اسرائیل) هەر ئەوەندەی وت و پێی نەكرا قسەكانیتر بكات، بەڵكو خوای گەورە قسەكانی گۆڕی و وتی: قارون ئەو پارەیەی داوە پێم و فەرمایشی پێكردم كەوابڵێم بە ئێوە، كە موسا ئەو پارەیەی داوە پێم لەبڕی خراپ كردن لەگەڵمدا، (بنی اسرائیل)یش، كە موساشیان لەگەڵ دابوو هاتنە لای قارون‌و پێیان وت: ئەوە چیتە، چ وای لێكردی ئەوە بكەیت؟ ئەوە موسا پێغەمبەرەو كوڕە مامتە دوژمنەكەی ئێمەی لەناوبردو، لەدونیاش ئەوەندە زۆری پێداوی، كە نەیداوەتە كەس لە(بنی اسرائیل) جا دڵخۆش مەبەو كەیفت بەخۆت نێ چونكە خوا ئەو كەسانەی لەخۆباییەو كەیفیان بەخۆدێ خۆش ناوێ.

ئەو بەشەی لەدونیا پێت دراوە وەریگرە بیّ ئەوەی خۆت بە گەورە بگری، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ القصص: ٧٧هەولّبدە بەو مالّ و سامانەی خوا پیی بەخشیووی مالّی قیامەت و بەهەشتی بەرین بکڕەو بەشی خۆشت لە دنیادا بەحەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەلّ بەندەکانی خوادا بکە هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەیت هەولّی فەساد و گوناهو تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆشناوێت تۆی خراپە دەچینن. ﴾ بەڵام قارون لەباتی شوکری خوای گەورە بکات لەسەر ئەو نیعمەتانە و گویّ رابگری لەئامۆژگاریەکانی قەومەکەی ئەوا هەموو ئەو نیعمەتانەی بۆ خۆی گەڕاندەوەو دایە پاڵە خۆیو، وتیە قەومەکەی: من بە هۆی زیرەکی خۆمو عیلمی خۆم ئەم خەزێنانەم بەدەست هێناوە، بەم جۆرە خوا لێم رازی بوو، منی بە ومالّو سامانە گەورە کرد بەسەر ئێوە.

پاشان هەر بەوەش رانەوەستا بەڵکو ڕۆژێك زۆر بەفیزەوە هاتە ناو قەومەکەی، کەلەم لاو لەولا خزمەتکارو حەرەسو دەستو پێوەندەکانی دەوریان دابوو، جا هەندێك خەڵك پێی هەڵخەڵەتان و بووە مایەی فیتنە بۆیان ، خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ القصص: ٧٩ - ٨٠ ئینجا ڕۆژێك قاروون خۆی سازدا و بە ڕازاوەیی چووە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی بۆ کەشخەکردن و خۆ نواندن، ئەوانەی کە ئاواتیان ژیانی دنیایە " وتیان: ئای خۆزگە ئێمەش وەکو

قاروون، سامان و دەسەلأتمان ببوایە، بەڕاستی خاوەنی بەختێکی گەورەیە! (٧٩) (بەلأم) ئەوانەی کە زانستی و زانیاری ڕاستیان پێبەخشراوە (دەربارەی حەلأڵ و حەرام و نرخی قیامەت دەزانن) وتیان: هاوار بۆ ئێوە، بۆ تێنافکرن پاداشتی خوایی زۆر چاکترە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی دامەزراوی هێناوەو کارو کردەوەی چاکی ئەنجام داوە، ئەو زانست و باوەڕو کردەوەیە بە کەس نادرێت، تەنها بە خۆگرو ئارامگران نەبێت. ﴾

جا کاتێك قارون وای کرد خودا خۆیو خانوبەرەو ماڵو سامانی ژێر خاك کردو لەناوی برد.

(ابن کثیر) لەتەفسیرەکەی وتویەتی: وتراوە لەناوچوونی قارون بە دوعای موسا بووە، وتراویشە کاتێك قارون بە فیزەوە چووە ناو قەومەکەی، بە لای موسا پێغەمبەردا ڕۆیی کە ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد، جا خەڵکەکە ، کە قارونیان بینی بەم هەیئەتە چاویان تیْ بڕیو ڕوویان لەوی کرد، موسا پێی وت: بۆ وا دەکەی؟ وتی: ئەی موسا ئەگەر تۆ بە پێغەمبەرایەتی لەمن گەورەتری ئەوا من بە ماڵو سامان لەتۆ گەورەترم جا یەکسەر خوای گەورە لەگەڵ زەوی کردنیە یەكو نغرۆی کردن.

(ابن عباس) وتویەتی: هەتا تەبەقەی حەوتەمی زەوی رووچوون.

(قتادة) وتویەتی: بۆمان باسکراوە کەوا هەموو ڕۆژ بە ئەندازەی قامەتێك ڕوودەچن هەتا ڕۆژی قیامەت. ﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ ﴾القصص: ٨١ واتە: نە ئەو ماڵەی، کە کۆی کردبۆوە و نە خزمەتکارو حەرەس نەیان توانی سزای خوای گەورەی لەسەر هەڵبگرنو نە خۆشی توانی یارمەتی خۆی بدا بەڵکو خەسارەتمەند بوو.

﴿ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْاْ مَكَانَهُۥ ﴾القصص: ٨٢ واتە: ئەوانەی قارونیان بینی وا لەناو ئەو نازو نیعمەتەنادایە و خۆی پێ هەڵدەكێشێ وتیان: ﴿ يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ ﴾القصص: ٧٩ جا كە خوای گەورە ژێر خاكی كرد ئەم جارە وتیان : ﴿وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ﴾ واتە: بە هۆی ئەوەی یەكێك ماڵو سامانی زۆر بێ ئەوا نابێتە هۆی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، چونكە خوای گەورە هەر بەخۆی دەبەخشیو هەر بەخۆشی دەیگرێتەوە، هەر بەخۆشی تەسك دەكاتەوەو هەر بەخۆشی فراوانی دەكات، هەر بەخۆی بەرز دەكاتەوەو دادەبەزێنێ، ئەم مانایەش لەفەرمودەیەكی مەرفوعدا، كە ابن مسعود وتویەتی: (خوای گەورە ئەخلاقی لەنێوانتان دابەش كردووە هەروەكو، كە رزقو ڕۆزی لەنێوانتان دابەش كردووە، خودا ئەوەی پێی خۆش بێ ماڵی دەداتێو ئەوەشی لاشی ناخۆش بێ هەر ماڵی دەداتێ، بەڵام ئیمان ناداتە كەسێك مەگەر ئەو كەسەی خۆش بوێ و پێی خۆش بێ بیداتێ) (رواه الحاكم وصححه).

﴿بِٱلْأَمْسِ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ واتە: ئەگەر لوتفو بەزەیی خوای گەورە ، نەبوایە ئێمەی وەكو قارون ژێر خاك دەكرد چونكە ئێمە هیوای ئەومان خواست وەكو ئەو ماڵو داراییمان هەبێ.

## ١٢-خاوەنی دوو باغەكە

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ ۚ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ الكهف: ٣٢ - ٤٤ (دەربارەی دۆزەخیان و بەهەشتیان) ئەی محمد صلی الله علیه وسلم، نموونەیان بۆ بهێنەرەوە بەدوو پیاو كە یەكێكیانمان كردووە بەخاوەنی دوو باخی ڕەزو، دەوری هەردوو باخەكەمان بەدار خورما تەنیوەو لە نێوانیاندا باخ و بێستانمان فەراهەم هێناوە... (٣٢) هەردوو باخەكەش میوەی چاكیان بەرهەم هێناوەو هیچیان لێ خەسار نەبووەو لە نێوان هەردوو باخەكەشدا ڕووبارێكمان هەڵقوڵاندووە... (٣٣) جا ئەو خاوەن باخە، زۆر سەروەت و سامانی تری هەبوو، (كابرای خاوەن باخ غەڕابوو بەسامانەكەی) بۆیە بە

هاوەڵە هەژارە ئیماندارەکەی وت کاتێك گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد: من سامانی زۆر زیاترم هەیە لە تۆ، ماڵ و منداڵیشم بەهێز ترە لەوانەی تۆ. (٣٤) ڕۆژێك چوو بۆ سەردانی یەکێك لە باخەکانی (لەگەڵ هاوەڵەکەیدا) لەکاتێکدا کە ستەمکار بوو لە خۆی (بەهۆی لە خۆبایی بوونیەوە)، بۆیە لەبەرخۆیەوە وتی: گومان نابەم کە ئەم باخ و باخاتە هەرگیز لەناو بچێت (٣٥) واشنازانم قیامەت بەرپا دەبێت، سوێند بە خوا ئەگەر بمگێڕنەوە بۆ لای پەروەردگارم دوای مردنم، ئەوە دڵنیام کەلای ئەویش جێگەو ڕێگەو چەندەها باخی ڕازاوەی لەمە باشترم بۆ ئامادە کراوە. (٣٦) هاوەڵە ئیماندارەکەی لەکاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت: ئایا باوەڕت نەماوە بەو زاتەی کە سەرەتا تۆی لە خاك دروست کردووە؟! لەوەودوا نوفتەیەك بوویت، پاشان کردیتی بە پیاو؟! (٣٧) بەڵام من دەڵێم کە:_الله_ (بەدیهێنەری هەموو بوونەوەر)، هەر ئەو پەروەردگارمە، هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێك بۆ ئەو پەروەردگارەم بڕیار نادەم. (٣٨) دەبوا کاتێك چوویتە ناو باخەکەتەوە، بتوتایە: ما شاو الله، هەرچی خوا ویستی لەسەر بێت هەر ئەوە پێش دێت ئەم هەموو نازو نیعمەتە بەخششی خوایەو بەهەرکەس بیەوێت دەیبەخشێت، هیچ هێزو توانایەك بۆ هیچ کەس نی یە تەنها بەهۆی خواوە نەبێت، ئەگەر تۆ من دەبینیت ماڵ و سامان و نەوەم لە تۆ کەمترە. (٣٩) ئەوە نزیکە و ئومێدەوارم پەروەردگارم لەو باخەی تۆ چاکترم پێ ببەخشێت (لە دنیادا یان لە قیامەتدا) بەڵایەکیش لەئاسمانەوە بۆ باخەکەت بنێرێت و، بیکاتە زەویەکی ڕووت و خلیسك و وشك . (٤٠) یاخود (دوور نیە) ئاوی باخەکە ڕۆبچێت و هەرگیز نەتوانیت بەدەستی بهێنیت. (٤١) (سەرئەنجام پێشبینی هاوەڵی خواناسی هاتەدی) سەروەت و سامانی بەبا دراو لەناو برا، ئینجا (بەدەم ئاخ و داخ و هەناسەی ساردەوە)، دەستی دەدا بەیەکداو لەسەر ئەو مەسرەفەی کەتێدا کردبوو، لەکاتێکدا باخەکە بەسەریەکدا تەپی بوو، لە جێی خۆیدا کاول بوو، ئەوسا دەیوت: خۆزگە من هیچ جۆرە

هاوەڵێكم بۆ خوا بڕیار نەدایە (باوەڕی دامەزراوم تەنها بەو هەبوایە) (٤٢) ئیتر هیچ دەستەو تاقمێك نەبوو جگە لە خوا فریای بكەوێت و لەخەشمی خوا دەربازی بكات، سەركەوتووش نەبوو. (٤٣) ئا لەو كاتانەداو لەو جۆرە حاڵانەدا یارمەتی و كۆمەك تەنها لە خوا، پەروەردگاری حەق و ڕاست و دروست وەردەگیرێت، هەر خۆی چاكترین پاداشتی ئامادە كردووە، چاكترین سەرئەنجامیش چاوەڕێی بەختەوەرانە. ﴾

(ابن كثیر) وتویەتی: خودای گەورە نمونەی بۆ كافرەكان هێناوەتەوە بە دوو پیاو، كە بۆ یەكێكیان دوو باغی پێدابوو، كە ئەم دووباغو بێستانە بە دارخورمایەكی چڕو پڕ دەورە درابوو، لەنێوانیشیان جۆرەها لەسەوزەو میوە چێنرابوو، كە هەموو بەروبوومێكی باش‌و زۆری هەبوو، ئەم دوو پیاوە شەریك بوون، پاشان پارەكەیان دابەش كردو هەر یەكەیان سێ هەزار دیناری بەركەوت، باوەڕدارەكە چەند بەندەیەكی بە هەزار دینار كڕی‌و پاشان ئازادی كردن، بە هەزارەكەی تریش جل‌و بەرگی بۆ رووت‌و پێخواسەكان كڕی، بە هەزارەكەی تریش خواردنی كڕی‌و برسی‌و هەژارەكانی تێركرد، هەروا مزگەوتێكی پێ دروست كرد و لەگەڵ چەند شتێكی تری باش.پیاوەكەیتریش بە ماڵەكەی ژنی تری پێهێناو، چەند مەڕو ماڵاتو هەندێك چێڵیشی كڕی، كە بۆ ماوەیەكی كەم زۆر زیادی كرد، بە هەندەكەی تریش بازرگانی كرد ، جا قازانجێكی زۆری كردو بووە دەوڵەمەندی سەردەمی خۆی. پیاوە باوەڕدارەكە پێویستی بە كاركردن هەبوو بۆیە چووە لای برادەرەكەی بۆ ئەوەی وەك كرێكارێك لەباغەكەی كاربكات ، جا كە چوو بۆلای خەریك بوو نەتوانێ بچێتە لای لەبەر دەرگەوانەكان‌و حەرەسیاتی توندیان، بەهەر شێوەیەك بێت توانی بچێتە لای‌و ناسیەوەو ئەویش كارەكەی خۆی پێ وت، ئەویش وتی: ئەی من و تۆ پارەكەمان لەنێوانمان دابەش نەكرد، چیت لەپارەكەی خۆت كرد؟

وتی: كارێكم پێ كرت بۆ ئەوەی لەلای خودای گەورە پاداشت وەربگرم، چونكە ئەوەی بۆ خوابێ ئەو دەمینێتەوەو سوودی بۆ خاوەنەكەی دەبی.

وتی: ئایە تۆ لەخێركەرەكانی، من وانازانم قیامەت هەبیٚو بێت، من وادەزانم تۆ پیاوێكی گێلیت، پاداشتیشت لای من تەنها ئەوەیە بێ بەشت بكەم لەهەموو شتێك لەبەر گێلایەتیەكەت. ئایا تۆ نازانی من چیم كرد بە پارەو سامانی خۆم، ئا ئەوە بە خۆت دەبینی چ پارەو پولو سامانێكی زۆرم هەیە، من كاسبیم كردو تۆش خۆت گیل كرد، برۆ دەرەوە لێرە نەمینێی.

پاشان بەسەرهاتی ئەو مەغرورە بووە ئەوەی، كە خوای گەورە باغو بیستانەكانی لەریشە هەڵكێشاو تەفرو تونای كردو سەر شۆڕی دونیاو قیامەتی كرد.

لەشتە سەیرەكانی تەفسیری كرمانیدا هاتووە، كە ئەوانە دوو برا بوونە لە(بنی اسرائیل) یەكێكیان باوەڕداربووە ناوی تەملیخا بوو، ئەویتریش ناوی نەطروس بوو كافر بوو ئەوانە ئەو دوو كەسەن، كە خوای گەورە باسی لێوە كردووە لەسوڕەتی الصافات، وەكو دەفەرموێ: ﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنۡهُمۡ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ الصافات: ٥١ - ٥٢یەكێكیان مۆڵەت دەخوازێت و دەڵێت: من بەڕاستی كاتی خۆی لە دنیادا هاوەڵێكم هەبوو... زۆرجار دەیوت: تۆ بڕوا بە شتی وا دەكەیت؟!

## ١٣-موساو سامیری

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ ۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْا۟ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّوا۟ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِى مِنۢ بَعْدِىٓ ۖ أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ ۖ وَأَلْقَى ٱلْأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيْهِ ۚ قَالَ ٱبْنَ أُمَّ إِنَّ ٱلْقَوْمَ ٱسْتَضْعَفُونِى وَكَادُوا۟ يَقْتُلُونَنِى فَلَا تُشْمِتْ بِىَ ٱلْأَعْدَآءَ وَلَا تَجْعَلْنِى مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِأَخِى وَأَدْخِلْنَا فِى رَحْمَتِكَ ۖ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِهَا وَءَامَنُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلْغَضَبُ أَخَذَ ٱلْأَلْوَاحَ ۖ وَفِى نُسْخَتِهَا هُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ هُمْ لِرَبِّهِمْ يَرْهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ الأعراف: ١٤٨ - جا لە دوای چوونی موسا (بۆ كێوی گور) قەومەكەی پەیكەری گوێرەكەیەكیان لە خشڵەكانیان دروست كرد، كە بۆڕەیەكی هەبوو! ! ئایا ئەوان نەیانزانی كە ئەوە بەڕاستی قسەیان لەگەڵدا ناكات و ڕێنموییان ناكات بۆ هیچ ڕێیەك، (سەیرە لەگەڵ ئەو هەموو كەم و كوورپیانەشدا) كردیان بەخوای خۆیان، ئەوانە ستەمكار بوون. (١٤٨) كاتێكیش كە لە دەستیان چوو و پەشیمان بوونەوە و (ڕاستییان بۆ دەركەوت و گوێرەكە بوو بە پەند لەبەر چاویان) زانیان و دڵنیا بوون كە بەڕاستی گومڕا بوون و وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر پەروەردگارمان بەزەیی پیاماندا نەیەتەوە و لێمان خۆش نەبێت، ئەوە بەڕاستی لە زەرەرمەندانین. (١٤٩) جا

کاتێك موسا گەڕایەوە بۆ لای قەومەکەی (زانی بووی خەریکی گوێرەکە پەرستین) زۆر بەتوڕەیی و پەستی و غەمباریەوە وتی: بەڕاستی دوای ڕۆشتنی من جێنشینیەکی خراپی منتان کرد، ئەوە پەلەتان کرد لە وادەی پەروەردگارتاندا؟ (ئیتر لەداخی ئەو لادان و سەرگەردانیە) تابلۆکانی (تەورات)ی فڕێداو پەلاماری قژی (هاروون)ی برای داو ڕای کێشا بۆ لای خۆی، (هاروون) وتی: کوڕی دایکم (خەتای من نەبوو، من زۆر هەوڵمدا بەڵام بێ سوود بوو) بە ڕاستی ئەو خەڵکە زۆریان بۆ هێنام و هێزیان لێسەندم، خەریك بوو بشمکوژن (کاکە گیان) کەوابوو دوژمنانم پێ شاد مەکە و لەگەڵ قەومی ستەمکاردا حسابم بۆ مەکە. (١٥٠) (ئەوسا ئیتر موسا بەخۆیدا هاتەوە و) وتی: پەروەردگارا لە خۆم و براکەشم خۆش ببە و هەردووکمان بخەرە نێو ڕەحمەت و میهرەبانی خۆتەوە و تۆ لە هەموو کەس بەسۆزتر و میهرەبانتریت. (١٥١) بەڕاستی ئەوانەی کە گوێرەکەکەیان پەرست، لەئایندەدا لەلایەن پەروەردگاریانەوە خەشم و قینیان دەگاتێ و زەلیلی و خەجاڵەتییش بەشیان دەبێت لە ژیانی دنیادا، هەر بەو شێوەیەش پاداشتی ئەوانە دەدەینەوە کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن. (١٥٢) ئەوانەش کە کردارە خراپەکانیان ئەنجامداوە و پاشان لە دوای کردارە خراپەکان تەوبەیان کردو پەشیمان بوونەوە و باوەڕێکی دامەزراویان هێنا، ئەوە بێگومان پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد(ێلی الله علیە وسلم) لە دوای ئەنجامدانی ئەوکارانە لێخۆشبوو میهرەبانە. (١٥٣) کاتێك تووڕەیی موسا هێور بۆوە، تابلۆکانی (تەورات)ی هەڵگرتەوە، کەلە توێیدا ڕێنموویی و ڕەحمەت و میهرەبانی تیادا دەدرەوشایەوە بۆ ئەوانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن و مەبەستیانە لێیان نەڕەنجێت. ﴾

هەروا فەرمویەتی: ﴿ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾

﴿فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوْمِهِۦ غَضْبَٰنَ أَسِفًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ ٱلْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِى ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِىُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَٰرُونُ مِن قَبْلُ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِى وَأَطِيعُوٓا۟ أَمْرِى ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذْ رَأَيْتَهُمْ ضَلُّوٓا۟ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيْتَ أَمْرِى ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبْنَؤُمَّ لَا تَأْخُذْ بِلِحْيَتِى وَلَا بِرَأْسِىٓۖ إِنِّى خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقْتَ بَيْنَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَمْ تَرْقُبْ قَوْلِى ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِىُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥۖ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾﴾ طه: ٨٣ - ٩٨

**(لەوەودوا موسا خۆی گەیاندە کێوی گور، خوای گەورە لێی پرسی:) ئەی موسا بۆچی تۆ پەلەت کردو قەومەکەت بەجێ هێشت. (٨٣) موسا وتی: ئەوان لەسەر ڕێبازی من دەڕۆن، (بەڵام من ئارەزوومەندی گفتوگۆت بووم) بۆیە بەپەلە هاتم تا تۆ ئەی پەروەردگارم لێم ڕازی بیت (فەرمانە پیرۆزەکانت وەربگرم). (٨٤) پەروەردگار فەرمووی: بێگومان ئێمە قەومەکەتمان لە دوای هاتنی تۆ تاقیکردەوە (کەچی سەرکەتوو نەبوون، باوەڕ دامەزراو نەبوون) کابرای سامیری گومڕای کردن. (٨٥)**

پاشان موسا گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی، بەتووڕەیی و داخ و خەفەتێکی زۆرەوە، وتی: ئەی قەومەکەم، مەگەر پەروەردگارتان بەڵێنی چاکی نەدابوونێ (کە سەرفرازتان بکات لە دنیاو قیامەتدا) ئایا ئەو بەڵێن و پەیمانە زۆری پێچووە؟ یاخود ویستتان خەشم و قین لەلایەن پەروەردگارتانەوە دابارێت بەسەرتاندا، بۆیە ئیتر ئەو بەڵێنەی دابووتان بە من نەتان بردەسەر (کە پابەندی یەکخواناسی بن؟!). (٨٦) خەڵکەکە وتیان: ئێمە سەرپێچی کردنمان لە بەڵێنەکەی تۆ بەئارەزووی خۆمان نەبووە، حەزمان لە سەرپێچی نەکردووە، بەلاّم ئێمە زێرو زیوێکی زۆری – قبطي– یەکان درابوو بەسەرماندا، جا ئیتر فڕێمانداو سامیریش بەو شێوەیە فڕێیدا.. (٨٧بەو زێرو زیوە پەیکەری گوێرەکەیەکی بۆ دروست کردن (جارجار) بۆڕەیەکی دەکرد، (سامیری و بێ دینەکان بێ شەرمانە) وتیان: ئەمە خوای ئێوە و خوای موسایە، ئەو لە بیری چووە و (بەشوێنیدا دەگەڕێت). (٨٨) جا ئایا ئەو نەفامانە نازانن ئەو گوێرەکەیە وەلاّمی هیچ قسەیەکیان ناداتەوە" هیچ زەرەر، یان قازانجێکی بۆتان نیە؟! (٨٩) بێگومان پێشتریش هاروون پێی وتن: ئەی قەومی من" ئێوە بەم گوێرەکە زێرینە تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بوون و تیایدا دەرنەچوون، دڵنیابن کە پەروەردگارتان خوایەکی میهرەبانە، شوێنی من بکەون و گوێڕایەڵی فەرمانی من بن. (٩٠) کەچی وتیان: هەرگیز وازی لێ ناهێنین و بەدەوریدا دێین و دەیپەرستین هەتا موسا خۆی دەگەڕێتەوە!! (٩١) (موسا، کە گەڕایەوە بە تورەییەوە) وتی: ئەی هاروون، چی وای لێ کردیت (بێ دەنگ بیت) و هیچ نەکەیت، کاتێك بینیتن ئاوا گومرا بوون؟ (٩٢) چی وای لێ کردیت پەیڕەوی من نەکەیت؟! ئایا لە فەرمانی من یاخی بوویت؟! (٩٣) هاروون وتی: کوڕی دایکم (بۆ ئەوەی سۆزی بجوڵێنێت) ڕیشم مەگرە و قژم ڕامەکێشە، (من بۆیە زۆر لەسەری نەچووم) بێگومان ترسام دوایی پێم بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە ناو نەتەوەی ئیسرائیلەوە و گوێت بەقسەی من نەدا. (٩٤) (ئنجا موسا ڕووی کردە کابرای سامیری) وتی: ئەی سامیری،

ئەوکارە خەتەرناکە چی یە کە ئەنجامت داوە؟ (ئەم پیلان و تەڵەکە و فێڵە چی یە دروستت کردووە)؟! (٩٥) سامیری وتی: ئەوەی من بینیم، ئەوان نەیانبینی، من مشتێکم لە شوێن پێی (ئەسپەکەی) جوبرەئیل هەڵگرت و فڕێمدایە ناو پەیکەرەکەوە، بەو شێوەیە نەفسی بەدکردارم ئەو کارەی پێکردم (یاخود دەگونجێت سامیری درۆ بکات، تا خۆی لە خەشمی حەزرەتی موسا ڕزگار بکات و جادوویەکی ئەنجام دابێت). (٩٦) (موسا بە سامیری) وت: دەبڕۆ تا ماوی لە ژیاندا (هەر کەسێك نزیکت کەوتەوە دەبێت) بڵێیت: بە هیچ شێوەیەك بەریەککەوتن نی یە (دیارە کە دەست هەرکەسی بەربکەوتبێت تووشی ئازارێکی زۆر بووە)، دڵنیاش بە کە کاتێکی تریشت بۆ دیاری کراوە، کە هەرگیز ناتوانیت لێی دەرباز ببیت، سەرنجی خواکەشت بدە کە بەدەوریدا دەسوڕایتەوە و دەتپەرست، دەبێت بیسوتێنین و هەلا هەلای بکەین و بیخەینە ناو دەریاوە. (٩٧) خەڵکینە: ئێوە دڵنیابن کە پەروەردگارتان تەنها زاتی (الله) یە، جگە لەو خوایەکی تر نیە، زانیاری و زانستی ئەو زاتە هەموو شتێکی گرتۆتەوە. ﴾

خوای گەورە باسی (بنی اسرائیل)مان بۆ دەکات، کاتێك موسا –علیه السلام– ڕۆیشت بۆ سەر چیای طور، کە لەوێ خوا قسەی لەگەڵ کردو ئەویش قسەی لەگەڵ خوا کردو چەند پرسیارێکی لێکرد خودای گەورەش وەڵامی دایەوە.

یەکێك لە(بنی اسرائیل) کە ناوی (هارون السامری) بوو، چەند خشلێکی کۆکردەوەو كردیە گۆلکێكو پاشان مشتە خۆلێکیشی تێکرد، کە هەڵیگرتبۆوە لەبن دەستو پێی ئەسپی جوبریل – علیه السلام – کاتێك بینی لەخنکاندنی فیرعەون لەناو ڕووباردا. ج، کە ئەم خۆڵەی تێکرد بۆڕی وەك ئەوەی گۆلکێکی ڕاستی بێت.

(قتادە)و جگە لەویش دەڵێن: ئەم خشڵو زێڕە بووە گۆلکێکی زیندوو دەبۆڕی.

هەندێکیش دەڵێن: بەڵکو ئەگەر با هەڵیکردبا دەچووە ناو کۆمیو لەدەمی دەهاتە دەرەوە، جا وەك چێڵ دەبۆڕی ، ئەوانیش سەمایان لەدەوروبەری دەکرد.

﴿فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ﴾ واتە: موسا خوایەکەی خۆی لەلای ئێمە داناوەو لەبیری کردوەو رۆیشتوە لەدوای بگەڕێ کەچی وا لێرەیە!

خودای گەورە –سبحانە وتعالی – ئەمەی بۆی چوون پوچی کردەوە لەکردنە خواکردنی گیاندارێكو دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ دەفەرموێ: ئەم گیاندارە نە قسە دەکاتو نەدەتوانێ وەڵام بداتەوەو نە دەتوانێ زەرەر بداو نە دەتوانێ قازانج بگەینێو، نە دەتوانێ ڕێنمویی خەڵکی بکات بۆ ڕێگایەکی ڕاست، جا، کە کردیانە خوای خۆیان ئەوا ستەمیان لەخۆیان کردو دەشیانزانی ئەمە پووچەو دەیانزانی کەوا لەسەر نەفامیو گومڕایی دەڕۆن.

جا کاتێك موسا – علیه السلام – گەڕایەوەو بینی وا گۆلك دەپەرستن ، زۆر توڕە بوو ئەو تەختانەی، کە تەوراتی لەسەر نوسرابوو هەمووی فڕێدا، وتراویشە، کە هەموی شکاند هەروەکو، کە لەلای ئەهلی کیتاب وا باس کراوە، پاشان خوای گەورە گۆڕیەوە بۆی بە چەند تەختەیەکی تر، بەڵام لەقورئان دەلالەت لەسەر ئەوە نادات، کاتێك ئەوەی بینی.

پاشان موسا – علیه السلام – ڕووی تێکردنو ریسواو سەر شۆڕی کردن لەسەر ئەو کار درێوەی، کە کردیان، ئەوانیش عوزریان بۆ هێنایەوەو وتیان: ﴿قَالُواْ مَآ أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلْنَآ أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ ٱلْقَوْمِ فَقَذَفْنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلْقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾﴾ طه: ٨٧ خەڵکەکە وتیان: ئێمە سەرپێچی کردنمان لە بەڵێنەکەی تۆ بەئارەزووی خۆمان

نەبووە، حەزمان لە سەرپێچی نەکردووە، بەڵام ئێمە زێڕو زیوێکی زۆری – قبگی- یەکان درابوو بەسەرماندا، جا ئیتر فڕێماندا‌و سامیریش بەو شێوەیە فڕێیدا.. ﴾

شەرمەزاری دایگرتن لەبەکارهێنانی خشڵو زێڕی فیرعەون و داروودەستەکەی، کە ئەهلی شەڕ بوون و خوای گەورە فەرمانی پێکردوون حەلالەو بەکاری بهێنن، بەڵام شەرمەزاری داینەگرتن، کە کاتێك بە هۆی گەوجاتیو نەفامی خۆیان گوڵکێکیان کردە هاوەڵو شەریك بۆ خوای تاكو تەنیاو پەرستیان..!

پاشان موسا –علیه السلام – رووی کردە هارونی برایو پێی ووت: ﴿ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ طه: ٩٢ - ٩٣(موسا، کە گەڕایەوە بە توڕەییەوە) وتی: ئەی هاروون، چی وای لێ کردیت (بێ دەنگ بیت) و هیچ نەکەیت، کاتێك بینیتن ئاوا گومرا بوون؟ (٩٢) چی وای لێ کردیت پەیڕەوی من نەکەیت؟! ئایا لە فەرمانی من یاخی بوویت؟! ﴾

هارونیش علیه السلام وتی: ﴿ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ﴿٩٤﴾ طه: ٩٤هاروون وتی: کوڕی دایکم (بۆ ئەوەی سۆزی بجوڵێنێت) ڕیشم مەگرە و قژم ڕامەکێشە، (من بۆیە زۆر لەسەری نەچووم) بێگومان ترسام دوایی پێم بڵێیت: تۆ جیاوازیت خستە ناو نەتەوەی ئیسرائیلەوە و گوێت بەقسەی من نەدا. ﴾

موسا علیه السلام وتی: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ ﴾الأعراف: ١٥١

پاشان موسا رووی کردە سامیری و پێی وت: ﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ ﴾طه: ٩٥ واتە: چی وای لێکردی ئەو کارە بکەی؟ وتی: ﴿ قَالَ بَصُرْتُ بِمَا لَمْ يَبْصُرُوا۟ بِهِۦ ﴿٩٦﴾ ﴾طه: ٩٦ واتە: جوبریلم بینی –علیه السلام – سواری ئەسپێك ببوو ﴿فَقَبَضْتُ قَبْضَةً مِّنْ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ ﴾ واتە: لەشوێنەواری ئەسپی جوبریل.

هەندێك وا باس دەکەن، کەوا جبریلیان دیتیە، کەوا ئەسپەکەی بەهەر شوێنێکدا بڕۆیشتبایە ئەوا ئەو جێگەیە سەوز هەڵدەگەڕا، جا چنگێك خۆڵی لەو شوێنەوارە هەڵگرتەوەو تێکەڵ بەو گۆلکەی کرد، کە لەزێڕی دروستی کردبوو، دواتر دەڵێ ﴿فَنَبَذْتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتْ لِى نَفْسِى ﴾ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ ﴿٩٧﴾ ﴾طه: ٩٧

ئەمەش دوعا لێکردنە بەوەی دەست نەکاتە کەس، واتە: نە دەست بداتە کەس‌و نە کەسیش دەستی لێبدات بە درێژایی ژیانی، پاشان موسا شار بەدەری کرد، فەرمانیشی بە (بنی اسرائیل) کرد، کەوا تێکەڵی مەبن‌و نزیك مەکەونەوە لێی‌و قسەی لەگەڵ مەکەن وەك سزایەك بۆی لەسەر ئەوەی ، کە ئەو شتەی دەستی لێدا نەدەبوو دەستی لێبدابایە، هەندێك دەڵێن: ئەگەر دەستی لەهەر یەکێك بدابە توشی تا دەبوو، ئەمەش وەك سزایەك لەدونیا، پاشان لەئاخیرەتیش هەڕەشەی لێکرد و وتی ﴿ قَالَ فَٱذْهَبْ فَإِنَّ لَكَ فِى ٱلْحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ وَإِنَّ لَكَ مَوْعِدًا لَّن تُخْلَفَهُۥ وَٱنظُرْ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِى ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفًا لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ طه: ٩٧(موسا بە سامیری) وت: دەبڕۆ تا ماوی لە ژیاندا (هەر کەسێك نزیکت کەوتەوە دەبێت) بڵێیت: بە هیچ شێوەیەك بەریەککەوتن نی یە (دیارە کە دەست هەرکەسی بەربکەوتبێت تووشی ئازارێکی زۆر بووە)، دڵنیاش بە کە کاتێکی تریشت بۆ دیاری

كراوە، كە هەرگیز ناتوانیت لێی دەرباز ببیت، سەرنجی خواكەشت بدە كە بەدەوریدا دەسوڕایتەوە و دەتپەرست، دەبێت بیسوتێنین و هەلا هەلای بكەین و بیخەینە ناو دەریاوە. ﴾

پاشان موسا – علیه السلام – رووی لەگۆلكەكە كردو بە ئاگر سوتاندی، پاشان خۆڵەمێشەكەی بە رووبار دادا و فەرمانی بە (بنی اسرائیل) دا لەو رووبارە بخۆنەوە، جا خواردیانەوە ئەوەی گۆلكەكەی پەرستبوو ئەوا خۆڵەمێشەكە بە لێوی وەدەنوسا، هەندێكیش وتویانە: رەنگیان زەرد هەڵدەگەڕا. پاشان خوای گەورە لەسەر زمانی موسا دەفەرموێ، كە پێیانی وت: ﴿ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾ ﴾طه: ٩٨

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ سَيَنَالُهُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَذِلَّةٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُفْتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ ﴾الأعراف: ١٥٢

پاشان خوای گەورە بە رەحمەتو لوتفی خۆی هەواڵیدا بە بەندەكانی ، كە ئەوەی تەوبە بكاو بگەڕێتەوە لام ئەوا تەوبەكەی قەبول دەكەم، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِهَا وَءَامَنُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٥٣﴾ ﴾الأعراف: ١٥٣

بەڵام خوای گەورە ئەوانەی گۆلكەكەیان پەرستبوو تەوبەی لێ قەبول نەكردن تەنها بە كوشتن نەبێ، هەروەكو، كە خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ إِنَّكُمْ ظَلَمْتُمْ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلْعِجْلَ فَتُوبُوٓا۟ إِلَىٰ بَارِئِكُمْ فَٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ عِندَ بَارِئِكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ ﴾البقرة: ٥٤

وتراوە بەیانیەك، ئەوانەی، کە گوڵکەکەیان نەپەرستبوو دەستیان دایە شمشێرو خوای گەورەش تەمێکی ناردە سەریان بۆ ئەوەی کەس خزمی کەسی خۆی نەناسێتەوە پاشان هێرشیان کردە سەریان و هەموویان کوشتن، هەندێك دەڵێن لەو بەیانیە: حەفتا هەزار کەسیان لێ کوژرا!

پاشان خوای گەورە فەرموی: ﴿ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾الأعراف: ١٥٤ والله تعالى أعلم.

## ١٤-عمرو بن لحی الخزاعی

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((عەمری کوڕی لوحەییم بینی ریخۆڵەکانی لەناو ئاگر لەدوو خۆی رادەکێشا، پرسیارم لێکرد لەو خەڵکانەی لەو ماوەیە لەنێوانماندا هەیە، فەرمووی: ئەوانە فەوتاون))[1].

(أبوهريره) (رضي الله عنه) وتویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرمووە (أكثم بن الجون الخزاعی): (( ئەی ئەکثەم، عەمری کوڕی لوحەی کوڕی قەمعەی کوڕی حەندەفم بینی لەناو ئاگر، ریخۆڵەکانی لەدوو خۆی رادەکێشا، پیاوێکم نەدیوە وەك تۆ بەو بچێو پیاوێکیشم نەدیوە وەك ئەو بە تۆ بچێ)) ئەکثەم وتی: دەترسم وێك چوونەکەی بۆ من زیانم پێ بگەیەنێ؟ فەرمووی: ((نەخێر، تۆ باوەڕداریو

(١) (صحيح) رواه البخاري ومسلم وأحمد، بەڵام بە بێژەی: ((رأيت عمرو بن عامر الخزاعي يجر قصبته في النار، وكان أوب من سيب السيوب)) ولم أجده بلفظ ابن اسحاق.

ئەو كافرە، ئەو یەكەم كەس بوو دینی پێغەمبەر ئیسماعیلی گۆڕی‌و، فنصب الأوثان، وبحر البحيرة[١]، وسيب السائبة[٢]، ووصل الوصيلة[٣]، وحمى الحامي[٤] )).

سەبارەت بە هێنانی بتیش لەشام بۆ مەككە:

ئەوا (ابن هشام) دەڵێ: هەندێك لەئەهلی عیلم بۆمی باسكرد: كەوا عەمری كوڕی لوحەی بۆ هەندێك ئیش‌و كار چوو بۆ شام، كاتێك گەیشتە مەئاب لەزەوی بەلقاء ، كە ئەو كات عەمالیقی لێ بوو – كە ئەوانە كوڕانی عیملاقن. وترا ناوی عەملیقی كوڕی (لاوذ)ی كوڕی (سام)ی كوڕی (نوح) بووە، جا پێیانی وت: ئەو بتانە چیە، كە دەبینم دەیان پەرستن؟پێیان وت: ئەوانە بتن دەیان پەرستین، داوای بارانی لێدەكەین بۆمان دەبارێنێ‌و داوای یارمەتی‌و سەركەوتنی لێدەكەین بۆمان جێ بەجێ دەكات، پێیانی وت: ئایە لەو بتانە بتێكم نادەنێ بۆ ئەوەی لەگەڵە خۆم ببەمەوە زەوی عەرەبان بۆ

---

(١) بحر البحيرة: پێشتر عەرەبە نەفامەكان ئەگەر وشترەكەیان (١٠) بەچكەی ببوایە ئەوا گوێیان كەل دەكردو بەرەڵایان دەكرد بۆ ئەوەی بە ئارەزوی خۆی بلەوەڕێ‌و ئاو بخواتەوەو گۆشتەكەشیان حەرام دەكرد، خوای گەورەش قەدەغەی ئەو كارەی ئەوانی كرد.

(٢) سيب السائبة: ئەوەیە، كە ئەگەر پیاوێك لەعەرەبە نەفامەكان لەسەفەرێك بگەڕابایەوەو نەزری بكردبایە، یان لەنەخۆشیەك چاك بووبایەوە، ئەوا دەیوت(ناقتی سائبة) نابێ كەس لەهیچ ئاوێك قەدەغەی بكات‌و نابێ بدۆشرێ‌و نابێ كەسیش سواری پشتی بی، ئەم كارەش خوای گەورە قەدەغەی كرد.

(٣) وصل الوصيلة: ئەوەیە، كە ئەگەر عەرەبە نەفامەكان وشترێكیان شەش جار بزابایە و چوار زگیان مێینە بوایەو لەجاری حەوتەم نێرو مێیەكی ببوایە، ئەوا دەیان گوت: گەیشت بە براكەی، شیرەكەیان حەلال دەكرد بۆ پیاوان و حەرامیان دەكرد بۆ ژنان.

(٤) حمى الحامي: واتە، ئەگەر ناودارێكی عەرەب لەنەفامیدا بچوبایە شوێنێك ئەوا سەگێكی بە عەپە عەپ دەهێنا جا ماوەی ئەو عەپە عەپە بۆ خۆی‌و دارودەستەكەی لەوەڕی ئەو شوێنەی بۆ خۆی دادەبڕی‌و دەپاراست‌و دەبووە شەریكی ئەو قەومە لەلەوەڕاندنی وشترو مەڕەكانی.

ئەوەی بیپەرستن؟ جا بتێكیان پێدا ناوی هوبەل بوو، ئەویش هێنایەوە مەككە و دایمەزراندو فەرمانیشی بە خەڵكی كرد بە گەورەی بگرنو بیپەرستن[1].

(ابن اسحاق) وتویەتی: دەڵێن: سەرەتای پەرستنی بەرد لەنەوەی ئیسماعیل ئەوە بوو، كە ئەوان ئەو كات سەفەریان نەدەكرد بۆ هیچ لایەك، بەڵام كاتێك گوزەرانیان بەرەو خراپی ڕۆیی ناچار بوون سەفەر بكەن بۆ شوێنی تر، كە بت پەرستیو بەرد پەرستی لەو شوێنانەی سەفەریان بۆ كردبوو فێر بوون هاتنەوەو ئەو بەردانەی دەوری حەرەمیان بە گەورە گرتوو تەوافیان لەدەوری كرد، جا بەم جۆرە لەسەر ئەمە بەردەوام بوون، هەتا ئایینی ابراهیمو اسماعیلیان لەبیر كردو گۆڕیانەوە بە بت پەرستی، بەڵام هەندێك شتی ئایینی ابراهیمیان هەر جێ بەجێ دەكرد، وەك حەج كردنو قوربانی كردنو بە گەورەگرتنی كەعبە، لەگەڵ زیادكردنی چەند شتێك بۆی.

ئەگەر هۆزی كینانەو قورەیش بیانویستایە تەهلیل بكەن دەیان ووت (لبيك اللهم لبيك لبيك لا شريك لك لبيك، إلا شريكا هو لك، تملكه وما ملك) لەتەلبیەدا بە تاكیان رادەگرت ، پاشان لەگەڵ بتەكان شەریكیان بۆ پەیدا دەكرد.

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾يوسف: ١٠٦

---

(١) سەرەتای پەرستنی عەمر بۆ بتەكان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كاتەی، كە هۆزی خوزاعە خۆیان زاڵ كردە سەر بەیتو هۆزی جورهومیان وەدەرنا، عەرەبەكانیش هەر داهێنانێكیان دابهێنایە دەیانكردە دەستور چونكە لەمەوسیمی حەج نانیان بەخەڵك دەداو جلو بەرگی بۆ دابین دەكردن، جاركی وا هەبوو لەیەك مەوسیم دە هەزار گۆشیتی سەردەبڕیو، دە هەزار جلكیشی دەپۆشیە هەژاران، بەردێكیش هەبوو لەنزیك كەعبە، كە پیاوێك لەهۆزی ثەقیف گەنمی لەسەر دەهاڕیو دەیكردە هەویر، جا، كە ئەو پیاوە مرد، عەمر پێی وتن: ئەم پیاوە نەمردوە، بەڵكوچویتە بەردەكە، فەرمانیشی پێكردن ئەم بەردە بپەرستن، بەردەكەش ناوی لات بوو. (راجع الروض الأنف).

## ١٥-أبو جهل

ناوی (عمرو بن هشام بن المغيرة بن عبدالله بن عمرو بن مخزوم بن يقظة بن مرة بن كعب بن لؤي القرشي المخزومي)یە ئەبو جەهل پێشتر بە (أبا الحكم) ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ناوی نا (أبا جهل). دەڵێن سێ کەس لەقورەیش لەسەردەمی نەفامیدا لەهەمووان زیاتر رایان پەسندتر بووە: (عتبە)و (أبو جهل) و (أبو سفيان)، بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەمانە پاشەکشەیان کردو، دواتر (أبو سفيان) تەوبەی کردو بووە موسوڵمان.

چیرۆکی دژایەتی کردنی (أبو جهل) بۆ ئیسلامو موسڵمانان زۆر زۆرە، لەوانە: ئەو زۆر بە پەرۆشەوە کاری دەکرد بۆ رێ گرتن لەخەڵك بۆ ئەوەی نەچنە دینی خواوە، جارێکیان دەشتەکیەك هاتە بازار بۆ ئەوەی مەڕەکانی بفرۆشێ پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی کرد بۆ ئیسلامەتی، (أبو جهل)یش چووە لایو، وتی: نەکەی بە گوێی ئەو پیاوە بکەی، دەشتەکیەکەش هەڵساو وازێ لێهێنا.

هەروەها رووداوێکی تریش، کە (ابن الأثير) بۆمانی دەگێڕێتەوە لە(أسد الغابة)داو دەڵێ: جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەبازاری (ذي المجاز) وەستابوو بانگەوازی خەڵکی دەکردو پێیانی دەوت: ((بڵێن لا إله إلا الله سەردەکەون)) (أبو جهل)یش لەدواوە خۆڵی پێدا دەکردو دەیوت: بەگوێی ئەمە مەکەنو لەدینەکەی خۆتان لامەدەن، چونکە ئەمە دەیەوێ واز لەلاتو عوززا بهێنن.

(أبو جهل) زۆر ئازاری پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەدا، لەوانە پێشەوا (بخاری) بۆمان دەگێڕێتەوە لە(ابن مسعود)ەوە کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەکرد لەلای کەعبە، (أبو جهل)یش لەگەڵ هاوەڵەکانی دانیشتبوون، جا هەندێکیان بە هەندەکیانی وت: کێ دەچێ ریخۆڵەو ورگی وشتری فلانە ماڵ بێنێو لەسەر پشتی موحەممەد دابنێ ئەگەر کڕنوشی برد؟ جا کامەیان لەهەمووان خراپتر بوو کە (عقبە بن

أبی معیط) بوو هێنای و، چاوەڕێی كرد هەتا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كڕنوشی برد ئەویش لەسەر پشتی لەنێوان هەردوو شانی دانا، منیش وا سەیر دەكەم‌و هیچیشم پێ ناكرێ، بریا پشتێكم هەبوایە ئەو كات. دەڵێ: جا هەموو پێكەنین‌و تەماشای یەكتریان دەكردو پێغەمبەریش (ﷺ) هەر لەكڕنوش بردن بوو سەری بەرزنەكردەوە. هەتا (فاتیمە)ی كچی هات لەسەر پشتی لادا، پێغەمبەر (ﷺ) سەری بەرزكردەوەو پاشان فەرمووی: ((خودایە قوڕەیش لەناو ببەی)) سێ جاران. ئەوانیش زۆریان لەلا گران بوو ئەگەر دوعای لێكردبانە، چونكە وایان دەبینی كەوا دوعا كردن لەو شوێنە قەبول دەبێ. پاشا ناوی هێنان و فەرمووی: ((خودایە ئەبو جەهل لەناو ببەی، خودایە عوقبەی كوڕی ڕەبیعە لەناو ببەی، خودایە شەیبەی كوڕی ڕەبیعەو وەلیدی كوڕی عوتبەو ئومەییەی كوڕی خەلەفـو عوقبەی كوڕی ئەبو موعیط لەناو ببەی)) حەوتەمیشی ژمارد بەڵام ئێمە لەبەرمان نەكرد. جا دەڵێ: سوێند بە خوا، بینیم ئەوانەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژماردنی كەوتبوون بەسەر یەكدا لەقەلیبی بەدر.

هەروا (أبو جهل) یەكێك بوو لەوانەی دەنگیدا لەبیرۆكەی كوشتنی پێغەمبەر (ﷺ) پێش كۆچ كردن.

(ابن إسحاق) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: هەندێك لەهاوەڵانم كە متمانەم پێیان هەیە بۆیان باس كردم كەوا لە(عبدالله)ی كوڕی (أبو نجیح) گێڕایتیانەوە ئەویش لە(مجاهد بن جبیر أبی الحجاج) ئەویش لە(عبدالله)ی كوڕی (عباس) – خوا لێیان ڕازی بێت – وتویەتی:كاتێك كافرەكان كۆبوونەوە لە(دار الندوة) بۆ ئەوەی ڕاوێژ بكەن لەكوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) جا ڕۆژێكیان هەڵبژارد بۆ ئەم ڕاوێژكردنە، كە ناوی (یوم الزحمة) بوو، لەڕێگا ئیبلیس لەسەر شێوەی پیاوێكی پیر، كە جلێكی ئەستوری لەبەردابوو ڕێی پێگرتن‌و لەسەر دەرگای ماڵەكە ڕاوەستا، كە بینیان وا ڕاوەستاوە لەسەر دەرگا،

وتیان: ئەو پیاوە پیرە كێیە؟ وتی: پیاوێكە لەئەهلی نەجد[1] گوێبیستی ئەوە بووە، كە ئێوە راوێژی لەسەر دەكەن، جا ئامادەبووە بۆ ئەوەی گوێی لێتان بێ، بەڵكە بتوانێ یارمەتیتان بدات، وتیان: باشە، وەرە ژوورێ، جا هاتە ژوورەوە، لەوكۆبوونەوەیەدا خانەدانەكانی قورەیش كۆ ببوونەوە وەك (أبو جهل) و (أمية)ی كوڕی (خلف)و لەگەڵ هەندێكی تر، كە لەقورەیش نەبوون.

جا ئەوانە هەندێكیان وتیانە هەندێكیان: ئەوە دەزانن و دەبینن ئەو پیاوە چی بە ئێمە كردووە، ئێمە دەترسین لەخۆی‌و دارودەستەكەی جا رایەك دەربڕن، كە هەموو پێی رازی بین.

دەڵێ: راوێژیان كرد، پاشان یەكێكیان وتی: با بە زنجیری ئاسن بیبەستینەوە و دەرگای لەسەر دابخەن پاشان چاوەڕێی بكەن لەوەی بەسەر هاوشێوەكانی هات لەشاعیرەكانی پێشە خۆی وەك زوهەیرو نابیغەو هیتر لەو مردنە، هەتاوەكو تووشی ئەوە دێت كە ئەوان بەسەریان هات[2].

پیاوە نەجدیەكە وتی: نەخێر وەڵاهی، ئەم رایە باش نیە ئەگەر ئێوە دەڵێن حەپسی دەكەین ئەوا لەپشت ئەو دەرگایەی كەلەسەرتان داخستووە ئەوا هەر قسەكانی دەگاتە شوێن كەوتووەكانی‌و هەر مایەی ترسناكی دەبن بۆ مولك‌و دەسەڵاتتان‌و پاشان لەبن دەستان دەردێنن و ژمارەشیان زۆر دەبێت هەتا زاڵ دەبن بەسەرتان، من ئەم رایە بۆتان بە باش نازانم، رایەكی تر دەربڕن.

---

(١) سهیل وتویەتی: بۆیە وتی من نەجدیم چونكە ئەوان وتیان كەس ئامادەی ئێرە نەبێت لەئەهلی (تهامە) چونكە لەگەڵ موحەممەد هاوسۆزن بۆیە خۆی هێنایە سەر پیاوێكی ئەهلی نەجد.

(٢) خاوەنی ئەم رایە (أبا البختري بن هشام )) بوو.

دووبارە راوێژیان کردەوە، یەکێکی تریان وتی: لەناوە خۆمان دەری دەکەین‌و شاربەدەری دەکەین ، ئەو کات گرنگ نیە بۆمان دەچێتە کوێ بەم جۆرە لەکۆڵمان دەبێتەوەو ئێمەش کاروباری خۆمان رێك دەخەین[1].

پیاوە نەجدیەکە وتی : نەخێر وەڵاهی، ئەمەش رایەکی باش نیە بۆتان، ئایە نابینن قسەی چەند شیرین‌و خۆشەو توانای خۆ زاڵ کردنی هەیە بەسەر دڵی پیاوەکان وەڵاهی ئەگەر ئەوەتان کرد ئەوا دڵنیا نابن لەهیچ کام لەعەرەبەکان ئەوا بە وتەکانی بەسەریان زاڵ دەبێ‌و ئەوانیش شوێنی دەکەون‌و، پاشان دەیانهێنێ‌و نیشتەجێی ئێرەیان دەکات، بەم شێوەیە دەسەڵاتان لێدەستێنن، جا هەرچی بیانەوێ لەگەڵتان بکەن ئەوا دەیکەن، رایەکی تر دەربڕن.

دەڵێ: (أبو جهل) وتی: وەڵاهی من رایەکم هەیە لەبارەیەوە بڕواناکەم پێشتر بیرتان لێکردبێتەوە. وتیان دەبڵێ (أبا الحکم) بزانین چییە؟ وتی: من دەڵێم لەهەر هۆزێك گەنجێکی بەهێزو خاوەن پلەو پایە هەڵبژێرین لەنێوانمان. پاشان هەریەکە شمشێرێکی تیژو بەهێزی بدەینێ، پاشان هەمویان وەك لێدانی یەك پیاو لێی بدەن و بیکوژن بەم شێوەیە لەکۆڵمان دەبێتەوە، ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوا خوێنی لەنێوان ئەو هۆزانە پەرتەوازە دەبێ‌و، (بنو عبد مناف)یش توانای شەڕی ئەو هەموو هۆزانەیان نیە، ئەگەر رازی بوون خوێنی بدەین ئەوا پێیان دەدەین. دەڵێ: پیاوە نەجدیەکە وتی: رای ئەو پیاوە رایەکی باشە و من لەو رایە بەو لاوە چیتر بە باشتر نازانم، جا هەموو لەسەر ئەم رایە کۆك بوون‌و پەرتەوازەیان کرد.

جا جوبریل علیه السلام هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ) پێی وت: شەو لەسەر جێگاکەت مەخەوە ، کە هەموو شەوان لەسەری دەخەوتی. دەڵێ: کاتێك شەو تاریکایی تەواوی

(١) خاوەنی ئەم رایە (أبو الاسود ربیعە بن عامر) بوو.

داهێنا کۆبونەوە لەلای دەرگاکەی‌و چاوەڕێیان کرد کەی دەخەوێ بۆ ئەوەی هەڵکوتنە سەری، کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانی بینی، وتیە (علی) کوڕی (أبی طالب): بخەوە لەسەر جێگاکەم‌و جوببە کەسکونەکەشم بە خۆت دا بدەو لەناوی بخەوەو، مەترسە هیچ کامیان زەرەرت پێناگەیەنن.

جا، کە کۆبوونەوە لەناویشیان (أبو جهل بن هشام) وتی: موحەممەد وا گومان دەبا ئەگەر ئێوە شوێنی بکەون دەبنە پادشای عەرەب‌و عەجەم‌و، پاشان لەدوای مردن زیندوو دەبنەوەو بەهەشتانێکی وەکو بەهەشتانی ئوردونتان پێدەدرێ، ئەگەریش وانەکەن ئەوا سەرتان دەبڕێ‌و، پاشان لەدوای مردن زیندو دەکرێنەوەو، جا ئاگر دەتان سوتێنێ.

دەڵێ: جا پێغەمبەر(ﷺ) لەپێش چاویان هاتە دەرێ‌و مشتێك خۆڵی هەڵگرتەوەو فەرمووی: ((منم ئەو قسەیەم کردوەو تۆش یەکێکی لەوانە)) خوای گەورە وای کرد چاوی ئەوان نەبینی، پێغەمبەر (ﷺ) خۆڵی بەسەریان دا دەکردو ئەم ئایەتانەشی لەسورشەتی (یس) خوێندەوە: ﴿يسٓ ۝١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ۝٣ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٤ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ۝٥ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ۝٦ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ۝٧ إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ۝٨ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ۝٩﴾ يس: ١ – سوێند بەو قورئانەی کە هەموو فەرمانێکی لە شوێنی خۆیایەتی... (٢) بەڕاستی تۆ ئەی محمد (ێلی الله علیه وسلم) لە فرستادە و پێغەمبەرانیت... (٣) لەسەر ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروستیت. (٤) ئەم قورئانە لەلایەن زاتێکی خاوەن دەسەڵات و میهرەبانەوە دابەزیووە و ڕەوانە کراوە... (٥) بۆ ئەوەی گەل و هۆزێکی پێ بێدار بکەیتەوە کە باوو باپیرانیان بێدار نەکراونەتەوەو بێ

ئاگایی و نەشارەزایی ماونەتەوە. (٦) سوێند بە خوا بە ڕاستی بڕیاری خوا هاتە دی لەسەر زۆربەیان کە دۆزەخ پڕ دەکەین لێیان، لەبەر ئەوە ئیمان و باوەڕ ناهێنن (بەهۆی سەرسەختی و گوێ نەگرتنیانەوە). (٧) بەڕاستی هەر دەڵێیت ئێمە کۆت و زنجیرمان کردۆتە گەردنیان و لە ژێر چەناگەیان توندکراوە و بە ناچاری سەریان بەرز ڕاگیراوە و ئەم لاولایان پێناکرێت و بەرپێی خۆیان نابینن. (٨) هەروەها بەربەستمان لە بەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە، پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە و نایەڵێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە) ئیتر ئەوانە حەق و ڕاستی نابینن. ٩ ﴾

هەتا پێغەمبەر (ﷺ) لەخوێندنی ئەم ئایەتانە بوویەوە لەم پیاوانە کەس نەما خۆڵی بەسەر سەری دانەکا، پاشان بۆ ئەو شوێنەی تەرخانی کردبوو ڕۆیشت، لەو کاتەدا پیاوێك کەلەوان نەبوو هاتو، وتی: لێرە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ وتیان: چاوەڕوانی موحەممەد دەکەین، وتی: خوا بتان کوژێ! وەڵاهی موحەممەد بەناوتان دا ڕۆییو خۆڵی بەسەر سەری هەموشتاندا کرد، پاشان ڕۆیی، ئایە بۆ سەیری خۆتان ناکەن چیتان بەسەر هاتووە؟ دەڵێ: جا هەر یەکەیان دەستی دایە سەری خۆی و بینی وا خۆڵی بەسەرەوەیە، پاشان دەستیان بە پشکنین کرد، عەلیش لەسەر جێی پێغەمبەر (ﷺ) جوببەکەی پێغەمبەری (ﷺ) بەخۆدا دابوو، جا وتیان: ئەوە موحەممەدە نوستوەو، جوببەکەشی لەبەرە، لەناکاو عەلی لەناوی هاتە دەرەوە، وتیان: وەڵاهی ئەو پیاوەی قسەی بۆ کردین ڕاستی وت.

(أبو جهل) زۆر ئازاری هاوەڵەکانی پێغەمبەری(ﷺ) دەدا یەکێك لەوانە بیلالی حەبەشی بوو، کەلەسەر بەردی سور کراوەی بیابان رای دەخستو بەردی گەورەشی لەسەر زگی دادەنا هەتا گەرمای ڕۆژ سوری دەکردەوەو پێی دەوت کوفر بە پەروەردگاری موحەممەد بکە، بیلالیش دەیوت: خوا تاکە خوا تاکە.

هەروا خانەوادەی یاسریش – خوایان لیّ رازی بێت – كە موشریكەكان (عمّار)و سومەییەی دایكی و یاسری باوكیان دەبرد بۆ (أبطح) –كە شوێنێك بوو بەردی زۆری لیّ بوو– جا لەگەرمەی هاویندا لەویّ سزایان دەدان بەدڕندەترین شێواز، پێغەمبەریش (ﷺ) بە لایاندا تیّ دەپەڕیو پێیانی دەوت ((ئارام بگرن خانەوادەی یاسر...مەوعیدی ئێوە بەهەشتە)) یاسر – خوا لێی رازی بێت – لەژێر ئەشكەنجەدا وەفاتی كرد پاشان سومەییەی خێزانیشی، كە (أبو جهل) بە حەربەیەك لەزگیداو كوشتیو بووە یەكەم شەهید لەئیسلام..خودا لەهەموویان رازی بێت. (راوه ابن اسحاق).

لەڕووداوی كۆچكردندا (أبو جهل) هات لەپێغەمبەری دەپرسی، جا (أسماء ) دەرگای لێكردەوەو وتی: كوانی باوكت؟ وتی: نازانم. جا زللەیەكی توندی لێدا هەتا گوارەی لەگویّ هەڵبزركا.

(أبو جهل) بە چاوی خۆی چەند موعجیزەیەكی بینی، كە لەپێغەمبەر (ﷺ) ڕوویدا بەڵام ئەمە نەبووە مایەی باوەڕهێنان پێی بەڵكو زیاتر منجڕی كردو سەركەشی كرد، لەوانە ڕۆژێك ئەعرابیەك ناوی (كهله) بوو قەرزی لەلای (أبو جهل) بوو ئەویش هەر قەرزەكەی نەدەدایەوەو ماوەكەی درێژدەكردەوە ئەویش قوڕەیشی تێكەیاند، ئەوانیش پێیان وت بڕۆ بە موحەممەد بڵیّ جا ئەعرابیەكە لەگەڵ أبو جهل چوونە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەدەرگایانداو پێغەمبەر (ﷺ) دەرگای لێكردنەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بە (أبو جهل)ی فەرموو: ((حەقی ئەو كابرایە بدە)) ئەویش وتی: باشە موحەممەد وەدەكەم! جا قوڕەیش لەسەر ئەمە لۆمەیان كرد ، ئەویش وتی: بینیم وشترێك دەمی كردبۆوە، وەلاهی ئەگەر رازی نەبام دەیخواردم. (البداية والنهاية).

*ابن عباس –خوایان لیّ رازی بێت وتویەتی: ئەم ئایەتە لەبارەی (أبو جهل)ی كوڕی هیشام هاتۆتە خوار :

*کاتێك خوای گەورە به داری زەقوم ترساندنی، (أبو جهل) وتی: قورەیشیەکان، ئایا دەزانن داری زەقوم چییە، کە موحەممەد پێتان دەترسێنێ؟ وتیان: نەخێر، وتی: خورمای عەجوەیە لەیەثریب، وەڵاهی ئەگەر پێی گەیشتین ئەوا هەر زوو قووتی دەدەین. خوای گەورەش لەبارەیەوە ئەم چەند ئایەتەی نارده خوارەوە : واتە : وانیه وەك ئەو دەیڵێ.

*(أبو جهل) لەشەڕی بەدر بەدەستی هەردوو کوڕی عەفراء ، کە ناویان (معاذ) و (معوذ) بوو کوژرا. (عبدالرحمن )یی کوڕی (عوف) خوا لێی رازی بێت دەڵێ: من لەشەڕی بەدر لەریزی پێشەوە بووم، کاتێك ئاوڕم دایەوە لەلای راستو لەلای چەپم دوو گەنج پەیدابوون وەك بڵێی من لەو شوێنەی لێی بووم ئەمین نەبووم یەکێکیان بە نهێنی بێ ئەوەی برایەکەی تری ئاگای لێ بێ پێی وتم. مامە (أبو جهل)م پێ نیشان بدە منیش وتم: برازام چی لێ دەکەی؟ وتی: پەیمانم لەگەڵ خوا بەستوە یان دەبێ بیکوژم یان دەبێ بمرم لەم پێناوەدا. برایەکەی تریشی بە نهێنی هەمان شتی پێ وتم. دەڵێ: لەو کاتە من هەستم نەکرد کە لەنێوان دوو پیاوانم، منیش ئاماژەم بۆ کردن ئەوانیش وەك هەڵۆ هێرشیان کردە سەری و لێیان داو کوشتیان، ئەمانەش هەردوو کوڕی عەفراء بوون (رواه البخاری فی صحیحه).

## ١٦-أبو لهب

ناوی (عبدالعزی)ی کوڕی (عبدالمطلب بن هشام)ە، نازناوەکەی (أبو عتبه)یە، مامی پێغەمبەری خوایە (ﷺ)، (أبو لهب) یەکێك بوو لەوانەی، کە زۆر ئازاری پێغەمبەر و هاوەڵەکانی دەدا، هەر ئەو بووە لایەنگری قورەیشیەکان دژی (بنی هاشم) و (بنی عبدالمطلب)، کە گەمارۆی ئابوریاندانو خواردنو خۆراکیان لێ بڕین هەتا تەواو بێ هێز بوونو سێ ساڵان لەدۆڵەکەی (أبو طالب) ژیانیان بەسەر برد.

(أبو لهب) دۆستێکی گەرمی (أبو جهل) و (عقبة)ی کوڕی (أبی معیط ) بوو، ڕۆژێکیان پێی وت:

(أبو لهب) پرسیار لەبرازاکەت بکەو پێی بڵێ، کەوا دەبێ ئێستا باوکت لەکوێ بێ؟

(أبو لهب)یش وتی: موحەممەد: (عبدالمطلب) ئێستا لەکوێیە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ((لەگەڵ قەومەکەی خۆیتی)). جا چووە دەرەوەو ووتی: پرسیارم لێکرد وتی: ((لەگەڵ قەومەکەی خۆیتی)) پێیان وت: ئەوا وا گومان دەبا، کە لەناو ئاگرە. وتی: موحەممەد ئێستا (عبدالمطلب) لەکوێیە؟ فەرمووی(( ئەوەی (عبدالمطلب) لەسەری مردووە هەر کەسێك لەسەر ئەوە بمرێ ئەوا دەچێتە ناو ئاگر)). (أبو لهب) وتی: دەبێ بەردەوام ببمە دوژمنی تۆ چونکە دەڵێی (عبدالمطلب) لەناو ئاگرە. جا هەر لەو ساتەوە دوژمنایەتیو ئەزیەتدانی بۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) زیادی کرد. (البداية والنهاية).

یەکێك لەو ئازارو ئەزیەتانە ئەوەیە، کە پێشەوا (أحمد) لە(ربیعه بن عباد الدیلی) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوام بینی لەبازاری (ذي المجاز) دەیفەرموو: ((ئەی خەڵکینە بڵێن لا إله إلا الله سەردەکەون و سەرفراز دەبن) جا یەك یەك لەکۆڵانەکانی ئەو بازارە دەگەڕاو خەڵکیش زۆر بە چڕو پڕیەوە لەدەوری کۆببونەوە، کەسم نەدیت قسەیەك بکات، ئەویش هەر بەردەوام قسەی دەکردو دەیفەرموو: ((ئەی خەڵگینە بڵێن لا إله إلا الله سەردەکەون و سەرفراز دەبن)) بەڵام لەدوایەوە پیاوێکی خێلی دەم و چاو جوان و پۆشتەو خاوێن و باوێن پرچی کردبووە دوو کەزی بادراو دەیوت: ئەوە دینەکەی خۆی جێهێشتووەو شوێن دینەکی نوێ کەوتوەو درۆزنە، منیش وتم ئەوە کێیە؟ وتیان: موحەممەدی کوڕی عبدالله یە باسی پێغەمبەرایەتی دەکات، وتم ئەی ئەو کەسە کێیە، کە بەدرۆی دەخاتەوە. وتیان: (أبو لهب)ی مامیتی. وتم: تۆ ئەو

کات خۆ بچوك بویت! وتی: نەخێر وەڵاهی من ئەوکات فامم دەکردو تێدەگەیشتم (صحیح لغیره).

*(ابن عباس) وتویەتی: کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ الشعراء: ٢١٤﴾ پێغەمبەر (ﷺ) سەرکەوتە سەر چیای (صفا)و پاشان هاواری کرد: ((یا صباحاه)) خەڵکیش لەدەوری کۆبونەوە، هەبوو بە خۆی دەهاتو هەبوو نێردراوێکی لەباتی خۆی دەنارد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی نەوەی عبدالمطلب، ئەی نەوەی فەهر، ئەی کوڕانی لوئەی، ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم سوپایەك لەپشت ئەو چیایە دەیەوێت هێرشتان بکاتە سەر ئایە پێم باوەڕ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ((من ترسێنەرێکم بۆ ئێوە لەسزایەکی بە ئێش)) ئەبو لەهەب وتی: دەك ئەمڕۆ داڕزێی، هەر بۆ ئەوە بانگت کردین؟ خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند : ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾﴾ المسد: ١ رواه البخاري ومسلم.

که ئەو سورەتە دابەزی (أبو لهب) وتیە کوڕەکەی (رُقیه)و (أم کلثوم) تەڵاق بدەن. کە ئەم دووانە لە(عتبة) و(عتیبة) مارە کرابوون، بەڵام نەیان گواستبوونەوە، پێیانی وت: تەلاقیان بدەن ئەگەر نا من لەئێوە حەرامم، ئەوانیش تەلاقیاندا، جا (رقیة) مێردی بە (عثمان) کردو پاشان، کە (رقیة) وەفاتی کرد (عثمان) (رضي الله عنه) (أم کلثوم)ی هێنا.

(أبو رافع) مەولای پێغەمبەر (ﷺ) وتویەتی: من لەلای ( عباس)ی کوڕی (عبدالمطلب) بووم خزمەتم دەکردن و موسوڵمان بووبووم و (أم الفضل)یش موسڵمان بووبوو لەگەڵ (عبّاس)، بەڵام لەبەر قەومەکەی نەیدەوێرا ئیسلامەتیەکەی خۆی ئاشکرا بکات، (أبو لهب) نەچوو بۆ شەڕی بەدر بەڵکو لەباتی خۆی (عاص)ی کوڕی (هشام)ی نارد کەپێشتر قەرزی لەسەر هەبوو، پێی وت: لەباتی من بڕۆ ئەو شەڕە ئەوا

لەقەرزەکانت خۆش دەبم ، ئەویش وایکرد، جا، کە هەواڵی بەزین و دۆڕاویان هاتەوە، خوای گەورەش (أبو لهب)ی نائومێد کرد، منیش پیاوێکی لاواز بووم و لەحوجرەیەکدا ئەو بەرداخانەم دەتاشی ، وەڵاهی دانیشتبوم لەحوجرەکە بەرداخەکانم دەتاشیو (أم الفضل)یش لەلام بوو، بینیم (أبو لهب)ی فاسق پێیەکانی خۆی راکیشا، دەڵێ: هەتا لەلای حوجرەکە دانیشت، بەجۆرێك پشتی بە پشتم وەبووە، جا خەڵکی وتیان: ئەو(أبو سفیان)ی کوڕی (الحارث)ە، (أبو لهب) وتی: برازاکەم وەرە ئێرە، (أبو سفیان)یش هات لە لای دانیشت، خەڵکیش هاتنو لەسەر سەریان راوەستان وتی: برازاکەم حاڵی خەڵکی چۆن بوو (واتە لەشەڕی بەدر)، وتی: هیچ نا، وەڵاهی هەر ئەوە، کە پێیان گەیشتینو رووبەروویان بووینەوە ئەوا بە ئارەزووی خۆیان ئێمەیان کوشتو بەدیل گرت، بە خوا کە ئەمەم بینی لۆمەی خەڵکم نەکرد، وتی: بۆچی؟ وتی: چەند پیاوێکی سپیم بینی کە سواری پشتی چەند ئەسپێکی رەنگ تێکەڵاوی سپیو رەش ببوون وەڵاهی کەس نەیدەتوانی خۆیان لەبەر بگرێ، وتی: لایەکی پەردەی حوجرەکەم هەڵدایەوە و وتم: وەڵاهی ئەمانە فریشتە بوونە، (أبو لهب)یش دەستی بەرزکردەوەو زللەیەکی لێدام منیش بۆی هەڵسامەوە بەڵام ئەو منی بەزەوی دادا هەتا چۆکەکانی لەسەر سنگم دانا، (أم الفضل)یش هەڵسا گرتی، منیش کۆڵەگەیەکم لەکۆڵەگەکانی حوجرەکە دەستدایێو لەسەرم دا هەتا سەری زور خراپ شکا (أم الفضل) پێی وت: هەچ دوژمنی خوا ئەوە چونکە گەورەکەی لێرە نەبوو بە لاوازت زانی؟ جا زۆر بەسەر شۆڕی لەو شوێنە هەڵسا، وەڵاهی لەپاش ئەمە تەنها حەوت شەوان تەمەنی مایەوە هەتا خوای گەورە توشی نەخۆشی (عدسە[1])ی کردو کوشتی، کوڕەکانیشی دوو شەو بەجێیان هێشت نەیان شاردەوە هەتا بۆگەنی بوو، هەتا پیاوێك لەقورەیش وتیە کوڕەکانی: شەرم ناکەن ئەوا باوکتان وا لەماڵە خۆی بۆگەن بووە؟ ئەوانیش وتیان: ئێمە لەو قونێرە دەترسین،

---

(١) عەدەسە نەخۆشیەکە لاشە هەمووی توشی قونێرو زیپکە دەکاو پاشان خاوەنەکەی دەکوژێ. وەرگێڕ.

چونكە قورەیش هەروەك چۆن خۆیان لەنەخۆشی تاعون دەپاراست ئەوها خۆیان لەنەخۆشی(عدسة)ش دەپاراست، پیاوێك وتی: ئێوە وەرن منیش لەگەڵتانم، دەڵێ: وەڵاهی نەیان شوشت بەڵكو ئاویان لەدوورەوە بەسەردا پرژاند پاشان هەڵیانگرتو لەسەرووی مەككە فرێیاندا ژێر بن دیوارێكو پاشان بەبەرد باریان كردو قەبرەكەیان پڕ كردەوە[1].

## ١٧- دایكی جەمیل

خێزانی ئەبو لەهەب

ناوی (أم جميل) كچی (حرب)ی كوڕی (أمیه)یە، خوشكی (أبو سفيان)ە لەجوانیان ناودابرا بە (العوراء ) بەڵام كردەوەكانی لەوپەڕی خراپیو ناشیرینی دابوو.

*ئەو ئافرەتە بە زمان و كرداری ئازاری پێغەمبەری خوای دەدا (ﷺ) ، لەوانە، كە پێشەوا (حاكم) بۆمانی دەگێڕێتەوە لە(أسماء )ی كچی (أبوبكر) كە وتویەتی: كاتێك ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾ المسد: ١ دابەزی (العوراء ) دایكی جەمیل بە گاڵەگاڵەوە هاتو بەردێكیشی لەدەست دابوو دەیوت:

مذمما عصينا وأمره أبينا ودينه قَلَيْنا

پێغەمبەریش (ﷺ) لەمزگەوت دانیشتبوو (أبوبكر)یشی لەگەڵدابوو، كاتێك (أبوبكر) بینی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە هات، دەترسم بت بینێ.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەو من نابینێ)).

پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك قورئانی خوێندو خۆی پێ پاراستو ئەو ئایەتەی خوێندەوە:

---

(1) (رواه الطبراني والبزار والحاكم وفي إسناده الحسين بن عبدالله قال الهيثمي في الزوائد: وثقه أبو حاتم وغيره وضعفه جماعة وبقية رجاله ثقات، قلت: قال الذهبي في التلخيص: ((واه)).

﴿وَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾﴾ الإسراء: ٤٥

جا هات لەسەر سەری (أبوبکر) راوەستاو پێغەمبەری خوای نەدیت. وتی: ئەی ئەبوبەکر کوانی هاوەڵەکەت؟ من هەواڵم پێ دراوە، کە هاوەڵەکەت جنێوی پێداوم، وەڵاهی ئەگەر بیدۆزمەوە بەو بەردە لێی دەدەم وەڵاهی من شاعیرم پاشان وتی:

مذمما عصينا   وأمره أبينا   ودينه قَلَيْنا

(أبوبکر) خوا لێی رازی بێت – وتی: نەخێر سوێند بە پەروەردگاری ئەو بەیتە جنێوی پێنەدای.

جا رۆیی و، هەر لەبەر خۆی دەیوت: خۆ قورەیش دەزانێ من کچی پیاوە گەورەکانیمە.

کە رۆیی ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایە تۆی نەدیت؟ پیغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((نەیدیتم خوای گەورە چاوەکانی لەئاستی من لادا)) (رواه الحاكم).

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئایە لاتان سەیر نیە چۆن خوای گەورە جنێوەکانی قورەیش لەسەر من لادەدا جنێو بە (مذمم) دەدەن لەعنەت لە(مذمم) دەکەن لەکاتێکدا من (محمد)م)) (رواه البخاري).

*پێشەوا (حاکم) لەرێگای (اسرائیل) بۆمان دەگێرێتەوە ئەویش لە(أبی اسحاق)وە ئەوەش لە(زەید)ی کوری (أرقم) کە وتویەتی:

خێزانی (أبو لهب) وتیە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك چەند رۆژێك سروشی لێ دانەبەزی: ئەی موحەممەد من وادەبینم شەیتانەکەت وازی لێت هێناوەو لێت تورە بووە، جا ئەوئایەتانە دابەزین: ﴿وَالضُّحَىٰ ﴿١﴾ وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ ﴿٢﴾ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ﴿٣﴾﴾ الضحى: ١ - ٣ (قال ابن حجر في الفتح ثقات).

*ئەو ئافرەتەیە بەکرداریش زۆر ئازاری پێغەمبەری خوای دەدا(ﷺ)، کە یەکێك لەوانە درِكو دالّی کۆدەکردەوەو لەسەر رێی پێغەمبەری خوای دادەنا، بۆیە خوای گەورە ناوی ناوە هەڵگری دار (حمالة الحطب).

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾ المسد: ١﴾ واتە: دارِزێو خەسارەتمەند بێ وکردەوەکانی بەفیرِۆبچێ. ﴿وتبَّ﴾ واتە: شتێکی جەخت کراوە، کە خەسارەتمەندە.

﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢﴾ المسد: ٢﴾ (ابن عباس) وتویەتی: (وما کسب) واتە: منالّی، دەگێرِنەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) قەومەکەی خۆی بانگ کرد بۆ ئیمان هێنان. (أبو لهب) وتی: ئەوەی برازاکەم دەیلێ ئەگەر حەق بێ ئەوا من لەرۆژی قیامەتدا مالّو منالّی خۆم دەکەمە فیدا، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی دابەزاند ﴿مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ٢﴾ المسد: ٢﴾.

﴿سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣﴾ المسد: ٣﴾ واتە: ئاگرێکی خاوەن بلّێسەو پرِوشك، کە زۆر سوتێنەرێکی بەهێزە.

﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ٤﴾ المسد: ٤﴾ ئەو ئافرەتە یارمەتی دەری مێردەکەی بوو لەسەر کوفرو عینادی، لەرۆژی قیامەتیش یارمەتی دەری دەبێت لەسزادانی لەناو ئاگری دۆزەخ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ٥﴾ المسد: ٥﴾ واتە: دار هەلّدەگرێو بەسەر مێردەکەیدا دەدات بۆئەوی زیاتر ئاگرەکەی بەتین بێت و زیاتر سزا بکێشێ.

(ابن كثير ) وتويەتی: هەندێك زانایان لەبارەی ئەو ئایە وتویانە ﴿فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ﴾ واتە: لەگەردەنیدا پەتێکی ئاگر هەیە، کە بڵندی دەکات بۆ لێواریو پاشان دەهێنێتە خوارەوەی خوارەوە، پاشان ئەم سزایە بەردەوام ئەوهایە لەبۆی.

*دایکی جەمیل بە کافری مرد، کۆتاییەکەشی پڕ بە پێستی کردەوەکانی بوو، ڕۆژێکیان دەرچوو بۆ ئەوەی دارو دڕك کۆبکاتەوە و لەسەر ڕێگای پێغەمبەری دابنێ، جا دانیشت لەسەر بەردێك بۆ ئەوەی پشوێك بدا پادشای زەوی و ئاسمانیش بەردەکەی لەبن دەرهێناو بەربوویەوەو مردو لەکۆڵ پێغەمبەری کردەوە. (تفسير القرطبي).

## ١٨-وەلیدی کوڕی موغیرە

ناوی (وليد بن المغيرة بن عبدالله بن عمر بن مخزوم بن يقظة بن مرة بن كعب بن لؤي بن غالب القرشي المخزومية)یە.

وەلیدی کوڕی موغیرە لەوانە هەژمار دەکرێ، کە ئاڵای دژایەتیان هەڵگرتبوو دژی ئیسلام و موسڵمانان و بە هەموو ڕێگەیەك هەوڵی دەدا رابوەستێ لەرووی ئیسلام.

*لەوانە جارێك لەگەڵ کۆمەڵە موشریکێکی قورەیش داوای لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد مانگی بۆ کەرت بکات، پێغەمبەریش (ﷺ) داوای لەخوا کردو خوای گەورەش داواکەی بۆ جێ بەجێ کرد، لەگەڵ ئەوەش ئەو هەر لەسەر عینادو کوفرەکەی بەردەوام بوو.

(أنس) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: خەڵکی مەککە داوای ئایەتێکیان کرد لە پێغەمبەر(ﷺ)، جا مانگ لەمەککە دوو جاران کەرت بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((شاهێد بن)). جا خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاند، کە دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ

ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا۟ ءَايَةً يُعْرِضُوا۟ وَيَقُولُوا۟ سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ القمر: ١
٢﴾ . رواه مسلم.

*لەریوایەتی (ابن مسعود)یش هاتووە، کە وتویەتی : مانگ لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا کەرت بوو، جا قورەیش وتی: ئەوە سیحری کوڕی کەبشەیە، وتیان: چاوەڕێ بکەن هەتا هەندێك موسافیر دێن چونکە موحەممەد ناتوانێ سیحر لەهەموو خەڵکی بکات، جا موسافیرەکان هاتن و لێیان پرسین ئەوانیش وتیان: بەڵێ، بینیمان ، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند، کە دەفەرموێ: ﴿ٱقْتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلْقَمَرُ ﴾ (أخرجە ابن جرير وابن المنذر وابن مردويه وأبو نعيم والبيهقي كلاهما في الدلائل).

*وەلید لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانی هەوڵیدا پرۆژەی ئەوە گەڵاڵە بکات، کە پێغەمبەر (ﷺ) رۆژێك خوای ئەوان بپەرستێ، ئەوانیش رۆژێك خوای ئەو بپەرستن بەڵام هەوڵەکەیان سەری نەگرت و پرۆژەکەیان نوشستی هێنا.

(ابن هشام) وتویەتی: ئەوەی پێم گەیشتوە ئەوەیە، کە (الاسود بن عبدالمطلب) و (ولید بن المغیرە) و(أمیە)ی کوڕی (خلف)و (العاص بن وائل) کە ئەوانە خاوەن راو پلەو پایە بوون لەناو قەومەکەی خۆیان، وتیان: موحەممەد وەرە با بپەرستین ئەوەی تۆ دەیپەرستیو بپەرستە ئەوەی ئێمە دەیپەرستین، بەو جۆرە ئێمەو تۆ بەشدار دەبنین لەیەك کاروباردا، ئەگەر ئەوەی تۆ دەتپەرست باشتر بوو لەوەی ئێمە دەمان پەرست ئەوا دەکا ئێمە قازانجمان کرد، ئەگەر ئەوەی ئێمەش دەمان پەرست خێرتربوو لەوەی تۆ دەتپەرست ئەوا دەکا قازانجت کرد.

جا خوای گەورە لەبارەیان سوڕەتی (الكافرون)ی دابەزاند کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠

عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ الكافرون: ١
٦﴾

واتە: ئەگەر خوای ناپەرستن بە مەرجێك من خوای ئێوە بپەرستم، ئەوا من هیچ پێویستیم بەوە نیە ، دینی خۆتان بۆ خۆتانو دینی خۆشم بۆ خۆم.

*وەلید خاوەنی ئەو قسەیەیە کە لەبارەی قورئان وتی سیحرە.

رۆژێك هەندێ لەقورەیشیەکان لەلای کۆبوونەوە، کە خاوەن پلەو پایە بوون لەلایان، پێی وتن: ئەی قورپشیەکان نەوە وا مەوسیمی حەج هاتەوەو، وەفدی عەرەبەکانیش بەرەو لاتان دێنو، گوێشیان لەمەسەلەی موحەممەد بووە، جا رایەکی یەککگرتووی لەبارەی دەربڕنو جیاوازی نەکەوێتە نێوانتان بەوەی هەندێکتان هەندێك بە درۆ بخاتەوە، وتیان: ئەی باوکی (عبد شمس) تۆ رایەکمان بۆ دابنێ بۆ ئەوەی بیلێین، وتی: بەڵکو ئێوە رادەربڕنو منیش گوێی لێ دەگرم، وتیان: دەڵێین کاهینە، وتی وەڵاهی کاهین نیە، ئێمە دەزانین کاهین چیەو لێی شارەزانیە ئەمە بەچرپەو نهێنیەکانی کاهین ناچێت، وتیان: دەڵێین شێتە، وتی: شێتیش نیە ، ئێمە شێتمان بینیوەو لێی شارەزاینە بەهیچ شێوەیەك پێی ناچێ، وتیان: دەڵێین، شاعیرە، وتی: شاعیریش نیە، ئێمە شارەزای هەموو جۆرە شیعرەکانین لەجۆری (رجز) و(هزج) و(قریض) و (مقبوض)و (مبسوط)، جا ئەوەی دەیڵێ شیعر نیە، وتیان: دەڵێین ساحیرە، وتی: ساحیریش نیە، ئێمە ساحیرو سیحرمان بینیوە، کە نەفوو لەشت دەکات و نەشت لێك گرێ دەدات ، وتیان: ئەی چ دەڵێ (یا عبد شمس)؟ وتی: وەڵاهی قسەکانی زۆر خۆشو شیرینن، بنچینەکانی وەك بنچینەی دارخورما بەهێزەو بەرەکەی پێگەیشتوو تۆکمەیە، لقو پۆپەکانیشی بەخشندەو پڕ خێرن، ئێوە هەر شتێك لەمانە بڵێن ئەوا دەزانرێ کەوا پوچەو بێ بناغەیە، باشترین راش دەربارەی بیڵێن ئەوەیە کە ساحیرە، وتەیەکی هێناوە، کە نێوان باوكو کوڕو نێوان براو نێوان عەشیرەت لێك دەکات.

جا لەسەر ئەم رایە پەرتەوازەیان کرد و، هەڵسان لەکاتی مەوسیمی حەج لەسەر ڕێگای خەڵکی دادەنیشتن و هەر کەسێك بەلایاندا بچوبایە هۆشداریان دەدایێ لەبارەی موحەممەدو باسیان بۆ دەکرد لەبارەی ئەوەی پڕوپاگەندەی بۆ دەکات.

خوای گەورە لەبارەی وەلیدی کوڕی موغیرە چەند ئایەتێکی دابەزاند ، کە دەفەرموێ: ﴿ ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّا إِنَّهُ كَانَ لِآيَاتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا ﴿١٧﴾ إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيْفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدْبَرَ وَاسْتَكْبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ يُؤْثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا قَوْلُ الْبَشَرِ ﴿٢٥﴾ المدثر: ١١ - ٢٥ سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرە) بدە. (١) سوێند بەو قورئانەی کە هەموو فەرمانێکی لە شوێنی خۆیایەتی... (٢) بەڕاستی تۆ ئەی محمد (ێلی الله علیه وسلم) لە فرستادە و پێغەمبەرانیت... (٣) لەسەر ڕێگەو ڕێبازێکی ڕاست و دروستیت. (٤) ئەم قورئانە لەلایەن زاتێکی خاوەن دەسەلآت و میهرەبانەوە دابەزیووە و ڕەوانە کراوە... (٥) بۆ ئەوەی گەل و هۆزێکی پێ بێدار بکەیتەوە کە باوو باپیرانیان بێدار نەکراونەتەوەو بێ ئاگایی و نەشارەزایی ماونەتەوە. (٦) سوێند بە خوا بە ڕاستی بڕیاری خوا هاتە دی لەسەر زۆربەیان کە دۆزەخ پڕ دەکەین لێیان، لەبەر ئەوە ئیمان و باوەڕ ناهێنن (بەهۆی سەرسەختی و گوێ نەگرتنیانەوە). (٧) بەڕاستی هەر دەڵێیت ئێمە کۆت و زنجیرمان کردۆتە گەردنیان و لە ژێر چەناگەیان توندکراوە و بە ناچاری سەریان بەرز ڕاگیراوە و ئەم لاولایان پێناکرێت و بەرپێی خۆیان نابینن. (٨) هەروەها بەربەستمان لە بەردەمیانەوە و لە پشتیانەوە داناوە، پەردەشمان هێناوە بەسەر چاویاندا (مەبەست ئەو بەربەستانەشە کە لە دەروونیاندا هەیە و نایەڵێت ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە) ئیتر ئەوانە حەق و ڕاستی نابینن. بەڕاستی ئەو بیری کردەوەو پەیامەکەی

هەڵسەنگاند (بەڵام بەهەڵە) (١٨) بەكوشت چیٚ و سەرەو نگوون بێت، چۆن هەڵسەنگاندنێكی كرد. (١٩) پاشان هەر بەكوشت بچێت بۆ خۆی و هەڵسەنگاندنێك كە كردی بۆ قورئان. (٢٠) ئینجا بیری لیٚ كردەوەو ورد بۆوەو تەماشای دەوروبەری كرد. (٢١) ئینجا ناوچاوی هێنایەوە یەك (وەك یەكێك بەقووڵی بیربكاتەوە) ڕەش داگیرسا. (٢٢) پاشان ڕووی وەرگێڕاو خۆی بەزلزانی. (٢٣) بەهەموو عەقڵیەوە وتی!! ئەم قورئانە جگە جادوو نەبێت كە وەردەگیرێت هیچی تر نی یە!!... (٢٤) ئەمە هەر قسەی بەشەرە و هیچی تر نی یە؟!﴾ (سیره ابن هشام بتحقیقنا).

*(ابن اسحاق ) وتویەتی: وەلید كاتێك مردنی گەیشتیٚ وەسیەتی بۆ هەرسیٚ كوڕەكەی كردو وتی: من خوێنم لەلای هۆزی خوزاعەیەو وەری مەگرنەوە، وەڵاهی دەزانم ئەوان بیٚ تاوانن، ریباشم لەلای هۆزی (ثقیف)ە وەری بگرنەوە، ئافرەتێكیشم لەلای (أبی أزیهر)ە لەكیستان نەچێت.

(أبو أزیهر) كچێكی خۆی لەوەلید مارە كردبوو، بەڵام دوایی نەیهێشت بیگوازێتەوە هەتا مرد.

## ١٩-عقبة بن أبي معيط

ناوی (عقبة بن أبي معيط بن أبي عمرو بن أمية بن عبد شمس بن عبدمناف)ە یەكێك بووە لەپیاوە شەیتانەكانی قوڕەیش.

*(عقبة بن أبي معيط) (أروی بنت كريز بن ربيعه)ی خواستو شەش منالی لیٚ بوو بە ناوی (وليد) و(عُماره)و(خالد) و(أم كلثوم)و(أم حكيم)و (هند).

سەبارەت بە خێزانەكەی (أروی) ئەوا هیجرەتی كردو بەیعەتیدا بە پێغەمبەی خوا (ﷺ) . (الطبقات الكبری).

*(عقبة بن أبي معيط)یەكێك بوو لەهەرە دوژمنە سەر سەختەكانی ئیسلام‌و بەسەختی لەدژی ئەم بانگەوازە هەقە دا دەوەستا:

(أبوبكر) خوا لێی رازی بێت وتویەتی: هاتمە مەككە (محمد)یش (ﷺ) ببو بە پێغەمبەر، جا (عقبة بن أبي معیط)و چەند كەسێكی تر لەسەرانی قورەیش هاتنە لام‌و پێم وتن: چی بووە دەڵێی شتێكتان لێ قەوماوە؟ وتیان: ئەی (ابوبكر) شتێكی زۆر گەورە روویداوە، هەتیوی (أبو طالب) داوای پێغەمبەرایەتی دەكات ئەگەر تۆش نەبی ئەوا لێی قەبول ناكەین جا شتێكمان بۆ بكە.

(أبوبكر) دەڵێ: شتێكم كرد، كە هەموو پەرتەوازە بكەن‌و پاشان چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ) موسوڵمان بووم. (أسد الغابه:١/٦٤٠).

*(عروة) وتویەتی: بە (عبدالله)ی كوڕی (عمرو)ی كوڕی (عاص)م وت: پێم بڵێ موشریكەكان سەخت ترین هەڵوێست چی بوو، كە نواندیان بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ وتی: كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی دەكرد لەپەنای كەعبە لەو دەمە (عقبة بن أبي معیط) هات‌و، شانی پێغەمبەری خوای گرت‌و هەندێك لەجل‌و بەرگەكەی ئاڵاند لەگەردەنی‌و بەتوندی رای كێشا (أبوبكر)یش – خوا لێی رازی بێت – هات شانی گرت‌و لەپێغەمبەری خوا دووری كردەوەو وتی: ﴿أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ ۝٢٨﴾غافر: ٢٨﴾ رواه البخاري.

لەقێزەوەنترین ئازاری ئەو كافرە بۆ پێغەمبەری خوا ئەوەیە كە (عبدالله)ی كوڕی (مسعود) – خوا لێی رازی بێت – بۆمانی دەگێڕێتەوە، كە دەڵێ: پێغەمبەری خوام نەبینی دوعا لەقورەیش بكات جگە لەرۆژێك نەبێ، كە نوێژی دەكردو كۆمەڵێكیش لەقورەیش دانیشتبوون، هەندێك ریخەڵۆك‌و هەناوی وشتریش لەوێ نزیك بوو، وتیان: كێ ئەم پیساییە هەڵدەگرێ و لەسەر پشتی دادەنێ؟ وتی: (عقبة بن أبي معیط) وتی:

من، جا هەڵیگرتوو لەسەر پشتی دانا، ئەویش هەر لەسەجدە بردن بوو، هەتا (فاتیمە) هات – خوا لێی رازی بێت –پیساییەکەی لەسەر پشتی لادا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((پەروەردگارم ئەم کۆمەڵە لەقوریش لەناو ببەی، خودایە (عتبە بن ربیعة)و (شیبة بن ربیعة)و (أبو جهل)ی کوڕی (هشام)و (عقبة بن أبي معیط) و (أُبی) کوڕی (خلف)، یان (أمیة)ی کوڕی خلف) لەناو ببەی: (عبدالله) وتی: ئەوانەم بینی بە کوژراوی لەشەڕی بەدر، پاشان راکێشران بۆ قەلیب جگە لە(أُبی) یان (أُمیە) نەبێ، کە جەستەکەی زەبەلاح بوو، پارچە پارچە ببوو. (متفق علیە).

*(أبی بن خلف) و (عقبة بن أبي معیط) دوو برادەری دڵسۆزی یەکتر بوون. (عقبة) پێشتر لەلای پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو گوێی لەفەرمودەکانی گرتبوو، ئەم هەواڵە گەیشتە (أبی) جا هاتە لای (عقبة)و پێی وت: ئایە راستە تۆ چویتە لای موحەممەدو گوێت لێ گرتووە! حەرام بی لەمن کە جارێکی تر قسە لەگەڵ تۆدا بکەم ئەگەر جارێکی تر بچیە لای و قسەی لەگەڵدا بکەی، بۆ ناچی تف بکەی لەدەم و چاوی. جا (عقبة بن أبي معیط) نەفرەتی خوای لێ بێ وایکرد. (سیرە ابن هشام).

لە(مصنف)ی عبدالرزاقیش دا هاتووە، کە (ابن عباس) وتویەتی: خودا مۆڵەتی نەدا ئەوها بکا، جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِي ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِي لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِي ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ الفرقان: ٢٧ - ٢٩.

ڕۆژێك دێت ستەمکار قەپ دەکات بەهەردوو دەستی خۆیدا وگاز لە هەردوو دەستی خۆی دەگرێت (لە پەشیمانیدا و) دەڵێت: خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەردا ڕێبازی ئیمانم بگرتایە. (٢٧) مەرگ بۆ خۆم، خۆزگە فلان کەسم نەکردایەتە هاوەڵ و دۆستی خۆم (چونکە سەری لێشێواندم). (٢٨) بەڕاستی گومڕاو وێلی کردم لە بەرنامەی خوا دوای

ئەوەی پێم ڕاگەیەنرا بوو، شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناهو تاوان، لەکاتی تەنگانەشدا پشتی بەردەدات. ﴾

لەریوایەتی (أبو نعیم)یش کە لە(الدلائل) دا هاتووە بەسەنەدێکی ڕاست لەرێگای (سعید)ی کوڕی (جبیر) ئەویش لە(ابن عباس)ەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) پێی وت: ((ئەگەر لەدەرەوەی مەککە لەیەکێك لەچیاکانیدا بتبینم ئەوا دەتگرمو دەتکوژم)).

جا لەشەڕی بەدر ، برادەرەکانی هەموو دەرچوون، بەڵام ئەو نەچوو لەگەڵیان برادەرەکانی پێیان وت: وەرە لەگەڵمان. وتی: ئەم پیاوە هەڕەشەی لێکردومە ئەگەر لەدەرەوەی مەککە چاوی پێم بکەوێت لەسەرم دەدا. وتیان: وشترێکی سورت دەدەینێ کە کەس نەتوانێ بیگاتێ، جا لەگەڵیان ڕۆیی، جا کە خوای گەورە موشریکەکانی توشی سەرشۆڕیو دۆڕان کرد، وشترەکەی پێیەکانی کەوتە ناو درزێکی زەویو توانرا دەست بەسەری بکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەدیلی گرت لەگەڵ حەفتا لەقورەیشیەکان ، جا ( أبو معیط) چووە لایو پێی وت: لەنێوان ئەم هەموو دیلە تەنها من دەکوژی؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ، ئەی تۆ تفت نەکرد لەدەمو چاوم)) جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَـٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ الفرقان: ٢٧﴾ وإسناده صحيح.

## ٢٠-(عاص)ی کوڕی (وائل)

ناوی (عاص)ی کوڕی (وائل)ی کوڕی (هشام)ی کوڕی (سعید)ی کوڕی (سهم)ی کوڕی (عمر)ی کوڕی (هصیص)ی کوڕی (کعب)ی کوڕی (لؤي القرشي السهمي)ە.

(عاص) لەو کەسانە بوو، کە بەردەوام گرفتیان بۆ پێغەمبەری خوا دروست دەکردو ئەزیەتێکی زۆریان دەدا.

(ابن کثیر) وتویەتی: ئایەتی ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ﴿٣﴾ الكوثر: ٣﴾ واتە: ئەی موحەممەد ئەوەی رقی لەتۆو ئەوەی هێناوتە لەهیدایەتو  هەق ئەوە خۆی دوابڕاوەو هەرخۆی لەپاش مردنی باسی لێوە ناکرێ، (ابن عباس)و (مجاهد) وتویانە ئەم ئایەتە لەسەر (عاص)ی کوڕی (وائل) دابەزی، (یزید)ی کوڕی (رومان) وتویەتی: (عاص)ی کوڕی (وائل) ئەگەر باسی پێغەمبەر بکرابایە دەیوت: لێی گەڕێن ئەوە پیاوێکی وجاغ کوێرە، ئەگەر مرد ئەوا ناوو دەنگی دەبڕێ‌و کەس باسی ناکات، خوای گەورەش ئەم سوڕەتەی دابەزاند..

(السّدی) وتویەتی: ئەگەر پێشتر یەکێك کوڕەکانی مردبان ئەوا پێیان دەوت (بُتِرَ)، جا کە کوڕەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) مردن وتیان: (بُتِرَ محمد): خوای گەورەش ئەم سوڕەتەی دابەزاند ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ﴿٣﴾ الكوثر: ٣﴾ ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی وتمان لەبارەی وشەی (الابتر) کە ئەگەر مرد ئەوا دەنگو باسی دەبڕێ‌و کەس باسی ناکات، جا لەنەفامی خۆیان وایان گومان برد، کە ئەگەر کوڕەکانی بمرێ ئەوا باسی ناکرێ‌و ناوو دەنگی دەبڕێ، بەڵام نەخێر، بەڵکو خوای گەورە ناوو دەنگو باس کردنی هێشتەوە بۆ هەموو کەسێكو شەریعەتەکەی واجب کرد لەسەر خەڵکی هەتا ڕۆژی قیامەت، درودو سڵاوی خوا لەسەر بێ هەتا ڕۆژی دوایی. (تفسیر ابن کثیر).

*(عاص)ی کوڕی (وائل) زۆر کافر بوو بە دینی خواو زۆر گاڵتەی بەشەرعەکەی دەکرد، لەوانە (خباب) کوڕی (الارت) دەڵێ: من پیاوێکی ئاسنگەر بووم، قەرزێکم لەلای (عاص)ی کوڕی (وائل) بوو چووم لای بۆ ئەوەی وەریبگرمەوە، وتی: نەخێر ناتدەمەوە هەتا کوفر بە موحەممەد نەکەی، منیش وتم: وەڵاهی کوفر بە موحەممەد ناکەم هەتا دەمری‌و زیندوش دەکرێیەوە.

دەڵێ: پێکەنی، پاشان وتی: ئەگەر مردم پاشان زیندو بومەوە، جا هاتیە لام‌و ئەو کات ماڵ‌و مناڵم هەیە قەرزەکەت دەدەمەوە. جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ مريم: ٧٧ - ٨٠ ئایا ئەو جۆرە کەسانەت بینیووە، کە باوەڕی بەئایات و فەرمانەکانی ئێمە نیەو دەڵێت: سوێند بە خوا من سامان و کوڕو نەوەم پێ دەدرێت! (٧٧) باشە، ئاخۆ (ئەو بەندە یاخیە) بەنهێنی و شاراوەکانی زانیووە، یاخود بەڵێنی وەرگرتووە لە خوای میهرەبان (کە دنیا بە دڵی ئەو بێت؟!). (٧٨) نەخێر، وانی یە (بەدڵی ئەو نابێت) ئەوەی کە دەیڵێت لە ئاییندەدا تۆماری دەکەین لەسەری و سزای دوور و درێژی بۆ ساز دەکەین. (٧٩) بێگومان ئەوەی ئەو دەیڵێت: بەمیراتی لێی دەسێنینەوە، بەتەنهاش دێتە لامان (بۆ لێپرسینەوە).﴾ (رواه مسلم).

*(ابن اسحاق) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر قەومەکەی خۆی بانگ کرد بۆ ئیسلامەتی، جا زۆر بە جوانی‌و پوختی قسەی لەگەڵ کردن، (زمعه بن الاسود)و (النضر بن الحارث) و (الاسود بن عبد يغوث)و (أبي بن خلف) و(عاص بن وائل) وتیان: دەبایە تۆ ئێستا فریشتەیەك لەلات بوایە قسەی لەباتی بکردبای و خەڵکیش بیان دیتبایە! جا خوای گەورە لەبارەی وتەی ئەوان ئەم ئایەتانەی دابەزاند ﴿وَلَوْ جَعَلْنَـٰهُ مَلَكًا

لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ الأنعام: ٩.خۆ ئەگەر فریشتەمان بکردایە بە فرستادە، ئەوە لە شێوەی پیاوێکدا دەماننارد و هەمان گومان کە ئێستا هەیانە بۆیان دروست دەبوو.﴾

*هەر (ابن اسحاق) کە لە(یزید بن رومان)وە ئەویش لە(عروة بن الزبیر) بۆمانی دەگێڕێتەوە: کە جوبریل هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە تەوافیان لەدەوری کەعبەدا دەکرد، جا هەڵسا پێغەمبەریش هەڵسا و چوە تەنیشتیو لەو دەمە (الاسود بن المطلب) بەلایدا تێپەڕی، ئەویش پارچە پەلکە دارێکی تەڕی گرتە دەمو چاویو دەمو دەست کوڕەی کرد.

جارێکر تر (عاص)ی کوڕی (وائل) بە لای تێپەڕبوو ئەویش ئاماژەی بۆ بن پێیەکانی کرد، (عاص)یش بەسواری گوێ درێژێك دەیویست بڕوا بۆ (تائیف)، گوێ درێژەکە کەوتە سەر دڕکێك و دڕکێکیان لەبنی پێی (عاص) چوە خوارو کوشتی.

*پێشەوا (الطبري) وتویەتی: ﴿ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ الحجر: ٩٥ لەبارەی (عاص)ی کوڕی (وائل السهمی)و هەندێك لەبرادەرە قوڕەیشیەکانی هاتە خوار.

## ٢١- (أبی بن خلف)

ناوی (أبی ) کوڕی (خلف)ی کوڕی (هشام)ی کوڕی (حذافة)ی کوڕی (جمح)ە.

*یەکێکە لەسەرکردەکانی قوڕەیش، کە زۆر هەوڵی دەدا لەرووی بانگەوازی پێغەمبەر رابوەستێ.

*(أبی ) زۆر مشتو مڕی دەکرد جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا دەڕۆیی لەرێگادا چاوی بەئێسکێکی رزی کەوت، وتی: موحەممەد، تۆ وا گومان دەبەی، کە خوا ئەو ئێسکە رزیوە زیندوو دەکاتەوە، پاشان هەڵیگرتەوەو لەناو دەستی هاڕیو پاشان فویەکی تێکردو بەرەو بدوی پێغەمبەری خوا بەر بەرەڵای کرد، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ((بەڵێ من وادەڵێم، خوا ئەوو تۆ زیندوو دەکاتەوە پاش ئەوەی ئەوهاتان لێدێت، پاشان تۆ دەکاتە ناو ئاگر))[1] جا خوای گەورە ئەم چەند ئایەتەی لەسەر دابەزاند. ﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ یس: ٧٨ - ٨٠.نموونەی لاوازیی وبێ دەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پروکاون؟! (٧٨) پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێك زاناو ئاگایە (دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە).... (٧٩) ئەو زاتەی کە لە درەختی سەوز ئاگرتان بۆ بەدی دەهێنێت، ئیتر ئێوە دایدەگرسێنن. ﴾

(١) مرسل صحيح، رواه الطبراني بسنده عن قتادة مرسلا.

*(ابن اسحاق) وتويەتی: (صالح)ی كوڕی (ابراهيم)ی كوڕی (عبدالرحمن)بۆی باسكردم، كەوا (أبی بن حلف) ئەگەر چاوی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بكەوتبايە پێی دەوت:

من ئەسپێكم هەيە هەموو رۆژێ عەلەفێكی زۆری دەدەمێ بۆ ئەوەی لەسەر پشتی ئەو ئەسپە تۆ بكوژم، پێغەمبەريش (ﷺ) پێی وت: ((بەڵكو إن شاء الله من دەتكوژم))[1].

دەڵێ: جا، كە رۆژی ئوحد هات، پێغەمبەر (ﷺ) پشتی دايە دۆڵێك لەوێ (أُبی بن خلف) چاوی بە پێغەمبەر كەوتو پێی وت، قوتارت نابێ لەدەستم، هاوەڵەكان وتيان: ئەی پێغەمبەری خوا ئايە يەكێك لەئێمە بۆی نەچێتە مەيدان؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لێی گەڕێن)) كاتێك كە نزيك بوويەوە پێغەمبەر (ﷺ) حەربەيەكی لە(حارث بن الصمة) وەرگرت، جا كە دەستی دايە حەربەكە، وەك شێر پەلاماری دا و بەحەربەكەی ملی بريندا‌ركرد بە جۆرێك، كە چەند جارێك ويستی لەسەر ئەسپەكەی بكەوێتە خوار، كە گەڕايەوە لای قورەيش بەم حاڵە، كە خوێن لەگەردەنی تێزابوو وتی: وەڵاهی خۆ موحەممەد منی كوشت! پێيان وت: تۆ عەقلت لەدەستدايە! تۆ هەر بەلايەكت لێ نيە، وتی: ئەو، كە لەمەككە بوو پێی وتم: ((من بكوژی تۆم)). وەڵاهی ئەگەر تفی لێ بكردبام دەی كوشتم. جا لە(سرف) ئەو دوژمنەی خوا مرد[2].

شيعری (حسّان)ی كوڕی (ثابت) لەكوژرانی (أبی) كوڕی (خلف)

(ابن اسحاق ) وتويەتی: (حسّان)ی كوڕی (ثابت) لەم بارەيەوە وتويەتی:

---

(١) صالح بن ابراهيم بن عبدالرحمن بن عوف ثقة، لەساڵی (١٢٧)ی كۆچی مردووە، كە لەكيتابی (التقريب) دا هاتووە.

(٢) (سرف) شوێنێكە شەش ميل لەمەككەوە دوورە.

لقـــد ورث الـــضلالة عـــن أبيـــه أبـــي يـــوم بـــارزه الرســـول
أتيـــتَ إليـــه تحمـــل رمّ عظـــم وتوعـــده وأنـــت بـــه جهـــول[١]
وقـــد قتلـــت بنـــو النجـــار مـــنكم أميّـــة إذ يغـــوث يـــا عقيـــلُ
وتـــبَّ ابنـــا ربيعـــة إذأطاعـــا أبـــا جهـــل لأمهـــا الهُبـــولُ[٢]
وأفلـــت حـــارثٌ لمَـــا شـــغلنا بأســـرِ القـــوم أسْـــرته[٣] فليـــلُ

هەر (حسّان)ی کوڕی (ثابت) وتویەتی:

ألا مـــن مبلـــغ عـــسى أبيـــاً لقـــد ألقيـــتُ في ســـحق الـــسعير[٤]
تمنّـــى بالـــضلالة مـــن بعيـــد وتقـــسمُ أن قـــدرت مـــع النـــذور
تمنيـــك الأمـــاني مـــن بعيـــد وقـــولُ الكفـــر يرجـــع في غـــرور
فقـــد لاقتـــك طعنـــة ذي حفـــاظٍ كـــريم البيـــت لـــيس بـــذي فجـــور[٥]
لـــه فـــضل علـــى الأحيـــاء طُـــراً اذا نابـــت ممـــلات الأمـــور

---

(١) الرّم: ئێسکی رزیو.

(٢) تبَّ: واته لەناوچوو. (الهبول): لەدەست دان. وتراوە: هبلته أمه واته: دایکی لەدەستی داو بزری کرد.

(٣) أسْرته: واته: عەشیرەتەکەی.

(٤) السحق: واته دووری و قوڵی.

(٥) الحفاظ: تورەیی لەشەڕدا

## ٢٢- (امیه)ی کوڕی (خلف)

ناوی(أمیة)ی کوڕی (خلف)ی کوڕی (وهب)ی کوڕی (حذامة)ی کوڕی (جمح)ی کوڕی (عمرو)ی کوڕی (هصیص)ی کوڕی (کعب)ی کوڕی (لؤي)یە.

*(أمیه) یەکێك بوو لەهەرە دوژمنەکانی پێغەمبەری خوا، ئەشکەنجەی جۆراو جۆریشی لەسەر بیلالی حەبەشی تاقی دەکردەوە.

(أمیة) ڕۆژێك وتیە خزمەت کارەکانی: ها ئەوە بیلالە ببیەن چی لێ دەکەن لێی بکەن.، ئەوانیش بردیانە (بطحاء)و لەسەر زەویە گەرمەکەی ئەوێیان داناو شتێکی قورسیشیان لەسەر هەردوو شانی داناو پێیان وت: کوفر بە موحەممەد بکە، ئەویش بەم قسانە زیاتر باوەڕی بە هێز دەبوو، هەتا کە (أبو بکر) – خوا لێی ڕازی بێت – بەلایدا تێپەڕی‌و ڕزگاری کرد لەبەندایەتی و کڕیەوە.

*(ابن اسحاق) وتویەتی: ئەوەی پێم گەیشتوە ئەوەیە، کە پێغەمبەر (ﷺ) بەلای (ولید)ی کوڕی (مغیرة)و (أمیه)ی کوڕی (خلف) و (أبو جهل)دا تێپەڕی ئەوانیش گاڵتەیان پێکردو جونیان پێدا ، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەمە زۆر تورەی کرد. جا خوای گەورە لەبارەیان ئەوئایەتەی دابەزاند ﴿وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ١٠﴾ الأنعام: ١٠.(ئەی محمد (صلی الله علیه وسلم) دڵت لەخۆت دانەمێنێت) سوێندبێت بەخوا بەڕاستی گاڵتەکراوە بە پێغەمبەرانی پێش تۆ، سەرنجام ئەوەی ئەوان بڕوایان پێی نەبوو، گاڵتەیان پێدەکرد، بەخەی پێگرتن و نغرۆی کردن (خوا تۆڵەی لێسەندن).﴾

*(أمیة)ی کوڕی (خلف) ئەگەر پێغەمبەری خوای بدیتبایە جوێنی پێدەداو ناوو ناتۆرەی لێ دەنا خوای گەورەش لەبارەیەوە ئەم سوڕەتەی دابەزاند. ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ

هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾ الهمزة: ١ - ٩هاوارو ئاهو ناڵه بۆ هەر کەسێك کە بە شوێن کەم و کوورپیدا دەگەڕێت و لە عەیب و عاری خەڵکی دەدوێت. (١) ئەو کەسەی ماڵ و سامانی زۆری کۆ کردۆتەوەو هەر خەریکی ژماردنێتی و (دڵی پێی خۆشە، ڕەزیلەو بەخشندە نیە). (٢) وادەزانێت بەڕاستی کە ماڵ و سامانەکەی دەبێتە هۆی تەمەن درێژی و نەمریی بۆی؟ (٣) نەخێر سوێند بەخوا بە سووکی و ڕیسوایی فڕێ دەدرێتە ناو (حگمە) وە. (٤) جا تۆ چووزانی (حگمە) چیە؟ (٥) بریتی یە لە ئاگری داگیرساوو بڵێسەداری خوا. (٦) ئەو ئاگرەی ڕوو دەکاتە ناو جەرگەی دڵ و دەروونەکان (کە مەڵبەندی کوفرو خوانەناسی و ڕەزیلی یە) (٧) بێگومان ئەو ئاگرو دۆزەخە لە شوێنێکدایە کە سەرگیراوو دەرگا داخراوە لەسەریان (ڕێگەی قوتار بوونی نیە). (٨) (خوا نەناسان لەوێ) لەناو چەند ستوونێکی ئاگرینی درێژدان (هیچ جم و جوڵێکیان بۆ ناکرێت). ❁

## کوژرانی (أمیە)ی کوڕی (خلف)

(ابن اسحاق) لە(عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف) – خوا لێی ڕازی بێت – دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ: (أمیة)ی کوڕی (خلفْ) پێشتر لەمەککە برادەرم بوو، ئەوکات ناوم (عبد عمرو) بوو، کاتێکیش موسوڵمان بووم ناوم لەخۆم نا (عبدالرحمن) لەمەککەش بووین، جا کاتێك (أمیە) چاوی پێم دەکەوت لەمەککە دەیوت: ئەی (عبد عمرو) ئایە ڕازی نیت بەو ناوەی، کە باوکت ناوی لێناویت؟ منیش دەم وت: بەڵێ، دەیوت: من (الرحمن)ی ناناسم، ناوێکی تر هەڵبژێرە بۆئەوەی پێت بانگ بکەم، جا یان بە ناوی یەکەم وەڵامم دەدەیەوە یان بە ناوێك، کە نایانسم بانگت ناکەم، دەڵێ: جا، کە بانگی برکردبام

دەیوت (یا عبد عمرو) منیش وەڵامم نەدەدایەوە دەڵێت: پێم وت: ئەی باوكی عەلی، چ دەڵێی بیڵێ، وتی: تۆ (عبدالاله)ی وتی: منیش وتم باشه، وتی: جا، كه بەلایدا تێپەڕیبام، دەیوت: ئەی (عبدالاله) منیش وەڵامم دەدایەوەو قسەم لەگەڵ دەكرد.

هەتا، كه ڕۆژی بەدر هات، بەلایدا تێپەڕیم، كه ڕاوەستابوو لەگەڵ كوڕەكەی (علی بن أمیة) كه دەستی گرتبوو، منیش چەند درعێكم هەڵگرتبوو، كه چاوی به من كەوت پێی وتم: ئەی (عبد عمرو) منیش وەڵامم نەدایەوە، وتی: ئەی (عبدالاله) وتم: بەڵێ، وتی: ئەم درعانه فڕێدەو وەره بۆ لای ئێمه چونكه ئێمه باشترین لەو درعانەی لەلاتن. وتی: وتم: بەڵێ، جا درعەكانم فڕێدا، دەستی خۆیو كوڕكەیم گرتو، دەیوت: هیچ ڕۆژێكم وەكو ئەمڕۆ نەدیوه، ئایه ئێوه پیویستیتان به (وشتری پڕ شیر نیه)؟ پاشان دەستم گرتنو بردمن.

(ابن اسحاق) وتویەتی: (عبدالرحمن)ی كوڕی (عەوف) (ﷺ) وتی: جارێكیان، كه من لەنێوان (أمیة)ی كوڕی (خلف)و كوڕەكەیدا بووم و دەستم گرتبوون، پێی وتم: ئەی (عبدالاله) ئەو كەسه كێیه، كه خۆی دیارخستوه بەوەی كه پەڕەیەكی نەعامەی لەسەر سینگی داناوه؟ وتم: ئەوه (حمزة)ی كوڕی (عبدالمطلب)ە، وتی: ئەوەبوو، كه ئەوهای بەسەر هێناین.

(عبدالرحمن ) دەڵێ: لەكاتێك من ئەو دووانەم دابووه پێشه خۆم، بیلال ئەوانەی بینی – پێشتر كه (أمیة)ی كوڕی (خلف) – بیلالی سزا دەدا لەمەككه، دەیبرده سەر لمی داغ كراوو لەسەری درێژ دەكرد بۆ ئەوەی واز لەئیسلام بهێنێ، پاشان فەرمانی دەدا بەوەی بەردی گەوره بهێنن و لەسەر سینگی دابنێن، پاشان پێی دەوت: تۆ بەردەوام دەبێ ئەو سزایه بچێژی یان دەبێ واز لەئایینەكەی (محمد) بهێنێ، بیلالیش دەیوت (أحدُ أحدُ) جا كه بیلال بینی، وتی: سەركردەی كافران (أمیه)ی كوڕی (خلف)، نابێ لەدەستی من قوتاری ببێ، وتم: ئەی بیلال ئەوانه دیلی منن وازیان لێ بهێنه. وتی:

نابیٚ قوتاریان ببیٚ لەچنگی من. وتم: ئەی کوڕی رەش پێست، وتی: قوتاریان نابیٚ لەچنگی من، جا یەك بە دەنگی خۆی هاواری کردو وتی: ئەی ئەنصاریەکانی خوا، ئەوە سەرکردەی کافرەکان (أمیە)ی کوڕی (خلف)ە، نابیٚ قوتاری ببیٚ لەچنگی من. دەڵیٚ: جا وەك حەلەقەی بازن دەوری ئێمەیاندا منیش بەرگریم لێدەکرد، دەڵیٚ: یەکێکیان شمشێرەکەی لەکالآن دەرهێناو لەپێی کوڕەکەیدا و کەوتە خوارەوە، لەم دەمەدا (أمیە) هاوارێکی لیٚ هەڵستا، کە هەرگیز وەکو ئەم هاوارەم نەبیستووە،وتم: خۆت قوتار بکە، بەلآم مەحاڵە ئەمڕۆ قوتار بیٚ و هیچ شتێکیش بە هانات نایە، دەڵیٚ: جا بە شمشێر پارچە پارچەیان کردن‌و لەناویان بردن. لەوکاتە (عبدالرحمن)ی کوڕی (عوف) وتی: رەحمەتی خوا برژیٚ بەسەر بیلالدا، هەم درعەکان‌و هەم هەردوو دیلەکانیشی لەدەستدام.

*(أمیة) کابرایەك لووت بەرزو خۆ بە گەورە زان بووە،رۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) سورەتی (نجم)ی لەمەککە دەخوێند، جا، کە گەیشتە ئایەتی سەجدە هەموو سەجدەیان برد تەنها (أمیة) نەبیٚ، کە چنگێك خۆڵی هەڵگرت‌و وتی: ئەمە بەسمە.

* (ابن الجوزی) لەتەفسیرەکەی (زاد المسیر) لەبارەی ئایەتی : ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ الکهف: ٢٨﴾ وتویەتی: ئەو ئایەتە لەبارەی (أمیة)ی کوڕی (خلف) هاتە خوارەوە، ئەمەش کاتێك بوو کە پێشنیاری کرد پێغەمبەر (ﷺ) هەژارو نەدارەکان لەخۆی دوور بخاتەوەو گەورەکانی قورەیش لەخۆی نزیك بکاتەوە.

(ابن کثیر) وتویەتی: ئایەتی : ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ﴿١٢﴾﴾ التوبة: ١٢ لەبارەی (أمیة)ی کوڕی (خلف)و هاوەڵانی هاتە خوارەوە.

## ٢٣- (نضر)ی كوڕی (حارث)

ناوی (نضر)ی كوڕی (حارث)ی كوڕی (علقمة)ی كوڕی (كلدة)ی كوڕی (عبدالمناف)ی كوڕی (عبد الدار)ی كوڕی (قصی)یە، یەكێكە لەگەورە پیاوانی قوڕەیش‌و، یەكێكە لەقسە ڕەوان و شاعیرەكانی عەرەب.

*(نضر) لەگەڵ ئەوەی دوژمنایەتیەكی سەختی پێغەمبەری دەكرد (ﷺ) بەڵام لەناو كۆڕو كۆبونەوەكانی قەومەكەی دەیوت: محمد لەناوتان گەنجێكی تازە پێگەیشتوو ڕاست گۆترو دەست پاك تر بوو لەهەمووتان ، جا كەزانیتان كەمێك تەلەداوی لەسەری سپی بوو، ئەوەی بۆی هێنان، وتتان: درۆزنەو ساحیرە، نەخێر وەڵاهی، نە ساحیرەو نە درۆزنە ، ئێمە ساحیرو ئەو كارەی دەیكەن پێی شارەزاین ئەم جارە وتتان: فاڵچیە، وەڵاهی فاڵچیش نیە، چونكە لەكاری فاڵچیش شارەزاین ، ئەم جارە وتتان: شاعیرە، وەڵاهی شاعیریش نیە، چونكە ئێمە جۆرەكانی شیعر بە (هزج)و (رجز)ەكەی شارەزاین، ئەم جارە وتتان شێتە، وەڵاهی شێتیش نیە، چونكە ئێمە دەزانین شێتی كووە، ئەی گەلی قوڕەیش ، بڕواننە كارو باری خۆتان، وەڵاهی شتێكی زۆر گەورە رووی لەئێوە كردووە. (سیرة ابن هشام).

*(نضر) چ جای ئەو دانپیانانەی كردی بەڵام لەبەرئەوەی زۆر هاموشۆی (أبو جهل)و (عقبة بن أبي معیط) و هاوشێوەیانی دەكرد، ئەوا وای كرد رێگر بێت و نەیەتە ناو ئیسلامەو، دژی قورئان بوەستێ‌و وا گومانیشی دەبرد، كە خوای گەورە ناتوانێ مردوان زیندوو بكاتەوە، خوای گەورە ئایەتەی لەبارەیەوە دابەزاند، كە دەفەرموێ ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣ ﴾ الحج: ٣ بەڵكو بەرپەرچی قورئانی دایەوەو وتی: (والزارعات زرعا، والحاصدات حصدا، والطاحنات

طحنا، و العاجنات عجنا، والخابزات خبزا، فاللاقمات لقما) چەند شتێکی تری هاوشێوەی ئەو قسە پووچانە، کە جێی پێکەنینە!!! (رواه عبد بن حمید).

*(نضر)ی کوڕی (حارث)و کۆمەڵێك لەقورەیشیەکان لەوانە بوون کە داوایان لەپێغەمبەر (ﷺ) کرد بۆ ئەوەی مانگیان بۆ بکاتە دووکەرت، کەرتێکی بکەوێتە سەرچیای (قبیس)و کەرتەکەی تریش بۆ سەر چیای(قعیقان) شەوەکەش مانگە شەوی چواردە بوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: ((ئەگەر وام کرد باوەڕ دێنن؟)) وتیان: بەڵێ، پێغەمبەریش (ﷺ) دوعای کردو خوای گەورەش دوعایەکەی قەبول کرد و مانگی کردە دوو کەرت، بەڵام ئەوان لەعینادو کوفر کردن زیاتر چیتریان نەکرد. (سیرە ابن هشام).

*هەروەها (نضر)ی کوڕی (حارث) لەنێو ئەو چەند کەسانە بوو کە چوونە لای پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك لەلایەن خواوە هەقی بۆهات و فەرمانی پێکرا بڵاوی بکاتەوە، جا، کە چوونە لای پێیان وت: ئەی محمد هاتوین قسەت لەگەڵ بکەین، وەڵاهی دەزانین، کە کەس لەنێو عەرەباندا شتێکی نەهێناوەتە ناو قەومەکەی ئەوەی تۆ هێناوتە، بەراستی تۆ باب‌و باپیران‌و دین و خواکانمانت عەیبدار کردووەو ریسوات کردوون، ئەگەر تۆ ئەوەی هێناوتە مەبەستتە لەرێگایەوە ماڵت دەست بکەوێ ئەوا وا دەکەین لەهەمووومان دەوڵەمەند تر بی، ئەگەریش حوکمی پێدەکەی ئەوا دەتکەینە حاکم بەسەرماندا، ئەگەر مولکیشت دەوێ ئەوا دەت کەینە مەللاك بەسەرماندا، ئەگەریش ئەوەی بۆت دێ شتێکە لەلایەن جنۆکەوەیەو ناتوانی لەدەستی قوتارت ببێ ئەوا پارەو پول کۆدەکەینەوە بۆ ئەوەی پزیشکێك بێنین بۆ ئەوەی چارەسەرت بکاو لەم قەیرانە قوتارت بکا، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموون: ((ئەو شتانەی وتتان لەمن دانیە، ئەوەی هێناومە بۆتان نامەوێ لەرێگایەوە ببمە دەوڵەمەندترینتان‌و ببمە حاکم لەسەرتان و پارەو پولی پێ خر بکەمەوە، بەڵکو خوای گەورە منی وەك نێرداوێك ڕەوانە کردووە بۆتان و کتێبێکیشی بۆ رەوانە کردووم و فەرمانیشی پێ کردووم کە

مژدەتان بدەمیٚو بشتان ترسێنم، منیش ئەوا پەیامەکانی خوام پیٚ راگەیاندنو دڵسۆزم بۆتان و ئامۆژگاریکەرتانم، جا ئەگەر ئەوەی من هێناومە بۆتان وەریبگرن، ئەوا خۆشبەختی تانە لەدونیاو ئاخیرەتدا، ئەگەریش وەری ناگرنو ڕەتی دەکەنەوە ئەوا ئارام دەگرم لەسەر فەرمانی خوا هەتا خوای گەورە حوکم دەکا لەنێوان من و ئێوەدا))

وتیان: ئەی محمد ئەگەر تۆ هیچ لەئێمە وەرناگری لەوەی پێمان گوتی، ئەوا دەزانی کەوا کەس وەك ئێمە جێگای تەسكو ناخۆش نیەو هەروا کەس وەکو ئێمە بیٚ ئاوو کەم گوزەران نیە، داوا لەخوایەکەت بکە بۆئەوەی ئەو چیایانەی زەویەکانی ئێمەی بەر تەسك کردۆتەوە بۆمان تەخت بکاو وڵاتەکەمان بەرفراوان بکاو چەند ڕووبارێك وەك ڕووبارەکانی شامو عێراق تیایدا هەڵقولێنیٚو ئەوەی لەبابو باپیرانمانیش، کە مردوونە زیندویان بکاتەوە، لەوانەی، کە زیندوی دەکاتەوە با (قصی بن کلاب)یان لەناو بێت چونکە ئەو پیاوێکی ڕاست گۆبووە بۆ ئەوەی پرسیاری لیٚ بکەین لەوەی تۆ دەیڵێی، کە ئایە ڕاستە یان ڕاست نیە، ئەگەر تۆیان بەڕاست زانیو ئەوەی ئەمەش دەیڵێین جێبەجێت کرد ئەوا ئێمەش بەڕاستت دەزانینو، تێدەگەین کەوا تۆ لەلای خوا بەڕێزیو پلەو پایەکی بەرزت هەیەو پێغەمبەری، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموون: ((من بەو شتانە بۆ ئێوە ڕەوانە نەکراوم، من بەوشتانەی خوا پێی وتم ئەوەم بۆهێناون و پێم ڕاگەیاندوون، ئەگەر وەری بگرن ئەوا خۆشبەختی دونیاو قیامەت دەبن، ئەگەریش بەسەرمی دادەنەوە، ئەوا لەسەر فەرمانی خوا ئارام دەگرم هەتا خوای گەورە حوکم دەکا لەنێوانماندا)).

وتیان: ئەگەر ئەوەشت بۆمان پێناکریٚ، ئەوا داوا لەخواکەت بکە فریشتە ڕەوانە بکا بۆ ئەوەی ڕاست گۆییت دەربخاو، پرسیاری لێبکە با چەند باخچەو کۆشكو گەنجینەیەکت لەزێڕو زیو پیٚ بدات بۆ ئەوەی پێویستت بە هیچ نەبیٚ، چونکە تۆ وەك دێی بۆ بازاڕو دەگەڕێی بەدوای پارەوە نانێکدا، جا با خواکەت ئەمەت بۆ بکات بۆ ئەوەی قەدرو ڕێزو گەورەییت بزانین لەلایەن خوایەکەت ئەگەر بەڕاستی تۆ پێغەمبەری.

پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون: ((من ئەوە ناکەم، من چیم هەتا ئەو داوایە بکەم لەپەروەردگارم، من بەو شتانە بۆ ئێوە نەنێردراوم، بەڵکو خوای گەورە بە مژدەدەرو ترسێنەر رەوانەی کردووم، ئەگەر پێی رازین ئەوا خۆشبەخت دەبن لەدونیاو قیامەتدا، ئەگەریش وەری ناگرن ئەوا ئارام دەگرم لەسەر فەرمانی خوا هەتا خوا حوکم لەنێوانماندا دەکات)). وتیان: کەواتە با خوایەکەت ئەگەر هەموو شتێکی پێدەکرێ با بەردبارانمان بکات لەئاسمانەوە، چونکە ئێمە باوەڕت پێناکەین هەتا ئەم کارە نەکەی.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەمە کاری خوایە ئەگەر بیەوێ دەیکاو ئەگەریش نەیەوێ نایکا)).

وتیان: ئەی محمد ئایە خوایەکەت نەیدەزانی ئێمە لەگەڵ تۆ دادەنیشین‌و داوای چەند شتێکت لێ دەکەین، بۆئەوەی تۆ پێش ئێمە شتەکانت بزانیبایە ! ئێمە پێمان گەیشتووە، کە ئەوەی فێرت دەکا پیاوێکە لەیەمامە ناوی رەحمانە، وەڵاهی ئێمە قەت باوەڕ بە رەحمان ناهێنین. ئێمە واز لەتۆ ناهێنین هەتا لەناوت دەبەین یان لەناومان دەبەی.

یەکێکیان وتی: ئێمە فریشتە دەپەرستین، کە کچی خوایە. یەکێکی تریش وتی: باوەڕت پێناکەین هەتا خواو فریشتەکان پێکەوە نەبینین.

*(نضر)ی کوڕی (حارث) ئەگەر پێغەمبەری بدیتابایە لەکۆڕێك، کە بانگەوازی بکردبایە بۆ خواو قورئانی بخوێندبایە ئەوا هۆشداری دەدا قورەیش لەوەی گوێی بۆ بگرن و دەیوت: وەڵاهی وتەکانی محمد لەوتەکانی من باشتر نیە وتەی ئەو قسەی گەلە کۆنەکانی پێشە خۆیەتی کەوا بە رۆژو شەو دووبارەی دەکاتەوە.

*(نضر)ی کوڕی (حارث) لەشەڕی بەدر بە دەستی (علی) کوڕی (ابو طالب) کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردبوو کوژرا.

## ٢٤- (عتبه)ی کوڕی (ربیعه)

ناوی (عتبه)ی کوڕی (ربیعه)ی کوڕی (عبدشمس)ی کوڕی (عبدمناف القرشی العبشمی)یه.

*یەکێکە لەهەر دوژمنە سەرسەختەکانی ئیسلام‌و، یەکێکە لەوانەی کە ڕێگای لەموسڵمانان دەگرت بێنە ناو ئاینی ئیسلام.

*عیکریمە، لەبارەی ئایەتی: ﴿ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ الأنعام: ٥١ وتویەتی: (عتبة بن ربیعة)و (شیبة بن ربیعة)و (مطعم بن عدی) و (حارث بن نوفل) و (قرظة بن عبد عمرو بن نوفل) هاتنە لای (أبو طالب)و وتیان: ئەگەر برازاکەت بەندەو بەکرێگیراوەکانمان دەربکاو دووریان بخاتەوە لەخۆی ئەوا خۆشەویستر دەبێ لەلامان‌و بۆی هەیە بڕوای پێبکەین! (أبو طالب)یش هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) قسەی ئەوانەی بۆ گێڕایەوە، (عمری کوڕی خطاب (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کارە نەکەی هەتا نەزانی مەبەستیان چیە لەم قسەیە! جا خوای گەورە ئەم ئایەتەیدابەزاند:

دەڵێ: (بیلال)و (عمار)ی کوڕی (یاسر)و (سالم) مەولای (أبو حذیفة) بوون‌و، (صبیح)یش مەولای (أسید) بوو هاوپەیمانەکانیش: (ابن مسعود)و (مقداد)ی کوڕی (عَمرو)و چەند کەسێکی تریش بوون، لەبارەی سەرکردەکانی کوفر لەقوڕەیشیەکان‌و مەوالی‌و هاوپەیمانەکانیان ئەم ئایەتە دابەزی:

جا، کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، (عمر)ی کوڕی (خطاب) هات پەشیمان بۆوە لەو قسەیەی کردبووی، خوای گەورە دەست بەجێ ئەم ئایەتەی دابەزاند: (تفسیر الطبري).

*(عتبة) لەوانە بوو، کە حەقی ناسی بەڵام شوێنی نەکەوت (ابن اسحاق) وتویەتی: (یزید ابن زیاد) بۆی گێڕامەوە ئەویش لە(محمد بن کعب القرظي)، کە وتویەتی: بۆیان

گێڕامەوە کەوا (عتبة)ی کوڕی (ربیعة) ڕۆژێك لەناو قوڕەیش دانیشتبوو، پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەتەنیا لەمزگەوت دانیشتبوو، وتی: ئەی قوڕەیشیەکان ئایا بۆ نەچم بۆ لای محمدو قسەی لەگەڵ بکەم‌و چەند شتێکی بخەمە بەردەمی بەڵکە هەندێکی قەبوڵە ئەو کات کامەیان هەڵبژارد ئەوا دەیدەینێ، یان ئەوەتا وازمان لێدێنێ، ئەمەش ئەو کاتە بوو، کە حەمزە موسوڵمان بوو، بینیان وا هاوەڵانی پێغەمبەر روو لەزیادبوون دەکات ، وتیان بەڵێ ئەی باوکی وەلید، بڕۆ قسەی لەگەڵ دا بکە، جا (عتبە) چوو بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) هەتا لەنزیکی دانیشت‌و وتی: ئەی کوڕی برام تۆ لەناومان خاوەن پلەو پایەو شەرەف‌و رەچەڵەکی بەرزی، تۆ شتێکی زۆر گەورەت هێناوە بۆ قەومەکەت، کە بە هۆیەوە پەرتەوازەت کردوون‌و ژیانت لێ تێکداون‌و خوایەکانیانت عەیبدار کردووەو کوفرت بە دینەکیان کردووە، گوێم بۆ بگرە چەند شتێك دەخەمە بەردەمت بەڵکە هەندێکیانت قەبوڵبێت.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((باوکی وەلید بیانڵێ من وا گوێ رادەگرم)) وتی: ئەی کوڕی برام ئەگەر ئەوەی تۆ هێناوتە دەتەوێ لەرێگایەوە پێی دەوڵەمەند ببی ئەوا دەتکەینە دەوڵەمەندترینمان، ئەگەریش گەورەبیت دەوێت ئەوا دەتکەینە گەورەمان هەتا کارێك ناکەین بێ پرسی تۆ، ئەگەریش مولکت دەوێ ئەوا دەتکەینە مەللاك بەسەرمانەوە، ئەگەریش ئەوەی بۆت دێ لەلایەن جنۆکەوەیە ناتوانی خۆتی لێ قوتار بکەی ئەوا هەموو ماڵ‌و سامانی خۆمان سەرف دەکەین بۆئەوەی دکتۆرێکت بۆ بێنین چارەسەری بکا. جا کاتێك (عتبە) تەواو بوو لەقسەکانی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((باوکی وەلید تەواو بووی لەقسەکانت؟)) وتی: بەڵێ، فەرمووی: ((کەواتە گوێم بۆ بگرە)) وتی: باشە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ۝٣ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ

فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ فصلت: ١ - ٥﴾.سەرنجی سەرەتای سوورەتی (البقرە) بدە. (١) ئەم قورئانە دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و میهرەبانەوە. (٢) کتێبێکە" ئایەت و فەرمانەکانی بەش کراوە و جیاکراوەتەوە (ئیمان وکوفر، حەڵاڵ وحەرام چاکە وخراپە...هتد)، قورئانێکە بە عەرەبیەکی ڕەوان بۆ کەسانێك کە دەیزانن و شارەزاییان هەیە (لە زمانەوانی و زانستەکان). (٣) هەر ئەم قورئانە مژدەبەخشە بەئیمانداران، ترسێنەری کافرانە، کەچی زۆربەی موشریکان پشتیان تێکرد و بەرهەڵستیان کردو نایبیستن. (٤) وتیشیان: ئێمە دڵەکانمان داپۆشراوە لە ئاستی ئەم بەرنامەیەدا کە تۆ بانگی ئێمە دەکەیت بۆ لای، گوێشمان کەڕو قورسە لە ئاستیدا، لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردە و بەربەست هەیە، تۆ هەوڵ و کۆششی خۆت بدە، بێگومان ئێمەش هەوڵ و کۆششی خۆمان دەدەین.﴾

کاتێك (عتبة) گوێی لەم چەند ئایەتە بوو بێدەنگ بوو گوێی بۆ گرت، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە ئایەتی سەجدەو سەجدەی برد پاشان فەرمووی ((خۆ گوێت لێ بوو باوکی وەلید))[1].

ئەنجا (عتبة) هەڵسا گەڕایەوە بۆ لای هاوەڵەکانی، هەندێك لەو هاوەڵانە بەهەندێکیان وت: سوێند بە خوا باوکی وەلید بە دەم و چاوێکی تر هاتەوە جگە لەو دەمو چاوەی پێش ئەوەی بچێتە لای. جا، کە دانیشت لەلایان وتیان: ها چی بوو بۆمان بگێڕەوە؟ وتی سوێند بەخوا گوێم لەقسانێك بوو، کە قەت گوێم لێنەبووە، سوێند بە خوا ئەم قسانە نەشیعرەو نە سیحرەو نە هی فالگرەوانیشە، قوڕەیشیەکان، گوێڕایەڵیم بکەنو بالەسەر منیش حیساب بکرێ، لەم پیاوە گەڕێن، سوێند بە خوا

(١) رجاله ثقات إلا أن القرظي وفاته (١٢٠هـ) وبينه وبين رسول الله مفاوز، ولاندري من حدثه. والله أعلم.

لەوقسانەی لەوەم گویٚ لیٚ بووە شتیٚکی زۆر گەورەو گرنگی تیٚدایە، ئەگەر عەرەب بەسەردا زاڵ بوون ئەوا بیٚ ئەوەی ئیٚوە هیچ شتیٚك بکەن ئەوا لەکۆڵی دەبنەوە، ئەگەریش بەسەر عەرەبدا زاڵ بوو ئەوا مولکەکەی مولکی ئیٚوەیەو عیزەتەکەشی عیززەتی ئیٚوەیەو بەمەش بەختەوەرترین خەڵك دەبن پیٚی، وتیان: سویٚند بە خوا ئەی باوکی وەلید بەقسەکانی سیحری لیٚکردووی، وتی: ئەوە رای منە لەبارەی ئەو، جا چی دەکەن بیکەن.

*(عتبة) لەو کەسانە بوو، کە پیٚغەمبەر دوعای لیٚکردو فەرمووی: ((اللهم عليك بالملأ من قريش، اللهم عليك بعتبة بن ربيعة اللهم عليك بشيبة بن ربيعة اللهم عليك بأبي جهل بن هشام اللهم عليك بعقبة بن أبي معيط ، اللهم عليك بأبي بن خلف أو أمية ابن خلف)) عبدالله وتی: ئەوانەم بینی بەکوژراوی لەشەڕی بەدر پاشان فڕیٚدرانە ناو قەلیب، جگە لە(أميه) نەبیٚ، کە پیاویٚکی قەڵەوو زەبەلاح بوو پارچە پارچە ببوو. (متفق عليه).

پیٚغەمبەر (ﷺ) لەپاش شەڕی بەدر بەسیٚ رۆژ فەرمووی: ((ئەی ئەبو جەهلی کوڕی هشام ئەی ئومەییەی کوڕی خەلەف، ئەی عوتبەی کوڕی رەبیعەو شەیبەی کوڕی رەبیعە ، ئایە ئیٚوە ئەو خوایەی بەڵیٚنی پیٚدابوون بۆی هیٚنانە دی؟ من خوای گەورە ئەوەی بەڵیٚنی پیٚدابووم بۆی هیٚنامە دی)) عومەر گوێی لەو وتانەی پیٚغەمبەر (ﷺ) بوو وتی: ئەوانە چۆن گوێیان لیٚ دەبیٚو چۆن دەتوانن وەڵام بدەنەوە لەکاتیٚك کە بۆگەن بوونە؟ پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سویٚند بەو کەسەی نەفسی منی دروست کردوە ئەوان زیاتر لەئیٚوە گوێیان لیٚیە بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە)).

## ٢٥-(شيبة بن ربيعة)

ناوی (شيبة)ی كوڕی (ربيعة)ی كوڕی (عبدشمس)ی كوڕی (عبدمناف القرشی العبشمی) يە.

*بە خۆیو بە عوتبەی برای يەكێكن لەهەرە دوژمنە سەرسەختەكانی ئیسلام.

*ئايەتی ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾﴾ الحج: ١٩﴾ لەبارەی ئەوانو چەند كەسێكی تر دابەزيوە.

(قيس بن عباد) دەڵێ: گوێم لە(أبو ذر) بوو سوێندی دەخوارد كەوا ئايەتی ﴿هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴿١٩﴾﴾ الحج: ١٩﴾ لەبارەی (حمزة)و (علي) و (عبيدة بن الحارث) و (عتبة)و (شيبة)ی كوڕی (ربيعة)و (وەليد)ی كوڕی (رەبيعة) دابەزی كاتێك لەشەڕی بەدر بۆيەكتر هاتنە مەيدان. (متفق عليه).

*(يونس بن عبيد) وتويەتی: (عتبة)ی كوڕی (رەبيعة)و شەيبەی برايیو (أبو جهل) و (أبو سفيان) لەنەفاميەت بەردەوام رای ئەوان بە زەوی نەدەكەوت و خاوەن راو مەشرووەرت بوون، بەڵام كە ئیسلام هات رای ئەوان هيچ بايەخێكی نەما. (الاستيعاب لابن عبدالبر).

كاتێك لەمەدينە بيلال و ئەبوبەكر (رضي الله عنه) تايان گرتبوو ئەوا لەعنەتيان لەگەورە پياوانی قوڕەيش دەكرد و دەيانوت

كل امرىء مصبح في أهله والموت ادنى من شراك نعله

كاتێكيش تا بيلالی بەردەدا دەيوت:

ألا ليت شعري هل أبيتن ليلة بواد وحولي إذخر وجليل

وهل إردن يوما مياه مجنة وهل يبدون لي شامة وطفيل

هەروەها دەيوت: نەفرەتی خوا لە(عتبة)و (شەيبە)ی كوڕی (رەبيعە)و (أميە) (ی كوڕی (خلف) بێت، كە لەزەوی خۆمان دەريان كردين بۆ زەوی دەردو نەخۆشی.

پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((خودایە مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە وەك خۆشەویستیمان بۆ مەککەو زیاتریش خودایە بەرەکەت بێخیە ناو روبەو چنگمان و بۆمانی چاك بکە، تایەکەشمان رەوانەی جوحفە بکە))دەڵێ: کە چووین بۆ مەدینە خراپترین زەوی خوا بوو لەنەخۆشی، دەڵێت: بوطحان ئاوێکی تێك چووی پێدا دەرۆیی. (رواه البخاری وأحمد).

*(شیبة) لەگەڵ برایەکەی (عتبة) کوژران، ئەمەش پاداشتێکی پڕ بە پێست بوو لەلایەن خوای گەورە بۆیان، لەشەڕی بەدرو لەسوپای موشریکەکان (عتبة)و (شیبة)و (ولید) هاتنە نێوانی هەردوو سوپا بۆ زۆرانبازی، سێ لاوی ئەنصاری بۆیان دەرچوون بە ناوی (عوف) و(معوذ)ی کوڕی (حارث) لەگەڵ پیاوێکی تر، کە دەڵێن (عبدالله)ی کوڕی (رەواحە) بوو. وتیان: ئێوە کێن؟ وتیان کۆمەڵێکین لەئەنصار، وتیان: ئێمە پێویستیمان بە ئێوە نیە.

پاشان یەکێکیان هاواری کرد: ئەی موحەممەد، لەقەومەکەی خۆمان پیاوانێك با بێن ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەڵسە ئەی (عبیدة بن الحارث)و (هەڵسە ئەی (حمزة بن عبدالمطلب) و هەڵسە ئەی (علی بن أبی طالب) وتیان: ئێستا تەواوە، ئەوانە هاوشانی بەرێزی ئێمەن.(عبیدە) کەلەهەموویان بە تەمەنتر بوو زۆرانبازی لەگەڵ (عتبة)ی کوڕی (رەبیعة) کردو (حمزة)ش زۆرانبازی لەگەڵ (شیبة) کردو، (علي)ش زۆرانبازی لەگەڵ (ولید) کرد.

(حمزە) ئەوەندەی پێنەچوو (شیبە)ی کوشت، (علی)ش هەر زوو (ولید)ی کوشت، بەڵام (عبیدە)و (عتبە) هەریەکەیان شمشێرێکی لەوەکەی تریان دا، بەڵام (حمزە)و(علی) زوو بە شمشێرەکەیان هەڵیان کوتایە سەر (عتبە)و کوشتیان، جا هەڵسان برایەکەی خۆیان هەڵگرتو بردیانەوە ناو سوپاکە.

## ٢٦- كعب بن الأشرف

(كعب بن الأشرف) لەعەشیەرەتی (طیئة)، دایکیشی لە(بنی النضیر)ە (سیرە ابن کثیر).

●(كعب بن الأشرف) بەشیعرەکانی زۆر ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدا و عەرەبەکانی هاندەدا بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و موسڵمانان لەگەڵ هاوەڵەکی بە ناوی (أبو رافع بن الحفیف).

●قورەیشیەکان لە(كعب بن الأشرف)یان پرسی کاتێك چووە مەککە: ئایە دینی ئێمە باشترە یان دینی موحەممەد؟ وتی: دینی ئێوەچونکە دینەکی کۆنە، بەڵام دینەکەی موحەممەد دینەکی نوێیە.

جا ئەم ئایەتە دابەزی : ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ آل عمران: ٢٣.ئایا نابینی ئەو کەسانەی بەشێك لە کتێبی ئاسمانیان پێدراوە کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای کتێبی خوا (تەورات) تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا، پاشان دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن و لە کاتێکدا ئەوان سەرپێچی کەرن.﴾

●هۆکاری رق هەڵسانی (كعب بن الاشرف) لەسەر ئیسلام و شوێن کەوتوانی ئەوە بوو: کە کاتێك کافرەکان لەشەڕی بەدر رووخانو تێك شکان، (زید)ی کوڕی (حارثة) چوو بۆ خوارووی مەدینەو (عبدالله)ی کوڕی (رەواحە)ش چوو بۆ سەرووی مەدینە ئەمەش بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی مژدە بدەنە موسڵمانان بەو سەرکەوتنەی ئیسلام بەسەر کافرەکانی مەککە، (كعب بن الاشرف) وتی: ئایە ئەمە راستە، موحەممەد ئەوانەی کوشتووە؟ ئەمانە خۆ گەورەی هەموو عەرەبەکان بوون، سوێند بە خوا ئەگەر موحەممەد ئاوای بەسەر ئەوانە هێنابێ ئەوا ژێرەوەی زەوی زۆر

بۆمن باشترە لەسەرەکەی، جا هەر لەو رۆژەوە هۆزە عەرەبیەکانو قورەیشیەکانی بە تایبەت هاندەدا لەسەر دوژمنایەتی کردنی ئیسلامو موسڵمانان.

(کعب بن الاشرف) کاتێك لەهەواڵەکە دڵنیا بوو، دەرچوو هەتا گەیشتە مەککەو، میوانی (مصلب بن أبی وداعە بن خبیرە السهمی) بوو، کە لەلاشی (عاتکە بنت أبو العیص بن أمیة بن عبد شمس بن عبدمناف)، کە رێزیان لێگرت، ئەویش شیعری دەوتو خاوەن تازیەکانی بە گریان دەخست لەقورەیشیەکان.

●سەبارەت بە کوشتنیشی ئەوا (محمد بن مسلمة) لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵانی لەناوماڵەکەی خۆی کوشتیان، (ابن هشام) لەسیرەکەی خۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ: کاتێك (کعب بن الاشرف) گەڕایەوە مەدینە هەڵسا جنێوی دەدا بە ئافرەتە موسڵمانەکان ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((کێ هەیە کوڕی ئەشرەف لەناو ببات؟)) (محمد)ی کوڕی (مسلمة) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەیکوژم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((ئەگەر پێت دەکرێ وەبکە)).

(محمد بن مسلمة) گەڕایەوە ماڵەوە سێ رۆژان هیچی نەخواردو نەخواردەوە تەنیا ئەوە نەبێ، کەپێی بژی، ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو پێی فەرموو: ((بۆچی خواردنو خواردنەوەت واز لێهێناوە؟)) وتی: لەبارەی تۆ شتێکم وتوە، کە تۆمەتە. فەرمووی: ((تۆ هەوڵو تەقەلای خۆت بدە)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە هەر دەبێ چەند شتێك بڵێین، فەرمووی: ((چی دەڵێن بیڵێن، گەردەنتان ئازا بێ)) جا بۆ کوشتنی (کعب بن الاشرف) پێنج کەس کۆبونەوە بە ناوی (محمد بن مسلمة)و (أبو نائلە) کە برای شیری (محمد بن مسلمة) بوو لەگەڵ (عبّاد بن بشر)و (حارث بن اوس)و (أبو عبس بن جبر).

پاشان چوونە لای دوژمنی خوا (کعب بن الاشرف) ، جا پێش ئەوەی ئەوان بچنە لای (أبو نائلە)پێشیان کەوتو کات ژمێرێك قسەیان پێکەوە کردو شیعریان وت، پاشان

وتی: دەزانی چیە ئەی کوڕی ئەشرەف! من بۆ کارێك هاتووم دەمەوێ بە تەنیا بۆ تۆی باس بکەم، جا ئەمە با نهێنی بێت لەلات، وتی: باشە، وتی: ئەو پیاوەی هاتۆتە ناومان بەڵایەکی زۆری بەسەرماندا هێناوە، کە عەرەب وا دوژمنایەتیمان بە هۆیەوە دەکات لەیەك قەوس تیرمان تێدەگرن‌و، هەموو رێگایەکی لەبەر دەماندا گرتووە هەتا وا خەریکە خۆمان و ماڵ‌و منداڵمان لەدەست بدەین‌و زۆری ئێمە ماندوو هیلاك کردوو ە، کعب وتی: من کوڕی ئەشرەفم، ئەی کوڕی سەلامە چۆنم وت کاروبارە کە وای لێهات، ابو نائلە پێی وت: دەمەوێ هەندێك خواردنمان بەبارمتە پێ بفرۆشێ دەشی نووسین، وتی: ئافرەتەکانتان دەکەنە بارمتە لەلام؟ وتی: تۆ چۆن ئافرەتەکانمان بکەینە بارمتە لەلات لەکاتێك تۆ گەنج ترین‌و بۆنخۆش ترینی خەڵکەی یەسریبی وتی: منداڵەکانتان دەکەنە بارمەتە لەلام؟ وتی: تۆ دەتەوێ ئابرومان ببەی، چەند هاوەڵێکم لەگەڵە وەکو خۆمن‌و لەسەر راوبیری من‌و دەمەوێ بیان بینی بۆ ئەوەی پێیان فرۆشییی‌و چاکەیان لەگەڵ بکەی و لەبری ئەمەش چەکەکانمان بەبارمتە لەلات دادەنێین، لەراستیدا ابو تئالە ویستی کعب چەك‌و تفەنگ رەت نەکاتەوە ئەگەر هێنایان وتی: لەچەك‌و تفاقدا ئەمەکداری هەیە، جا أبو نائلە گەرایەوە لای هاوەڵەکانی‌و ئەمەی بۆ گێرانەوەو فەرمانی پێکردن چەك لەگەڵ خۆیان ببەن‌و ، پاشان برۆنە لای‌و لەگەڵی کۆببنەوە، جا لەلای پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆبوونەوە ابن اسحاق وتویەتی: پوڕ بن زید بۆی گێرامەوە، ئەویش لەعیکریمەو عیکریمەش لە ابن عباس وە کە وتوویەکی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵیان رۆیی بۆ بەقیعی غەرقەد، پاشان رێی نیشاندان‌و فەرمووی ·بەناوی خوای گەورە بەرێکەون،خودایە یارمەتیان بدەی) پاشان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، ئەم شەوە مانگە شەو بووو،ئەوان رۆیشتن هەتا گەیشتنە قەلاکەی، أبو نائلە بانگی کرد،ئەویش تازە ژنەکی گواستبۆوە، جالە ناو ·پێخەفەکەی راست بۆوە، ژنەکەشی لەلایەکی راوەستاو وتی: تۆ پیاوێکی شەڕکەری،

خاوەن شەڕەکانیش لەم کاتە درەنگە ناچنە دەرەوە، وتی: ئەوە أبو نائلەیە، ئەگەر بیزانیبایە خەوتووم هەڵینەدەساتندم، وتی سوێند بەخوا دەنگەکەی بۆنی شەڕی لێدێت،وتی: کەعب پێی وت، ئەگەر ئەم پیاوە خەڵك بانگ بکا بۆ ئەوەی لێیان بدات ئەوا وەڵامی دەدەنەوە.

جا هاتە لایان‌و نزیکەی کاژمێرێك قسەی لەگەڵ کردن‌و قسەیان لەگەڵ کرد، پاشان پێی وت: ئەی کوڕی ئەشرەف دەتوانی پێکەوە پیاسیەك بکەین بۆ دۆڵی عەجوز،بۆ ئەوەی ئەوەندەی شەو ماوە لەوێ بۆ خۆمان قسان بکەین؟ وتی ئەگەر دەتانەوێ بابچین، جا ئەندازەی کات ژمێرێك ڕۆیشتن، پاشان أبو نائلە دەستی خستە ناو پرچی بن گوێیەکی‌و پاشان بۆنی کردو وتی: هیچ شەوێك وەکو ئەم شەوە بۆنی ئەو خۆشم بۆن نەکردووە، پاشان ماوەیەکی دیکە ڕۆیشتن ، پاشان هەمان شتی کردوە هەتا دڵنیا بوو، پاشان ماوەیەکی تر ڕۆیشتن جاسەری گرت‌و، پاشان وتی: لەدوژمنی خوا بدەن، ئەوانیش لێیان دا بەشمشێرەکانیان بەڵام زۆر سودی نەبوو.

محمد بن سلمە وتی: چەقوەکم بیرکەوتەوە کاتێك بینیم شمشێرەکانمان سودیان نەبوو دەستم دایێ، جا دوژمنی خوا هاورێکی لێ هەستا قەلا نە ماڵە دەورویەرمان ئاگر هەڵنەکەنەوە لەسەری وتی: جا چەقۆیەکم لەبن ناوکی دا پاشان خۆم هاوێشتە سەرێ هەتا گەیشتە کۆمی‌و کەوتە خوارەوە، حارسی کوڕی ئەوسی کوڕی موعاز لەئێمە بریندار بوو لەپێیەکانی کاتێك ششمێرەکانی ئێمەی بەرکەوت.

وتی: جا دەرچووین هەتا ڕۆیشتین بۆ لای بنی امیە بن زید و لەوێش بۆبنی قریڤە و لەوێش بۆ بعاپ ، هەتا سەرکەوتین بۆ بەردە ڕەشەکانی دۆڵی مەدینە، حارسی کوڕی ئەوسی برادەریشمان لەبەر زۆر خوێن ڕۆیشتنی برینەکەی‌و شەکت بوونی بەم هۆیەوە دوا کەوت، ئێمەش ماوەیەك چاوەڕوانمان کرد، پاشان شوێن پێی ئێمە ی هەڵگرت‌و هاتە لامان.

وتی: ئێمەش هەڵمان گرتو هێنامە لای پێغەمبەر خوا (ﷺ) لەئاخیری شەو، کە لەشەونوێژ کردن دابوو سەلاممان لێکردو ئەویش بۆ لامان هات، هەواڵمان پێدا بەگوشتنی دوژمنی خواو، ئەویش بەتفی پیرۆزی خۆی برینی هاوەڵەکەمانی چەور کرد، جا گەرایەوە ماڵەوەو ئێمە گەڕاینەوە ماڵەوە، جوولەکان زۆر لەم رووداوە ترسانو هیچ جوولەکەیەك نەبوو لەوکاتەکەی ئەم رووداوە روویدا لەخۆی نەترسێ (السيرە لابن هشام).

## ٢٧- حیێي کوڕي اخطب

ناوی حیّی بنُ أخطب بن سعيه بن عامر بن عبيد بن كعب بن الخزرج بن أبى حبيب بن النظير بن النّحام بن ينموم ه لەنەوەکانی يعقوب عليه السلام لەهۆزی پێغەمبەر هارونی کوڕی عیمران عليه السّلام بوو. (الطبقات الكبرى:٨/١٢٠).

*حُیّی سەرسەختانە دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ)ی کرد، خوو نەریتی ئەم پیاوەش هەروا مایەوە نەفرەتی خوای لێ بێ تاوەکو بۆ دەستهەڵگرتنی لەم کارەی لەبەردەم پێغەمبەری خوا (ﷺ) کوژرا لەرۆژی شەڕکردنی وەك جەنگاوەری بّنی قُریظة (البداية والنهاية: ٣/٢١٢).

*لەهەوڵی دەستگیرکردنی پێغەمبەر (ﷺ) ئەم نەفرەتیە رۆڵی سەرکردایەتی گێڕا..

ئەوەش لەکاتێکدا بوو کەوا پێغەمبەر (ﷺ) کە ابوبکرو عمرو علی لەگەڵ بوو هاتە لای بەنی نضیر کە یارمەتییان بدەن لەهزرێك کە بۆی هاتبوو، گوتی: یارمەتیم بدەن لەو بیرۆکەی بۆم هاتووە. ئەوانیش گوتیان: بەڵێ باوکی قاسم، بەراستی کاتی هاتووە کە بێیە لامان و پێویستییەکمان لێداوابکەیت، دانیشە تاوەکو خواردنێکت بۆ بێنین‌و گوێڕایەڵیت بکەین لەوەی داوامان لێدەکەیت، دواتر حُیی هاتو بەهاوەڵەکانی خۆی

گوت: لەوەی ئێستا نزیکتر نابینن، بەردێکی بەسەردا بەردەنەوەو بیکوژن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانیشی دانیشتن، برادەرەکانی حُیی لەوکاتەدا ویستیان بەردێکی خڕی گەورەی بەسەردا غلۆل بکەنەوە، بەڵام خوای گەورە بەردەستی گرتن تاوەکو جبریل هەواڵەکەی پیێ راگەیاند. (تفسیر الطبري/ ٤/٤٨٥).

*ئەم نەفرەتیە بەمەش رانەوەستا، بەڵکو رۆیی دوژمنان کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی شەڕ لەگەڵ موسڵمانان بکەن. بەراستی قینو دڵپیسی دڵی جوولەکەی پڕکردبوو، وایان لێهاتبوو کە بیریان دەکردەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی شەهید بکەن، لەسەر ئەم مەبەستەش پێکهاتنو پەیمانیان دا لەسەر جێبەجێ کردنی، ئەوە بوو حُیّي بنُ أخطب و سلامُ بنُ أبي الحُقَيْق لەکۆمەڵێك لەپیاوە ماقوڵو گەورەکانیان دەرچوون تا چینو توێژەکان کۆبکەنەوە بۆ دژایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و موسڵمانەکان، گەڕانەوە لای قورەیشیەکانی مەککەو هاندانیان لەسەر جەنگ کردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و گوتیان: لەگەڵ ئێوە دەبین هەتاوەکو لەناوی دەبەین..پاشان ئەم کۆمەڵەیە لەجوولەکەکان دەرچوون بۆلای هۆزی غطفان و بانگێشتیان کردن بۆ جەنگان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) و پێیان راگەیاندن کەوا قورەیش پەیمانیان پێداون لەسەر ئەوە، پەیمانیشان بە پیاوانی غطفان دا کە بەرهەمی ساڵێکی خورمای خَیْبَر یان پێبدەن ئەگەر سەرکەوتن بەسەر محمد (ﷺ)، ئەوەبوو هۆزی غطفان رازی بوون، بەم شێوە لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە چینو توێژەکان کۆبکەنەوەو بانگێشتی هەموو ئەوانەش بکەن کە خوێنیان لای محمد رژاوە..تاوەکو دە هەزار جەنگاوەری کۆکردەوە ، ئەم سوپایە گەورەیە لەژێر فەرمانڕەوایی أبی سفیان بن حرب لەمانگی شوالی ساڵی پێنجی کۆچی کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەهەواڵی ئەو سوپایەی زانی، هاوەڵانی کۆکردەوەو گفتوگۆی لەگەڵ کردن لەوەی کە بزانن چی پێویستە بیکەن، ئینجا سەلمانی فارسی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەفارس

ئەگەر لەدوژمن بترساین چاڵێکمان هەڵدەکەند..ئەم بیرۆکەی چاڵ لێدانە موسوڵمانانی سەرسام کردو دەستیان بە کارەکە کرد، کاتێك کۆمەڵەی بێباوەڕان گەیشتنە ئەوێ سەریان سوڕما لەخەندەقەکە، بەم جۆرە هەردوو بەرە لەبەردەم خەندەقەکە رووبەرووی یەکتر وەستان، موسوڵمانان ژمارەیان کەم بوو و چەك‌و تفاقیانیش لاوازو کەم بوو، موشریکەکانیش بەزۆری ژمارەیان و بە زەبەلاحی کەل‌و پەلیانەوە ئامادەبوون..بەم شێوە هەردوو سوپا بۆ ماوەی چەند رۆژێك وەستان کە هەریەکێکیان چاودێری ئەویتری دەکرد. خۆ ماتکردن‌و چاوەڕێ کردنەکە تەنگی پێ هەڵچنین‌و هیچ لەنێوان ئەوان‌و موسڵمانان نەما ئاڵوگۆڕکردنی تیر نەبێ لەدوورەوە و حُیّی کوڕی أخطب یش لەوە ترسا کە ئەم هەڵە لەدەستدات، زانی کە هیچ رێگەیەك نی یە بۆ چوونە ناو شارەکە جگە لەرێگەی چوونە ژوورەوەی بني قریظة نەبێت، بني قریظة هێشتا لەسەر بەڵێنی خۆیانن کە بە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) دابوو، ئەوەبوو رۆیشتن بۆلای سەرکردەیان کە کعب ی کوڕی أسد بوو دەرگای لەسەر داخستن، ئەویش دەستی کرد بەفێڵ لێکردنی تاوەکوو چووە ناو قەڵاکەی، ئینجا پێی گوت: بە تینی رۆژەوە هاتوومە لات..قوڕەیش‌و گەورە پیاوانی قوڕەیشم بۆ هێناوی، هۆزی غطفان و گەورە پیاوانیم بۆ هێناوی، بەڵێنیان داوە لەسەر ئەوەی کە محمدو هاوەڵانی لەناو ببەن.

ئینجا کعب وتی: بەبێ هێزو تینی رۆژتەوە هاتویتە لام. قوڕت بەسەر ئەی حیّی: لێمگەڕێ من ئەو کارە ناکەم کە داوام لێدەکەیت چونکە بەراستی هیچم لەمحمد نەبینیوە مەگەر وەفاو راستگۆیی نەبێ! ! حیی کوڕی أخطب بەردەوام بوو لەفێڵکردن لە کعب‌و پەیمانی پێدەداو هەڵیدەخەڵەتاند تاوەکو لەگەڵی رێکەوت، وەعدی لێ وەرگرت کە پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەرو هاوەڵانی هەڵبوەشێنێتەوەو ناپاکی بکات‌و لەگەڵیان رێکەوێت، پاشان حیّی پەیمانی پێداو گوتی: ئەگەر رێت بە قوڕەیش‌و هۆزی غطفان دا ئەوا من و ئەو جوولەکانەی لەگەڵمن دێینە لای تۆو پشتگیریت لێ دەکەین.

کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو ناپاکی یەی زانی کە لەبنی قریضة لەبەرامبەری کرابوو، سعدی کوڕی معاذی گەورەی ئەوس‌و سعدی کوڕی عبادەی گەورەی خەزرەجی لەناو کۆمەڵێ لەهاوەڵانی هەڵبژاردو ناردیانی بۆ لای بنی قریظةو پێیانی گوت: ((بڕۆن بۆ لای بنی قریظة، ئەگەر ئەوەی پێمان دەگوترێ راست بوو ئەوا پێمان رابگەیەنن و هەواڵەکەش لەنێو خەڵکی بڵاو مەکەنەوە، ئەگەر هاتوو هەواڵەکەش راست نەبوو ئەوا لەنێو خەڵکی بڵاوی بکەنەوە)) ئەوەبوو دەرچوون تاوەکو گەیشتنە لایان، بینیان لەسەر خراپترین رەفتارو مامەڵەن کە دەربارەیان گوترابوو، جا کە ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر (ﷺ) قسەی پێغەمبەریان پێگەیاندن، گوتیان: ((هیچ پەیمانێکمان لەگەڵ ئەو نیە)) ئەوەبوو سعدی کوڕی معاذ دەستی کرد بە باسکردنی وەفاو ئاگاداری کردنەوە لەدەرئەنجامی ناپاکی‌و خیانەت‌و پێیانی گوت: دەترسم لەوەی کە وەکو بنی النضیر تان لێبێت بەڵکو خراپتریش..ئەوانیش قسەی قۆڕو ناشیرینیان پێگوت، هەتا جوێنیان پێ داو ئەویش قسەی ناشیرینی بەرامبەر کردن، سعدی کوڕی عبادە پێی گوت: وازیان لێ بێنەو قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێ چونکە ئەوەی لەنێوان ئێمەو ئەواندایە لەوە زیاترە..پاشان سعدی کوڕی معاذو سعدی کوڕی عبادة گەڕانەوەو پێغەمبەریان لەناو موسڵمانەکان بینی‌و گوتیان: ((عُضَلُ والقَارَةُ)) مەبەستیان ئەوەبوو کە ئەوان دەرکیان بە ناپاکی‌و خیانەتی جولەکەکان کرد هەروەکو پێشتر ئەو دوو هۆزە ناپاکیان بەرامبەر موسڵمانان کردبوو، جا پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: ((دەست پێ بکەن ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان)). بەم شێوەیە ئەم هەواڵە بڵاوەی کرد لەنێو موسڵمانان‌و کارەساتەکە لەسەریان توندتر بوو ترسیان زیاتر لێنیشت، وا گومانیان برد کەوا بەبێ گومان لەناوچوون‌و هیچ چارە نیە، وایان لێ هاتبوو کە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ جَآءُوكُم مِّن فَوْقِكُمْ وَمِنْ أَسْفَلَ مِنكُمْ وَإِذْ زَاغَتِ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلْقُلُوبُ ٱلْحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا

﴿١١﴾ الأحزاب: ١٠ - ١١كاتێكیش دوژمنان لەسەرو خوارتانەوە هاتنە سەرتان، كاتێكیش چاوەكان ئەبلەق بوون، دڵەكان گەشتبوونە گەروو، گومانی جۆراو جۆرتان دەبرد بەبەڵێنەكانی خوای گەورە (بەسەركەوتنی ئیمانداران). (١٠) لەوێدا ئیمانداران تاقی كرانەوە و تووشی تەنگانە و سەختیەكی زۆر توندو بەهێز بوون، تووشی دڵەلەرزەیەكی زۆر سەخت كران.. ﴾

كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەو بەڵاو خەمو خەفەتەی بەخەڵكەوە بینی كە بەرۆكیانی گرتبوو، دەستی كرد بە مژدە پێدانیان و پێیانی دەگوت: ((سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە خوا لەو نارەحەتیە رزگارتان دەكات كە دەیبینن، هیوا خوازیشم كەوا بەبێ ترس بەدەوری كەعبە بخولێمەوەو خواش كلیلەكانی كەعبەم پێبداتو كیسراو قیصریش لەناو ببات و گەنجینەكانیان ببەخشنەوە لەپێناوی خوا )) (الرحیق المختوم).

بنوقریظة مەبەستی وابوو بەشەو هێرش بكەنە سەر مەدینەو ناپاكی بەرامبەر پێغەمبەر(ﷺ) بكەن بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەوەی زانی، پیاوێكی نارد كە پێی دەگوترا سلمه بن أسلم و (٢٠٠) پیاویشی لەگەڵ ناردو زەیدی كوڕی حارثەو (٣٠٠) پیاوی نارد بۆ ئەوەی چاودێری شارەكە بكەن. هاوبەش دانەرانیش دەوری موسڵمانانیان دا هەتا وایان لێكردن وەك بڵێی لەنێو قەڵایەك دان لەبەر لەشكرەكانیان، كێشەكە گەیشتە لوتكە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((خوایە پەیمان وبەڵێنی خۆت بەسەردا دەخوێنمەوە ! خوایە بێگومان گەر بتەوێ ناپەرستریێ..خوایە دوورمان بكە لەزیانیانو بەسەریاندا سەرمان بخە تۆ نەبێ كەس بەسەریاندا زاڵ نابێ)) پێغەمبەری خوا (ﷺ) و هاوەڵانیشی نزیكەی ١٠ شەو گەمارۆدران، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ویستی ئاشت ببێتەوە لەگەڵ هۆزی غطفان لەسەر ئەوەی كە سێ یەكی بەرهەمی شارەكەیان پێبدات و وازی لێبێنن، بەڵام ئەنسار بەوە رازی نەبوو، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا

(ﷺ) وازی لەوەهێنا کە دەیویست. لەکۆتایی دا ئەوەیان بۆنەهاتەدی کە بۆی هاتبوون، خواش وەڵامی فێڵەکەی دانەوەو بایەکی بۆ ناردن کە چادرەکانیان هەڵکەنێ‌و لەهێزیان کەم بکاتەوە، تاوای لێهات کە أبو سفیان فەرمانی گەڕانەوەو پاشەکشەی داو پاشەکشەیان کرد. لەگەڵ هەڵاتنی رۆژ موسڵمانان چاویان هەڵبڕی کەسیان نەبینی لەو کۆمەڵە سەربازەی لەبەریان وەستابوون، موسڵمانان زانیان کە ئەوە یارمەتی خوای گەورەیە بۆ ئەوان. بەو هۆیەوە بڕوایان زیادی کرد بەوەی کە لەسەر رێگای راستن ، خواش هەمیشە پشتیوانیانە لەبەرامبەر دوژمنەکانیان پێغەمبەری نازدار (ﷺ) سەیرێکی هاوەڵەکانی کرد بەدڵێکی پڕ لەهیواو متمانە بە خوا و گوتی: ((ئێستا ئێمە هێرشیان دەکەینە سەر نەوەك ئەوان)) پاشان ئەم وتەیەی گوت و هاوەڵانیشی لەدوایەوەو وتیانەوە: (( لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَه صَدَقَ وَعْدَه ونَصر عَبْدَه وأعَزَّ جُنْدَه وهَزَمَ الأحزاب وَحْدَه، لا شَيْءَ قَبْلَهُ ولا شَيْءَ بَعْدَهُ)) .

ئەگەر چی بنی قریظة ش ناپاکی کرد بەڵام تاکە کەلێن بوو کەوا تێیدا ئازاری موسڵمانان دراوە ئەگەر ئەو کەلێنەش نەبوایە لەوانە نەبوو هاوبەش دانەران بۆ ئازاردانی موسڵمانان دەرکیان بە هیچ رێگەیەك بکردایە، لەراستیدا زۆر لەبەردەم چاڵەکە راوەستان و زۆریش بە دەوری خولانەوەوو زیاترێك لەجارێك هەوڵیاندا کە رێگەیەك بدۆزنەوە پێیەوە دەربچن بۆ موسڵمانان، نەیانتوانی..بەڵام پەیمان شکاندنی بنی قریظة ویەکبوونیان لەگەڵ کۆی کۆمەڵەکانی تر، هۆکاری ئەوە بوو کە هیوای بۆ گیانی هاوبەش دانەران گەڕاندەوە، ئەم ناپاکی یەش نزیکبوو لەناوچوونی دەوڵەتی ئیسلامی لێ بکەوێتەوە، لەراستیدا گومان لەوەدا نی یە کە کاری بنی قریظة تەنها پەیمان شکاندنەکە نەبوو، بەڵکو ناپاکی‌و خیانەت بوو لەهەمان کاتدا جا دەبێ سزای ئەوانە چی بێ کە ئەم جۆرە ناپاکی یە دەکەن؟ (الرحيق المختوم).

لەبەر ئەوە كاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەخەندەق گەڕایەوە، چەكەكەی دانا، خۆی شوشت، ئینجا جبریل كە سەری دادەوەشاند لەبەر تۆزو خۆڵ هاتە لای، پێی گوت:

چەكەكەت دانا؟ سوێند بە خوا تا ئێستا چەكەكانمان دانەناوە، دەربچە بۆیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بۆ كوێ؟)) ئەوەبوو ئاماژەی بۆ بنی قریظة كرد. (رواه البخاری). پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو رۆژەی كە دەستی لەشەڕەكە بەردا لەنێوماندا هاواری كرد ((كە هیچ كەسێك نوێژی نیوەڕۆ نەكات لەبنی قریظة نەبێت)) هەندێك لەبەر لەدەست چوونی كاتەكە ترسان، ئەوەبوو لەبنی قریظة نوێژیان نەكرد، ئەوانی تر گوتیان: لەوشوێنەی كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێكردووین نەبێ لەهیچ شوێنێكی تر نوێژ ناكەین ئەگەر كاتیش بەسەرچێ، گوتی: هیچ یەكێك سەرزەنشتی ئەوەی تری نەكرد لەو دوو كۆمەڵە (متفق علیه). عائیشە رەزای خوای لێ بێت فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) زرێ یەكەی پۆشی، رێی بە خەڵكی دا كە بەڕێ بكەون‌و دەربچن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو، بەلای بنی غنیم تێپەڕی كە هاوسێی مزگەوت بوون لەدەوروبەرەكەی، پێی گوتن: ((كێ بە لاتاندا رۆی؟)) گوتیان: دِحیَةُ الكلبي بە لاماندا رۆی، دحیَةُ الكلبي لەردێن‌و ددان و دەم وچاوی بە جبریل علیه السلام دەچوو، عائیشە فەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە سەر بنی قریظةو بیست‌و پێنج شەو گەمارۆی دان، جا كاتێك گەمارۆی سەریان توندترو بەڵاكە گەورەتر بوو، پێیان گوترا: رازی بن بەبڕیاری پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەوەبوو پرسیان بە أبالبابە ی كوڕی عبدالمنذر كرد، ئەویش پێی گوتن كەوا بڕیارەكە سەربڕینە. گوتیان: بەبڕیاری سعدی كوڕی معاذ رازی دەبین، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((قایل بن بە بڕیاری سعدی كوڕی معاذ)) ئەوەبوو قایل بوون، پێغەمبەری خواش (ﷺ) بە دوای سعدی كوڕی معاذی دا نارد، سعدیان بەسواری كەرێكەوە هێنا كە كورتانێكی دروست كراو

لەتوێکڵو لفکەی دارخورما ریشاڵی لەسەربوو، سواری سەر پشتی کەرەکەیان کردبوو چونکە بریندار بوو، کە گەیشتە ئەویّ کەس و کاری دەوریاندا بۆ ئەوەی لەبەرژەوەندی ئەوان بڕیاربدات، گوتیان: ئەی باوکی عمرو! هاوپەیمانەکانتو کەس و کارو خەڵکی نەبەزییو ناسراوی تۆین. عائشە فەرمووی: ئەی چۆنە قسەیان لەگەڵ ناکات و ئاوڕیشیان لیّ ناداتەوە، تاوەکو لەماڵەکانیان نزیك بوویەوە، ئاوڕی لەکەس و کارەکەی دایەوەو گوتی: بەراستی کاتی ئەوەم هاتووە کە لەبەر خاتری خوا گویّ بەگلەیی و سەرزەنشتی لۆمەکارانە نەدەم. عائشە فەرمووی: أبو سعید گوتی: کاتێك لەپێغەمبەر (ﷺ) بەدیارکەوت گوتی: ((هەستنەوە بە تەنگ گەورەکەتانەوە بچن و دایبەزێنن)). عُمر گوتی: خوای گەورە گەورەمانە. گوتی: دایبەزێنن، جا دایانبەزاند. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((بڕیاریان لەبارەوە بدە)). سعد گوتی: من وا بڕیاریان لەسەر دەدەم، کە شەڕکەرەکانیان بکوژرێن، منداڵەکانیشیان بەدیل بگیرێن، سامانیان دابەش بکرێت، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((سوێند بە خوا بەراستی بڕیارت لەبارەوە دان، بەپێی بڕیاری خوای گەورەو بڕیاری پێغەمبەرەکەی))). (رواه أحمد وأصله فی الصحیحن).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو بۆ بازاڕی شارەکە و چەند چاڵێکی تێدا هەڵکەند، پاشان بانگی پیاوانی بنی قریظة ی کرد، ئینجا بە کۆمەڵ کۆمەڵ دوای بۆی دەرچوون کە لەگەردەنیان دەدراو فڕێدەدْرانە ناو چاڵەکانەوە، کاتێك حُییّ کوڕی أخطب یان هێنایە بەردەمو پێغەمبەر (ﷺ) چاوی پیّ کەوت حُیّی گوتی: سوێند بە خوا سەرزەنشتی خۆمم نەکردووە لەدژایەتی کردنت، بەڵام ئەوەی ململانێی خوا بکات ئەوا شکست دەهێنیّ، پاشان گوتی: ئەی خەڵکینە بە فەرمانی خوا رازیمو ئەمەش کوشتارییەکی زۆربوو کەلەسەر جووەکان سەپێنرا، پاشان بێدەنگ بوو لەگەردەنی درا.

سێ پیاویش لەبنی قریظة موسڵمان بوون، كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵنیای كردن لەگیانیان‌و كەس‌و كاروماڵیان. (زاد المعاد: ٣/١٢٠، والرحیق المختوم).

## ٢٨-عبدالله كوڕی أبی كوڕی سلول

عبدالله كوڕی أُبی كوڕی سلول سەركردەی دووڕووان بوو، یەكێك بوو لەوانەی كە زۆر رقیان لەپێغەمبەر(ﷺ) دەبۆوە، كەلەراستیدا بۆ پاراستنی خۆی ماڵەكەی بووە موسوڵمان.

*هەرچی هۆكاری دوژمنكاری یەكە بوو: ئەوەبوو كە پێش كۆچی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ مەدینە خەڵكەكەی ویستیان تاج بخەنە سەری‌و بیكەنە گەورە لەسەرخۆیان، بەڵام كەپێغەمبەر (ﷺ) كۆچی كرد وازیان لێهێنا، ئەوەبوو كە پێغەمبەر (ﷺ) بەهۆكاری لەدەست دانی دەسەڵاتەكەی زانی و لەو كاتەوە رقی لێ هەڵگرت‌و بەرگی دووڕوویی پۆشی‌و دەستی كرد بە شكاندنی موسڵمانان لەهەموو شوێنێك، لەنموونەكانی لەسەر دووڕوویی‌و ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی رەزای خوایان لەسەر بێت:

*لەوكاتەی كە گەورانی قورەیش كۆبوونەوە لەوانەی كە لەغەزای بەدر نەكوژرابوون، بڕیاریاندا كە تۆڵە لەمحمدو هاوەڵانی بكەنەوە، سوپایەكی بەهێزیان بۆ ئەوە ئامادەكرد، لەمەككەوە بەرەو مەدینە بەڕێكەوتن، كە ژمارەیان سێ هەزار جەنگاوەر بوو. ئەو هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش راپرسی بە هاوەڵانی كردو سەربەستی كردن لەوەی كە دەربچن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان و شەڕ لەگەڵ كردنیان‌و یان لەناو شارەكە بمێننەوە، ئینجا ئەگەر هاتنە ناو شار ئەوا لەوێ شەڕیان لەگەڵ بكەن، ئەوەبوو هەندێ لەموسڵمانە بەتەمەنەكان رایان وابوو دەرنەچن لەشارەكە، بە هەمان شێوە عبدالله ی كوڕی أبی كوڕی سلول لەگەڵ ئەو كەسانەبوو كە ئەو رایەیان

هەبوو، جگە لەوەی کە زۆرێکیش لەهاوەڵان لەوانەی کە بێ بەش بوون لەگەورەیی شەڕی بەدر و بەشدار نەبوون تیایدا حەزیان کرد دەربچن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێگەمان بدە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانمان، بۆئەوەی وانەزانن کە ئێمە لێیان ترساوین‌و لاواز بووین...ئەوانەی ئەم بیروڕایەیان هەبوو وازیان لەپێغەمبەری خوا (ﷺ) نەهێنا تاوەکو ڕازی بوو لەسەر ئەوەی کە ویستیان پێغەمبەریش لەگەڵیان دەربچێ، جا چووە ماڵەوە زرێکەی پۆشی‌و چەکەکەی هەڵگرت. ئەوانەی کە پێداگریان کرد لەسەردەرچوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وایان گومانبرد کە ئەوان زۆریان لێکرد کە ڕازی بێ لەسەر شتێك کە نەیدەویست، ئەوەبوو پەشیمان بوونەوە لەوەی کە کردیان، کاتێ هاتە دەرەوە بۆ لایان گوتیان: زۆرمان لێکردی ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ ئەوەی کە مافی ئەوەمان نەبوو، ئەگەر دەتەوێ مەیە دەرەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر هەر پێغەمبەرێك زرێکەی پۆشی نابێ دایبنێ تاوەکو شەڕ نەکا)) پێغەمبەر (ﷺ) لەناو هەزار هاوەڵی خۆی لەشارەکە دەرچوو کە لەگەڵی بوون، ئەمەش لەمانگی شوَّال دا بوو، ڕۆیشتن تاوەکو گەیشتنە شوێنێك لەنێوان مەدینەو ئوحود، عبدالله کوڕی أبی کوڕی سلول خۆی‌و سێ یەکی سوپاکەی لەگەڵ خۆی گەڕاندەوە، کە وۆربەیان لەدەست‌و پێوەندو هاوەڵە دووروەکانی بوون‌و دەیگوت: گوێی لەمن نەگرت‌و بەگوێی منالانی کرد، کە ڕاپرسیان پێ ناکرێ، ناشزانین لەسەر چی خۆمان بە کوشت بدەین؟ عبدالله ی کوڕی حەرام شوێنیان کەوت و سوێندی دان کە واز لەپێغەمبەرەکەیان نەهێنن، بەلام وەلامیان نەدایەوە، ئەوەبوو ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ نَافَقُوا ۚ وَقِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوِ ادْفَعُوا ۖ قَالُوا لَوْ نَعْلَمُ قِتَالًا لَّاتَّبَعْنَاكُمْ ۗ هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلْإِيمَانِ ۚ يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ۗ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ﴿١٦٧﴾﴾ آل عمران: ١٦٧ دووڕوویی و نالەباریی

دووڕووەکانیش دەربخات، کاتێك پێیان وترا: وەرن بجەنگن لە پێناوی خوادا، یان (هیچ نەبێت) بەرگری لە خۆتان و ماڵ و منداڵتان بکەن، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە شەڕو جەنگ بەرپا دەبێت ئەوە شوێنتان دەکەوتین و دەجەنگاین، ئەوانە ئەو ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان، بەدەمیان شتێك دەڵێن کە لە دڵ و دەروونیاندا نییە، خوایش زانایە بەوەی کە دەیشارنەوە... (الرحيق المختوم).

*لەغەزای بنی المصطلق عبدالله کوڕی أبی هەڵی وەرگرت لەناکۆکی نێوان دوو گەنج کە لێك زویر ببوون، لەجابرەوە ڕەزای خوای لێ بێت بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پیاوێك لەموهاجیرەکان شەقێکی لەپاشەوەی پیاوێکی ئەنصاری دا، پیاوە ئەنساریەکە گوتی: خۆزگەم بە ئەنساریەکان، موهاجیرەکەش گوتی: خۆزگەم بە موهاجیرەکان ،ئینجا کە پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لەمە بوو: ((چیتان لەنەزانی داوە)) پێیان گوت: پیاوێك لەموهاجیرەکان زللەیەکی لەپاشەوەی پیاوێکی ئەنساری داوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((وازی لێبێنن، ئەم جۆرە کارانە بۆ گەنن)) جابر گوتی: کاتێك موهاجیرەکان هاتنە مەدینە ژمارەیان کەمتر بوو لەئەنساریەکان، پاشان ژمارەی موهاجیرەکان زیادی کرد، ئەم قسەیە گەیشتە عبدالله ی کوڕی أبی کوڕی سلول، گوتی: کاری خۆیان کرد، سوێند بە خوا ئەگەر بگەڕێینەوە مەدینە ئەوا دەسەڵاتدارەکان بێ دەسەڵاتەکان دەردەکەن، کە ئیمامی عمر گوێی لەمە بوو، هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێمگەڕێ با لەگەردەنی ئەم دووڕووە بدەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((ئەی عمر، لێیگەڕێ با خەڵکی نەڵێن کە محمد هاوەڵەکانی دەکوژێت)) (متفق عليه).

لەریوایەتێکی تر: لەپێشە خۆی دووبارەی دەکردەوەو دەیگوت: سوێند بە خوا وەکو ئەوەی لێهاتووە کە دەڵێ: سەگەکەت قەڵەو بکە تا بتخوات. (أخرجه عبد بن حميد، وابن جرير).

*لەگەڵ ئەوەش: عبدالله ی کوڕی أبی کوڕی سلول ئەوپەڕی توانای خۆی بەکارهێنا بۆ برادەرایەتی کردنی جوولەکە، لەدوای ئەوەی کە بنو قینقاع پەیمانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) شکاند، ابن اسحاق گوتی: کە عاصم ی کوڕی عمری کوڕی قتادە بۆی باسکردم، گوتی: ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) گەمارۆی دان و گەمارۆکەی سەریانی نەشکاند تاوەکو هاتنە سەر قسەی ئەوو بە بڕیاری ئەو رازی بوون، عبدالله ی کوری ابی کوری سلول رووبەرووی پێغەمبەر (ﷺ) بووە و لەبەری قیت بووەوە، لەو کاتەی خوا لەناویاندا دەسەلاتی بەو دابوو گوتی ئەی محمد لەگەڵ هاوەلانم باش بە لەو کاتیش هاوپەیمانی خەزرەج بوون گووتی پیغەمبەریش(ﷺ)بەرامبەر ئەم قسەیەی خاوە خاوی کرد دووبارە گووتی ئەی محمد لەگەل هاوەلانم باش بە، پێغەمبەر (ﷺ) پشتی تیکرد جا عبداللەی کوری ابی دەستی خستە ناو زرێی پیغەمبەر (ﷺ)، پیغەمبەری خواش (ﷺ) فەرمووی وازم لێبێنە پیغەمبەری خوا ئەوەندە تووڕە بوو بەرچاوی تاریك بوو لێی، پاشان گوتی: ((قوڕت بەسەر بەرمدە)) عبدالله ی کوڕی أبی گوتی: نا والله بەرت نادەم تاوەکو چاکە نەکەی لەگەڵ هاوەلانم، چوارسەد کەسی بێ زرێو سێ سەد کەسی زرێپۆش منیان لەرەش و سوور واتە لەهەموو شتێك پاراستووە، لەیەك کاتدو پێکەوە دەیانکوژی، سوێند بە خوا من پیاوێك لەچەندەها کێشەی دونیا دەترسم چۆن ئەم هەموو هاوەڵو بەرگریکارەم بە جارێك دەکوژی، گوتی: ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: باشە نایان کوژم بۆ تۆ لێیان دەگەڕێم.

*یەکێك لەو رووداوانەش کە تیایدا ئازاری پێغەمبەری (ﷺ) داوە طبري دەگێڕێتەوە: (١١/٣٨٦): کەوا عبدالله ی کوڕی رەواحە لەگەڵ عبدالله ی کوڕی أبی و پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبوو، کاتێك محمد (ﷺ) رۆیی، عبدالله ی کوڕی أبی گوتی: بەراستی میزی کەرەکەی ئازاری داین، نەیهێشت فریشتەی سروش بێتە لامان،

جا ناخۆشی وا کەوتە نێوان عبدالله کوڕی أبی و ابن رواحە کە چەکیان لەیەکتر دەرهێنا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) هاتە لایان، ئینجا لەیەکتری جیاکردنەوە.

*هەر عبدالله کوڕی أبی بوو کە کێشەی تاوانبارکردنی عائشە رەزای خوای لێ بێت دروست کرد ، کە دەربارەی ئەم ئایەتەی خوا هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾﴾ النور: ١١ (لێرەوە قورئان دەربارەی ئەو بوختانە دەدوێت کە بۆ حەزرەتی عائیشە لە لایەن دوو ڕووەکانەوە هەڵبەسترا، هەندێك لە ئیماندارانیش بێ لێکدانەوەو تێفکران دەیانوتەوە). بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (یاخود وا خۆیان نیشان دەدا کە لە خۆتانن) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆتان (تا ئیمانداران لە دووڕووەکان جیا بێتەوە، ئیماندارانی دڵپاك وریا ببنەوە)، بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچیانە لە گەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش سەرۆك و گەورەو هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورە بۆی ئامادەیە..

والذي تَوَلّى كِبْرَهُ واتە: عبدالله ی کوڕی أبی کوڕی سلول.

مانای (إفك) واتە: درۆکردن وبۆختان هەڵبەستان بە(عائشة) لەیەکێك لەشەڕو غەزاکانی پێغەمبەر(ﷺ). لەشەوێك لەشەوەکانی ئەو شەڕە، عائیشە چوو کاری خۆی جێ بەجێ بکات، لەرێگادا ملوانکەیەکی بزرکرد، گەڕایەوە بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە، بەو هۆیەوە دواکەوت، پێغەمبەر (ﷺ) لەبەر ئەوەی پەلەی بوو فەرمانیدا لەو جێیە کۆچی بکەن، بێ ئەوەی کەس بزانێ، کە دایکمان (عائشة) لەناو کەژاوەکەدا نی یە، بۆیە ئەوانیش کەژاوەکەیان هەڵگرتو لەسەر وشترەکەیان داناو واگومانیان برد کەلەناوی دایە، پاشان زۆر بەپەلە رۆیشتن و دوای خۆیان بەجێیان هێشت. جا کاتێك

(عائشە) گەڕایەوە شوێنی کەژاوەکەی خۆیو بینی کەس لەوێ نەماوە، لەشوێنی خۆی دانیشت، دڵنیا بوو لەوەی دەگەڕێنەوە لای، ئەوەبوو خەو زۆری بۆ (عائشە) هێناو نوست، صفوان ی کوڕی معطل هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) کاری ئەوەبوو لەدوای سوپا بڕوا و ئەو شتەی ئەو کاروانە لێی دەکەوێت هەڵیبگرێتەوەو بیگەڕێنێتەوە، جا کاتێك (عائشە)ی بینی ناسیەوە، ووتی (إنا لله وإنا إليه راجعون) چەند جارێك ئەو وشانەی دووبارە کردەوە هەتا بە خەبەر هات، ئەویش وشترەکەی خۆی لێی نزیك کردەوە ، (عائشە) سواری ووشترەکە بوو، پاشان (صفوان) جڵەوی وشترەکەی گرتو لەکاتی نیوەڕۆ گەیاندیەوە مەدینە.کاتێك عبدالله ی کوڕی أبی کوڕی سلول ی دووروو وتی: ئەوە کێ یە؟ وتیان: عائشەیە، وتی: خێزانی پێغەمبەرەکەتان هەتا بەیانی لەگەڵ پیاوێك بووەو پاشان هێناویتیەوەش!

جا دووڕووەکان هەڵسان بە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵە لەبارەی عائیشەو صفوان، ئەو بوختانە گەورەیەو ئەو هەواڵە درۆیيە لەهەموو مەدینەدا بڵاوبوویەوە، هەتا سروش لەئاسمان دابەزیو بەرائەتی عائیشەی کرد لەو بوختانو درۆیە، هەروا ئەو کەسانەشی بە درۆ خستەوەو روو رەشی کردن کە هەستان بە ئەنجامدانی ئەم بوختانەو هەڕەشەی سزایەکی زۆر بە ئێشی لێکردن، (عائیشە) رەزای خوای لێ بێت خۆی ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بیویستایە سەفەرێك بکات ئەوا تیرو پشکی لەنێوان هاوسەرانی دەکرد، جا هەر یەکێکیان دەرچووبایە لەگەڵ خۆی دەبرد، لەیەکێك لەغەزایەکان تیرو پشکی کرد، من دەرچووم، پاش ئەوەی ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە لەگەڵی دەرچووم، کە لەناو کەژاوەیەك هەڵیان گرتبوم، جا رۆیشتنو نەهاتەوە تاوەکو لەغەزایەکەی بوویەوە، ئینجا گەڕایەوە نزیك مەدینە، شەوێك فەرمانی دا کۆچ بکەین، جا لەو کاتەی فەرمانی دا رۆیشتم بۆ ئەوەی قەزای حاجەتی خۆم بکەم لەشوێنێکی دوور لەسوپاکە کاتێك کارەکەم جێ بەجێ کردو

گەرامەوە لای کاروانەکە لەرێگادا دەستم دا لەسینگم بینیم ملوانکەکەم یەکێك لەمۆرییەکانی لێکەوتووە، گەڕامەوە بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە بەو هۆیەوە دواکەوتم، ئەوانی کەژاوەکەی منیان هەڵگرت ڕۆیشتن‌و کەژاوەکەی منیان لەسەر وشترەکە دانا، وایان دەزانی لەناوی دام، لەو سەردەمەدا ئافرەتان لاوازو کەم کێش بوون‌و گۆشتن نەبوون چونکە هەر یەك یان دوو لوقمە نانیان دەخوارد، جا ئەوانەی کەژاوەکەی منیان هەڵگرتبوو لەبەر سوکەیی من هەستیان نەکردبوو لەناو کەژاوەکەدا نیم، چونکە چەند کەسێك بوون، ئەگەر یەك دوو کەس بوونایە هەستیان پێ دەکرد ، لەوکاتە من ژنێکی کەم تەمەن بووم، کە ملوانکەکەم بینیەوەو گەڕامەوە شوێنی خۆم، سوپایەکە ڕۆیشتبوو کەسی لێ نەمابوو، ئەوەبوو چوومەوە ئەو شوێنەی کە لێی بووم، دەم زانی کە بەجێم نایەڵن‌و دەگەڕێنەوە دوام، جا دانیشتم‌و خەویش زۆری بۆ هێنام‌و نوستم، صفوان ی کوڕی معطل السلمی لەدواوەی سوپاکە بوو، هات هەتا نزیك بوویەوە لەجێگەکەی من بینی وا یەکێك نوستووە ، پێشتر پێش دابەزینی ئایەتی حیجاب منی بینی بوو و بەدەنگی (إنا لله إنا إليه راجعون)ی ئەو بەخەبەر هاتمەوە، چۆکی بە حوشترەکەی داداو لێی نزیك کردمەوەو منیش سواری وشترەکەی بووم، پاشان صفوان جڵەوی وشترەکەی گرت‌و بردمیەوە بۆلای سوپاکە کە لە(نهر الظهيرة ) دابەزیبوون، پاش ئەوەی کە ئەوەی کوژرابوو کوژرابوو، ئەوەی کە بوختانەکەو درۆکەی هەڵبەستابوو عبدالله ی کوڕی أبی کوڕی سلول بوو.

عائیشە دەڵێت: جا کە هاتینەوە مەدینە لەوێ نزیکەی مانگێك نەخۆش کەوتم، خەڵکیش باسی بوختانەکەی دووروەکانیان دەکرد ، بەمە زیاتر نەخۆشیەکەم زیاترو دژوارتر دەبوو، کەم لوتفیەکیشم لەپێغەمبەر(ﷺ) بەدی دەکرد، چونکە هەر ئەوەندە کە دەهات سەلامی دەکردو دەیفەرموو (چۆنی؟)،لەبارەی بوختانەکەش هیچ شتێکم نەدەزانی تاوەکو چاك بوومەوە، لەگەڵ دایکی مسطح شەو چووینە دەرەوە بۆ دەست

بە ئاو گەیاندن، دایکی مسطح ساتمەیەکی کرد، وتی: دەك مسطح بەدبەخت بی، منیش پێم وت: شتێکی زۆر خراپت وت! جوێن بە پیاوێك دەدەی بەشداری شەڕی بەدری کردبێت؟ وتی: خوشکم ئایە نازانی ئەوانە چییان وتووە؟ جا دایکی مسطح هەواڵەکەی هەموو بۆ گێڕامەوە، کە بەمە زیاتر نەخۆش کەوتم، کە گەڕامەوە ماڵی خۆم، پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لام و فەرمووی: ((ئێستا چۆنی؟)) وتم: مۆڵەتم بدە بچمەوە ماڵی باوکم. دەڵێت: دەم ویست بگەڕێمەوە ماڵی باوکم بۆ ئەوەی زیاتر لەو هەواڵە بکۆڵمەوەو زیاتر شتیان لیَ بزانم، پێغەمبەر(ﷺ) مۆڵەتی دامو جا هاتمە لای باب ودایکم، بەدایکم وت: خەڵکی لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟ وتی: زۆر خەم مەخۆ و بەزەییت بەخۆدابێتەوە، کەم ئافرەت هەیە هەوێدار بیَو خۆشەویستیش بێت لای پیاوەکەی و قسەی بۆ دروست نەکەنو گرفتی بۆ نەنێنەوە. وتم: (سبحان الله) خەڵکی ئەم هەموو شتانەیان وتووە؟ دەڵێت: جا ئەم شەوە هەتا بەیانی نەنوستم و چاوەکانم هەر فرمێسکیان دەباراند، کاتێك سروش لەوادەی خۆی دواکەوت، بۆ بەیانی هەر یەکە لەعلی کوڕی أبو طالبو أسامەی کوڕی زەیدی بانگ کردو راوێژی پی کردن لەبارەی لێك جیابوونەوەی لەگەڵ خێزانی، سەبارەت بە أسامە ئەو ئاماژەی بۆ کرد بەوەی خۆشیانی دەویستو لێیان شارەزابوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەڵاهی لەبارەی خێزانت لەباشە زیاتر هیچی زیاترم لیَ نەزانیوە، علی کوڕی أبی طالبیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ، خودا لەسەر تۆی تەنگ نەکردووەتەوە، ئافرەتانی جگە لەو زۆرن، پرسیار لەجار یەکە بکە راستیت پیَ دەڵێت: جا پێغەمبەر (ﷺ) جار یەکەی کە ناوی (بریرە) بوو بانگی کردو فەرمووی: ((بریرە هیچ شتێکت لە(عائشە) بینیوە؟)) (بریرە) وتی: نەخێر سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق رەوانەکردووە هیچ شتێکم لیَ نەبینیوە جێگەی گومان بێت، تەنها ئەوە نەبێت کە ئافرەتێکی کەم تەمەنەو بیَ ئەزموونەو لەسەر هەویر خەوی لیَ دەکەوێتو مریشکیش دێت دیخوات. جا پێغەمبەر

(ﷺ) هەر لەو ڕۆژەوە وتی: ((کێ هەقم پێ دەدات لەبارەی پیاوێك کە بوختانی بە خێزانم کردووەو ئەزیەتی داوین، وەڵاهی لەخێر زیاتر هیچ شتێکی ترم لێ بەدی نەکردووە، لەگەڵی دا پیاوێك تۆمەتبار دەکەن، کە بە هەمان شێوە هیچ شتێکی ترم لێ نەزانیوە تەنها خێر نەبێ، کە هیچ کاتێ نەچووەتە لای خێزانەکانم منی لەگەڵ دا نەبوبێ)). ((سعد)ی کوڕی (معاذ)یش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من وەڵاهی هەقت پێدەدەم لەبارەی ئەو پیاوە ئەگەر لە(أوس)یەکان بوایە لەملمان دەدا، ئەگەریش لەبرا (خەزرەج)یەکانیشمان بێت فەرمانمان بکە بۆ ئەوەی جێ بەجێی بکەین لەسەری)).

گەورەی خەزرەجیەکان کە ناوی (سعد) کوڕی (عبادە) بوو کە پیاوێکی باشیش بوو بەڵام خویەکی نەفامی گرتبوو وتی: سوێند بە خوا درۆدەکەی ناتوانی بیکوژی. (أسید)ی کوڕی (خضیر) گوتی: سوێند بە خوا درۆت کرد، وەڵاهی دەیکوژین چونکە تۆ مونافیقیو بەرگری لەمونافیقان دەکەی.

بەم جۆرە (أوس)و (خزرج)یەکان لێك هەستانەوەو ویستیان یەکتری بکوژن پێغەمبەریش (ﷺ) لەسەر مینبەر بوو هاتە خوارەوەو هێوری کردنەوە هەتا هەموو بێدەنگ بوون، (عائشە) دەڵێت: ئەم ڕۆژە هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوم‌و هەر فرمێسکم دەباراند، دایك‌و باوکیشم لەلام دانیشتبوون بەم جۆرە دوو شەوو ڕۆژێك گریام، هەتا وام زانی گریان جگەری لەت کردوم. دەڵێت: لەکاتێك باوانم هەردوکیان لەلام دانیشتبون منیش دەگریام ئافرەتێکی ئەنصاری مۆڵەتی خواست منیش مۆڵەتم داو هات لەتەکم تەنیشت‌و ئەویش دەستی کرد بە گریان، لەکاتێك ئێمە لەو حاڵەتە دابووین پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاتە ژوورەوەو دانیشت کە لەم ڕۆژەی خەڵکی ئەم بوختانەیان هەڵبەست لەلام دانیشتبوو، یەك مانگ چاوەڕێی کرد لەبارەی منەوە سروشی بۆ نەهات (عائشە) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) شایەدمانی هێناو پاشان فەرمووی (ئەی عائشە) لەبارەی تۆوە ئاواو ئاوام پێگەیشتووە ئەگەر بێ تاوان بی ئەوا

خوای گەورە تەبریەت دەکات، ئەگەریش گوناهێکت کردبێت ئەوا داوای لێخۆشبوون لەخوا بکەو بگەڕێوە لای، چونکە ئەگەر بەندەیەك دانی بە تاوانەکەی خۆی دانا پاشان تەوبەی کرد خودا تەوبەکەی قەبوڵ دەکات)).

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەوتەکەی بویەوە چیدیکە چاوەکانم فرمیسکی نەباراندو، بە باوکیشم وت: بزانە پێغەمبەر (ﷺ) دواین بڕیاری لەبارەی منەوە چییە؟ وتی: وەڵاهی نازانم چی بە پێغەمبەری خوا بڵێم.

(عائشە) دەڵێت: لەو کاتە من ئافرەتێکی کەم تەمەن بووم‌و زۆر قورئانم نەدەزانی، پێیانم وت: وەڵاهی من دەزانم ئێوە گوێ بۆ ئەو خەڵکە دەگرن‌و، ئەو شتەتان لەدەروونتدا جێگیربووەو بەراستی دەزانن، ئەگەر پێتان بڵێم من بێ تاوانم خواش دەزانێ کە من بێ تاوانم ئەوە باوەڕم پێ ناکەن، ئەگەریش دان بنێم بە تاوانێك خواش دەزانێ کە بێ تاوانم ئەوە باوەڕم پێ دەکەن، وەڵاهی هیچ نمونەیەك لەوە باشتر نیە کە بۆ خۆم‌و بۆ ئێوەی بێنمەوە لەوتەی باوکی (یوسف) بۆ کوڕەکانی: ﴿وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٍ كَذِبٍۚ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًاۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌۖ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾﴾ یوسف: ١٨براکانیشی هاتن بەهەندێ خوێنی ساختەوە کە بەسەر کراسەکەیەوە بوو (هێنایان بۆ باوکیان) ئەویش وتی: نەخێر وانیە، بەڵکو خۆتان بۆ خۆتان ئەم کارەتان سازداوە» جا چارم تەنها خۆگریی و ئارام گرتنە بەجوانترین شێوە، هەر خواش داوای کۆمەکی لێدەکرێت لەسەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن.

پاشان لەسەر جێگەکەم خۆم وەرگێڕا ئاواتم دەخواست خودای گەورە خۆی پاکێتی‌و بێ تاوانی من رابگەیەنی، بەڵام هەر لەهەمان کاتدا زۆر خۆم بە کەمتر لەوە دەزانی خودا قورئانم لەبارەیەوە دابەزێنێ، لەلایەکی تر ئاواتێکی دیکەم دەخواست کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەخەو ئاگادار بکاتەوە لەبارەی بێ تاوانی من، جا وەڵاهی

هەر لەو مەجلیسە کەس دەرنەچوو هەتا خوای گەورە سروشی بۆ دابەزاند، سروشەکە ئەوەندە قورساتی کردە سەری هەتا پەشۆك بوو ئارەقەی وەك دەنکە مرواری لەدەم و چاوی دەتکا، جا کاتێك ئەو قورساتیە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لاچوو پێکەنی و یەکەم ووشە، کە لەزاری هاتە دەرێ زتی: (ئەی عائیشە) سوپاس و ستایشی خودا بکە چونکە پاکی و بەرائەتی تۆی کرد)). دایکم پێی ووتم: برۆ هەستە بۆ لای پێغەمبەری خوا برۆ. وتم: نەخێر وەڵاهی ناچم بۆ لایی و سوپاسی کەس ناکەم تەنها خوای پەروەردگار نەبێ، جا خوای گەورە ئەو ئایەتانەی دابەزاند لە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾﴾ النور: ١١ کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند لەبارەی پاکی و بەرائەتی من (ابوبکر)ی (صدیق) –رەزامەندی خوای لێ بێ – کە یارمەتی (مسطح)ی کوڕی (أثاثة)ی دەدا کە یەکێك بوو لەخزمەکانی. وتی: وەڵاهی چیتر یارمەتی (مسطح) نادەم لەپاش ئەوەی باوەڕی کرد بەو تومەتەی بە (عائشە)یان هەڵبەستا.خوای گەورە ئەم فەرمایشتەی خۆی دابەزاند : ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُو۟لُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ النور: ٢٢ (ابوبکر) وتی: بەڵێ: وەڵاهی حەزدەکەم خوا لێم خۆش ببێ بۆیە لەقسەکەی خۆی پەشیمان بوویەوەو دووبارە دەستی کردەوە بە یارمەتیدانی (مسطح).

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پرسیاری لەزەینەبی کچی جەحش دەکرد دەربارەی من و گوتی: ((دەرکت بە چی کردووە لەوەی بینیوتە؟) ئەویش گوتی: من گوێ و چاوی خۆم دەپارێزم لەشوێنکەوتنی عائیشە ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بە خوا ئەوەی

دەربارەی ئەویش زانیومە تەنها شتی چاك بووە. (عائیشە) دەڵێ: هەر زەینەبیش بوو کە پێیدا هەڵدەگوتم، جا خواش بە خواپەرستی یەکەی لەگوناهی بە دوور خستەوە. (متفق علیە).

*کاتێك عبدالله ی کوڕی أبی کەوتە سەرەمەرگ، عبدالله ی کوڕی هاتە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ابن عمر رەزای خوای لێبێت دەگێڕنەوە کە گوتی: ((کە کاتێك عبدالله کوڕی أبی کۆچی دوایی کرد کوڕەکەی هاتە لای پێغەمبەر(ﷺ)و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کراسەکەتم بدێ با لەناویدا بیشارمەوە، نوێژیشی لەسەر بکەو داوای لێخۆشبونی بۆ بکە. پێغەمبەری خواش (ﷺ) کراسەکەی دایێو گوتی: رێم بکە با نوێژی لەسەر بکەم، ئەویش رێی بۆ کردەوە. ئینجا کاتێك ویستی نوێژی لەسەر بکات عمر رەزای خوای لێ بێت رایکێشاو گوتی: ئەی خودا قەدەغەی نەکردووە کە نوێژ لەسەر دووڕووان نەکەی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: من لەنێوان دوو هەڵبژاردن دام، گوتی: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةٗ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٨٠﴾ التوبة: ٨٠﴾، ئەوە بوو نوێژی لەسەر کرد جا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٖ مِّنۡهُم مَّاتَ أَبَدٗا وَلَا تَقُمۡ عَلَىٰ قَبۡرِهِۦٓۖ إِنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمۡ فَٰسِقُونَ ٨٤﴾ التوبة: ٨٤ . (متفق علیە).

لەریوایەتی بوخاری هاتووە: ئینجا کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستاوەو بۆی راوەستا، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژ لەسەر ابن أبی دەکەی کە لەفلانە رۆژەو فلانە رۆژە ئەوەهاو ئەوەهای گوت - قسەکانیم بۆ دەژمارد - پێغەمبەری خواش زەردەخەنەیەك گرتیو گوتی: وازم لێبێنە ئەی عمر. ئینجا کاتێك زۆرم پێگوت گوتی: من سەربەست کراوم لەهەڵبژاردەکانو یەکێکیانم هەڵبژارد. ئەگەر بزانم لەحەفتا جار

زیاتر داوای لێخۆشبوونی بۆ لەخوا بکەم ببەخشرێ سوێند بە خوا لەحەفتا جاریش زیاتر داوای لێخۆشبونم بۆی دەکرد. دەڵێ: ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی لەسەر کرد، پاشان رۆیو هیچ نەمایەوەش لەوێ مەگەر کەمێك نەبێ تاوەکو ئەم دوو ئایەتەی سورەتی (براءة) هاتە خوارەوە کە یەکێکیان ئەم ئایەتە بوو ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾ التوبة: ٨٤ عُمر دەڵێ: لەپاش ئەوە سەرم سوڕما لەنەترسانم لەپێغەمبەری خوا(ﷺ)، جا خواو پێغەمبەرەکەشی بەوە زاناترن)).

*لەجابرەوە رەزای خوای لێ بێت دەگێڕنەوە کە دەڵێ: ((پێغەمبەر (ﷺ) هاتە لای عبدالله ی کوڕی أبی دوای ئەوەی شاردرایەوە، ئینجا دەریی هێناو هەندێك لەلیکی خۆی پێدا پڕژاندو، کراسەکەی خۆشی لەبەر کرد)) . (متفق علیه).

## ٢٩- مسیلمة الكذاب

مسیلمة الكذاب: یەکێکە لەوانەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان کرد، ناوی خۆشی نا رحمن الیمامە واتە: (بەخشندەی شاری یەمامە) جا خوا بەرگی درۆی خستە بەرو بە درۆش ناوبانگی دەرکرد، ناوی بە مسیلمة الكذاب نەبایە، نەدەهێنرا وایلێهات کە نموونەی پێ دەهێنرایەوە لەدرۆ کردن لەشارو دێیو بیابان.

*لە (ابن عباس)ەوە گێڕدراوەتەوە دەڵێ: مسیلمەی درۆزن لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ غیرەتی کرد کە بڵێ: ئەگەر محمد پێغەمبەرایەتیەکە لەدوای خۆی بۆ من جێبێڵێ ئەوا شوێنی دەکەوم، لەناو خەڵکێکی زۆری قەومەکەشی هاتە لای، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ثابت ی کوڕی قیس ی کوڕی شمّاس بەرەو رووی هات پارچە لاسکێکی گەڵای دارخورماش لەناو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تاوەکو گەیشتە سەر سەری مسیلمە کە لەناو هاوەڵانی دانیشتبوو گوتی: ((ئەگەر داوای ئەو

پارچە لاسكەیەم لێبكەی پێتی نادەم، ناشتوانی لەفرمانی خوا رابكەی، ئەگەر پشتیش هەڵبكەی ئەوا بێگومان خوا لەناوت دەبات، بێگومان لەخەون تۆیان پیشاندامو دەزانم تۆ ناخت چۆنە. (متفق علیە).

*ئەم خەونەش ئەوەیە كە أبو هریرە رەزای خوای لێ بێت گێڕاویەتەوەو دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((لەكاتێكدا كە لەخەوبووم، دووبازنەی زێڕم بینی هۆی بینینی ئەم دوو بازنەیە سەرنجی راكێشام، جا لەخەوما سروشم بۆهات كە فوویان لێبكەم، منیش فووم لێیان كرد، بازنەكان هەڵفڕین. ئەم دوو بازنەیەم وا لێكدایەوە كە دوو درۆزن لەدوامەوە دەردەچن، كە یەكێكیان (العَنْسِيّ) بوو، ئەوەی تریانیش (مسیلمة)ی درۆزنی شاری یەمامە بوو. (متفق علیە).

*عمرو بن العاص دوای پەیامی پێغەمبەرایەتی چووە لای (مسیلمة)ی درۆزن پێش ئەوەی موسوڵمان بێت و برادەری مسیلمە بوو لەسەردەمی نەزانی، مسیلمە گوتی: لەو ماوەیە چی هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر ئەو هاوەڵەتان؟ (عمرو) گوتی: لەراستیدا سورەتێكی كورتی بۆ هاتۆتە خوارەوە، گوتی: ئەو سورەتە كامەیە؟ گوتی: سورەتی (العصر)ە و بەسەری دا خوێندەوە، مسیلمە گوتی: منیش هاوشێوەی ئەوەم بۆ هاتۆتە خوارەوە پاشان گوتی: ((یا وبر یا وبر إنّها أنت أذنان وصدر وسائرك حفر نقر) واتە: (ئەی وبر ئەی وبر (وبر: كەروێشكێكی رۆمی یە) تەنها دوو گوێو سینگێكی، ئەوەی ترت سمێكی كون كراوە) پاشانْ گوتی: پێت چۆنە ئەی عمرو؟ (عمرو) پێی گوت: سوێند بە خوا تۆ دەزانی كە من دەزانم تۆ درۆكەی. (تفسیر ابن كثیر/سورە یونس). وە هەر لە تەفسیری ابن كثیر دا هاتووە (لەتەفسیری سورەتی –یس–) دەڵێ:

*كاتێك ویستی (مسیلمة)ی درۆزن بۆ گرتنە دەستی پێغەمبەرایەتی زیادی كرد، پێغەمبەری خوا ﷺ (حبیب بن یزید)ی لەدوا نارد بۆ ئەوەی پەشیمان بێتەوەو دەستی هەڵگرێ لەو ویستە گومڕاكەرەی ئینجا مسیلمە پرسیاری لەحبیب كرد: و گوتی: تۆ

شایەتی دەدەی کە محمد پێغەمبەری خوایە، ئەوەبوو حبیب گوتی: بەڵێ، پاشان مسیلمە گوتی: ئەدی شایەتی دەدەی کەوا من پێغەمبەری خوام، حبیب گوتی: گوێم لێت نیە، قەپاغ لەسەر گوێیەکانمن. ئەوەبوو (مسیلمە)ی نەفرەتی فرمانی بە شمشێر وەشێنەکە کرد کە (حبیب) پارچە پارچە بکات، هەر جارێکیش پرسیاری لێکرد لەوە زیاتری پێ نەگوت تاوەکو لەبەردەمی کۆچی دوایی کرد و دەیگوت: أشهد أنّ محمدا رسول الله، واتە: شایەتی دەدەم کەوا بەراستی محمد پێغەمبەری خوایە.

*ئەم ویستەی مسیلمة زیادی کرد، وای لێ هات بڕیارو فرمانی ئاراستە دەکرد بۆ قەومەکەی، لەوانە ئەوەبوو کە چووە لای پێشبینەکەرێك کە پێیان دەگوت (سجاح)، جوانی یەکەی سەرسامی کرد و بڕیاری هاوسەرگیری لەگەڵدا، ئینجا مارەیی یەکەی وا بۆ هەژمارکرد کە واجب بوونی نوێژی بەیانیو، مەغریبیان لەسەر لاببات بە گوێرەی بانگەشەکانی.

*لە(نُعیم)ی کوڕی (مسعود) ریوایەت کراوە کە دەڵێ: هەردوو نێردراوەکەی مُسیلمە هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ جا پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ((ئەگەر ئەم یاسایە نەبوایە کە نێردراوەکان ناکوژرێن ئەوا لەگەردەنم دەدان)). ئەم نوسراوەشی لەگەڵیان نوسی: ((لە(مُحمّد)ی پێغەمبەری خواوە بۆ (مسیلمة)ی درۆزن أمّا بعد: بێگومان ئەم ئەرزە مولکی خوایەو هەر کەسێکی خۆی بیەوێ هەڵی دەبژێرێو دەیکاتە میراتبەرێو پاشنە ڕۆژی باشیش هەر بۆ پارێزکارانە)) گوتی: هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ڕۆژی دوایی دەرناکەوێت تاوەکو ٣٠ درۆزن دەرنەکەون کە هەر یەکێکیان وانیشانبدات کە پێغەمبەرە)). (رواه الطبري، وأبو داود مختصرا، وقال الهيثمي في المجمع: رواه الطبراني من طريق ابن اسحاق قال: حدثني شيخ من أشجع، ولم يسمعه وسماه أبو داود: سعد بن طارق، وبقية رجاله ثقات).

*هەروەها کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە خوای گەورەو میهرەبان گەیشتەوە میحنەتی مسیلمة زیادی کرد. هەرچی ابوبکر بوو هەر هێشتا هیچی نەکردبوو سوپایەکی بەسەرکردایەتی (خالد)ی کوڕی (ولید) بۆ ئامادەکرد ڕەزای خوای لێبێت لەکۆمەڵەیەکی زۆری هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئینجا شەڕێکی بەهێزیان لەگەل کرد تاوەکو خوای گەورە لەناوی بردو لەسەر دەستی (وحشی) کوڕی (حرب) ڕەزای خوای لێ بێت کوژرا.

ئیمامی بوخاری لە(صحیح)ەکەیدا لە(وحشی) ڕەزای خوای لێ بێت ریوایەتی کردووە فەرمووی: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کردو مسیلمە خۆی دەرخست گوتم: سوێند بە خوا بۆ مسیلمە دەردەچم بەڵکو بیکوژم و هاوتایی(حمزە)ی پێ بکەم. فەرمووی: ئینجا لەگەڵ خەڵکی دەرچووم کە هێشتا مسیلمە لەسەر ئەو کارەی خۆی بوو کە لەسەری بوو، فەرمووی: بینیم وا پیاوێك لەکەلێنی دیوارێك وەستاوە وەکو وشترێکی خۆڵاوی وابوو لەبەر تۆزی شەڕەکەو پرچێکی پەرش‌و بڵاوی هەبوو، فەرمووی: ڕمەکەی خۆمم بۆ هەڵدا ، ڕمەکەم لەناوڕاستی سینگی دا تا لەنێوان شانەکانی پشتەوەی دەرچوو، پیاوێکی ئەنساریش خۆی بۆ هەڵدا بە شمشێر لەسەریدا. گوتی: ئینجا کەنیزەکێك لەسەربانی ماڵێکەوە گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، بەندە ڕەشەکە (مسیلمە)ی کوشت)).

## ٣٠-المسيح الدّجّال

وشەی المسيح لەقسەی عەرەبەکان دا بە دوو ماناوە دێت، یەکێکیان: (المسیح الدجال)ە کە سەرچاوەی گرتووە لە(الممسوح) واتە: نەماو، لەبەر ئەوەی چاوێکی نەماوە، ئەوەی تریان (المسیح عیسی) یە علیە السلام، کە بنەڕەتەکەی بە عیبرانی (مشیح)ە بە شین، بەڵام کاتێك عەرەب ئەم وشەیان بە عەرەبی کرد شینەکەیان کرد بە سین، هەروەهاش لە(زاد المسیر)ی (ابن الجوزی) هاتووە کە لە أبی عبید وەرگیراوە.

*هەروەها (المسیح الدجال) یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی ڕۆژی دوایی، لەفەرموودە(صحیح)ەکانیش داباس کراوە، لە(صحیح)ی بوخاری دا هاتووە: ((کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بردووەتە بەر خوا لەسزای گۆڕو سزای ئاگری دۆزەخ..لەبەڵای (المسیح الدجال)یش)).

*لەکتێبی (الفتن)ی (أبی نعیم بن حماد) دا هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بەر لەدەرکەوتنی (المسیح الدجال) چەند ساڵێکی دەستبڕو کارەساتبار دێنە پێش کە راستگۆ تیایدا بە درۆ دەخرێ‌و درۆزنیش بە راستگۆ دادەنرێ..)).

*لەراستی دا هەموو پێغەمبەران ئاگادارییان داوە لەبەڵای (المسیح الدجال)، ئەگەر چی چاوەڕوانی دەرکەوتنیشی نەکرێ لەو سەردەمەیان بەڵام وەکو ئاگاداربوونیان و بەزەیی‌و بە تەنگەوە هاتنیان لێی ئاگادارکراونەتەوە.

*چۆنیەتی (المسیح الدجال): المسیح الدجال چەند سیفەتێکی دیاری هەیە، لەوانە توێژە پرچێکی لوول خواردووی هەیە، چاوەکانی وەکو ترێی سەر ئاوکەوتوون، لەنێو چاوەکانی نوسراوە کافر. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((الدّجال ممسوح العین مکتوب بین عینیە کافر) واتە: چاوێکی نیەو لەنێوان چاوەکانی نوسراوە کافر، پاشان

پیتەکانی بە حینجە گوت: ك ف ر وتی: ((هەموو موسڵمانێك دەتوانی بیخوێنیتەوە)). (رواه مسلم).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((دجّال چاوی چەپی کوێرەیە، تەنکە یاخود توێژە پرچێکی هەیە، بەهەشتو دۆزەخی پێیە، ئینجا بزانن کە دۆزەخی بەهەشتەو بەهەشتەکەشی دۆزەخە)) (رواه مسلم). هەروەها پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان لەنێو چاوەکانی نوسراوە کافر، ئەو کەسە توانای خوێندنەوەی هەیە کە رقی لەکارەکانیەتی، یان هەموو بڕوادارێك دەتوانیّ بیخوێنێتەوە)). هەروەها فەرمووی: ((بزانن هیچ یەکێك لەئێوە پەروەردگاری مەزنی نابینیّ تاوەکو دەمریّ)). (رواه مسلم) لەریوایەتێکی (مسلم)یش هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((الدّجّالُ مكتوبٌ بين عينيه ك ف ر ، أي كافر)).

*(هەرچی شوێنی دەرچوونیەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((بێگومان دجّال لەئەرزێکی رۆژهەلات دەردەچێت، کە پێی دەگوتریّ: خوراسان، خەڵکانێك شوێنی دەکەون کە دەمو چاویان ئەستوورو خڕو پانە)) (صحيح رواه أحمد). هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((شەڕی دوورگەی عەرەب دەکەن، خوا بۆتانی دەخاتە سەر پشت، پاشان شەڕی فارس دەکەن، دیسان خوا ئەم دەرگایەشتان لێدەکاتەوە، پاشان شەڕی رۆم دەکەن، بەهەمان شێوە خوا دەرگای ئەویشتان لێدەکاتەوەو داگیری دەکەنْ، پاشان شەڕی (دجّال) دەکەن، خوا بەسەر ئەویشدا زاڵتان دەکات، راوی فەرمووی: ئینجا (جابر) گوتی: دجّال نایەت تاوەکو رۆم ئازاد نەکرێت. (صحيح رواه أحمد). پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((هەندیّ لەجووی ئەصبەهان دوای (دجّال) دەکەون کە ژمارەیان (٧٠) هەزارە، پشتەماڵەیان لەبەرە)) (رواه مسلم).

پێغەمبەری خوا ﷺ لەفەرمودەیەکی تر فەرموویەتی ((دجال لەڕۆژهەڵاتەوە دێت، نیەتی هاتنە ناوەوەی مەدینەیە، دێت تا دەگاتە دەوری چیای ئوحود، پاشان فریشتەکان رووی بۆ شام وەردەگێڕن کە لەوێدا لەناو دەبرێ)) (رواه مسلم).

● (دجال نە دەچێتە مەککەو نە مەدینە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((هیچ جێگەیەك نیە (دجّال) هەر دەچێتە ناوی جگە لەمەککەو مەدینە، هیچ دەرچەیەکی مەککەو مەدینەش نی یە کە چەند فریشتەیەکی بەڕێز وەستاوە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانو چاودێریی دەکەن، ئینجا (دجّال) دەچێتە ئەرزێکی شۆرەکات کە گیای لێ شین نابێت لەبەر شۆڕی ئینجا سێ بوومە لەرزە ئەرزەکە دەلەرزێنێ، هەموو بێ باوەڕو دووڕوویێك بۆی دەردەچێت)) (متفق علیه). دەڵێن: لەنێو خەڵکی ئەوە بڵاو دەکرێتەوە کە دجّال بە دیارکەوتووە ئینجا هەرچی دووڕووە بۆی دەردەچێ.

● (بەڵای دجّال) هەرچی بەڵای (دجّال)ە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ((سوێند بە خوا من لەدجّال زاناترم بەوەی لەگەڵیەتی، دوو رووباری لەگەڵە کەلەبەریان دەڕوات، یەکێك لەرووبارەکان لەئاوێکی سپی یە لەبەر چاو، ئەوەی تریان وا دەبینرێ کە ئاگرێکی کڵپەدارە، ئینجا ئەگەر یەکێك رووبەڕوویان بوویەوە ئەوا با بچێتە ناو ئەو رووبارەی کە بە ئاگر دەیبینێ و چاوی خۆی بگرێ، پاشان با سەری خۆی دانەوێنێو لێی بخواتەوە، چونکە بێگومان ئەو رووبارەی کە بە ئاگرێکی کڵپەدار دەیبینی ئاوێکی سارژدە، (دجّال)یش چاوێکی نەماوە، پێستێکی ئەستور لەسەر چاویەتی، لەنێوان چاوەکانی نوسراوە کافر، هەموو ئیماندارێك دەیخوێنێتەوە، بە خوێندەوارو نەخوێندەواریەوە)) (رواه مسلم). لەریوایەتێکی تردا هاتووە کە دەڵێ:

((بێگومان (دجّال) ئاوو ئاگری پێیە، ئینجا بزانن کە ئاگرەکەی ئاوێکی ساردە، ئاوەکەشی ئاگرە ، ئاگاداربن لەناو نەچن)).

● (خۆپاراستن لەدجّال): پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((هەر کەسێ (١٠) ئایەت لەسەرەتای سورەتی (الكهف) لەبەر بکات ئەوا پارێزراو دەبێ لە(دجّال) لەریوایەتێکی تردا هاتووە: (لەکۆتایی سورەتی الكهف)) (رواه مسلم).

● (بە زەبرترین رکابەری دجّال): أبو هريرة فەرمووی: هێشتا هۆزی (تميم)م لەسێ شتدا خۆش دەوێ، دەربارەی ئەوان لەپێغەمبەرەوەم ﷺ بیستووە کە دەیگوت: ((ئەوان بە زەبرترینی ئوممەتی منن لەسەر دجّال))(رواه مسلم).

● (مەزنترین پلەی شەهیدبوونی خەڵکی لەلای پەروەردگاری جیهانیان): لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێردراوەتەوە کە فەرموویەتی: ((کە دجّال بەدەردەکەوێ لەپێشە خۆی رووبەرووی پیاوێکی ئیماندار دەبێتەوە، چەکدارەکان دەیگرن: چەکدارەکانی دجّال، جا پێی دەڵێن: بۆ کوێ دەچی؟ ئینجا ئیماندارەکەش دەڵێ: بۆ لای ئەو کەسە دەچم کە دەرکەوتووە، چەکدارەکان پێی دەڵێن: باوەڕت بە پەروەردگاری ئێمە نیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگاری ئێمە هیچ شتێکی لێ ون نیە ئەوانیش دەڵێن: بیکوژن، دوایی هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن: ئەدی پەروەردگارتان قەدەغەی نەکردوون کە هیچ کەس بە بێ ئیزنی ئەو نەکوژن، ئینجا دەیبەن بۆ لای دجّال، کە کاتێك ئیماندارەکە بینی دەڵێ: ئەی ئەخەڵکینە، ئەوە ئەو (دجّال)ەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە، دجّال فەرمان دەکاتو لەسەر زگ درێژ دەکرێ، دەڵێ: بیبەنو سەرو دەمو چاوی بشکێننو برینداری بکەن، جا لەهەموو لایەکی پشت و سکی دەدرێ، دجّال دەڵێ: باوەڕم پێ نایەنێ؟ ئەویش دەڵی: تۆ (المسيح)ی درۆزنی، فەرمان دەکرێ بەوەی کە بە مشار لەتۆقی سەریەوە تاوەکو نێو لاقەکانی لێك جیابکرێنەوە، پاشان (دجّال) بە نێوان دوو پارچەکەدا دەڕوات، دوایی پێی دەڵێ: هەستەوە، ئەویش بە فەرمانی خوا راست دەبێتەوە، پاشان دجّال پێی دەڵێ: ئیمانم پێ دەهێنی؟ ئەویش پێی دەڵێ: هیچم زیاتر نەکردووە لەتۆ ئەوە نەبێ کە بەرچاو روونتر بوومە. پاشان

دەڵێ: ئەی خەڵکینە بزانن ئەوەی بە منی دەکات، لەدوای من بە کەسی تری ناکات لەنێو خەڵکی، دواتر دجّال دەیبات بۆ ئەوەی بیکوژێتەوە، خوای گەورە نێوانی ملو ئێسکەچەڵەمەی سەرەوەی سنگی دەکاتە مس، (دجّال) هیچ ڕێگەیەکی نامێنێ بۆ سەربڕینی، ئینجا هەردوو دەست و هەردوو پێی دەگرێو فڕێی دەدا، جا خەڵکی وادەزانن فڕێی داوتە ناو ئاگرەکە، بەڵام لەراستی دا فرێدراوەتە بەهەشت)) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئەو کەسە خاوەنی بەرزترین پلەی شەهیدی یە لەلای پەروەردگاری جیهانیان)) (مسلم/٢٩٣٨،١١٣، البخاری/٧١٣٢).

● (باسی دەعباکەو کۆتایی دجّال) هەرچی کۆتایی یەکەیەتی: کۆتایی هاتنی بەڵای دجّال بە هاتنە خوارەوەی عیسی علیه السلام دێت کە لەلای (المنارة البیضاء) لەرۆژهەڵاتی دیمەشق لەنێو دوو جلی زەردی تۆخ(المهردتین)، کەلەپەکانی دەستی لەسەر باڵەکانی دوو فریشتە داناوە، ئینجا عیسی علیه السلام لەدەرگای شاری (اللد) دەگاتە (المسیح الدجّال)و دەیکوژێ. لە(النّواس بن سمعان)ەوە، فەرمووی: بەرەبەیانێك پێغەمبەری خوا ﷺ باسی (دجّال)ی کرد و بەشێوەیەك نزمو بەرزی کردەوە وا گومانمان برد کەوا لە(طائفة النخل)ە، جا کاتێك بۆ لای چووین بەوەی زانی کە ئێمە چیمانەو گوتی: ((چیتان دەوێ؟)) گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرەبەیاندا باسی (الدجّال)ت کرد و بەشێوەیەك بەرزو نزمیت کرد وامان زانی کەوا لە(طائفة النخل)ە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((جگە لەدجّال منی ترساندووە کە توشتان بێت، ئەگەر (دجّال) بەدەرکەوت، لەکاتێکدا من لەناوتانم ئەوا بێ ئێوە رکابەری دەکەم، ئەگەریش بە دەرکەوتو لەناوتان نەبووم، ئەوا هەر کەسێك بەرپرسیاری خۆیەتی، خوای گەورە رابەری منە لەسەر هەموو موسڵمانێكو ئەو یارمەتی بەندەکانی دەدات، بێگومان (دجّال) گەنجێکە توێژە پرچێکی تەنکی هەیە، کۆرەیە، هەروەکو ئەوەی کە لەگەڵ (عبدالعُزّی بن قطن) بەراوردی بکەم، جا گەر هەر کەسێ لەئێوە پێی

گەیشت ئەوا بە چەند ئایەتێکی سەرەتای سورەتی الکهف بخوێنێ، بێگومان ئەوەش بزانن کە ئەو کتو مت لەنێوان عێراقو شام بە دەردەکەوێت، دواتر لەراستو چەپیەوە خراپەکاری دەکات، جا خۆاگر بن ئەی بەندانی خوا)). گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا جا چەند دەمینێتەوە لەسەر زەوی؟ گوتی: ((چل رۆژ، رۆژێکی وەکو سالێکە، رۆژێکی وەکو مانگێکە، رۆژێکی تری وەکو حەفتەیەکە، رۆژەکانی تریشی وەکو رۆژەکانی ئێوەیە)) گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا لەو رۆژەی کە وەکو سالێکە نوێژێکی رۆژێکی ئێستامان بەسیەتی؟ گوتی: ((نەخێر، چەندێتی ماوەکەی ئەم رۆژە بخەملێنن)) گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی خێرایی یەکە چەندە لەئەرزدا؟ گوتی: ((وەکو خێرایی بارانێکە کە با بیگوزەرێنێ، دەچێتە سەر گەلێكو بانگیان دەکات بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بهێنن ئەوانیش باوەڕی پێدەهێننو وەلامی دەدەنەوە، ئینجا فەرمان بە ئاسمان دەکات کە باران ببارێنێو باران دەبارێو فرمان بە زەوی دەکاتو شینایی لێ دەڕوێت، مالاتەکانیان کە دوای نیوەڕۆ دەگەڕێتەوە گوانیان پڕ شیرترو تەنگەیان گەورەتر دەبێت لەتێرییان، دواتر دەچێتە لای قەومێکی ترو بانگێك دەکات بۆ باوەڕپێهێنانی بەلام ئەوان وەلامی نادەنەوەو بەدەم بانگەوازەکەیەوە نایەن، جا دجّال روویان لێ وەردەگێڕێو قاتو قڕی روویان تێدەکاتو هیچیان بە دەست نامێنێ لەو سەروەتو سامانەی هەیانبوو، هەروەها بەلای کاولخانەیەکدا دەڕواتو پێی دەلێ: گەنجینەکانت دەربکە، جا گەنجینەکانی وەکو کۆمەلەی مێش هەنگوین کە چۆن بە دوای شاهەنگ دەکەون دوای دەکەون، پاشان داوا لەپیاوێکی زۆر گەنج دەکات کە باوەڕی پێ بێنێ، کە باوەڕی پێ ناهێنێ بە شمشێرەکەی دەیکاتە دوو پارچەی دوور لەیەك بە ئەندازەی لێدانەکەی، پاشان داوای لێدەکاتەوە کە باوەڕی پێ بهێنێ دەمو چاوی پیاوە گەنجەکە دەگەشێتەوە و پێدەکەنێو دەلێ: ئەوە چۆن دەگونجێ بۆ خوایەتی کردن، لەو کاتەدا کە ئەم پیاوە گەنجە لەسەر ئەم بارە بوو کاتێك خوا

(عیسای کوڕی مەریم)ی ناردو لەلای منارە سپی یەکەی ڕۆهەڵاتی دیمەشق لەنێو دوو جلی شێوە زەعفەران‌و بورس دێتە خوارەوە کە لەپەکانی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە، کاتێك سەری خوار دەکاتەوە پرچی دڵۆپەی ئاوی لێ دەتکێتەوە،کاتێکیش بەرزی دەکاتەوە دڵۆپە ئاوی وردە زیو ئاسای شێوە مرواری لێ دێتە خوارەوە، هیچ کافرێك بە زیندویی نامێنێ کاتێك بۆنی (عیسی علیه السلام)ی بۆ دەچێت، خۆشی لەو کاتە کۆتایی دێت کاتێك بینایی چاوی لەدەست دەدات، عیسی علیه السلام دوای دجّال دەکەوێ تاوەکو لەدەرگای شاری(لُد)ی نزیك قودس دەیگاتی‌و دەیکوژێ..)) (رواه مسلم).

●ئیمامی مسلم‌و أبو داود و الترمذي لە(الشّعبی)یەوە کە لە(فاتیمە)ی کچی (قیس) خوای لێ ڕازی بێت دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی داو فەرمووی: ((سوێند بە خوا لەڕاستی دا من ئێوەم نە بۆ مژدەپێدان‌و نە ترساندن‌و کۆنەکردۆتەوە ، بەڵکو لەبەر ئەوە کۆم کردنەوە چونکە (تمیم الداری) پیاوێکی گاور بوو جا هاتە لام‌و بەیعەتی دامیّ‌و موسڵمان بوو، هەروەها وا باسی (دجّال)ی کرد کە من بۆم باسکردبوون، ئەوەی بۆ باس کردم کە لەگەڵ ٣٠ پیاوی هۆزی (لَخْم و جُذام) سواری کەشتی یەکی دەریایی بوو، بۆ ماوەی مانگێك شەپۆلی دەریا یاری پێ کردبوون، دواتر کەشتی یەکەیان بەرەو دوورگەیەك برد کە تاوەکو ڕۆژئاوا گەیشتوونەتە ئەوێ‌و سواری بەلەمەکانی کەشتی یەکە بوونەو چوونەتە دوورگەکە، لەوێ دەعبایەکی توکنی موو زبر ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، لەبەر تووکنی پێش‌و پاشی ئەو دەعبایەیان لێك جیا نەکردووەتەوە، گوتوویانە: ئەی هاوار ئەتو چی؟ ئەویش گوتوویەتی: من (الجسّاسە)م کە گیانەوەرێکە جاسوسی بۆ دەجال دەکات، گوتیان: الجساسە چییە؟ گوتی: گەلۆ بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوە کە لەکەنیسەیە چونکە بێگومان ئەو تامەزرۆیە بۆ هەواڵی ئێوە، گوتی: کاتێك ناوی پیاوەکی بۆ هێناین ترساین لەوەی کە ئەو دەعبایە شەیتان بێ، گوتی: بە خێرایی دەرچووین بەرەو کەنیسە کە بینیمان کە پیاوێکی زەبەلاحی لێیە کە لەژیانمان دروستکراوی وا قایم کراوم نەبینیبوو. هەردوو دەستی

تاوەکو ملی‌و هەردوو چۆکی تا پاژنەکانی بە ماددەی ئاسنی داپۆشرابوو گوتمان هاوار بۆ تۆ، تۆ کێی؟ گوتی: لەراستیدا ئێوە لەهەواڵی منتان پرسیوە، جا پێم بڵێن ئێوە کێن؟ گوتیان: ئێمە کەسانێکی عەرەبین، سواری کەشتی یەکی دەریایی بووین لەناکاو شەپۆلەکان زیاد لەئاستی ئاسایی بەرزبوونەوەو بەریەك کەوتن، ئەوەبوو بۆ ماوەی مانگێك شەپۆلی دەریاکە ئەولاو ئەولای پێکردین، پاشان کەشتی یەکەمان بۆ لای ئەو دورگەیەی تۆ هێناو لەوێ وەستاندمان‌و سواری بەلەمەکانی ناو کەشتی یەکە بووین، دواتر هاتینە ناو دورگەکە و دەعبایەکی توکنی پڕ موو توشمان بوو کە پێش‌و پاشی لەبەر زۆری موو لێك نەدەکرایەوە، گوتمان: هاوار بۆ تۆ، تۆ چی؟ ئەویش گوتی: من (الجسّاسه)م. گوتمان: (الجسّاسه) چی یە؟ گوتی: برۆن بۆ لای ئەو پیاوەی کەنیسە، بێگومان ئەو تامەزرۆی زانینی هەواڵی ئێوەیە، جا ئێمەش بە خێرایی بەرەو لای تۆ هاتین و لێی ترساین‌و لەوە دڵنیا نەبووین کە نەوەکو شەیتان بێ. ئینجا گوتی: هەواڵی دارخورمای (بَیسان)م پێ بدەن چۆنە؟ گوتمان: لەچی ئەم دارخورمایە دەپرسی؟ گوتی: دەربارەی بەروبومەکەی پرسیار دەکەم تا بزانم کە بەر دەگرێ؟ پێمان گوت: بەڵێ. گوتی: بزانن کە خەریکە وای لێ بێت کە بەر نەگرێ. گوتی: دەربارەی دەریاچەی (الطّبَرِيّة) هەواڵم پێ بدەن چۆنە؟ گوتمان: دەربارەی چی ئەم دەریاچە پرسیار دەکەی؟ گوتی: ئایا ئاوی تێدایە؟ گوتیان: دەریاچەیەکی پڕ ئاوەو ئاوێکی زۆری هەیە. گوتی: هەرچی ئاوی ئەو دەریاچەیە خەریکە وشکی دەکات. گوتی: هەواڵی سەروچاوەی ئاو(زُغَر) چی یە؟ گوتیان: دەربارەی چ شتێکی ئەو سەروچاوە پرسیار دەکەی؟ گوتی: ئاو لەو سەروچاوە هەیە؟ ئایا خەڵکەکەی ئەوێ کشتوکاڵی تێدا دەکەن؟ گوتمان: بەڵێ، سەروچاوەکە ئاوی زۆرە، خەڵکەکەشی کشتوکاڵی تێدا دەکەن. گوتی: لەبارەی پێغەمبەری نەخوێندەواران هەواڵم پێبدەن چی کرد؟ گوتیان: لە(مەککە) دەرچوو لەمەدینە نیشتەجێ بوو. گوتی: عەرەب شەڕیان لەگەڵ کرد؟ گوتمان: بەڵێ. گوتی: چی پێ کردن؟ ئێمەش هەواڵی ئەوەمان پێدا کە سەرکەوتنی هێنا بەسەر ئەو عەرەبانەی کەشوێنی نەکەوتن و بە گوێی ئەویان نەکرد، پێیانی گوت: بەراستی بەو شێوەیە بوو؟ گوتمان: بەڵێ. گوتی: بزانن کە بۆ خۆیان باشترە کە

گوێڕایەڵی بکەن. منیش دەربارەی خۆمەوە هەواڵی ئەوەتان پێدەدەم کە من (المسیح)م، منیش لەسەر ئەوەم کە رێگەم پێ بدرێ کە دەربکەوم، دواتر دێمە دەرەوەو لەزەوی دا گوزەر دەکەمو گوندێك نامینێ کە نەچمە ناوی لەماوەی چل شەو جگە لەمەککەو مەدینە، چونکە هەردوو شارم لەسەر قەدەغەکراوە کە بچمە ناویان، هەر جارێك کە بمەوێ بچمە ناو یەکێکیانەوە، یان یەکێك لەدوو شارە، فریشتەیەك بەرەو رووم دێت کە شمشێرێکی رووتی بە دەستەوەیە، کە رێی چوونە ناویم لێ دەگرێ، لەرێگەی هەر یەکێکیانیش چەندان فریشتە هەن کە بەرگری لێدەکەنو چاودێری دەکەن.

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەری دەدا بەو (مِخْصَرة)[1]ی کە لەدەستی بوو دەیگوت: ئەو شارە شاری(طیبة)یە، شاری (طیبة)یە، شاری (طیبة) واتە: مەدینە ئایا باسی ئەوەم بۆ کردوون؟)) خەڵکی گوتیان: بەڵێ. ((بەراستی ئەو باسەی (تمیم) تووشی سەرسوڕمانی کردم کە یەکی گرتەوە لەو باسەی کە من دەربارەی مەدینەو مەککە بۆم کردبوون، ئاگادار بن کەوا بێگومان ئەو لەدەریای (شام)ە یان لەدەریای (بەحرەین)ە، نەخێر بەڵکو لەلای رۆژهەڵاتە، ئەوەی لەلای رۆژهەڵاتە، ئەوە لەلای رۆژهەڵاتە، ئەوە ئەوە))[2]. بەدەستی ئاماژەی بۆ رۆژهەڵات کرد. (رواه مسلم).

---

(١) مخصرة: ئەو دارە یان تووڵە یان قامچی یەیە کە لەپێشدا بە دەستی وتاربێژ یان پاشا بوو کاتێك قسەی دەکرد.

(٢) مەبەستی (دجّال)ە کە لەلای رۆژهەڵاتەوە دێت.

## ٣١- یأجوج و مأجوج

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الأنبياء: ٩٦هەتا ئەو کاتەی بەربەستەکەی (ذو القرنین) لەسەر دوو تیرەی یاجوج و ماجوج دەکرێتەوە (کە ئەمەش یەکێکە لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی کۆتای دنیا) و ئەوانە ئەو کاتە لە هەموو کون و کەلێنێکەوە بە لێشاو پەیدا دەبن و زۆر دەبن.

لە(حذیفة)ی کوڕی أسید الغفاری دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: لەکاتێك باسی شتێکمان دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، گوتی: ((باسی چی دەکەن؟)) گوتیان: باسی رۆژی دوایی دەکەین، گوتی: ((بێگومان تاوەکو دە بەڵگە نەبینن ئەوا رۆژی دوایی دەرناکەوێ)) ئینجا باسی ئەوانەی کرد: ((دوکەڵەکە، دجّال، دەعباکە، هەڵاتنی رۆژ لەرۆئاوا، هاتنە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم علیه الصلاه والسلام، یأجوج ومأجوج، سێ رۆچوون: یەکێ لەرۆژهەڵات، یەکێ لەرۆژئاوا، یەکێ لەدوورگەی عەرەب، لەدوای ئەوە ئاگرێ لەیەمەن دەردەچێ، ئەو ئاگرە خەڵکی بەرەو شوێنی زیندووبوونەوەیان دەبات))[1].

*(بنەمای دروست بوونی یأجوج و مأجوج و جۆرەکانیان): فەرموودەی زۆریان دەربارەوە هاتووە، ئەوان لەنەوەی ئادەمن، هەروەها نەوەی (یافث)ی کوڕی (نوح)ن، هەروەها سێ جۆریان هەیە:

(أ)جۆرێکیان لاشەیان وەکو درەختی (کاژ)ە، کە درەختێکی زۆر گەورەیە.

(ب)جۆرێکیان چوار باڵیان هەیە کە درێژیان چوار گەزە یان چوار باڵە.

---

( ١) (صحیح) رواة مسلم ٤/٢٢٢٦، وابن حبان ١٥/٢٠١، والترمذي ٤/٤٧٧.

(ج) جۆرێکیان گوێیەکی رادێخیو گوێ یەکەی تری بە خۆی دادەدا، ئەم فەرمودەیەش (ابن أبی حاتم) لەڕێی (شریح بن عبید)و (کعب الاحبار) ئیمامی (حاکم)یش لە(ابن عباس)ەوە گێڕاویەتیەوە (رەزای خوایان لێ بێت): ((کەوا هەندێکیان بست بستن، یان دوو بست دوو بستن، هەروەها درێژترینیان سێ بستە))[١].

ئیمامی (أحمد)و (الطبراني)یش بەشێوەیەکی مرفوع ئەم فەرموودەیەان وەرگرتووە لە(خالدی کوڕی عبدالله کوڕی حرملة) کە لەخاڵۆژنی وەری گرتووە: (( ئێوە دەڵێن دوژمن نیە، بەڵکو ئێوە هێشتا شەڕی دوژمن دەکەن تاوەکو کاتی شەڕکردنتان دێت لەگەڵ یأجوج ومأجوج، کە دەم و چاو پانن، چاو بچووكو پرچ سوورن، لەهەموو بەرزایی یەکەوە بەپەلە دێنە خوارەوە، دەم و چاویان ئەستوورە لەبەر زیادە گۆشتی و پانو بەرینە)) صحیح رواه أحمد ٢٧١/٥.

*(زۆری ژمارەی یأجوج ومأجوج): هەرچی زۆری ژمارەیانە، لەفەرموودەیەك دا (ابن حبان) لە(صحیح)ەکە (لەبەشی هەواڵەکانی پێغەمبەرﷺ دەربارەی بەڵاو رووداوەکانی تووشی ئوممەتەکەی دێت) کەلە(ابن مسعود)ەوە (رەزای خوای لێ بێت ) بەرزی کردووەتەوە، فەرموویەتی: ((بەلای کەمی یأجوج ومأجوج ١٠٠٠ وەچە لەپشتی خۆیان بەجێ دێڵن))[٢].

(ابن أبی حاتم)یش لەڕێی (عبدالله ی کوڕی عمر) ئەم فەرمودەیەی تخریج کردوە، فەرموویەتی: ((جنۆکەو مرۆڤ دە بەشن، لەم دە بەشە نۆ بەشی (یأجوج و مأجوج)ە، ئەوەی تر ئەو خەڵکەیە بە جنۆکەو مرۆڤ))[٣].

---

( ١) (موقوف) سه یری فتح الباري بكه ١٠٧/١٣، لەگەل تحفة الاحوذي ٣٥١/٦.

( ٢) (ضعیف) رواه ابن حبان :٢٤١/١٥، والسیوطي في الدرّ المنثور ٤٥٥/٥.

( ٣)(صحیح موقوفا) رواه الحاكم ٥٣٦/٤، وصححه، ووافقه الذهبي في التلخیص وقال: حدیث صحیح، قلت: وأمثاله لا یقال بالرأي وله حكم المرفوع والله تعالی أعلم.

هەروەها لە(أبی هریرە)ەوە رەزای خوای لێ بێت گێڕدراوەتەوە لەپێغەمبەری خواوەﷺ گوێی لێبووە فەرموویەتی: ((هەموو رۆژێ چاڵ هەڵدەکەنن تاوەکو نزیك ببنەوە لەبینینی تیشکی خۆر، ئینجا دەڵێن: بەیانی بۆ هەڵکەندنی دەگەڕێینەوە، جا کە دەگەڕێنەوە دەبینن زەویەکە زۆر رەقترە لەجاران، تاوەکو کاتیان دێتو خوای گەورە ویستی ئەوە دەبێت کە بۆ سەر خەڵکی بیان نێرێ، دەڵێن: بەیانی بۆی دەگەڕێینەوە إن شاء الله، جا دەگەڕێنەوە بۆ هەڵکەندنی کە چاڵەکە هەر لەسەرئەو شێوەیەیە کە لەسەری بەجێیان هێشتبوو، ئینجا هەڵی دەکەنن، پاشان دەردەچنو دێنە سەر خەڵك)) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئینجا خەڵکی لەبەریان هەڵدێنو بۆ قەلاکانیان دەچن))[1].

*(هەرچی دەرچوون و خراپەکاریو لەناوچوونیانە): ئیمامی مسلم دەربارەی حاڵی یأجوج ومأجوج کە دەردەکەون فەرموودەیەکی هێناوە کە لەفەرموودەی (النّواس بن سمعان) دایە دوای باسی دجّالو لەناوچوونی لەسەر دەستی عیسی علیه السلام و هاوەڵانی، کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((پاشان عیسی علیه السلام دەچێتە لای گەلێك کە خوای گەورە لەدجّال بە دووری گرتوون، دەست بە دەمو چاویان دادێنێ و باسی پلەکانیان دەکات لەبەهەشت، لەو کاتەدا خوا سروشی بۆ عیسی علیه السلام ناردو وتی: چەند بەندەیەکم ناردووەتە سەر زەوی کەس ناتوانێ لەگەڵیان بجەنگێ، جا ئەی عیسی ئەو خەڵکەم هاندە کە بچنە کێوی (طور)، جا خوای گەورە یأجوج و مأجوج دەنێرێ ﴿وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٍ يَنسِلُونَ ﴿٩٦﴾﴾ الأنبياء: ٩٦ جا بەشی

---

( ١) (صحيح) رواه الترمذي فيسننه ٣١٣/٥، والحافظ ابن حجر في الفتح ١٠٨/١٣ وقال: ورجاله رجال الصحيح، إلا أن قتادة مدلس وقد رواه بعضهم عنه، فأدخل بينهما واسطة، أخرجه ابن مردويه، لكن وقع في التصريح في رواية سليمان التيمي عن قتادة، بأن أبا رافع حدثه، وهو في صحيح ابن حبان..وذكر له طرقا، فالجملة الحديث ثابت صحيح والله أعلم.

یەکەمیان دەچنە سەر دەریاچەی (طبريّة)و ئەو ئاوەی تێیدایە هەمووی دەخۆنەوە، بەشەکەی تریشیان دەڕۆن بۆ ئەوەی ئاوی تێدا بخۆنەوە بەڵام دەبینن بە تاڵ بووەو دەڵێن: سوێند بە خوا ئاو لەو دەریاچەیە هەبووە، ئینجا ژیانی عیسی علیه السلام و هاوەڵانی وا تەنگ دەبێ کە سەری مانگایەکیان لەلا باشتر دەبێ لەسەد دیناری ئەورۆ بۆ ئێوە، ئینجا عیسی علیه السلام و هاوەڵانی داوای ئەوە دەکەن کە خوای گەورە لەناویان ببات‌و خوای گەورەش جۆرە کرمێکیان دەنێرێتە سەر کە ملیان دەگرن و دەیانکوژن، جا هەموویان وەکو مردنی یەك کەس لەناو دەچن.

پاشان (عیسی)ی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی دێنە سەر ئەرزەکە، کە دێن تەنها بستێکیش لەو ئەرزە نابینن کە پڕ لە بۆگەنی بەزیان نەبووبێ، عیسی (علیه السلام) و هاوەڵانیشی داوا لەخوا دەکەن کە رزگاریان بێ لەو بۆنە، ئینجا خوای گەورە باڵندەیەکی مل وشتر ئاسا دەنێرێ‌و کە لەشەکانیان هەڵدەگرن‌و فڕێیان دەدەنە ئەو شوێنەی کە خوای گەورە دەیەوێت، دواتر خوای گەورە بارانێك دەبارێنێ کە تەنانەت هیچ ماڵێکی کۆچەران‌و رەشماڵنشینانیش لەبەری دەرناچێت، ئینجا بەشێوەیەك زەوی دەشوات‌و پاکی دەکاتەوە کە وەکو ئاوێنەی لێ دەکات لەبەر ساف‌و پاکی پاشان فرمان بە ئەرز دەکرێ:بەروبومەکەت شین بکەو پیت‌و بەرەکەتی خۆت بگێڕەوە، لەو رۆژەدا کۆمەڵێ خەڵك، لەدار هەنار دەخۆن‌و کاسەکەشی دەکەن بە سێبەر، هەروەها شیرێش بەرەکەتی تێدەکەوێ بەشێوەیەك کەوا شیری وشتر بەشێوەیەکە بەشی کۆمەڵێکی زۆری خەڵك دەکات، سك پڕی‌و زۆر شیری مەڕیش بەشی تیرەیەك دەکات، لەکاتێك کە ئەوان وەزعیان بەم شێوەیە بوو، خوای گەورە بایەکی بۆن خۆشی هێمنیان بۆ دەنێرێ کە بەر هەنگلیان دەکەوێت‌و روحی هەموو ئیماندارو موسڵمانێك دەکێشێت، بەم شێوە تەنها خەڵکی خراپەکار دەمێنێتەوە کە وەك کەر سواری یەکتر دەبن‌و، ئینجا لەسەر ئەم کۆمەڵە خەڵکە رۆژی قیامەت هەڵدەستێت)) (رواه مسلم).

لەفەرمودەیەکی ریوایەتکراوی مسلمو هەندێ ئیمامی تر هاتووە: ((ئەم کۆمەڵە خراپەی خەڵك دەڵێن: بێگومان ئەوەی لەسەر زەوی بوو کوشتمان، ئینجا با ئەوەی لەئاسمانە بیکوژین، دواتر کە تیرەکانیان بۆ ئاسمان هەڵدەدەن، خوای گەورە تیرەکانیان بە رەنگی خوێناوی یەوە بۆ هەڵدەداتەوە)).

*لەریوایەتێکی تردا هاتووە کە دەوترێ: پاشان یەکێکیان رمەکەی دەهەژێنیۆ بۆ ئاسمان هەڵی دەدات، جا ئەم رمە بە بۆیەی خوێن بۆیان دەگەڕێتەوە بۆ تاقیکردنەوەیان وەکو فیتنەیەك، ئینجا لەم کەینو بەینە خوای گەورە کرمێك دەنێرێ کە گەردنیان دەگرێ وەکو خەنجەری کوللە دەم لەملیان دەچێتە دەرەوە، بەشێوەیەك دەمرن کە گوێ بیستی هەستیشیان نابی، ئینجا موسڵمانان دەڵێن: ئایا پیاوێك هەیە گیانی خۆی لەپێناوی ئێمە بەخت بکات بۆ ئەوەی سەیری ئەوە بکات کە ئەو دوژمنانە کردویانە، پیاوێکیان خۆی بر ئەوە یەکلادەکاتەوە بەشێوەیەك کەوا بۆ خۆی دابنێ کە ئەو دەکوژرێ، جا کە ئەم پیاوە دێتە دەرەوە دەبینی یەك لەسەر یەکیان کەوتووەو مردوون، کەوایان دەبینێ هاوار دەکات: ئەی کۆمەڵەی موسڵمانان، مژدەتان لێبێ، بەراستی خوا دوژمنانی لەکۆمەڵ کردونەتەوە، ئینجا لەشارو قەلاکانیان دێنە دەرەوەو ماڵاتەکانیان دەلەوەڕێنن))[1].

ئەوانەی لەرۆژی شەممە دەستدرێژییان کرد

## ٣٢- هاوەڵانی شەموو

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾﴾ البقرة: ٦٥ سوێند بە خوا بێگومان زانیووتانە و ئاگادارن چیمان بەسەر ئەوانەتاندا هێنا رۆژانی شەممە دەستدرێژییان دەکردو لە سنوور دەردەچوون،

---

( ١) (صحيح) رواه ابن حبان ٢٤٥/١٥، وأحمد ٧٧/٣، وأبو يعلى ٣٧٨/٢.

(لەبەر ئەوە بڕیارماندا‌و) وتمان: ببنە مەیموونی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا (بڕیار بوو جوولەکەکانی شارەکەی قەراغ دەریا - ئیلیە - ڕۆژانی شەممە تەرخان بکەن بۆ خواپەرستی و ڕاوەماسی تیادانەکەن، دیارە ماسییەکانیش هەستیان بەوە کردووە، بۆیە لەو ڕۆژەدا خۆیان نواندووە، جولەکەش بەسروشت زۆر بەتەماعن، بیریان کردەوە لە تەگبیرو فێڵێك، ئەویش بەوەی کە لە ڕۆژی هەینیدا داوو تۆڕیان بۆ بنێنەوە تا لە شەممەدا تێی بکەون، ڕۆژی یەك شەممە چی کەوتۆتە داوو تۆڕەکانەوە دەری بهێنن ﴾ هەروەها فەرمویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ النساء: ٤٧ ئەی ئەوانەی کتێبتان پێ بەخشراوە باوەڕ بهێنن بەو (قورئانەی) کە ناردوومانەو بەڕاست دانەری ئەوەی ئێوەیە، پێش ئەوەی (ڕۆژێك بێت) کە ڕووخسارانێکی (بێ دین) پان و پلیش بکەینەوە و ئاسەواری دەم و چاو نەیەڵین و بەرەو پشتی بکەین و وەکو پشتی سەری لێبکەین، یاخود نەفرینیان لێبکەین وەکو چۆن نەفرینمان لە خەڵکانی شەمموان کرد (ئەوانەی کە بەفێڵ ڕاوە ماسیان کردو فەرمانی خوایان شکاند)، بێگومان هەر فەرمانی خوایە کە هەمیشەو بەردەوام ئەنجام دراوە ﴾

لەچەند ئایەتێکی تر فەرمویەتی: ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ۙ لَا تَأْتِيهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ۙ ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ قَالُواْ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ

﴿بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ۝١٦٥ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ۝١٦٦﴾ الأعراف: ١٦٣ - ١٦٦ پرسیار لە جوولەکان بکە دەربارەی ئەو شارەی کە لەسەر قەراغی دەریا بوو، لەکاتێکدا ئەوان لە ڕۆژی شەممەدا سنووریان دەشکاند (کە بڕیار بوو ڕۆژی شەممە تەرخان بێت تەنها بۆ خواپەرستی) کاتێك لە ڕۆژی شەممەکەیاندا ماسیە گەورەکانیان بەسەر ئاوەوە بۆ دەهاتن، ئەو ڕۆژەش کە شەممەیان نەدەبوو ماسیەکانیان بۆ نە دەهات، ئا بەو شێوەیە بەهۆی یاخی بوون و لادانیانەوە تاقیمان کردنەوە. (دیارە کە هەندێك لەو جولەکانە فەرمانی خوایان شکاندووە، بەهەر فێڵێك بووە ڕاوی خۆیان کردوە، بۆیە دەستەیەك لە پیاو چاکانیان کەوتوونەتە ئامۆژگاری کردنی دەست درێژکاران) کەچی کاتێکیش دەستەیەك لەوان وتیان: بۆچی ئامۆژگاری کەسانێك دەکەن کە خوا هەر لەناوبەریانە، یان سزادەریانە بەسزایەکی توند ( لە وەڵامیاندا) وتیان: ئاخر بابەڵگەیەکی دڵسۆزی و غەمخۆری بێت بۆ لای پەروەردگارتان و بەو هیوایە ئەوان لە خوا بترسن. (١٦٤) جا کاتێك فەرامۆشیان کرد ئەوەی ئامۆژگاریان پێی کرابوو، ئێمەش ئەوانەی کە قەدەغەی خراپەیان دەکرد ڕزگارمان کردن و ئەوانەش کە ستەمیان کردو هەوڵیاندا بۆ کردنی ئەوکارە ناڕەوایە، بەسزایەکی سەخت گیرۆدەمان کردن، بەهۆی ئەوەی لە سنوور دەرچوو بوون. (١٦٥) جا کاتێك هەر سەرکەشییان کرد لەوەی کە قەدەغە کرابوو لێیان، ئێمەش پێمان وتن: ببنە کۆمەڵە مەیمونێکی سووك و ڕیسواو دوور لە ڕەحمی خوا. ﴾

کەسانی ئەم ڕووداوە، کۆمەڵێکی جوولەکە بوون، کە لەگوندێکی کەنار دەریا نیشتەجێ ببوون، لەلایەن ڕوونکەرانەوە لەسەر ناوەکەی جیاوازی هەیە، لەبارەیەوەش

گفتوگۆی زۆر كراوە، هەرچی قورئانی پیرۆزە ناوی ئەو كۆمەڵەیە نابات‌و گرنگی دەدات بە باسكردنی چیرۆكەكە لەپێناو پەند لێ وەرگرتنی.

(ابن جرير)و (ابن ابی حاتم)و (ابو الشيخ) ئەم فەرمودەیان دەركردووە كە لە(ابن عباس)ەوە دەگێڕنەوە دەربارەی ئەم ئایەتە ﴿وَسْئَلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ ﴿١٦٣﴾﴾ الأعراف: ١٦٣﴾

ئەم ئایەتە. گوتی: بێگومان ئەو خوایەی ئەو رۆژەی لەسەر نەوەكانی يعقوب عليه السلام (فرض)ی كرد، رۆژی (هەینی) لەسەر (فرض) كردوون، ئەو كەسانە لەرۆژی شەممەدا یاخی بوون‌و ئەم رۆژەیان بە گەورە گرت‌و یاخی بوون لەوەی فرمانیان پێ كرابوو، جا كاتێك كە شەممەیان تایبەتمەند كرد تیایدا تاقی كرانەوە بەراوكردنی ماسی‌و لەسەریان قەدەغەكرا، كە لەگوندێك بوون ناوی (مدين أيله) یان (طور)، جا كە رۆژی شەممە دەهات ماسی دەریای دەتەنییەوەو سەیریان دەكردن، كاتێك رۆژی شەممەش تەواو دەبوو ماسی نەدەماو تاوەكو هەمان رۆژی شەممەی هەفتەی داهاتوو نەدەبینران، كاتێكیش شەممە دەهاتەوە ماسی رووی دەكردەوە دەریاكان، پاشان پیاوێم لەناو ئەوانە هەڵسا ماسیەكی گرت‌و بەداوێك بەستیەوەو سنگێكی لەكەنار دەریا بۆ چەقاندو پاشان فرێیدایە ناو ئاو، جا كە بەیانی هاتەوە ماسیەكەی راكێشایە دەرەوەو بە نهێنی خواردی، ئەوانیدیكەش فێری ئەو كارە بوون، كەسیش لەناویان قەدەغەی نەكردن لەم كارە تەنها چەند كەسێك نەبێ، كە بە ئاشكرا قەدەغەی ئەم كارەیان كردو ئاگاداریان كردنەوە، جا كۆمەڵێك لەوان وتیانە ئەو كەسانەی قەدەغەیان كردن ﴿وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾﴾ الأعراف: ١٦٤﴾ واتە: بۆچی ئامۆژگاری گەلێك

دەکەن کەوا خەریکە خوای گەورە لەناویان ببات یان بەتوندترین سزا ئازاریان بدات، وتیان: تا لای خوای پەروەردگارتان شەرمەزار نەبین‌و بەڵکە ئەوانیش بترسن).

ئەوانە لەناوە خۆیان بوونە سێ بەش، بەشێکیان قەدەغەیان کردن‌و بەشێکیشیان وتیان: بۆچی ئامۆژگاری ئەو گەلە دەکەن و بەشێکیشیان تاوانەکەیان ئەنجامدا، ئەوانەی کە قوتاریان بوو لەسزای خودا تەنها ئەو بەشە بوون کە قەدەغەی خراپەو تاوانەکەیان کردو ئەوانیدیکەش خوای گەورە هەمووی لەناو بردن، بەیانیەك ئەوانەی، کە خوای گەورە رزگاری کردن دانیشتبوون‌و چاوەڕێی خەڵکیان دەکرد لەماڵەکانیان بێنە دەرەوە بەڵام کەسیان نەدیت ئەوان ئەو شەوە لەماڵەکانیان مابوونەوەو دەرگایان لەسەر خۆیان داخستبوو، ئەوانیش وتیان: لەوانەیە شتێکیان بەسەر هاتبێ، بڕۆن تەماشا بکەن‌و بزانن چیان بەسەر هاتووە، ئەوانیش چوون تەماشایان کردن‌و بینیان وا بووینە مەیمون‌و پیاوەکانیان دەناسینەوە، کە کێیەو بوویتە مەیمون‌و ئافرەتەکانیشیان دەناسینەوە کە کێیە بوویتە مەیمون.

(عکرمة) دەڵێت: رۆژێك هاتمە لای (ابن عباس) دەگریاو، قورئانیش لەسەر کۆشی بوو وتم: بۆچی دەگریێ؟ وتی: ئەم چەند پەڕە دەم گریێنی. ئەوانەش کە سوڕەتی (الاعراف)ە وتی: دەزانی (أیلە) چییە؟ وتم: بەڵێ. وتی: ئەوە گەڕەکێکی جوولەکەکان بوو لەرۆژی شەممە ماسی زۆر بە خور دەهاتە کەناری دەریاکەیان، پاشان ماسیەکان بزردەبوون‌و، لەشەموەکی تر بۆ دیار دەکەوتنەوە ماوەیەك ئەوهایان بەسەر برد، پاشان شەیتان وەسوەسەی خستە ناو دڵیان‌و وتی: ئێوە قەدەغە کراون لەرۆژی شەممە ماسی بخۆن لەرۆژی شەممە بیگرن‌و لەرۆژەکانی تر بیخۆن، کۆمەڵێك لەوان بە گوێی شەیتانیان کردو، کۆمەڵێکی تریش وتیان: بەڵکو قەدەغەکراون لەراوکردن‌و خواردنی ماسی لەرۆژەکانی شەممە، کۆمەڵێك بە خۆو بە ژن‌و ماڵ‌و مناڵەوە لەو تاوانە تێوە گلا، کۆمەڵێکیش خۆیان دوورە پەرێز کردو چوونە لای راست‌و، کۆمەڵێکیش

دوورکەوتەوەو خۆی لاداو چووە لای چەپو بێدەنگ بوون، راستەوانەکان وتیان: قورتان بەسەر...؟ خۆتان بپارێزن لەسزای خودا، چەپەوانەکانیش وتیان (بۆچی ئامۆژگاری گەلێك دەکەن کەوا خوای گەورە بڕیاری داوە لەناویان بباتو سزایەکی بەئێشیان بدات، راستەوانەکان وتیان: (تا لای پەروەردگارتان شەرمەزار نەبینو بەڵکە ئەوانیش بترسن) ئەگەر واز بهێنن ئەوە لامان خۆشەویسترە لەوەی لەناو بچن، ئەگەریش واز نەهێنن ئەوە با لای پەروەردگارتان شەرمەزار نەبین. جا ئەوان بەردەوام بوون لەسەر گوناهەکە، راستەوانەکان وتیان: ئەی دوژمنانی خوا خۆ تاوانەکەتان ئەنجامدا، وەڵاهی چاوەڕێ دەکەین بەیانی خوا سزای خۆی بنێریتە سەرتان جا یان لەزەوی بتانباتە خوارێ یان بەردبارانتان بکات یان بەسزایەکی تر سزاتان بدات، کە بەیانی داهات لەدەرگایان دان و بانگیان کردن بەڵام وەڵامیان نەداوە، پەیژەیەکیان داناو بەسەر دیواری شارەکە کەوتن پیاوێك تەماشای کردن و وتی: ئەی! بەندەکانی خوا بوینە مەیمونو کلکیان پێوە هاتووە! دەرگایان لێکردنەوەو چوونە لایان، مەیمونەکان خزمو کەسەکانی خۆیان لەمرۆڤەکان دەناسیەوە بەڵام مرۆڤەکان خزمو کەسەکانیان، کە ببونە مەیمون نەدەناسیەوە، مەیمونەکان دەهاتنەلای خزمو کەسەکانیانو جلو بەرگیان بۆن دەکردنو دەگریانو پێیان دەوت: ئەی ئێمە قەدەغەی ئەو کارەمان لەئێوە نەکرد؟ئەوانیش بەسەر ئاماژەیان دەکردو دەیان وت بەڵێ پاشان (ابن عباس) ئەم ئایەتەی خوێندەوە : ﴿فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾﴾ الأعراف: ١٦٥﴾ وتی: سزایەکی بە ئێش. وتی: ئەوانەی قەدەغەیان کردن رزگاریان بوو، ئەوانیتریش رزگاریان نەبوو، ئێمەش شتانێك دەبینین ئینکاری دەکەین بەڵام قسەی لەبارەی ناکەین. وتم: بە فیدات بم، ئایە وانابینی ئەوان رقیان لەوە بۆوە کە

ئەوان دەیانکرد و خۆیان دوورخستەوە لەوان و تیان ﴿مِّنۡهُمۡ لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ﴾ وتی: فەرمانی پێکردم منیش دوو پۆشاکی ئەستورم لەبەر کرد.

## ٣٣-أصحاب الاخدود

لەبارەی ئەم چیرۆکە (ابن اسحاق) وتویەتی: خەڵکی نەجران مووشریك بوون‌و بتیان دەپەرست، لەیەکێك لەو گوندانەی نزیك نەجران – نەجران شارێك بوو کە خەڵك رووی تێدەکرد– جادوو گەرێك هەبوو کوریژگەکانی خەڵکی نەجرانی فێرە سیحر دەکرد، ئەو جادوو گەرە رەشماڵێکی لەنێوان ئەو گوندەو نەجران هەڵدا، خەڵکی نەجرانیش کوریژگەکانی خۆیان دەناردە لای ئەو جادووگەرە بۆئەوەی فێرە جادویان بکات، (ثامر) یەکێك لەوانە بوو، کە کورەکەی خۆی (عبدالله) ناردی لەگەڵ کوریژگەکانی نەجران، جا ئەگەر (عبدالله) بە لای خاوەنی رەشماڵەکە برۆیشتبایا سەرسام دەبوو بە نوێژو دەوعاو عیبادەتی ئەویش لەلای دادەنیشت و گوێی بۆ دەگرت، هەتا موسڵمان بوو، خوای تاك‌و تەنیای پەرست‌و پرسیاری لێدەکرد لەبارەی شەریعەتی ئیسلام، هەتا کە شارەزابوو لێی، پرسیاری لێکرد لەبارەی (اسم الاعظم) بەڵام ئەو لێی شاردەوەو پێی وت: ئەی برازام! تۆناتوانی هەڵی بگری‌و هێشتا ئەو جۆرە تێگەیشتنەت نیە بۆ ئەم ناوە، (ثامر)یش باوکی (عبْدالله) وای دەزانی کورەکەی هەروەکو کوریژگەکانی تر دەچێتە لای جادووگەرەکە، (عبدالله)، کە زانی مامۆستاکەی متمانەی زۆری پێ نیە لێی دەترسێ، چەند تیرێکی هێنا، هەر ناوێکی خوای گەورە ، کە فێری ببوو لەسەر تیرێکی دەنوسی‌و هەر تیرێك تایبەتی کردبوو بە ناوێك پاشان هەژماری کردن‌و ئاگرێکی کردەوەو دەستی کرد بە سوتاندنی تیرەکەکان یەك لەدوای یەك هەتا، کە گەیشتە ناوی (الاسم الاعظم)و هاوێشتە ناو ئاگرەکە تیرەکە نەسوتاو هیچی لێ نەهات، جا هاتە لای

مامۆستاکەی‌و پێی وت، کەوا ئەو ناوی (الاسم الاعظم) دەزانی کە لێی شاردبۆوە، ئەویش وتی: چیە؟ وتی: ئەو ناوە ئەوەیە، وتی: چۆنت زانی؟ ئەویش سەرگوزەشتەکەی بۆ گێڕایەوە، وتی: ئەی برازام، تۆ تازە زانیت ئەو ناوە چییەو ئاگات لەخۆت بێت.

(عبدالله)ی کوڕی (ثامر) لەپاش ئەمە ئەگەر بچوبایە نەجران و یەکێکی نەخۆشی بدیتبا پێی دەوت: ئەی بەندەی خوا، ئایە دێیە سەر ئایینی من‌و خوا بە تاك بزانی خوای گەورەش شیفای نەخۆشیەکەت بدات؟ ئەویش دەیوت، بەڵێ و موسڵمان دەبوو، ئەویش دوعای بۆ دەکردو چاك دەبۆوە. هەتا کەس نەما لەنەجران لەوانەی کە نەخۆش بوون ئەوا هاتبوونە ناو ئەو دینە و چاکیش ببونەوە بە دوعای (عبدالله) بۆیان، هەتا هەواڵی گەیشتە لای پادشای نەجران‌و بانگی کردو پێی وت: تۆ خەڵکی ئەم شارەت تێك داوە و دژی ئایینی من‌و باب‌و باپیرانم وەستاوی، دەبی بتکەم بە پەندەی زەمانە، ئەویش وتی: تۆ ناتوانی ئەوە بکەی.

وتی: بەدارو دەستەکەی خۆی راگەیاند بیبەن بۆ سەر چیای بەرزو لەوێ فڕێی بدەنە خوارەوە، ئەوانیش وایان لێدەکرد، بەلام ئەو هیچی بەسەر نەدەهات، ئەم جارە ناردی بۆ رووبارەکانی نەجران، کە هەر شتێك بکەوتبایە ناوی دەخنکا، بەڵام ئەو، کە هاوێشتیانە ناوی هیچی بەسەر نەهات.

کاتێك (عبدالله) بەسەریدا زاڵبوو پێی وت: تۆ وەڵاهی ناتوانی بمکوژی هەتا باوەڕ بە خوای تاك‌و تەنها نەهێنی، ئەگەر تۆ وات کرد ئەوا دەتوانی بمکوژی، وتی: جا ئەو پادشایە بڕوای بە خوای (عبدالله) هێنا، پاشان بە گۆچانێك لەسەری (عبدالله)ی داو سەری شکاندو مرد، پاشان پادشایەکەش هەر لەجێگای ئەو مرد، خەڵکی نەجرانیش هاتنە سەر ئایینی (عبدالله)ی کوڕی (ثامر)، کە دینی عیسای کوڕی مەریەم بوو، حوکمی بە ئینجیل دەکرد، پاشان ئەوانەش هەر هەمان ئێش‌و ئازاریان دیت لەسەر ئەم

ئایینە، هەر لەو كاتەوە ئایینی نەصرانیەت كەوتە ناو نەجران، خوای گەورەش باشتر دەزانێ.

(ابن اسحاق) وتویەتی: ئەم فەرمودەیە فەرمودەی (محمد بن كعب القرظي)یەو لەگەڵ هەندێك لەخەڵكی نەجران كە لە(عبدالله بن ثامر)یان وەرگرتووە، خوای گەورەش باشتر دەزانی كە چیبووەو چی روویداوە.

(ذو نواس) بە خۆیو بە سەربازەكانی هەڕەشەی لەخەڵكی نەجران كرد، كە ببنە جولەكە ، سەرپشكی كردن لەنێوان ئەوەو كوشتندا، ئەوانیش كوشتنیان هەڵبژارد ، ئەویش هەڵسا چاڵی زۆر گەورەی هەڵكەند لەزەویو ئاگری تێدا كردەوەو خەڵكەكەی سوتاندو هەندێكیشی بە شمشێر كوشتو هەتكیشی كردنو ژمارەی كوژراوەكان نزیكەی بیست هەزار كەس دەبوو، جا لەبارەی (ذی نواس) ئەم چەند ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، ﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ﴿٦﴾ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٨﴾﴾ البروج: ٤ - ٨.

(ابن اسحاق ) وتویەتی: دەڵێن ئەوەی (ذو نواس)ی كوشت (عبدالله)ی كوڕی (ثامر) بوو، كە گەورەو پێشەوای گەلەكەی بوو.

هاوەڵی بەڕێز (صهیب) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: لەئوممەتانی پێش ئێوە پادشایەك هەبوو، ئەو پادشایە جادووگەرێكی هەبوو، جا كاتێك جادووگەرەكە پیر بوو بە پادشاكەی وت: من پیر بوومە مردنیش نزیك بۆتەوە گەنجێكم بۆ بنێرە بۆ ئەوەی جادووی فێر بكەم پادشاكەش گەنجێكی بۆ نارد، رۆژانە ئەم گەنجە دەچوو بۆ لای جادووگەرەكە لەرێگاكەیدا خواپەرستێك هەبوو هەر كات گەنجەكە دەگەیشتە شوێنی خواپەرستەكە دادەنیشتو گوێی لێدەگرتو قسەكانی لەلا پەسند بوو، هەر

کاتێکیش بهاتبایە لای جادووگەرەکە لێی دەداو بە گەنجەکەی دەوت: بۆ درەنگ هاتووی گەنجەکەش هات بۆ لای خواپەرستەکە و سکاڵای کردو خواپەرستەکە وتی: هەر کات چووی بۆ لای جادووگەرەکە بڵێ: ماڵەوە درەنگ منیان نارد، هەر کات گەڕایتەوە بۆ ماڵەوە بڵێ: جادووگەرەکە درەنگ منی بەڕێکرد، گەنجەکە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تارۆژێکیان سەیری کرد لەسەر رێگای خەڵك ئاژەڵێکی ترسناکی گەورە رێگای لەخەڵك گرتبوو کەس نەیدەتوانی تێپەڕێ بۆیە وتی: ئەمڕۆ دەزانمو بۆم دەردەکەوێ، کە ئایە بەرنامەو مەنهەجی جادووگەرەکە راسترە یان بەرنامەی خواپەرستەکە بۆیە بەردێکی هەڵگرتو وتی: ئەی پەروەردگار ئەگەر بەرنامەو مەنهەجی ئەو خواپەرستەت لا چاکترە لەبەرنامەو مەنهەجی ئەو ساحیرە ئەوا بەم بەردە ئەم ئاژەڵە بمرێت، بەڵکو خەڵکی رزگاریان بێت و تێپەڕن گەنجەکەش بەردەکەی تێگرتو ئاژەڵەکەی کوشت ئینجا خەڵکی تێپەڕینو رزگاریان بوو، گەنجەکە بە خواپەرستەکەی وت، کە ئەو کارەی کردووە، خواپەرستەکەش وتی: رۆڵە ئێستا تۆ چاکتری لەلای خوا لەمن بەڵام تاقی دەکرێیتەوە ئەگەریش تاقی کرایتەوە ناوی منو شوێنم بەکەس مەڵێ گەنجەکەش کوێرو بەڵەکیو هەموو نەخۆشیەك دوعای بۆ دەکردو بە ئیزنی خوا چاك دەبوونەوە.

پادشا وەزیرێکی هەبوو هەردوو چاوی کوێر بوو کاتێك گوێ بیستی ئەوە بوو، کە گەنجێك هەیە دوعا بۆ کوێر دەکاتو چاك دەبێتەوە ، بۆیە دیاریو خەڵاتێکی زۆری لەگەڵ خۆی بردو چوو بۆ لای گەنجەکەو پێی وت: شیفام بدەو چاوەکانم چاك بکەوە، گەنجەکەش وتی: من کەس چاك ناکەمەوە شیفاش لای من نیە، ئەوەی کە بە تەنها شیفای خەڵك دەدا ئەوا خوای پەروەردگارە، ئەگەر باوەڕی پێ بهێنی ئەوا بۆت دەپاڕێمەوە خواش شیفات دەدات وەزیرەکەش باوەڕی هێنا بە خوای گەورەو چاوی چاك بۆوە، پاشان وەزیرەکە هات بۆ لای پادشاکەو لای دانیشت هەروەك چۆن جاران

لەلای دادەنیشت، پادشاکەش، کە بینی چاوی چاك بۆتەوە بە وەزیرەکەی وت: کێ چاوەکانی بۆ گێڕایتەوە؟

وەزیرەکەش وتی: خوای پەروەردگارم، پادشاکە وتی: جگەلەمن پەروەردگارێکی تر هەیە؟ وەزیرەکەش وتی: پەروەردگاری منو تۆ (الله)یە، ئەنجا پادشاکە بەردەوام سزاو ئەشکەنجەی وەزیرەکەی دا تا وەزیرەکە شوێنی گەنجەکەی بە پادشاکە وت، ئینجا ناردیان بە دوای گەنجەکەو هێنایان بۆ لای پادشاکە کاتێك، کە لاوەکەی بینی پێی وت: رۆڵە سیحرو جادوەکەت گەیشتۆتەئەو ئاستە، کە کوێرو ناکامو بەڵەکی چاك بکەیتەوە، گەنجەکەش وتی: من هیچ کەس چاك ناکەمەوە، تەنها خوای پەروەردگار شیفای خەڵك دەدات، ئەنجا بەردەوام سزاو ئەشکەنجەی لاوەکەیان دا تاکو شوێنی راهیبەکەی پێ وتن، ئینجا شوێنی راهیبەکەی پێ وتنو جا راهیبەکەیان هێناو پێیان وت: لەو ئایینەی خۆت پەشیمان ببەوەو بگەڕێوە، راهیبەکەش وتی: پەشیمان نابمەوە، ئەنجا مشارێکیان هێناو لەناوەراستی سەری دایان ناو کردیان بە دوو لەتەوە، دوایی وەزیرەکەیان هێناو پێیان وت: بگەڕێوە لەو دینەو پەشیمان ببەوە، وەزیرەکەش پەشیمان نەبۆوەو ئەویشیان بە مشار کرد بە دوولەتەوە، ئەم جارە گەنجەکەیان هێناو پێیان وت: بگەڕێوەو پەشیمان ببەوە لەو ئایینە کە لەسەریت، گەنجەکەش پەشیمان نەبۆوە، پادشاکە فەرمانی کرد، کە بیبەن بۆ سەرشاخێك ئەگەر پەشیمان بۆوە ئەوا بیهێننەوە، ئەگەر پەشیمانیش نەبۆوە ئەوا لەسەر شاخەکە بیخەنە خوارەوە.

کاتێك، کە گەیشتنە سەر شاخەکە گەنجەکە لەخوای پەروەردگار پاڕایەوەو وتی: خوایە بەوەی خۆت دەتەوێ رزگارم بکە لەدەست ئەوانە، جا شاخەکە لەژێریان کەوتە لەرزینو هەموو کەوتنە خوارەوە و تەنها گەنجەکە رزگاری بوو ، پاشان هەرزەکارەکە گەڕایەوە لای پادشاکە، پادشاکەش وتی: چیت لەهاوەڵەکانت کرد؟ وتی خوای گەورە لەناوی بردنو لەکۆڵ منیانی کردەوە، ئەم جارە پادشاکە فەرمانی کرد کەوا بیبەنە

ناوەڕاستی دەریا بەناو بەلەمێك، ئەگەر گەڕایەوەو پەشیمان بۆوە لەئایینەکەی ئەوە باشە ئەگەر نا تێی هەڵدەنە ناو دەریاکە، گەنجەکەش لەخوای گەورە پاڕایەوەو وتی: خوای پەروەردگار بەوەی خۆت دەتەوەێ لەناویان ببە، جا بەلەمەکە وەرگەڕاو هەموو تیایدا خنکان دووبارە گەنجەکە گەڕایەوە لای پادشاکە، پادشاکە وتی: هاوەڵەکانت چیان بەسەر هات؟ وتی: خوای گەورە لەناوی بردن. جا وتیە پادشاکە: تۆ ناتوانی من بکوژی هەتا ئەوەی من فەرمانت پێ دەکەم جێ بەجێی نەکەی، وتی: چیە؟ وتی: هەموو خەڵکی لەگۆڕەپانێك کۆدەکەیتەوەو، منیش لەکۆلکە دارخورمایەك لەخاچ دەدەی، پاشان تیرێك لەناو هەگبەی تیرەکانم دەردێنیێو داوێیە ناو کەوانو پاشان بڵێ: بە ناوی خوای ئەو گەنجە پاشان تیرەکەم تێ بگرە، ئەگەر ئەتو ئەوهات کرد ئەنجا دەتوانی بم کوژی ،جا پاشاکە هەموو خەڵکی لەگۆڕەپانێك کۆکردەوەو گەنجەکەشی لەدارخورمایەك لەخاچ داو پاشان تیرێکی لەناو هەگبەی تیرەکانی دەرهێناو لەناو کەوانی داناو پاشان وتی: بەناوی پەروەردگاری ئەم گەنجە، پاشان تیرەکەی تێ گرت دای لەنێوان چاوو گوێی گەنجەکەو دەستی خستە سەر شوێنی رمەکە بینیان مردووە. خەڵکەکە هەموو تێکڕا وتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری ئەو گەنجە هێنا، ئەنجا بە پادشاکەیان گوت: ئەی پادشا ئەوەی، کە تۆ لێی دەترسای ئەوە روویداو خەڵکی وا هەموو باوەڕیان هێنا! پادشا فەرمانیکرد چاڵ هەڵبکەننو ئاگری تێدا بکەنەوەو وتی: ئەوەی پەشیمان بۆوە ئەوا لێی گەڕێن، هەر کەسێکیش پەشیمان نەبۆوە ئەوا بیخەنە ناو ئاگرەکەوە ئەوانیش وەیان کرد، هەتا کە ئافرەتێکیان هێنا، کە منداڵێکی بچوکی لەگەڵ دابوو ، ئافرەتەکە هەندێك خۆی توند کرد لەبەر منداڵەکەی، منداڵەکە بە دایکی وت: دایە گیان ئارام بگرە تۆ لەسەر حەقی.

## ٣٤- هاوەڵانی فیل:

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ۝٥﴾ الفيل: ١ - ٥ ئایا نەتزانیووە (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پەروەردگارت چی کرد بەخاوەن فیلەکان؟! (١) ئایا سەری لیٚ نەشێواندن و پیلان و نەخشەکانیانی پووچ نەکردەوە؟! (٢) پۆل پۆل باڵندەی نەنارده سەریان؟! (٣) تا بەبەردی سەنگگڵ (وەك خشتی سوورەوە کراو)، بەرد بارانیان بکەن. (٤) سەرەنجام وەکو پووش و پەلاش و کاری خوراوی لێکردن، ﴾

پوختەی چیرۆکەکە هەروەکو، کە (ابن اسحاق) بۆمان دەگێرێتەوەو دەڵێ: ئەبرەهە قولەیسی[(١)] لەصەنعا دروست کرد، کلێسەیەکی دروست کرد، کە نمونەی کەم بوو لەو سەردەم لەسەر زەوی، پاشان نامەیەکی بۆ نەجاشی نووسی کە دەقەکەی ئەوەبوو: ئەی پادشا نەجاشی ئەوا من کلێسەیەکم بۆ دروست کردوی کە بۆ هیچ پادشایەك پێش خۆت دروست نەکراوە وازیش ناهێنم هەتا عەرەبەکان ناچار نەکەم بۆ حەج کرد بۆ ئەو کەنیسەیە، جا کە عەرەبەکان لەنێوە خۆیان باسیان لەنامەکەی ئەبرەهە کرد بۆ

---

( ١) قولەیس ئەو کلێسەیەیە کەوا ئەبرەهە ویستی عەرەبەکان لەحەج کردنیان روو لەویٚ بکەن، بۆیەش ناونراوە بە قولەیس لەبەر بڵندی بینایەکەی قەلانیسیش بەو کڵاوە دەڵێن کە دەکرێتە سەر سەران، ئەبرەهە خەڵکی یەمەنی زۆر ریسواو سەر شۆڕ کرد لەدروست کردنی ئەو کلێسەیە، زۆرێك لەبەردی روخام و بەردی تری بەنەخشی زێڕ دەهێنا بۆ کلێسەکە لەقەسری بەلقیس، کە چەند فەرسەخێك لەو کلێسەیەوە دووربوو، ئەبرەهە لەزەبرو زەنگو توندی لەسەر کرێکارەکان ئەوەبوو، کە ئەگەر کرێکارێك خۆری لیٚ هەلاتباو هێشتا نەگەیشتبایە سەر کارەکەی ئەوا دەستی دەبری.

نەجاشی عەرەبێك لە(النسأه)[1] تورەبوو، كە یەكێك بوو لەهۆزی بنی فقیم بن عدی بن عامر.

ابن اسحاق وتویەتی: كەنانی دەرچوو هەتا گەیشتە قولەیس و لەنێوی دانیشت، پاشان دەرچوو گەیشتەوە جێگای خۆی، هەواڵ درایە ئەبرەهە لەم بارەیەوەو وتی: كێ ئەوەی كردووە؟ پێی وترا: پیاوێك لەعەرەبەكان لەوانەی كە ئەهلی ئەو ماڵەنە، كە عەرەب بۆ حەج كردن بۆی دەچن كاتێك كە گوێی لەوە بوو كە تۆ دەتەوێ عەرەبەكان ناچار بكەی بێن بۆ حەج كردن بۆ قولەیس ئەویش تورەبوو هات لەناوی دانیشت بەو مانایەی كە ئەم جێگایە بۆ حەج كردن ناشێت.ئەبرەهە لەمە زۆر تورەبوو سوێندی خوارد بەوەی بڕوات ماڵی خوا لەمەككە بڕوخێنێ، پاشان فەرمانی بە حەبەشیەكان كرد و ئەوانیش خۆیان ئامادەكرد، پاشان رۆیشتن‌و فیلێكی زۆریشیان برد لەگەڵ خۆیان، عەرەبەكان ئەم دەنگ‌و باسەیان زانی بۆیە لێی ترسان و پێی قلس بوون‌و، رایان گەیاند كەوا جیهاد حەقە لەسەریان بۆ ئەوەی بەرگری لەماڵی خوا بكەن، كە ئەبرەهە دەیەوێ بیڕوخێنێ.

پیاوێك لەخەڵكی یەمەن، كە لەهەرە پیاوە خانەوادەكان‌و پادشایان بوو پێی دەوترا (ذو نفر) لەدژی ئەبرەهە وەستا بە خۆی‌و بە هەموو عەرەبەكانەوە بۆ ئەوەی بەرگری لەماڵی خوا بكەن، خەڵكێكی زۆر بە دەم بانگەوازەكەیەوە چوون، پاشان لێی چوونە

---

( ١) النسأة: بەو كەسانە دەگوترا لەناو عەرەبەكان كە گۆڕانكاریان بە مانگەكان دەكرد لەناو عەرەبەكان لەسەردەمی نەفامی، كە مانگێكیان لەمانگە قەدەغە كراوەكان حەلال دەكرد (بۆ ئەوەی خوا ئەوەی بە رەوای نەدیوە رەوای بكەن) لەشوێنی ئەو مانگەش مانگێكی تریان لەمانگە حەلالەكان حەرام دەكرد هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٧﴾ التوبة: ٣٧.

پێش‌و رووبەرووی بوونەوەو شەڕیان لەگەڵ ئەبرەهە کرد، بەڵام (ذو نفر)و هاوەڵەکانی شکان و دۆڕان و(ذو نفر) بە دیل گیرا، کاتێك ئەبرەهە ویستی بیکوژێ (ذو نفر) پێی وت: ئەی پادشا مەم کوژە لەوانەیە مانم باشتر بێت بۆت لەوەی بم کوژی، ئەویش وازی لێهێناو نەیکوشت لەلای خۆی بەندی کرد، چونکە ئەبرەهە پیاوێکی نەرم‌و لەسەر خۆ بوو.

پاشان ئەبرەهە ئەوەی بۆ دەرچوو بوو بەرێکەوت هەتا گەیشتە (خَثعم) پیاوێك بە ناوی (نفیل بن حبیب الخثعمي) لەهەردوو عەشیرەتی (خثعم) شەهران‌و ناهیس‌و ئەوەی شوێنیان کەوتن لەعەشیرەتەکانی تری عەرەب، بەرامبەر بە ئەبرەهە راوەستان‌و شەڕیان لەگەڵ کرد بەڵام ئەبرەهە توانی بیان شکێنیّ‌و نوفەیلیش بە دیل گیرا و هێنایانە لای ئەبرەهە، کاتێك ویستی بیکوژێ، نوفەیل پێی گوت: ئەی پادشا مەمکوژە، من دەبمە رێنیشاندەرت بۆ زەوی عەرەب‌و، ئەمەش هەردوو دەستی منە بۆ تۆ لەبارەی هەردوو هۆزی عەرەبی خەثعەم شەهران و ناعیسن بەوەی گوێڕایەڵیت بکەن‌و لەقسەت دەرنەچن، ئەبرەهەش نەیکوشت‌و وازی لێهێنا.

جا نوفەیل لەگەڵ ئەبرەهە دەرچوو رێی نیشاندا، هەر کە بەلای تائیفدا رۆیی ئەوا مەسعودی کوڕی موعەتتیبی کوڕی مالیکی کوڕی کەعب هاتە پێشوازی و لەگەڵ چەند پیاوێکی هۆزی سەقیف.

ابن اسحاق وتویەتی: پێیانْ وت: ئەی پادشا ئێمە گوێڕایەڵیت دەکەین‌و، هیچ خیلافێکمان لەگەڵ تۆدانیەو ماڵی ئێمە ئەو ماڵە نیە، کە تۆ دەتەویّ – مەبەستیان لات بوو – بەڵام تۆ ئەو ماڵەت مەبەستە، کە لەمەککەیەو، ئێمەش چەند کەسانێکت لەگەڵ دەنێرین رێگات نیشان بدەن، ئەویش لێی بوردن‌و وازی لیّ هێنان.

لاتیش ماڵێك بوو لەتائیف، كە بەگەورەیان رادەگرت وەكو كەعبە، ابن هشام وتویەتی: أبو عبیدة النحوی ئەم هۆنراوەیەی بۆ وتم، كە بۆ ضرار بن خطاب الفهري وتبوی:

وفرّت ثقیف إلى لاتها بمنقلب الخائب الخاسر

ابن اسحاق وتویەتی: (أبو دغال)یان نارد لەگەڵیدا بۆ ئەوەی رێیان نیشاندا بۆ چوونە مەككە، جا ئەبرەهە لەگەڵ أبو رغال دەرچوو هەتا گەیشتنە میغمەس[1]، كاتێك لەو شوێنە هەڵیاندا أبو رغال لەوێ مردو، عەرەبەكانیش قەبرەكەیان بەردبارن كرد، ئێستا ئەو قەبرە هەر لەمیغمەس بەردباران دەكرێ.

كاتێك ئەبرەهە لەمیغمەس هەڵیدا، پیاوێكی لەحەبەشیەكان نارد پێی دەوترا الاسود بن مقصود، كە بەسواری ئەسپێك رۆیی هەتا گەیشتە مەككە، جا ماڵو سامانی ئەهلی توهامەو جگە لەوەش بردو دووسەد وشتری عبدالمطلبیشي برد، كە ئەو كات ئەو گەورەو ریش سپی قورەیش بوو، قورەیش و كینانەو هوزەیل و ئەوەی لەحەرەم بوون ویستیان شەڕی لەگەڵ بكەن، پاشان بۆیان دەركەوت، كە توانای رووبەروو بوونەوەیان نیە، بۆیە بۆی دەرنەچوون.

ئەبرەهە حناطة الحمیری ناردە مەككەو پێی وت: پرسیار لەگەورەو ریش سپی ئەو شارە بكەو، پاشان پێی بڵێ: كەوا پاشا ئەبرەهە نەهاتووە شەڕ لەگەڵ ئێوە بكات، بەڵكو هاتووە ئەو كەعبە بڕوخێنێ ئەگەر نەبنە رێگر لەبەردەمی ئەوا ئەو پێویستی بە خوێن رشتنی ئێوە نیەو، ئەگەریش مەبەستی شەڕكردنیشی نەبوو لەگەڵم ئەوە بیهێنە بۆ لام.جا كە حناطة چووە ناو مەككە، پرسیاری لەگەورەو ریش سپی مەككە كرد و پێیان وت: كەوا عبدالمطلب ی كوڕی هشام ی كوڕی عبدمناف ی كوڕی قوصەیە،

---

( ١) میغمەس شوێنێكە لەسەر رێگای تائیف كە ٣/٢ی فەرسەخێك لەمەككە دوورە.

ئەویش چووە لای‌و ئەوەی ئەبرەهە فەرمانی پێکردبوو پێی ڕاگەیاند، عبدالمطلب پێی وت سوێند بە خوا مەبەستمان شەڕ نیە لەگەڵیداو تواناشمان نیە شەڕی لەگەڵ بکەین ئەوە ماڵی خوایەو ماڵی خۆشەویستەکەی إبراهیمە سەلامی خوای لێ بێ – ئەگەر خوای گەورە ڕێگەی پێ بگری ئەوا ماڵی خۆیەتی ئەگەریش ڕێگەی پێ نەگری، ئەوا سوێند بەخوا توانامان نیە بەرگری لەکەعبە بکەین، حناطة پێی وت: دەوەرە با بچینە لای چونکە فەرمانی بە من کردووە تۆ ببەمە لای.

عبدالمطلب چوو لەگەڵیدا، کە هەندێك لەکوڕەکانیشی لەگەڵدا بوو هەتا هاتنە ناو سەربازگەکە، پرسیاری لەذي نفر کرد ، کە پێشتر هاوڕێی بوو، هەتا، کە چووە لای بینی وا لەناو بەندیخانەدایە، پێی وت: ئەی ذي نفر: ئایە هیچ ڕێگە چارەیەکت هەیە لەوەی بەسەرمان هاتووە؟ ذو نفر پێی وت: پیاوێکی بەندکراوی وەکو من چی پێ دەکرێ کەوا چاوەڕوانی کوژرانە لەلایەن ئەبرەهە من هیچ ڕێگە چارەو چارەسەریەکم نیە لەوەی بەسەرت هاتووە ئەوەندە نەبی کەوا من أنيس ی شوفێری فیلەکە برادەرمە پێی دەڵێم، کەوا شتێکت بۆ بکات لەلای ئەبرەهە و بتباتە لای، بۆئەوەی تکات بۆ بکات ئەوەندەی پێی بکرێ، ئەویش وتی: زۆر باشە.

ذو نفر بە أنيس ی وت: عبدالمطلب گەورەو ریش سپی قوڕەیشە لەمەککە ، نانی خەڵك دەداو نانی گیاندارانیش دەدا لەشاخەکان پادشا دوو سەد وشتری لێ بردووە بزانە قەت وەناکەی وشترەکانی بۆ بگەڕینیەوە، ئەویش وتی: هەوڵی بۆ دەدەم. أنيس قسەی لەگەڵ ئەبرەهە کردو پێی وت: ئەی پادشا ئەوە گەورەو ریش سپی قوڕەیشە چاوەڕوانە لەپێش دەرگات، کە پیاوێکی خانەدانو گەورەی مەککەیە و نان دەری هەژارانەو نان دەری گیاندارانە لەشاخەکان مۆڵەتی بدەتە بێتە لات بۆ ئەوەی پێداویستیەکان لەلات باس بکات و چاکیش بە لەگەڵی، جا ئەبرەهە مۆڵەتیدا بێتە ژوورەوە.

وتويەتی: عبدالمطلب پياوێكی گەورەو جوان و گرانو سەنگين بوو، كاتێك ئەبرەهە چاوی پێ كەوت رێزی لێناو نەيويست لەخوارە خۆی دابنيشێنی،حەزيشی نەدەكرد حەبەشيەكان بيبينن كەوا لەسەر تەختی حوكم پێكەوە دانيشتوونە بۆيە ئەبرەهە لەسەر كورسی حوكم هاتە خوارەوەو لەسەر يەك مافور پێكەوە دانيشتن، پاشان وتيە تەرجەمانەكەی كەوا پێی بڵێ داواكاريت چيە؟ وتی: داواكاريم ئەوەيە پادشا دووسەد وشتری لێ بردوم بۆم بگەڕێنيتەوە، كاتێك ئەبرەهە ئەمەی گوێ لێ بوو پێی وت: من زۆر سەرسام بووم پێت كاتێك چاوم پێت كەوت، پاشان لەپێش چاوم كەم بويتەوە كاتێك ئەوە داواكاريەكەت بوو ئايە قسەم لەگەڵ دەكەی لەبارەی چەند وشترێك، كە لەتۆم بردووە، لەكاتێكدا كەعبەيەك واز لێدەهێنی كەوا دينی خۆتو بابو باپيرانتەو منيش هاتومە بيروخێنم و تۆش لەبارەی ئەوەوە هەر قسەم لەگەڵ ناكەی! عبدالمطلب پێی وت: من بەخێو كەری وشترەكانم،ماڵی خواش هەر خۆی بەرگری لێدەكات، ئەبرەهە پێی وت: كەس نيە رێگەم پێ بگری، پێی وت: دەبڕۆ خۆتو كەعبە بڕۆ بڕۆخێنە.

كاتێك عبدالمطلب لەلای ئەبرەهە هاتە دەرەوە گەڕاوە لای قورەيشو هەواڵەكەی بۆ گێڕانەوەو فەرمانی كرد كەوا لەمەككە دەربچنو خۆيان لەپەنای كێوو شاخەكان حەشار بدەن لەترسی زەبرو زەنگی سەربازەكان، پاشان عبدالمطلب هەڵساو دەستی دايە حەلقەی دەرگای كەعبە لەگەڵ پياوێكی قورەيش لەخوا پاڕانەوە بەوەی خوای گەورە بەسەر ئەبەرهەو سەربازەكانی سەريان بێخی، جا عبدالمطلب كاتێك دەستی گرتبوو بە حەلقەی دەرگای كەعبە دەيوت:

لا هُمّ إنَّ العبدج يمنعرحلَه فامنع حلالك

لا يغلبن صليبهم ومحالُهُم غدوا مِحالك

واقيدی دێرێكی تری زياد كردووە:

إن كنت تاركهُم          وقبلَتَنا فأمُر ما بدا لك

ابن إسحاق وتويەتی: پاشان عبدالمطلب حەلقەی دەرگای کەعبەی بەرداو ڕۆیشتن لەگەڵ ئەوانەی قورەیش بۆ شاخەکانی دەوروبەری مەککەو خۆیان لەناودا حەشارداو دەیانڕۆنی کەوا ئەبرەهە کاتێك دەچێتە ناو مەککە چی لێدەکات.

ئەبرەهە خۆی ئامادەکرد بۆ چوونە ژوورەوەی مەککەو فیل و لەشکرەکەی ئامادەکردو ناوی فیلەکەشی مەحمود بوو، کاتێك فیلەکەیان بەرەو مەککە برد ئەو دەمە نفیل بن حبیب الغثعمي هاتە لای فیلەکە و گوێی گرتو پێی وت: مەحمود وەرکەوەو لەکوێ هاتوی بگەڕێوە ئەوێ، چونکە تۆ لەماڵی خوای ، پاشان گوێی بەردا. جا فیلەکە دانیشتو ، نفیل بن حبیبیش سەرکەوتە سەرچیا، ئەوان لەفیلەکەیان دەدا هەتا هەستێتەوە سەر پێیان، بەڵام ئەو هەڵنەدەستاوە، ئەم جارە بە تۆبز لەسەریاندا بۆ ئەوەی هەستێتەوە سەر پێیان بەڵام هەڵنەستاوە، ئەم جارە بن زگی فیلەکەیان بە ئاسنێکی سەرخوار بریندار کرد هەتا خوێنی لێهات بۆئەوەی هەستێتەوە بەڵام هەڵنەستاوە، ڕویان وەرگێڕا بۆلای ڕاست هەستاوەو ڕۆیی بەڵام ڕویان وەرگێڕا بۆ لای شام وەکو جارانی کردەوە، بۆ لای ڕۆهەڵاتیان وەرگێڕا هەڵساوە ڕۆیشت بەڵام بۆ لای مەککەیان وەرگێڕا یەکسەر دانیشت. خوای گەورە لەدەریاوە باڵندەیەکی بۆ ناردن وەك شەمشەمە کوێرە وابوون، هەر باڵندەیەك سێ بەردی هەڵگرتبوو بەردێك بە دەنوکیو دووبەردەکەی تریش بە پێیەکانی، کە قەبارەیان وەك نیسكو نۆك دەبوو، ئەم بەردانە بەهەر یەکێکیان بکەوتبایە لەناوی دەبرد.

جا هەڵاتنو لەو ڕێگایە دەگەڕان، کە لێوەی هاتبوونو پرسیاریان لەنفیل بن حبیب کرد بۆ ئەوەی ڕێگای یەمەنیان نیشان بدات، جا نفیل کاتێك بینی خوای گەورە ئەوهای بەسەرهینان وتی:

أيــن المفــر والإلـــه الطالـــب والأشـرم المغلـوب لـيس الغالـبُ
ألا حييــت عنّــا يــا رُدَيْنــا نَعِمْنــاكُمْ مــع الإصــباح عينــا
أتانــا قــابِسٌ مــنكم عــشاء فلــم يقــدر لقابِــسِكُم لَــدَينا
رُدَيْنــة لـــو رأيـــتِ ولاتريْــهِ لـدى جَنـب المحـصب مـا رأينـا
لَعَـــذَرتني وَحَمِـــدتِ امـــري ولم تأسـي علـى مـا فـات بيْنـا
حَمِــدتُ الله إذا أبــصرت طــيرا وخِفـتُ حجـارة تُلقـى علينـا
وكـــل القـــومِ تـــسألُ نُفيـــل كــأنَّ علــيَّ للحُبــشانِ دينــا

جا، که لەمەککە دەرچوون بەرەبەرە لەسەر رێگاکان دەکەوتنە خوارەوە،ئەبرەهەش برینداربوو، هەرجارەو پەنجەیەکی هەڵدەوەراو دوایی کێم وخێزاوی لێدەهات، هەتا گەیاندیانەوە صەنعاء که وەکو جوجکەیەکی لێهاتبوو دوایی مرد.

ابن اسحاق وتویەتی: یەکەم جار کەوا نەخۆشی خوریکە لەزەوی عەرەبەکان پەیدابوو ئەوا لەو ساڵە بوو یەکەمین جاریش کەوا داری حەرمەڵو گوژارك پەیدابوون کەوا لەدارە تام تاڵەکانن ئەوا لەم ساڵە بوو.

ابن هشام وتویەتی: الابابیل کۆیە عەرەبەکان بە تاك ناویان نەهێناوە تەنها بە کۆمەڵو کۆ نەبێ، (سجیل)یش واتە: توندو پتەو.

ابن اسحاق وتویەتی: کە لەعائیشەوە نەقلی دەکات، کەوا وتویەتی: شوفێری فیلەکەم بینی لەمەککە کە هەردوو چاوی کۆرەببوو دەرۆزەیان دەکرد.

## ٣٥-بکوژی (عمار)ی کوڕی (یاسر)

أبوغادیه وتویەتی: کاتێك عمّار بن یاسر کوژرا ئەم هەواڵەیان بە (عمرو بن العاص) ڕاگەیاند، ئەویش وتی گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو ﷺ فەرمووی: ((بکوژی عمّار لەنێو ئاگرە)). بە عەمریان وت: ئەی تۆ وا شەڕی لەگەڵ ناکەی! وتی: پێغەمبەر فەرمویەتی: ئەوەی دەیکوژێ‌و شت‌و مەکەکەشی بە تالان دەبات . (حدیث صحیح رواه أحمد).

مەناوی وتویەتی: کۆمەڵی موعاویە عماریان کوشت لەپێکدادانی صفین، کە عادیە الجهینی بەرمێك لێیداو کەوتە خوارەوە، ئەم جارە یەکێکی تر هات سەری لێ کردەوەو بردیانە لای عمرو بن العاص، کە هەریەکە دەیگوت من کوشتومە. عمرو وتی: هەردوکتان بۆ ناو ئاگرن. عکرمە وتویەتی: ابن عباس بە من‌و بە عەلی کوڕی وت: بڕۆنە لای أبو سعید گوێ لەقسەکانی بگرن جا ڕۆیشتین‌و بینیمان وا أبو سعید دیوارێکی چاك دەکاتەوە، پاشان پۆشاکەکەی خڕ کردەوەو قسەی بۆ کردین، هەتا گەیشتە دروست کردنی مزگەوت‌و وتی: ئێمە خشت خشتمان هەڵدەگرت بەڵام عمّار دوو دووی دەبرد، پێغەمبەر ﷺ بینی، جا هەندێك جل‌و بەرگی لە تۆز داوەشاندو فەرمووی: ((هاوار بۆ عمّار کۆمەڵێکی دەرچوو لەحەق دەیکوژن، کە ئەو بانگیان دەکات بۆ بەهەشت ئەوانیش بانگی دەکەن بۆ ئاگر)). وتی: عمّار وتی: خودایە پەنا بە تۆ دەگرم لەفیتنەو ئاشوب.

الحافظ ابن حجر لە فتح الباری وتویەتی: ئەگەر وترا کەوا کوشتنی عمّار لەپێکدادانی صفین بوو، کە لەگەڵ علی بوو ئەوانەی کوشتیان لەگەڵ معاویە بوون و کۆمەڵێك لەهاوەڵانیشیان لەگەڵدا بوون، چۆن دەکرێ دوعایان لێبکرێ بۆ ناو ئاگر؟ لەوەڵامدا: ئەوا وا گومانیان دەبرد کەوا خەڵك بۆ بەهەشت بانگ دەکەن‌و ئەوان موجتەهید بوون‌و گلەییان لێ ناکرێ لەسەر بەدواکەوتنی گومانەکانیان، جا بانگەشە کردن بۆ بەهەشت بانگەشەکردنە بۆ هۆکارەکانی کە یەکێك لەهۆکارەکان گوێڕایەڵی خەلیفەیە، عمّاریش

بانگی دەكردن بۆگوێڕایەڵی علی كەوا هەر ئەو خەلیفەی حەق بوو، ئەوانیش بانگەشەیان دەكرد بۆ شتێكی تر و پێچەوانە، كەواتە ئەوان عوزریان هەیە لەبەر ئەو لێكدانەوەیەی بۆخۆیان كردیان. والله تعالی أعلم.

## ٣٦-ئەو كەسەی دزی لەحاجیەكان دەكرد لەگەڵ ئەو كەسەی دزی لەماڵی پێغەمبەری خوا كرد ﷺ

عبدالله ی كوڕی عمر وتویەتی: رۆژگیرا لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ نوێژی كردو زۆر لەقیام راوەستا، پاشان ركوعی بردو زۆر لەمایەوە لەركوع، پاشان سەری بەرزكردەوە. (شعبە وتویەتی): وابزانم لەسوجدەش هەر وای كردو جا لەسوجدەكەی گریاو دەیفەرموو: ((خودایە بۆ بەڵێنی ئەوەم پێ دەدەی لەكاتێك من داوای لێخۆشبونت لێدەكەم، خودایە بۆچی بەڵێنی ئەوەم پێدەدەی لەكاتێك من لەناویانم)).

جا كە نوێژی كرد فەرموی: ((بەهەشتم پێ نیشاندرا، هەتا ئەگەر دەستم ببردبا بۆ ئەوەی بەر وبومەكەی لێ بكەمەوە ئەوا دەستم دەگەیشتێ، ئاگریشم پێ نیشاندرا و دەستم كرد بە فو لێكردنی لەترسی ئەوەی نەوەك گەرماییەكەی بتانگاتی، لەنێویشیدا ئەو كەسەم بینی كە دوو وشترەكەی پێغەمبەری خوای دزی لەگەڵ ئەوكەسەی كە بەرای بنی دُعدُع بوو دزی لەحاجیەكان دەكرد، ئەگەر خەڵكی ئاگایان لێ بایە كە دزیان لەلایەن ئەو پیاوە لێكراوە دەیوت ئەوە من نەبووم بەڵكو گۆپالەكەك رایكێشاوە، ئەگەریش خەڵكی ئاگایان لێ نەبایە ئەوا بۆ خۆی دەبرد.

## ٣٧-خاوەنی پشیلەکە

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: بەهەشت لەمن نزیك کرایەوە هەتا ئەگەر بم ویستبایە ئەوا لەبەروبوومەکەیم لیّ دەکردەوەو بۆتانم دەهێنا، ئاگریش لەمن نزیك کرایەوە وتم: خودایە منیش لەگەڵیانم؟ دیتم ئافرەتێك پشیلەیەك رنوکی لێدەدات، وتم: ئەو ئافرەتە بۆ ئەوهایە؟ وتیان: لەبرسان ئەو پشیلەیەی کوشت کە نانی نەدا پێیو بەرەڵاشی نەکرد بۆ ئەوەی لەجانەوەری سەر زەوی بخوات)) رواه البخاری.

## ٣٨-ئەو ئافرەتەی بە زمانی جیرانەکانی ئەزیەت دەدا

أبو هريرة –رەزای خوای لیّ بێت – دەڵێت: پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باسی فڵانە ئافرەت دەکەن، کە زۆر نوێژکەرەو ، رۆژوو گرەو، زۆر خێرو خێرات دەکات، بەڵام ئەوەندە هەیە بە زمانەکەی ئەزیەتی جیرانەکانی دەدات! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ئەوە دەچێتە ناو ئاگر)) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فڵانە ئافرەتیش دەڵێن کەم نوێژی سوننەتو رۆژوو خێرو خێرات دەکات، هەندێك جاریش قاویت دەکاتە خێر، بەڵام بە زمانەکەی ئەزیەتی جیرانەکانی نادات! فەرموی: ((ئەوە دەچێتە بە هەشت)) (حديث حسن رواه أحمد).

## ٣٩-ئەو وتاربێژو بانگخوازانەی ریابازی دەکەن

أسامه بن زيد الحارثة –رضي الله عنه – وتویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خواﷺ بوو فەرمووی: ((پیاوێك لەرۆژی دواییدا دەهێنن و دەیهاوێنە ناو ئاگر، جا ریخۆڵەی لەناو زگی دێتە دەرەوەو لەدەوری دەسوڕێ وەك چۆن گوێ درێژ لەدەوری ئاش دەسوڕێ، ئەهلی ئاگر لێی کۆدەبنەوەو دەڵێن: ئەی فلان تۆ بۆچی ئەوهات بەسەر دێت؟ ئایە تۆ فەرمانت بە چاکەو قەدەغەی خراپەت نەدەکرد؟ دەڵێ: بەڵێ، بەڵام فەرمانم بە چاکە دەکردو خۆم ئەنجامم نەدەداو قەدەغەی خراپەشم دەکردو خۆم ئەنجامم دەدا. (متفق عليه).

أنس بن مالك وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((شەوی ئیسرا بە لای خەڵکانێکدا رۆیشتم لێوەکانیان بە گازی ئاسنین دەبڕدرا، وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەمانە وتار بێژی ئوممەتەکەتن لەدونیا، ئەوانە فەرمانیان بە چاکە دەکردو خۆیان لەبیر دەکردو قورئانیشیان دەخوێندەوە بەڵام پشت گوێیان دەخست)) (حديث صحيح رواه أحمد).

ئەم فەرمودەیە لەریوایەتێکی تردا هاتووە بە بێژەی ((ئەوانە وتاربێژی ئوممەتەکەتن ئەوانەی قسە دەکەنو بەگوێی قسەکانی خۆیان ناکەن))

خودایە پەنا بە تۆ دەگرین لەزانستێك کەوا سودی نیەو لەدڵێك، کە مل کەچ نیەو لەنەفسێك کە تێر نابێو لەدوعایەك کە گیرا نابێ.

## ٤٠- دزی کردن لەغەنیمەت

عبدالله بن عمرو – رضي الله عنهما – وتویەتی: پیاوێك هەبوو لەلای شتو مەکەکانی پێغەمبەر، کە لەسەفەر لەگەڵە خۆی دەبرد ناوی کیرکیرەبوو جا وەفاتی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((دەچێتە ناو ئاگر)) جا رۆیشتن تەماشایان کرد و بینیان وا عەبایەکی لەبەر دایە، کە لەغەنیمەتی جەنگ دزی بووی. (متفق علیە)

عمر بن الخطاب – رضي الله عنه– فەرمویەتی: لەرۆژی خەیبەر چەند کەسێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هاتنو وتیان: فلانە کەس شەهیدە، فلان شەهیدە، هەتا هاتنە سەر پیاوێكو وتیان: فلانیش شەهیدە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((نەخێر من بینیم لەناو ئاگر، بە هۆی عەبایەك، کە دزی بووی لەغەنیمەتی جەنگ)) (متفق علیە).

أبو هريرة – رضي الله عنه– وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چووینە خەیبەر، خوای گەورە فەتحی کرد بۆمان کە هیچ لەزێرو زیومان بە غەنیمەت نەگرت، بەڵکو شتو مەكو خواردنو جلو بەرگمان بە غەنیمەت گرت، پاشان رۆیشتین بۆلای دۆڵەکە، لەگەڵ پێغەمبەری بەندەیەکی لەگەڵ بوو، کە پیاوێك لەتیرەی جذام دایبوی پێیو ناوی رفاعەبن زید ، کە لەبنی خبیب بوو، کە چووینە ناو دۆڵەکە بەندەکەی پێغەمبەری خوا هەڵسایەوە بۆ ئەوەی شتو مەکی سەر وشترەکەی بێنتە خوارەوە لەناکاو تیرێکیان لێداو بەو هۆیەوە مرد، وتمان: شەهادەتەکەی لیّ پیرۆز بیّ ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نەخێر، سوێند بە خوای گەورە کە نەفسی منی بە دەستە،ئەو پۆشاکەی لەبەریەتی هەمووی دەبێتە ئاگر، کە لەرۆژی خەیبەر ، کە هێشتا غەنیمەت دابەش نەکرابوو ئەو دزی بووی)).

جا خەڵکی زۆر ترسان، لەم ساتە پیاوێك قەیتانێك یان دوو قەیتانی هێناو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەوەم لەرۆژی خەیبەر بەدەست کەوتووە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((قەیتانێك یان دوو قەیتان ئەویش بۆ ناو ئاگرە)). (متفق علیە).

## ٤١- ئەو کەسەی فەخرو شانازی بە خۆی کرد

أبی بن کعب وتویەتی: لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ دوو پیاو باسی نەسەبی خۆیان کرد، یەکێکیان وتی: من فلانی کوڕی فلانم، تۆ کێی؟ تۆ دایکت نیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((دوو پیاو لەسەردەمی موسا – علیه السلام – باسی نەسەبی خۆیان کرد یەکێکیان وتی: من فلانی کوڕی فلانم – هەتا نۆ کەسی ژمارد – تۆ کێی؟ تۆ دایکت نیە؟ ئەویش وتی: من فلانی کوڕی فلانم کوڕی ئیسلامم. دەڵێت خوای گەورە وەحی بۆ موسا نارد – علیه السلام – لەبارەی ئەو دوو کەسەو بەیەکەمی گوت ئەوەی نۆ نەسەبی خۆی ژماردو وتی: بڕۆ ناو ئاگر لەگەڵ ئەو نۆ کەسە، کە تۆ دەیەمینیانی، دەربارەی تۆش ئەی ئەو کەسەی باسی دوو نەسەبی خۆت کرد، ئەوا بڕۆرە بەهەشت لەگەڵ ئەو دوو کەسەو تۆش سێ هەمینیانی. حدیث صحیح رواه احمد والحمیدی والبیهقی.

لەریوایەتێکی تری ئەو فەرمودەیەدا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ((ئەوەی ئینتیساب بکات بۆ نۆ پشتی کافران فەخرو شانازیان پێوە بکات، ئەوا ئەو دەیەمینیانە بۆ ناو ئاگر)).

## ٤٢-حەفتاو دوو کۆمەڵ بۆ ناو ئاگرن

أنس بن مالك وتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نەوەی ئیسرائیل بوونە حەفتاو یەك کۆمەڵ، ئوممەتی منیش دەبنە حەفتاو دوو کۆمەڵ، هەمووی دەچنە نێو ئاگرەوە تەنها یەکێکیان نەبێ ئەویش جەماعەیە)) (حدیث صحیح رواه ابن ماجه).

أنس بن مالك – رضي الله عنه – فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((نەوەی ئیسرائیل بوونە حەفتاو یەك کۆمەڵ جا حەفتا کۆمەڵیان لەناو چوون و تەنها یەك کۆمەڵیان قوتاریان بوو، ئوممەتی منیش دەبێتە حەفتاو دوو کۆمەڵ، حەفتاو یەك

کۆمەڵیان لەناو دەچن تەنها یەك کۆمەڵ نەبێ، ))) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەو کۆمەڵە کێیە؟ ((فەرمووی: ئەوانە: الجماعة الجماعة)) (حديث صحيح لغيره رواه أحمد).

لەریوایەتێکی تری ئەم فەرمودەیەدا هاتووە کەوا پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ئەهلی هەردوو کیتاب لەبارەی دینەکەیان بوونە حەفتاو دوو کۆمەڵ، ئەو ئوممەتەش دەبێتە حەفتاو سێ کۆمەڵ هەموویان بۆ ناو ئاگر دەچن تەنها یەکێکیان نەبێ، ئەویش جەماعەیە، لەناو ئوممەتەکەم خەڵکانێك پەیدا دەبن ئەو کۆمەڵە گومڕایانە دەکەنە هاوڕێو هاوسێی خۆیان چۆن سەگ هاوڕێو هاوسێی خاوەنەکەیەتی، هیچ جومگەو دەمار نامێنێ ئیلا دەچنە ناویەوە)).

أس بن مالك – رضي الله عنه – دەفەرموێ: ((ئەی کۆمەڵی عەرەب ئەگەر ئێوە هەڵنەستن بەوەی پێغەمبەرەکەتان بۆی هێناون ئەوا جگە لەئێوە هەر پێی هەڵناستن )) (حديث حسن رواه أحمد وأبو داود).

## ٤٣- موفلیسو قەللۆش

أبو هريرة –رضي الله عنه – فەرمویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((ئایە دەزانن قەللۆش کێیە؟)) وتیان: قەللۆش لەناو ئێمە ئەو کەسەیە کە درهەم و دیناری نەبێ. فەرمووی: ((قەللۆشی ئوممەتی من ئەو کەسەیە، کە لەرۆژی قیامەت بە نوێژو رۆژوو زەکاتەوە دێت، بەڵام لەهەمان کاتدا جوێنی بەوە داوەو بوختانی بەم کردوەو ماڵی ئەوی خواردووەو خوێنی ئەوی رشتوەو لەمی داوە، جا چاکەکانی دەبەن، ئەگەریش چاکەکانی هیچ نەمان ئەوا لەگوناهەکانیان هەڵدەگیرێو دادەنرێتەسەر گوناهەکانیو پاشان فرێدەدرێتە ناو ئاگر)) (رواه مسلم).

# بەشی شەشەم

# نهێنی زۆری ژمارەی دۆزەخی یەکان و بەتایبەتی لەئافرەتان

بەراستی چەندەها دەق هاتووە وەکو دەستنیشانکەری زۆری ئەوانەی کە دەچنە ئاگرەوە و کەمی ژمارەی ئەوانەی دەچنە بەهەشتەوە لەنەوەی ئادەم. خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾یوسف: ١٠٣ئەمەش بەڵگەیە لەسەر زۆری بێ باوەڕو هاوبەش پەیداکەرەکان کە بانگەوازی پێغەمبەرانیان رەتکردەوەو وەکو پێغەمبەرمان (ﷺ) پێمانی راگەیاندووە لەفەرموودە راستەکەی کە فەرموویەتی: ((ئوممەتەکانم نیشاندار، پێغەمبەرێکم بینی کە کۆمەڵە کەسێکی کەمی لەگەڵە، پێغەمبەرێکی تر کە یەك دوو پیاوی لەگەڵ دایە، پێغەمبەرێك کە کەسی لەگەڵ دا نیە...)) (متفق علیه). هەروەها لەفەرمودە راستەکانی بوخاریو موسلیم کە لە ابی سعید الخدری رەزای خوای لێ بێ ئەویش لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە هاتووە کە ((خوای گەورە دەفەرموێ: ئەی ئادەم. ئینجا ئادەم دەڵێ: بەڵێ ئەی خوایە هەموو خێر وبێرێك لەدەست تۆیە. ئینجا دەفەرموێ (بَعْثَ)ی ئاگر دەربێنە. ئادەم فەرمووی (بَعْثَ)ی ئاگر چی یە؟ خوا فەرمووی: لەهەر هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ. ﴿ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ ﴾ الحج: لەو ڕۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێك لە شیر خۆرەکەی بێئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سك پڕو دوو گیانێکش کۆرپەلەکەی دەدانێت، خەڵکی دەبینیت، وەکو سەرخۆشن، لە ڕاستیدا سەرخۆشیش نین، بەڵکو سزای خوایی

زۆر سەخت و سامناکە و سەری لێ شێواندوون. ﴿لەو رۆژەدا منداڵ پیر دەبێ. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی کێمان ئەو کەسەین؟ گوتی: مژدەتان لێ بێ بێگومان یەکێك لەئێوەو هەزار لەیەئجوج و مەئجوجە. پاشان فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە من بێگومان تکادەکەم کە چارەکێکی ئەهل(خەڵك)ی بەهەشت بن. ئینجا تەکبیرمان لێدا پاشان گوتی: تکادەکەم نیوەی ئەهلی بەهەشت بن. ئینجا تەکبیرمان لێدا پاشان فەرمووی: تکادەکەم کە نیوەی ئەهلی بەهەشت ئێوە بن ئینجا تەکبیرمان لێدا پاشان فەرمووی: ئێوە لەناو خەڵکی نین مەگەر وەکو موویێکی رەش لەپێستی گایەکی سپی یان وەکو موویێکی سپی لەپێستی گایەکی رەش)).

## نهێنی زۆری ژمارەی ئەهلی ئاگر:

بزانە کەوا بەراستی هۆکاری زۆری ئەهلی ئاگر نەگەشتنی راستی خەڵکی نیە لەسەر جیاوازی سەردەمەکانیان، بەراستی خوای گەورە لەبەندە ناگرێ ئەگەر بانگەوازی ئەویان پێ نەگەیشتبێ، خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ الإسراء: ١٥ ئەوەی هەوڵی دابێت رێبازی ڕاست و دروست بگرێت، ئەوە بەڕاستی بەقازانجی خۆی تەواو دەبێت و هەر خۆی بەهرە لە هیدایەتەکەی وەردەگرێت، ئەوەش گومڕا بووەو ڕێبازی سەرلێشێواوی گرتۆتەبەر، ئەوە بێگومان هەر خۆی زەرەر دەکات و گومڕاییەکەی لەسەری دەکەوێت، کەس گوناهی کەس هەڵناگرێت، کەس بەرپرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر، ئێمەش سزای کەسمان نەداوە تا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین.

﴾ لەبەر ئەوە خوای گەورە بۆ هەموو ئومەتێك ترسێنەرێکی ناردووە، خوای گەورە

فەرمویەتی: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾فاطر: ٢٤. بەڵام هۆكاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ كەمی ژمارەی ئەوانەی وەڵامی پێغەمبەرانیان داوەتەوەو زۆری ژمارەی ئەوانەی بێ باوەڕ بوونە پێیان هەروا زۆری ئەوانەی وەڵامیان داوەتەوە لەكاتێكدا باوەڕیان (ئیمانیان) دڵسۆزو پاك نەبووە إبن رجب لەكتێبەكەی (التخويف من النّار) هۆكاری كەمی ئەهلی بەهەشت دەخاتە ڕوو زۆری ژمارەی ئەهلی ئاگر، پاشان فەرمویەتی: (ئەو فەرمودانەو ئەو مانایانەی دەیدەن بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە زۆربەی نەوەی ئادەم لەئەهلی ئاگرن و هەروەها بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە شوێن كەوتووی پێغەمبەران ژمارەیان كەمە بەگوێرەی ئەوانی تر، جگە لەشوێن كەوتوانی پێغەمبەران هەمویان لەئاگر دان مەگەر ئەو كەسەی كە بانگەوازی پێ نەگەیشتبێ یان نەیتوانیوە لێی تێ بگا لەبەر ئەو ڕایە جیاوازانەی تێیدا هاتووە، زۆرێك لەوانەی كە دەگەڕێنەوە بۆ شوێن كەوتوانی پێغەمبەران دەستیان گرتووە بە ئاینێكی هەڵوەشاوەو كتێبێكی گۆڕدراو، هەروەها ئەوان لەئەهلی ئاگرن وەكو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ ﴾هود: ١٧ (ئایە ئەو جۆرە كەسانەی كە باس كران) وەكو ئەو كەسە وایە كە لەلایەن پەروەردگاریەوە هەموو شتێكی بۆ ڕوون كراوەتەوە، (ئەمیش باوەڕی پێیەتی چونكە) پێغەمبەرێك بەڵگەنامەی خوا دەخوێنێتەوە و لە پێش ئەمیشەوە پەیامەكەی موسا (كە تەوراتە) پێشەواو ڕەحمەت بووە، ئەو جۆرە كەسانەی (كە ژیرو هۆشمەدن) باوەڕی پێ دەهێنن، جا ئەو دەستە و كۆمەڵانەی كە باوەڕ بەم پەیامە ناكەن، ئەوە ئاگری دۆزەخ چاوەڕێیانە، نەكەیت تۆ لەجۆرە گومانێكدا بیت لەم قورئانەو لەم پەیامە،

چونکە بەڕاستی ئەوە حەقیقەتە و لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت ڕەوانە کراوە، بەلاّم زۆربەی خەلّکی باوەڕ ناهێنن﴾ بەلاّم ئەوانەی کە دەگەڕێنرێنەوە سەر قورئان‌و شەریعەتی تەواو ئاینی ڕاست زۆرێکیان لەئەهلی ئاگرن بە هەمان شێوە، ئەوانە لەو دوو ڕوانەن کە لە هەرە ژێرەوەی ئاگرن، زۆرێك لەگەڕێنراوان بۆ ئاینی ئیسلام بە شێوەی دیارو نادیار لەخشتە براوە بەو شتانەی گومانیان لیّ دەکریّ وە ئەوانەش ئەهلی بیدعەو گومڕایین، بەراستی چەندەها فەرموودە هاتووە لەسەر ئەوەی کە ئەوئوممەتە بۆ حەفتاو هەندێك کۆمەڵە دابەشدەکریّ هەمووی لەئاگرن مەگەر یەك کۆمەڵە نەبیّ، محمد (ﷺ) فەرمویەتی: ((بێگومان نەوەی بەنی ئیسرائیل بەشکراوە بۆ سەر حەفتاو یەك کۆمەڵە، بێگومان ئوممەتی من دابەشدەکریّ بۆ سەر حەفتاو دوو کۆمەڵە، هەموی لەئاگردان مەگەر کۆمەڵەیەك نەبیّ، ئەوانەش برادەرانن( الجماعة)) (ابن ماجە ریوایەتی کردووەو فەرمودەکەش ڕاستە).

زۆرێك لەئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەخشتە براوە بەئارەزووە قەدەغەکراوەکانی هەرەشە لەسەر کراوەکانی بە ئاگر –بەهەتا هەتایش لەناوی نەمێنێەوە ئەوە لەهەرەشەی خستنە ناو ئاگر ڕزگاری نابیّ و هیچ کەسێك شایەنی بەلّێنی تەواو بە بەهەشت نیە لەو ئوممەتە مەگەر یەك کۆمەڵە نەبێت ئەو ڕێگا ڕاستەش ئەو ڕێگەیەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بە ئاشکرایی‌و بە نهێنی لەسەری بونە، وە سەلامەت بووە لەفریودانی ئارەزووەکان‌و گومان لیّ کراوەکان، وە ئەوانەش زۆر کەمن بە تایبەتی لەسەردەمە دواینیەکان، وە خوای گەورە زاناترە.

وەرەنگە گەورەترین هۆکاری شوێن کەوتنی ئارەزوەکان بیّ، ئەو هۆکارەش ئەوەیە کە ئەڤینی ئارەزووەکان لەقولاّیی نەفسی ئادەمی ڕوێنراوە، خوای گەورە دەفەرمویّ :

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ

وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ آل عمران: ١٤ئارەزووی ئافرەت و بوونی نەوەی نێرینە و خاوەنێتی ئاڵتون و زێڕو زیووی زۆرو زەبەندە و ئەسپی چاك و ڕەسەن و (هۆكارەی هاتووچۆ) هەروەها ماڵات و زەوی و زاری كشتوكاڵ بۆ خەڵكی ڕازێنراوەتەوە، ئەوانە هەمووی نازو نیعمەتی ژیانی دنیان، خوایش (بۆ چاكان) شوێنی گەڕانەوەی ڕازاوەو خۆشی لای خۆی ئامادە كردووە (كە بەهەشتە). ﴾ زۆرێك لەخەڵكی بەدوای ئەو ئەو ئارەزوانەوەیە لەسەر ئەو ڕێگەیەی كە نەفسی ئارەزوی لێ دەكات و دڵی پێ خۆش دەبێت، لەوەدا شەریعەتی دابەزیوی خوا لەبەر چاو ناگرێ سەرەڕای ئەوەش دەستگرتنی ڕۆڵەكانە بە میراتی باوكانیان كە پێچەوانەی شەریعەتی خوایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ الزخرف: ٢٣ هەر بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێكمان نەناردووە بۆ هیچ شارێك، كە خۆشگوزەرانەكان نەیانوتبێت: ئێمە باوو باپیرانی خۆمان بینیووە پابەندی بیروباوەڕێك بوون، بێگومان ئێمەش چاو لەوان دەكەین و پەیڕەوی ئەوان دەكەین. ﴾ لەصحیحی بوخاری‌و مسلم، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمویەتی: ((ئاگری دۆزەخ بە ئارەزوەكان دەورە دراوە، و بەهەشت بە ناخۆشیەكان دەورە دراوە))، لەریوایەتێك كە هی (مسلم)ە، ((ئابڵۆقە دراوە)) لەجیاتی ((دەورەدراوە)) هاتووە، واتە: لەنێوان كەسەكەو ئاگری دۆزەخ پەردەی (ئارەزوو) هەیە، ئینجا كاتێك كردی دەچێتە ناوی.

## زۆری ئافرەت لەئاگری دۆزەخ:

بوخاری و مسلم لەأبی رجاءِ العطاردي، گوتی: گوێم لەابن عباس بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: ((لەبەهەشتم روانی بینیم زۆربەی ئەهلی بەهەشت هەژارەکانن، لەئاگری دۆزەخم روانی بینیم زۆربەی ئەهلی دۆزەخ ئافرەتن)) لەریوایەتێك لەدوو کۆمەڵە فەرموودە راستەکان، لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((چاودێری دەرگای بەهەشتم کرد، کە بینیم زۆربەی ئەوانەی چوونە بەهەشتەوە هەژاران بوون و دەوڵەمەندەکان راگیراو بوون، جگە لەوەی کە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ بێ گومان فرمانیان لەسەر کرا بخرێنە ئاگری دۆزەخەوە. چاودێری دەرگای ئاگری دۆزەخم کرد بینیم زۆربەی ئەوانەی چوونە ناوی ئافرەتان بوون))).

لە(ابن عمر)ەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێر بکەن، زۆر داوای لێ خۆش بوون بکەن، بەراستی ئێوەم بینی کە زۆربەی خەڵکانی ئاگری دۆزەخ بوون)) جا ئافرەتێك لەوان وتی لەبەرچی ئێمە زۆربەی خەڵکی ئاگری دۆزەخ بووین؟ گوتی: ((زۆر نەفرەت دەکەن، کوفرانەی نیعمەتەکانی مێرد دەکەن نەم بینیوە وەکو ئێوە کەوا دەتوانن پیاوێکی ئاقڵو هۆشمەند فریو بدەن، ئافرەتەکە وتی: ناتەواوی ئەقڵو دین چی یە؟ فەرمووی: ((گەواهی دوو ئافرەت بەرامبەر پیاوێکە، چەند رۆژێك دەمینێتەوە بەبێ نوێژی)) (متفق علیه)).

*(ئاگادار کردنەوە): مسلم لەفەرموودە راستەکانی گێڕاویەتەوە، لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرمویەتی: ((بێگومان یەکەم کۆمەڵە دەچێتە بەهەشتەوە لەسەر وێنەی مانگی شەوی چواردە دەچنە بەهەشتەوە، ئەو کۆمەڵەی کە دوای ئەو دێت لەسەر وێنەی رووناکی ئەستێرەی شەوقدار لەئاسمان دەچێتە بەهەشتەوە، بۆ

هەر پیاوێك لەوانە دوو ئافرەت هەیە، موخی ئێسکی لاقیان لەدواوەی گۆشتیانەوە دەبینرێ، رەبەنی لەناو بەهەشتدانیە.

القاضي فەرموویەتی: رووخساری ئەم فەرموودەیە وا دەردەخات کە ئافرەت زۆربەی ئەهلی بەهەشت پێکدەهێنن. وەلەفەرموودەیەکی تر: ((بێگومان ئەوان زۆربەی ئەهلی ئاگر پێکدێنن))،

فەرموویەتی: بەشێوەیەکی گشتی لەوەوە وا دەردەکەوێ کەوا ئافرەت زۆرینەی نەوەی ئادەمن، فەرموویەتی: ئەم ئافرەتانەش هەمووی لەئادەمییەکانن ئەگەرنا ژمارەیکی زۆر حۆری بۆ هەر یەکێك لەئەهلی بەهەشت هەیە. واتە ئافرەتی دونیا زۆرینەی ئەهلی ئاگرن، ئافرەتی رۆژی دوایی زۆرینەی ئەهلی بەهەشت پێکدەهێنن.

المناوی لە(الفیض) باسی ئەوەی کردووە: کە بێگومان کەمی ژمارەی ئافرەتە بەهەشتیەکانی دونیا پێش دەرهاتنیانە لەئاگری دۆزەخ بەتکاکردن(شەفاعەت) بەڵام دوای دەرهێنانیان بە تکاکردنو رەحمەتی خوا کاتێك هیچ یەکێك لەوانەی کە گوتویەتی لا اله الا الله لەناو ئاگری دۆزەخ نامێنێ ئینجا ئافرەت بەهەشتدا زۆرتردەبن لەپیاو و ئەو کات بۆ هەر پیاوێکی بەهەشت دوو ئافرەت هەیە لەئافرەتی دونیا لەگەڵ حەفتا حۆری لە قرطبي و جگە لەو ئەو ئەم باسەی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە.

قرطبي فەرموویەتی: بێگومانِ ئافرەت کەمترین دانیشتووی بەهەشتن چونکە حەزوو ئارەزوو بەسەریان زاڵ دەبێ بۆ جوانی ئامادەکراوی دونیا و پشت کردنو رۆژی دوایی ئەمەش لەبەر ناتەواوی ئەقڵیان و هەڵخەڵەتانیان.

# بەشی حەوتەم

## خراپی لەکۆتایی ژیاندا

(سوء الخاتمة)

بێگومان کۆتا خراپی ژیان– خوای گەورە لێیمان بپارێزێ– ئەوەیە: کە مردنی مرۆڤ لەکاتێك بێت کە پشت هەڵکەرە لەپەروەردگاری گەورەو پایەبەرز، بەردەوامە لەسەر ئەو شتانەی کە خوای پاكو بێگەرد تورە دەکات، فەرامۆشکەری ئەو شتانە بێن کە خوا لەسەری واجیب کردووە، هیچ گومانی لەسەر نی یە کەوا ئەوە کۆتایی یەکی چارە رەشە، لەبەر ئەوە پارێزگاران لێی دەترسن، لەپەوەردگاری پاكو بێگەردو پایەبەرز دەپاڕێنەوە کە لەمەیان بپارێزێ.

لەسەر هەندێ لەوانەی لەسەرەمەرگدان چەند نیشانەیەك یان بارودۆخێك دەردەکەوێ کە خراپ کۆتایی ژیان بەدەردەخات، لەوانە نەتوانێن گوتنی وشەی شەهادە – (لااله اله الله). رەفزکردنەوەی.

وەکو قسەکردن بەشتە خراپەکان و حەرام کراوەکان و دەرخستنی لەکاتی سەرەمەرگ بەهەمان شێوە لەو وتەو کردارانەی کە پشت هەڵکردن لەئاینی خوای گەورەو بێزاری لەدابەزینی قەزای خوا بەدەردەخات. لەوانەیە گونجاو بێت کە هەندێك نمونە لەسەر ئەوە بهێنینەوە:

●جا یەکێك لەوانە: ئەوەیە کە زانا ابن القیم هێناویەتی لەکتێبەکەی (الجواب الكافی): کە یەکێك لەکاتی مردن پێی گوترا : بڵێ: لا إله إلا الله ...گوتی: چ سوود بە من دەگەیەنێ نەمزانیوە تەنها رۆژێکیش بۆ خوا نوێژم کردبێت ؟! دواتر ئەم وشەیەی نەگوت.

●الحافظ ابن رجب رەحمەتی خوای لیّ بێت گێڕاویەتەوە ( لەکتێبەکەی: جامع العلوم والحكم) لەیەکێك لەزانایان، و ئەم زانایەش (عبدالعزیز بن أبی رواد)ە کە وتویەتی: لەلای پیاوێك بووم لەکاتی مردن تەلقین کرا بە لا اله الا الله ، پاشان لەدواهەمین وتەکانی وتی: کە ئەو بڕوا بەمە ناکات لەسەر ئەمە مرد. فەرمووی :ئینجا دەربارەی ئەم پیاوە پرسیارم کرد ، کە هەمیشە خۆرەوەی ئارەق بووە، پاشان عبدالعزیز دەیگوت: خۆتان لەگوناه بپارێزن، بێگومان ئەمە بوو کە ئەمەی تووش کرد.

●بەهەمان شێوە ئەوەی الحافظ الذهبي رەحمەتی خوای لیّ بێت باسی کردووە: ئەوەیە کە پیاوێك لەگەڵ ئەو کەسانە دادەنیشت کە زۆر ئارەقیان دەخواردەوە، ئینجا کاتێك گەیشتە سەرە مەرگ یەکێك هات شەهادەی پیّ بێنیّ ئینجا کابرا لەسەرە مەرگ بوو پێی گوت: دەخۆمەوە ئارەقم دەویّ. دوایی مرد. پەنا بەخوا لەخراپ کۆتایی هاتنی ژیان.

● الحافظ الذهبي رەحمەتی خوای لیّ بێت بەهەمان شێوە باسی ئەمەی کردووە (لەکتێبەکەی الکبائر): کە پیاوێك لەوانەی کە یاری شەترەنجیان دەکرد کەوتە سەرەمەرگ، ئینجا پێی گوترا: بڵیّ: لا اله الا الله..ئەویش گوتی: شاهدك، لەیاری دا، ئینجا لەبڕی وشەی یەکتاپەرستی گوتی: شاهدك.

● ابن القیم رەحمەتی خوای لیّ بێت باسی لەپیاوێك کردووە کە ناسراوە بە هەواداری بۆ گۆرانیو گوتنەوەی، ئینجا کاتێك گەیشتە سەرەمەرگ پێی گوترا: بڵیّ: لا اله الا الله..ئینجا ئەویش دەستی کرد بە گۆرانی گوتن دەیگوت: تاتَنا تَنتَنا..تا گیانی دەرچوو، بەهیچ شێوەیەك شەهادەی نەهێنا بە وشەی یەکتاپەرستی.

● ابن القیم فەرموویەتی: هەندیّ بازرگان باسی کەسێکی نزیکی خۆیان بۆ من کرد کە کەوتە سەرەمەرگ لەوکاتەی لەلای بوون ،وەلەوکاتەی ئەوان تەلقینیان دەدا بە لا اله الا الله ئەویش دەیگوت: ئەم پارچەیە هەرزانە، ئەوە فرۆشراوێکی باشە، ئەوە

بەوەندەیە، تاوەكو مردو وشەی یەكتاپەرستی نەگوت..داوای سەلامەتی و تەندروستی چاك لەخوا دەكەین لەهەموو ئەمانە.

●ئا لێرەدا زانا ابن القیم رەحمەتی خوای لێ بێت لێدوانێكی هەیە، پوختەیەكی لێ دەهێنینەوە، كاتێك لێدوانی داوە لەسەر هەندێ لەم چیرۆكانەی كە لەپێشدا باسكراوە، كە گوتویەتی: ((پاكیو بێگەردی بۆ خوا ، خەڵكی چەند پەندیان لەمەوە وەرگرتووە؟ وە ئەوەی لێیان بزرشە لەحاڵەتەكانی ئەوانەی لەسەرەمەرگن زۆرن گەورەترە، ئینجا كاتێك یەكێك لەحاڵەتی ئامادەیی هۆشو هێزی تەواوی تێگەیشتنی دایە، بەراستی شەیتان دەستی بەسەردا گرتووە، لەوەی دەیەوێ لەسەر پێچیەكانی خوا بەكاری هێنا، بەراستی دڵی بێئاگا كرد لەزیكری خوای گەورە، زمانی لاڵ كرد لەكردنی زیكری خوای گەورە،ئەندامەكانی لەكاركەوت لەگوێ رایەڵی خوا، جا گومانی چی لێ دەكەیت لەكاتی نەمانی هێزی، خەریك بوونی دڵو نەفسی بەو ئێشەی گیان كێشان كە تێیدایە؟ بەراستی شەیتان هەموو هێزو وزەی خۆی كۆكردۆتەوە، شتی لەسەر كۆكردووەتەوە بەهەموو هێزو تواناى خۆی بۆ ئەوەی كاری تێبكات لەكاتی گونجاوی خۆی، بێگومان كۆتاهەمین كارە، جا كاتی بەهێزترینی شەیتان ئەو كاتەیە لەسەر ئەم كەسە، ئەویش لەبێهزترین كاتدایە، جا كێ هەیە دەربچێت سەلامەت بێت لەم بارودۆخە؟ جا لەوێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ إبراهيم: ٢٧خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەكات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا، لەسەرەمەرگ و لە قیامەتیشدا، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەكەوێت و) گوفتاریان ڕێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن، لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمكاران گومڕا دەكات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەكرێت. ﴾

جا چۆن ئەو کەسەی خوای پاکو بێ گەرد دڵی بێ ئاگا کردووە لەزیکری خۆی لەبەدەست هێنانی چاك کۆتایی هاتنی ژیان سەرکەوتوو دەبێت، لەکاتێك بەدوای ئارەزووی خۆی دوکەوێ، کردارەکانی خراپو لەسنوور دەرچووو، ئەو کەسەی دوورە لەدڵی خۆی دوورە لەخوای گەورە و بێ ئاگایە لێی، خۆ تەرخانکەر بۆ پەرستنی هەواو ئارەزووی، دەسبەسەری هەوەسی خۆیەتی، زمانی هیشکە لەزیکری خوا، ئەندامەکانی لەشی لەکارکەوت لەگوێڕایەڵی کردنیو سەرقاڵە بەسەرپێچی کردنی خواو دوورە لەوەی کە سەرکەوتوو بێت بۆ بەدەست هێنانی کۆتا ژیانێکی چاك) ا.هـ.

● بزانە کە کۆتا خراپی ژیان لەسەر دوو جۆر پۆلین دەکرێ – خۆمان بە خودا دەپارێزین لەمە:

(یەکەم) لەسەر دڵ لەکاتی گیانەڵاو بەدەرکەوتنی مەترسیەکانی:

هەبوونی گومان یان بێ باوەڕی لەدڵ دا لەم کاتەدا کە گیانی یەکێك دەکێشرێ ئەمە دەبێتە پەردەیەك لەنێوان ئەو کەسەو خوا، ئەوە دووری هەمیشەییو سزای هەتاهەتایی دەگەیەنێ.

(دووەم) ئەمە لەخوار پلەی یەکەمە لەگەورەیی ، ئەوەیە کە خۆشەویستی شتێك لەشتەکانی دونیا یان هەوەسێك لەهەوەسە حەرامکراوەکان بەسەر دڵی دا باڵ بکێشێ لەکاتی مردن، ئینجا ئەمە دێتە پێش چاوی لەدڵیەوە، خەڵکی لەسەر ئەمە دەمرن کە لەسەری ژیاوە، جا ئەگەر لەوکەسانە بوو کە ریبا وەردەگرن ئەوا بەمە کۆتایی پێ دەهێنرێ، ئەگەر لەم کەسانە بوو کە رەفتار بە کردارە قەدەغەکراوەکانی تر دەکات وەکو بێ هۆشکەرەکان و گۆرانییەکان و جگەرەکێشان و تەماشاکردنی وێنە حەرام کراوەکان و زوڵم کردن لەخەڵکی ئەوا بەراستی بەمە کۆتایی پێ دەهێنرێ، واتە بەوەی کە کۆتا خراپی ئەم بەدەردەخا پەنا بەخوا، بەهەمان شێوە ئەگەر بنچینەی یەکتاپەرستی بوونی هەبوو ئەوا ئەو کەسە دەکەوێتە ژێر مەترسی سزاو تۆڵە. گومان

لەوە دانییە کە مەردوم بەزۆری لەسەر ئەمە دەمرێ کە لەسەری ژیاوە هەروەکو ئەوەی کە زیندوو دەکرێتەوە لەسەر ئەمەی کە لەسەری مردووە، خوای گەورەش زاناترە.

## هۆکارەکانی کۆتا خراپی ژیان

بەمە دەزانرێ کە کۆتا خراپی ژیان بۆ چەند هۆکارێکی پێشوو دەگەڕێتەوە، کە خۆ لێ پاراستنی پێویستە جا لەگەورەترین و ترسناکترینی ئەمانەی خوارەوەیە:

(١)تێکچوونی بیروباوەڕ، بێگومان ئەو کەسەی بیروباوەڕی تێکچوو بە روونی شوێنەواری ئەمەی لەسەر بەدیاردەکەوێ و لەوکاتەدا لەهەموو شتێك زیاتر پێویستی بەیارمەتیو سەقامگیری هەیە لەلایەن خوای گەورە.

(٢) بەرەو دونیا چوونو زۆر هۆگربوونو پێیوە بەشێوەیەك بێ ئاگا دەبێ لەرۆژی دوایی.

(٣) لادان لەراستیو پشت کردن لەچاکەو ڕێی رووناکی..

(٤) سووربوون لەسەر سەرپێچیەکان و خووپێوەکردنی، بێگومان پاشان ئەگەر کەسێك نەفسی خووی بە شتێك گرت بەدرێژایی ژیانی خۆشی ویستو دڵگیری بوو، ئەوا باسکردنی ئەم شتەی لەکاتی مردن لەسەر ئاسان دەبێ، و لەزۆر کاتدا لەحاڵی سەرە مەرگ دەیڵێتەوە.

الحافظ ابن کثیر فەرموویەتی: ((بێگومان تاوانەکانو یاخیبونەکان و هەوەسەکان خاوەنەکەی سەرشۆڕ دەکەن لەکاتی مردن، لەگەڵ پشت تێکردنەکانی شەیتان لەو کەسە، ئینجا پشت تێکردنو پشت بەردانەکانی لەسەر کەڵەکە دەبن لەگەڵ لاوازی ئیمان، پاشان توشی کۆتا خراپی ژیان دەبێ:﴿ لَّقَدْ أَضَلَّنِي عَنِ الذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَاءَنِي وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِلْإِنسَانِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ الفرقان: ٢٩ بەڕاستی گومڕاو وێلی کردم لە

بەرنامەی خوا دوای ئەوەی پێم ڕاگەیەنرا بوو، شەیتان هەمیشە و بەردەوام هانی مرۆڤ دەدات بۆ گوناهو تاوان، لەکاتی تەنگانەشدا پشتی بەردەدات. ﴾

*بزانە کە بێگومان کۆتا خراپی ژیان – خوا بمان پارێزی لێی – توشی کەسێك نابێت کە ڕووخسارو ناخی لەگەڵ خوا پاكو چاك بێتو ڕاستگۆ بێت لەگوفتارو کردارەکانی، جا بێگومان کەس ئەمەی نەدیوەو نەبیستووە، کەیەکێك ئەوە سیفاتی بێت تووشی کۆتا ژیانی خراپ هاتبێت!!، بەڵکو ئەو کەسەی ناخی ناپاك بوو لەگەڵ ڕووخساری بەشێوەیەکی کرداری و بەتەواوی و ئەو کەسەی کە بەجەرگە لە کردنی تاوانە گەورەکانو غیرەت دەیگرێ لەسەر کردنی تاوان ئەوا توشی کۆتا خراپی ژیان دەبێ، جا ئەمە بەسەریدا زاڵ دەبێ تاوەکو دەمرێ پێش تۆبە کردنی)) أ.هـ.

برای موسڵمانم: لەبەر ئەوە کەسی ئاقڵ شایەتە کەوا ئاگای لەخۆ بێت کە دڵی بەشتێك لەشتە حەرام کراوەکان پەیوەست بێت، شایەیستە کەوا دڵو زمانو ئەندامەکانی لەشی پەیوەست بکات بە زیکری خوای گەورەو، بەردەوام بێ لەسەر گوێڕایەڵی کردنی خوا لەهەر شوێنێك بوو ، لەپێناو ئەو ساتە کە ئەگەر لەدەستی چوو دەبێو تێدا سەرشۆڕدەبیو بەدبەخت دەبێ هەتا هەتایە.

(خوایە باشترین کاری ئێمە بخە دواساتی ژیان، باشترینی ساتەکانی تەمەنمان بخە کۆتایی ژیانمان، باشترینی ڕۆژەکانمان ئەو ڕۆژە بێ کە تێیدا پێت دەگەین، خوایە هەموومان سەرکەوتوو بکە لەکردنی چاکەکانو خۆپاراستن لەو شتانەی کە خوا نایەوێ. وصلی الله علی نبینا محمد وعلی اله وصحبه).

# بەشی هەشتەم
# چەند چیرۆكێك دەربارەی كۆتا خراپی ژیان بۆ پەند وەرگرتن

## چیرۆكی یەكەم
## ((برادەرەكەی خۆمم دەوێ))

دكتۆر أيمن گوتی:من هەڵدەستام بە گەڕانی رۆژانە لەسەر نەخۆشەكان لەژووری چاودێری توندو تۆڵ لەو نەخۆشخانە كەنەدیەی كەوا من تێیدا بەدوای خوێندنی پزیشكی باڵاوە بووم، ئینجا ناوی نەخۆشەكەم بەبیرهاتەوە كە لەسەر جێی خۆی بوو لەژووری ژمارە (٣) كە ناوی محمد بوو، بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ سەیرم كرد كە رووخساری بپشكنم و سەیری دەمۆ چاوی بكەم كە ئەوەندەی نەمابوو لەژێر چڵی لوولەی ئامێری ژیاندنەوە بزر بێ بەراستی گەنجێكی تەمەن ٢٥ ساڵە بوو توشببوو بە نەخۆشی كەمی بەرگری لەش (ئایدز) پێش دوو رۆژ هێنرایە نەخۆشخانەوە بە هۆی هەوكردنێكی توند لەسیەكانی بارودۆخی زۆر ترسناك بوو، و نیمچە نائومێدێیكمان بۆ دروست بوو لەژیانی ئەوە. یەكەم نەخۆشی موسڵمان نەبوو لەوڵاتی بێگانە كە چارەسەری بكەم بەڵام بەرامبەر ئەو هەستێكی تایبەتم بۆ دروست بوو كە هۆكارەكەم نەدەزانی.

لەدوای گەڕانی بەیانیان چەند ساتێكم ڕفاند و لەو گەنجە نزیك بومەوەو هەوڵمدا كە بە نەرمی قسەی لەگەڵ بكەم ئەو گوێی لەمن دەبوو بەڵام نەیدەتوانی كە وەڵام بداتەوە مەگەر بەچەند وشەیەكی نادیار، پەیوەندیم بە ماڵەوەی كرد، دایكی وەڵامی دامەوە وا

دەرکەوت کەوا بەراستی ئەوان لەرەچەڵەکەوە عەرەبێکی لوبنانین، باوکی بازرگانێکی گەورە بوو لەو شارەو خاوەنی چەند شوێنێکی شیرنەمەنی بوو، حاڵی کوڕەکەم بۆ دایکی باس کرد لەکاتی قسەکردنم لەگەڵ دایکی زەنگی ئاگادارکردنەوەکە دەستی بە دەنگ بەرزکردنەوە کرد بەشێوەیەکی ترسناك لەم ئامێرە لکاوانە بەم هەرزەکارەوە وەکو ئاماژەیەك لەسەر دابەزینێکی خێرا لەسوڕانی خوێن، لەقسەکانم لەگەڵ دایکی شلەژامو پێم گوت: چارەنیەو دەبێ ئێستا ئامادەبی، ئینجا گوتی: من سەرقاڵم بە کارەکەمەوە دەبم دوای تەواوبوونی دەوام، دوایی ئامادە پێم گوت: لەوانەیە ئەوکات کاتی ئەمە بەسەربچێ‌و تەلەفۆنەکەم داخست.

دوای نیو سەعات سستەرەکە داوای لەمن کرد کە ئامادەبم بۆ بینینی دایکی نەخۆش کە ئافرەتێکی کامیل بوو رووخساری ئیسلامی لەسەر بەدیار نەدەکەوت، بەشپرزەیی بەدیارکەوت، باسی باری خراپی کوڕەکەیم بۆ کرد لەپرمەی گریانیدا...هەوڵی ئارامکردنەوەیم کردو پێم گوت: داوای چاکبوونەوەی لەخوا بۆ بکە، بەسەرسوڕمانەوە سەیری کردمو گوتی: چیت گوت؟ پێم گوت: داوای چاکبوونەوەی لەخوا بۆ بکە! گوتی: تۆ موسڵمانی؟گوتم: سوپاس بۆ خوا. گوتی ئێمەش موسڵمانین. گوتم: ما شاء الله.بۆچی ناچیە لای سەری‌و هەندێك قورئانی پیرۆزی لەسەر بخوێنی بەڵکو خوا لەسەری سووك بکات؟ موچڕکی پیاهات بەشڵەژانەوە کەوتە پرمەی گریانێکی بەهێزو گوتی: نازانم.

گوتم چۆن نوێژ دەکەی؟ گوتی ئێمە لەجەژن نەبێ نوێژ ناکەین لەجەژن نەبێ لەوەتەی هاتوین بۆ ئەم شارە ...بەڵام من هەموو دوو ساڵێك دەڕۆم بۆ سەردانی گۆڕەکانی باوو باپیرانم لە لوبنان و دوعایان بۆ دەکەم بەبێ پێ زانینی هاوسەرەکەم ..و من ئافرەتێکی دیندارم ..لەدڵی خۆم گوتم: (پەنابەخوا دیندارێك بەبێ نوێژکردن‌و ناشزانێ قورئان بخوێنێتەوە).

دەربارەی حاڵی کوڕەکەی پرسیارم لێکرد، گوتی: دڵی پاك بوو، ژیانی خۆشدەویست بەڵام لەساڵی رابردوو لەگەڵ ئەم کچەی دەستی بەسەرداگرتبوو کەمێك لایدا..و باشترین گوزەرانی هەبوو..گوتم: نوێژی دەکرد؟ گوتی: نەخێر بەڵام نییەتی وابوو کە حەج بکات لەکۆتایی ژیانی..لەدڵی خۆم گوتم: (کێ کەفیلایەتی ئەوە دەکات کە تا وەکو سی ساڵی یان چل ساڵی و پەنجاو شەستی ساڵی بژی..چەند کەسی بچووك مردوون و نەگەیشتۆتە بیست ساڵی)..

دوای ئەوە لەکوڕە هەژارەکە نزیك بومەوە لەکاتێکدا ململانێی سەرەمەرگی دەکرد، ئامێری ئاگادارکەرەوە دەنگی بەرزدەبویەوە و دایکەکە بە دەنگی بیستراوەوە دەگریا، سستەرەکان بەسەسوڕمانەوە سەیریان دەکرد، زۆر هەوڵم دا کە شەهادە بە کوڕەکە بێنم و ئەویش وەڵامی نەدەداوە..چەند جارێکی تر هەوڵمدا گەنجەکە کەمێك بێداربوویەوە.. پێم گوت: بڵێ لا اله الا الله. کوڕەکەش بە هەموو ئەندامەکانی یەوە هەوڵی دەدا و فرمێسك بەچاوەکانی دەهاتە خوارەوەو بینیم ڕەنگی بۆ ڕەشی هەڵدەگەڕا..دوایی دەستی بە قسەکردن کردو گوتی:

هێورکەرەوەیەکی ئازارم دەوێ..ئینجا پێم گوت: ئەی لاو بڵێ لا اله الا الله ..لێوەکانی دەلەرزین منیش دەمگوت ئەی خوایە ئێستا شەهادە دێنێ...پاشان بە ئینگلیزی گوتی: (I CANT I CANT) هاوڕێکەی خۆمم دەوێ ناتوانم..لێدانەکانی دڵی کەمی دەکرد..هێشتا زمانی تێکەڵو پێکەڵ دەبوو دەیگوت: هاوڕێکەمم دەوێ ناتوانم..لێدانی دڵی کەم دەبوویەوەو هەناسەدانی بەرەو نەمان دەچوو..خۆم پێ رانەگیرا دەستم بە گریان کردو وتم توخوا: ئەی لاو تکات لێدەکەم بیڵێو ئەویش دەیگوت: ناتوانم..لێدانی دڵی وەستاو منیش دەستی لاوەکەم گرتبوو ئاگام لەخۆم نەماو دایکی خۆی هاوێشتە سەر سینگی و هاواری دەکردو رووخساری لاوەکەش رەشێیکی تێر دایگرتبوو، خۆم پێ رانەگیراو هەموو دابو نەریتە پزیشکییەکانم

لەبیرچوویەوەو واقم وڕما لەهەستیاری حاڵەتەكەو تەقیمەوەو هاوارم كرد لەسەر دایكەكەو گوتم تۆ بەرپرسیاری..تۆو باوكی ئەمانەتەكەتان فەوتاند خوا بتان فەوتێنێ...دایكە كە هەر دەگریا..

وتەی خوای گەورەم بەیر هاتەوە:﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ الجاثية: ٢١ ئایا ئەوانەی كە گوناهو تاوانەكانیان ئەنجام داوە، وایان زانیووە هەر وەك ئەوانە حسابیان بۆ دەكەین كە ئیمانیان هێناوە و كاروكردەوەو چاكەكانیان ئەنجام داوە؟! ژیانی دنیاو مردن و دوای مردنیان وەك یەك دەبێت؟! ئای كە بەبڕیاری خراپ بڕیار دەدەن. ﴾

ابن القیم رەحمەتی خوای لێ بێت گوتویەتی: ئینجا ئەگەر بەندە گەنج بوو، كەبەو پەڕی تاقەت و هێزدا شەیتانیش پێی وێراو بەكاری هێنا لەوەی كە دەیەوێ لەسەرپێچی كردنەكانی خوا چۆن گومانی پێ دەبردرێ لەكاتی نەمانی هێزیو سەقاڵبوونی دڵو نەفسی بەوەی كە ئەو لەو ئازاری روح كێشانەدایە؟ شەیتان هەموو هێزو وزەی خۆی لەسەر كۆكردۆتەوە بۆ ئەوەی لەوەوە بگاتە هەڵی خۆی..جا بەهێزترین كاتی شەیتانەكەی كە لەسەری دەبێ ئەو كاتەیەو، لاوازترین كاتی ئەو كەسەش لەسەرەمەرگە.جا دەبێ كێ لەتاوانی خۆی سەلامەت بێ و دەربچێ..جا لێرەدا : ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۚ وَيَفْعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ إبراهيم: ٢٧ خوای گەورە ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پایەدار دەكات لەسەر گوفتاری بەجێ و دروستیان لە ژیانی دنیادا، لەسەرەمەرگ و لە قیامەتیشدا، (باوەڕی دامەزراو فریایان دەكەوێت و) گوفتاریان رێك و پێك و دامەزراو دەبێت و بەئیمانەوە دەمرن، لەولاشەوە هەر ئەو خوایە ستەمكاران

گومڕا دەکات و ئەوەی پەروەردگار بیەوێت هەر ئەوە پێش دێت و دەکرێت.﴿
(بەپێنوسی د.أیمن بن أسعد عبدە، لەکەنەدا).

## چیرۆکی دووەم

## ((جگەرەیەکم بدەنێ))

ئەمە چیرۆکی گەنجێکە لەسەر مەرگ پێی دەڵێن: بڵێ لا اله الا الله ئەویش دەڵێ: جگەرەیەکم بدەنێ..دووبارە دەڵێن: بڵێ لا اله الا الله. بەڵکو بەوە کۆتایی بەژیانی دەهێنرێ.

ئینجا دەڵێ: من لەوە بەریم جگەرەیەکم بدەنێ.

(لەکاسێتی شێخ علی القرنی ، الایمان و الحیاة)

## چیرۆکی سێ یەم

## ((من لەدۆزەخم))

ڕووداوێك لەشاری الریاض لەسەر یەکێك لەڕێگا خێراکان بەسەر سێ هەرزەکاردا هات کەلەناو ئۆتۆمبێلێکدا بوون دوو کەس مردن و سێ یەمیان لەسەرە مەرگ مایەوە پیاوێکی هاتووچۆ بۆ لای چوو – کە ئامادەی شوێنی ڕووداوەکە بوو، پێی گوت: بڵێ: لا اله الا الله ..پاش ئەمە دەستی بە قسەکردن کرد سەبارەت بە خۆی و دەیگوت: من لە سەقەرم..من لە سەقەرم..تاوەکو لەسەر ئەمە مرد – پەنا بە خوا – پاشان پیاوەکەی هاتووچۆ دەستی بە پرسیارکردن کرد سەبارەت بەمە و دەیگوت سەقەر چییە؟

تاوەكو وەلام لەكتێبی خوای گەورە بدۆزیتەوە:﴿ سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ المدثر: ٢٦ - (ئەو بێ ویژدانە بەسەریەوە ناچێت) دەبێت بیگەیەنمە ناو دۆزەخ. (٢٦) جا تۆ نازانیت دۆزەخ چیە. (٢٧) هیچ ئەندامێك ناهێڵێتەوەو دەست هەڵناگرێت (٢٨) پێستیان هەڵدەقرچێنێت و ڕەشی دەكات و دەری دەخات. (٢٩) نۆزدە فریشتە سەرپەرشتی دۆزەخ دەكەن. ﴾

(لەشریتی : كل من علیها فان)

## چیرۆكی چوارەم

## ((بەراستی جوێنی بە دین دا))

ئەوە چیرۆكی گەنجێكە -كە لەكاڵتەجاڕان بوو- دەگێرنەوە كە تووشی ڕووداوێكی تۆقێنەر بوو لەرێگای مەككە بۆ جدّە.

گێڕەرەوەی چیرۆكەكە كە ئامادەی دیمەنەكە بوو گوتی جا كاتێك رووكاری ئۆتۆمبێڵەكەو دیمەنە دەرەكییەكەمان بینی، من و ئەوانەی لەگەڵم بوون لەبرادەران گوتمان : دەچینە سەر ڕووداوەكە، تەماشا دەكەین بزانین حالی ئەم كەسە چۆنەو چی لێهاتووە، ئینجا كاتێك لەپیاوەكە نزیك بوینەوە بینیمان لەگیانەڵڵای ژیانیەتی، و تۆماركەرەكە (المسجِّل)یمان بینی كە لەسەر گۆرانیەكی بیانی بێ نرخ بوو ، چیرۆك بێژ دەڵێ: تەسەحیلەكەمان كوژاندەوە، پاشان سەیری پیاوەكەمان كرد و سەرنجی سەرەمەرگی ئەوامان دا پاشان گوتمان: ئەوە هەلێكە بەڵكو خوا -عزّ وجلّ- رزگاری

دونیاو دوارۆژی ئەم پیاوە بخاتە سەر دەستی ئێمە، ئینجا پێمان گوت: تۆ، بڵێ: لا اله الا الله . ئایا دەزانی لەگیانەڵڵای ژیانی چی گوت برام؟

خۆزگە ئەمەی نەگوتبا، بەراستی وشەیەکی تۆقێنەرو گەورەی درکاند ! بەراستی جوێنی بە دینی خوای پەروەردگاری جیهان دا، خۆمان بە خوا دەپارێزین لەبەدبەختیو سەرشۆڕی کۆتا خراپی ژیان.

## چیرۆکی پێنجەم

## ((لەنەخۆشخانە))

یەکێك لەپیاو چاکان دەڵێت: یەکێك لەوانەی کەلەپەیمانگایێك لەپەیمانگا زانستیەکان لەوڵاتی خۆمان دەیانخوێند دەڵێ:

سێ جار سوێند بە خوا دەخۆم‌و پێویستم بەوە نی یە کە درۆ بکەم بەراستی لەیەکێك لەنەخۆشخانەکان نەخۆش بووم، نەخۆشێك هێنرا و لەتەنیشت منەوە دانرا لەو ژوورەی کە تیایدا لەسەر خەوگەکە خەوێنرابووم..دەڵێ: ئەو نەخۆشە رەنگی زەرد بوو، ئینجا لەرۆژی داهاتوو رەنگی بۆ گەنمی گۆڕا، و لەرۆژی سێیەمیش رەنگی وەکو رەنگی ئێمە لێهات. دەڵێ: جا گوتم: بەڵکو دەستی بە چاکبوونەوە کردبێت ..بەڵام رۆژی چوارەم هاتەوە بینیم رەنگی رەش هەڵگەڕاوە.. لەرۆژی پێنجەم بەرە بەرە رەنگە رەشەکە زیادی دەکرد!!! دەڵێ: پاشان لەو پیاوە ترساین. بەراستی پێش ئەوە دەمناسی، لەو کەسانە بوو کە لەنوێژەکان دوادەکەوت، لەو کەسانە بوو کە بۆ دەرەوە گەشتی دەکردو ماددە بێ هۆشکەرەکانیان وەردەگرت..

لێی نزیك بومەوەو دەستم بە قورئان خوێندنەوە کرد لەسەری، دوایی هەستم بە دەرکەوتنی چەند بۆنێکی ناخۆش کرد بۆ لێی – پەنا بەخوا – دەڵێ: کاتێك دەستم کرد بە خوێندنەوەی قورئان لەسەری بەدەنگێکی بەرز زەڕی، منیش ترسام و

دوورکەوتمەوە، پاشان نەخۆشێکی تر پێمی گوت: بەردەوام به لەخوێندنەوە..دوایی گوتم: سوێند بە خوا لەسەری ناخوێنمەوە. گوتی : برۆ بۆ لای فلان ژووری تەنیشتمان، بانگی بکە با لەسەری بخوێنێ، پاشان گەنجەکەی تر هاتو دەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئان لەسەری. دەڵێ: دیسان جارێکی تر بە توندی زەڕی، هێشتا گەنجەکە لەسەر خوێندنەوەی قورئان لەسەری بەردەوام بوو تاوەکو بۆ جاری سێ یەم بەزەڕینێکی ترسناکەوە زەڕی. پاشان داوای دکتۆریان بۆ کرد، ئینجا دکتۆرەکە هاتو سەماعەکەی لەسەر سینگی دانا، پاشان گوتی: مرد.

بەڵێ بێگومان مرد و کۆتایی بە ژیان هێنا، لەم کاتەدا کە ئەو دیمەنە خراپەی هەبوو، لەبەر ئەوەی بەراستی ئەو خراپەکار بوو، لەلای خوای گەورە، بەبێ گرنگیدان بەسنووری، هەر یەکێك لەسەر ئەم حاڵە بێت ئەوا شایەنە کە بەوە کۆتایی بە ژیانی بهێنرێ وەکو پاداشتێکی گونجاو پڕ بەپێست پەروەردگاریش زوڵم لەکەس ناکات.

## چیرۆکی شەشەم

## ((لەناو ئۆتۆمبێل))

گێرەڕەوەی ئەم چیرۆکە یەکێك بۆی گێرامەوەو گوتی: من بۆ خوێندن لەویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بووم حاڵم وەکو ئەو گەنجانە بوو کە شەویان لەسەماکەو سەماکردن بەسەردەبرد، رۆژێکیان لەرابواردنو گەمەکردن دەگەڕاینەوەو هەندێکمان بە پێشکەوتن بۆ ئەو خانوەی کە تێیدابووین یەکێك لەئێمە دواکەوت پاشان ونمان کردو بەجێمان هێشتو گوتمان بەڵکو پاش کەمێکی تر دێت.

هەر چاوەڕێمان کرد بەڵام نەهات، پاشان دابەزین تاوەکو راستو چەپی بۆ بگەڕێین، پاشان لەکۆتاییدا گوتمان: بێگومان دەبێ لەو شوێنە بێ کە بۆ ئۆتۆمبێل دروست

دەكرێ لەژێرەوەی بیناكە ئینجا چووینە شوێنەكە بینیمان كە بزوێنەری ئۆتۆمبێلەكە هێشتا كاردەكات‌و هاوەڵمانیش ناجوولێ، وهێشتا مۆسیقا دەنگی دەدایەوە، كۆتایی شەوەوە تا ئەو كاتەی دەرگای سەیارەكەمان كردەوە، دوایی دەرگاكەمان كردەوە، بانگمان كرد: فلان، ئینجا بینیمان بەراستی لەوەتەی سەیارەكەی لەو شوێنە وەستابوو، ئەو مردبوو بەراستی ئەم كۆتاییە كاریگەرەی، ئەم گەنجە لەدڵی زۆرێك لەئێمە كڵپەی هۆشیاری‌و پەشیمانی‌و گەڕانەوەی بۆ لای خوای گەورە داگیرساند، دوایی بۆ لای خوا گەڕانەوەو چیتر نەیان خواردەوەو بەلای خراپەوە نەچوون بەڵكو خۆیان دابەدەستەوەو گەڕانەوە بە یارمەتی خوا پاشان بەتێڕامان لەحاڵی برادەرەكەیان كەلەسەر سەرپێچی خوا مرد – پەنا بە خوا – لەراستیدا كۆتایی یەكەی ئامۆژگاری بوو بۆ ئەو كەسەی ئامۆژگاری كردنی دەوێ، بەڵام بەفیڕۆدەرو جلفڕ دوورە پەرێزن لەمە.

## چیرۆكی حەوتەم

## ((لەبانكۆك))

ئەمە چیرۆكی گەنجێكی ترە لەو لادەرانەی كە گەشتیان بۆ بانكۆك دەكرد بۆ خراپەكاری‌و داوێن پیسی، لەكاتێكدا كە لەسەرخۆش كردن‌و خۆخەڵەتاندنی بوو چاوەڕێی یارەكەی دەكرد –بەراستی دەمێك دواكەوت– ئەمە زۆری نەخایاند مەگەر چەند ساتێك نەبێ تا ئەو كاتەی پێی گەیشت، جا كاتێك بینی بە پێوە چووە كڕنووش بۆی وەكو بە گەورە گرتنی، جا لەسەر شانەكان نەبێ هەڵنەستایەوە لەم كڕنووشە ریسوایەو كۆتایی بەژیانی هات، ئینجا خۆمان دەپارێزین بە خوا لەكۆتا خراپی ژیان.

# چیرۆكی هەشتەم

## ((شەوە سوورمكە))

لەم چیرۆكەدا چوار گەنج دێنە بەر باس، كە لەیەك ناوچە كاریان دەكرد، چەند ساڵێكیان بەسەردا تێپەڕی و مانگانەكانیان كۆدەكردەوە، ئینجا كاتێك گوێیان لەوڵاتێكی بەرەڵابوایە كە داوێن پیسی تێدایە بۆی دەچوون لەكاتێكدا ئەوان لەكارەكەیان دانیشتبوون لەپڕ گوێیان لەوڵاتێك بوو كە بۆی نەچووبوون، ئەوەی گرنگە ئەوەیە كە پەیمانیاندا دوای ئەوەی كە راوێژیان لەنێوان خۆیان كرد پاشان بڕیاریان دا كە ئەم جارە مانگانەكانیان كۆبكەنەوە بۆ ئەوەی گەشت بۆ ئەو وڵاتەی گوێیان لەخراپەكاریەكەی ببوو كاتی گەشتەكە هاتو سواری فڕۆكە بوونو ڕۆیشتن بۆ ئەو جێگای كە دەیانەوێ، زیاتر لەچەند حەوتەیەكیان پێچوو لەو وڵاتە لەكاتێكدا لەنێوان زیناو جۆرەها ئارەقە بوون، چەند كارێك كە خوای گەورە توڕە دەكات.

لەكاتێكدا كە لەشەوێك لەشەوەكان بوو، لەكاتێكی درەنگی شەو، بەئاشكرا بەرامبەر خوای گەورە دەوەستنەوە بەسەرپێچی كردنو خراپەكاری، لەوكاتەی ئەوان لەگەرمەی رابواردنو گاڵتەی ناشیرین بوون لەپڕ یەكێك لەو چوار گەنجە دەكەوێو لەخۆ دەچێ، هاوەڵانی بەپەلە بۆ لای دەچن تا بزانن چی یەتی، كە بینیان تاسان بەوەی كە گیانی دەرچوو ململانێی دەكرد لەگەڵ مردن، ئینجا ئیمان لەدڵی یەكێك لەهاوەڵانی جوڵاو پێی گوت: براكەم، بڵێ: لا اله الا الله، دواتر گەنجەكە ڕەتی كردەوە–پەنا بەخوا– گوتی: وازم لێ بێنە، كوپێ ئارەقی زیاترم بدێ، وەرە لام فلانە كچ، پاشان گیانی دەرچوو بۆ لای خوای گەورە لەكاتێك لەسەر ئەم بارە خراپە بوو، داوای سەلامەتیو تەندروستی چاك لەخوای گەورە دەكەین.

پاشان حاڵی سێ کەسەکەی تر کاتێك هاوەڵی خۆیان و ئەو کارەیەی بۆی گەڕایەوە بینی ئەوەبوو کە دەستیان بە گریان کردو لەسەماخانەکە دەرهاتن بە تۆبەکاری، هاوەڵی خۆیان لەدارەبازەوە ئامادەکرد، بەهەڵگیراوی گەڕاندیانەوە وڵاتەکەی، کاتێك گەیشتنە فرۆکەخانە دارەمەیتەکەیان کردەوە بۆ ئەوەی دڵنیابنەوە لەتەرمەکەی، ئینجا کاتێك تەماشای دەمو چاویان کرد بینینان کە دەمو چاوی رەشو لێڵ هەڵگەراوە – پەنا بە خوای گەورە.

## چیرۆکی نۆیەم

## لەدوورگەکانی هیند

چیرۆك بێژەکە ئەوەی کە شێخەکە لێی دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەسەر پشتی کەشتیەك بووین بۆ رزقو رۆزی لەدەوری وڵاتان بەو کەشتیە دەگەڕاین، گەنجێکی باش، گەنجێکی دڵپاكو خاوەن خورەوشتێکی جوان، خوا پەرستیمان لەرەنگو رووی بەیدەکرد، رووناکیو شادی لەسەر رووخساری شێوەیان دەدا، جگە لەنوێژو دەست نوێژ نەبێ هیچی دیکەی پێوە دیار نەبوو یان ئامۆژگاریکەرێکی رێنیشاندەر، ئەگەر کاتی نوێژ هاتبا بۆمان بانگی دەداو نوێژیشی بۆ دەکردین، ئینجا ئەگەر یەکێك لەنوێژکردن بەدواکەوتبا یان بەجێمابا ئەوا سەرزەنشتی دەکردو ئامۆژگاری دەکرد، بەدرێژایی گەشتەکانمان لەگەڵ ئێمە بوو هەر لە ئامۆژگاری ئێمەدا بوو . رۆژێك لەرۆژان دەریا ئێمەی فرێدایە دوورگەیەك لەدورگەکانی هیند پاشان بۆی دابەزینو وەکو دەریاوانەکانیش لەسەری راهاتبوون ئەوەبوو کە چەند رۆژێك بمێننەوەو لەم دورگانە پشو بدەن، لەدوای هیلاکی گەشتە درێژەکە کۆببنەوەو لەبازاڕەکانی شار بگەڕێن بۆ ئەوەی ئامۆترینی ئەو شتانەی لەناوی دەیبینن بۆ کەسانی خۆیان و منداڵەکانیان بکڕن پاشان لەشەودا بگەڕێنەوە بۆلای کەشتیەکە، یەکێك لەوان کە تووشی گومڕایی

بوو، گرفتاری شوێنەکانی گاڵتەو ئارەزوو خراپەکاریو دەستدرێژی بوو، ئەم گەنجە باشە هیچ کات لەکەشتی یەکە دانەدەبەزی، بەڵکو ئەم ڕۆژانەی لەناو کەشتی یەکە بەسەر دەبردو ئەو بەشانەی پێویستی بە چاککردنەوە هەبوو چاکی دەکردەوە، پەتەکانی لوول دەکردو گرمۆڵەی دەکردەوەو دارەکانی دەهێناو توندی دەکردن و بەزیکرو قورئان خوێندنو نوێژکردن خەریك بوو.

چیرۆك بێژ: دەڵێ بەفرمێسکەکان چاوی دەدرەوشایەوەو بەسەر ریشی دادەهاتە خوارەوە:لەیەکێك لەگەشتەکان و لەکاتێکدا گەنجەکە خەریکی ئەم کارانەی بوو لەناکاو هاوڕێیەکی لەکەشتی یەکە کە لەوانە بوو کە شوێنکەوتووی ئارزووی خۆی بوو سەرقاڵی کارە خراپەکانی بوو، لەجیاتی کاری چاك، سەرقاڵی خوڕەوشتە نزمەکان بوو لەجیاتی خوڕەوشتە بەرزەکان، ئینجا دەستی بە پستە پست کرد لەگەڵیو گوتی: هاوڕێکەم، بۆچی لەناو کەشتی دانیشتووی و نایەیتە دەرەوە؟ بۆچی دانابەزی تاوەکو دونیایێکی جیاواز لەدونیاکەت ببینی؟ ئەوە ببینی کە دڵ دەکاتەوەو دەروون هۆگر دەکات!من پێم نەگوتووی بۆ شوێنەکانی داوێن پیسی و تووڕەیی خوا وەرە، نەمگوتووە کە بێیتە باڕەکانو خوا لەخۆت توڕە بکەی، بەڵام وەرە سەیری یاریگای مارەکان بکە بزانە چۆن خاوەنەکەی یاری پێ دەکاتو لێی ناترسێ، سەیری سوارچاکی فیل بکە بزانە چۆن فیلەکە لموزی خۆی دەکاتە قاندرمەو پاشان هەردوو پێیو دەستی بڵند دەکات تاوەکو لەسەر یەك پێ رایدەگرێ.. ئەی هاوار هاوڕێکەم خۆزگە ئەو کەسەت دیتبایە کە بەسەر بزمارەکان دا دەڕوات کە چۆن ئارام دەگرێ، ئەو کەسە ببینی کە پشکۆ لەدەمی دەکات هەروەکو بڵێی خورمایە، ئەو کەسە ببینی کە ئاوی دەریا دەخواتەوەو بەئاسانی قوتی دەدات هەروەکو بلێی ئاوی فوڕات بە ئاسانی قوت بدات، برام دابەزەو سەیری خەڵك بکە!

دوایی ڕۆحی گەنجەکە بزوا بە هۆی شەوقی ئەوەی کە گوێی لێ بوو و گوتی: ئایا ئەوەی دەیڵێی لەدونیا هەیە؟

پاشان برادەر خراپەکە پێی گوت: بەڵێ، ئەمە هەر لەو دورگەیە هەیە، ئینجا دابەزە، ئەوەی دڵخۆشت دەکات ببینە، و گەنجە باشەکە لەگەڵ برادەرەکەی هاتە خوارێ، لەبازاڕەکانی شارەکەو شەقامەکانی سوڕانەوە تاوەکو بردیە ناو ڕێگە بچووکە تەسکەکان، ڕێگاکە کۆتاییانی پێ هێنا بەماڵێکی بچووك ئینجا گەنجە خراپەکە چووە ناو ماڵەکەو داوای لەگەنجە باشەکە کرد کە چاوەڕێی بکات و گوتی: دوای کەمێکی تر دێمەوە، بەڵام! ئاگادار بە نەکەی نزیکی خانوەکە بکەویەوە. گەنجەکە دوور لەدەرگاکە دانیشت کاتی بە قورئان خوێندنو زیکرکردن بەسەر دەبرد. لەناکاو! گوێی لەقاقایەکی بەرز بوو ، دوای ئەوە دەرگاکە کرایەوەو ئافرەتێك لێی دەرهات کە جلی شەرمو حەیای فڕێدابوو. گەنجە چاکەکە وتی ئەی هاوار! بەراستی ئەوە ئەو دەرگایەیە کە برادەرەکەم لێی چووە ژوورێ. دەرونی گەنجەکە جولاو لەدەرگاکە نزیك بوویەوەو گوێی گرت لەوەی کە لەماڵەکەوە ڕوودەدات، لەناکاو گوێی لەهاوارێکی ترو قاقایەکی بەرزی تر بوو، ئینجا لەدەرزی دەرگاکە سەیری کردو تێڕوانین دوای تێڕوانین کەوتو تێروانینەکان بەدوای یەکداهاتنو ئەویش شتێك دەبینی کە لەگەڵی ڕانەهاتبوو و لەپێشتر نەیبینیبوو، ئەوەی جێی بایەخە ئەوەیە کە گەڕایەوە شوێنی خۆی، کاتێك هاورێکەی دەرهات گەنجەکە بەپەلە چوو بۆ لای وەکو نارەزاییەك: ئەوە چی یە؟! قورت بەسەر! ئەوە کارێکە خوا توڕە دەکاتو ڕازی ناکات، ئینجا گەنجەکە گوتی: وس بە هەی کۆرە هەی بێ ئاگا، ئەوە پەیوەندی بە تۆوە نی یە. چیرۆك بێژەکە گوتی: لەکاتێکی درەنگی شەو بۆ لای کەشتیەکە گەڕاینەوە ، گەنجەکە بە بێداری مایەوە لەو شەوەی، بەبیر قاڵی لەوەی کە بینی، بەراستی سەهمی شەیتان لەدڵی پتەو بوو، تێڕوانینەکە لغاوی دڵی گرتە دەست، پاشان هەر کە ڕۆژ هەڵدەهات و بەیانی دەکردەوە

ئەو یەکەم کەس دابەزی بوو لەکەشتییەکەو تەنها سەیرکردن نەبێ هیچ کاری تری نەبوو، لەلای ئەو هیچی تر نەبوو سەیرکردن نەبێ، بۆ ئەو شوێنە دەرۆیشتن، جا هەر کە یەکەم جار دەیڕوانی دووەم جاریشی بەدوایدا دەهات، تاوەکو دەرگای بۆ دەکرایەوەو هەموو کاتەکانی رۆژەکەی لەوێ بەسەر دەبردو بەهەمان شێوە بۆ رۆژی دواترو دوای دوو رۆژ کەشتییەوانەکە ئەو گەنجەی لێ دیار نەماو پرسیاری دەربارەی کرد: بانگبێژ لەکوێ یە؟ کوانێ پێشنوێژمان؟ ئەو گەنجە چاکە لەکوێ یە، هیچ دەریاوانێك وەڵامی نەدایەوە، ئینجا فەرمانی پێکردن کە پەرتو بلاو بن بۆ گەڕان بە دوای، پاشان هاوڕێ خراپەکەی بۆ لای کەشتی یەوانەکە هاتو دانی بەوەنا کەوا بردویەتی بۆ شوێنێك بۆ زیناکردنو داوێن پیسیو ئێستاش بەبێ گومان لەوێ یە..پاشان کەشتییەوانەکە بەروویدا هاواری کردو وتی: بڕۆو بیهێنە ئێرە..ئایا لەخوا ناترسی..ئایا لەتۆڵەی ئەو ناترسی، خێراکە بڕۆ بیهێنە ئێرە، ئینجا هاوڕێکەی جار لەدوای جار چوو بۆ لای بەڵام بێ سوود بوو، نەیتوانی ئامادەی بکات لەبەر ئەوەی نەیدەویستو گەڕانەوەی لەگەڵ ئەوان رەت دەکردەوە، هیچ بەپەرچدانەوەیەك لەسەرکردەی کەشتی یەکەوە نەبوو مەگەر ئەوە نەبێ کە فەرمان بە چەند پیاوێك بکات کە بەزۆری ئامادەی بکەن، پاشان بەهێز رایان کێشا، بۆ سەرکەشتییەکە هەڵیانگرت...

چیرۆك بێژ گوتی: کەشتی یەکە کەوتە رێ بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتو دەریاوانەکان بۆ کارەکانیان رۆیشتن و ئەو گەنجەش لەسووچەیەکی کەشتی یەکە دەستی بە گریان کردو دەینرکاند تاوەکو وای لێهات کە خەریك بوو دەمارەکانی دڵی لەتینی گریان پارچە پارچە بێ، ئینجا یەکێکیان هەستا خواردنی پێشکەش بکات بەڵام نەیخوارد، لەسەر حاڵی کلۆڵی مایەوە لەم چەند رۆژەدا، شەوێك لەشەوان گریانو پڕمەکەی زیادی کردو هیچ کەسێك لەکەشتی یەکە نەیتوانی بنوێ، ئینجا کەشتی یەوانەکە هاتە لایو

پێی گوت: برا لەخوا بترسە چیت بەسەر هاتووە بەراستی نرکەنرکەکەت ئێمەی دوودڵ کردووەو ناتوانین بخەوین، قورت بەسەر چی حاڵی توی گۆڕی؟ هاوار بۆ تۆ چی کارەساتباری کردووی؟ ئینجا گەنجەکە وەڵامی دایەوە بە ئاخ هەڵکێشانەوە: وازم لێبێنە بێگومان تۆ نازانی چیم توش بووە. پاشان کەشتی یەوانەکە گوتی: جا چیت تووش بووە؟ لەو کاتەدا گەنجەکە عەورەتی بە دیار خست بینی لەخراپی ئەوەی توشی بووە، کەشتی یەوانەکە وەڕس بوو و لەرزی پێدا هات کاتێك ئەوەی بینیو گوتی: خۆم بە خوا دەپارێزم لەوە، کابتنەکە لەلای هەڵسا..

لەبەرەبەیان نیشتەجێیانی کەشتی یەکە هەڵسانەوە لەبەر هاوارێکی دەنگدراوە کە هەڵیانی ساند لەخەو ئینجا بۆ لای سەرچاوەکەی چوون ئەو گەنجەیان بینی کە مردووە و داری کەشتی یەکەی بە ددانەکانی گرتووە، کۆمەڵەکە گەڕانەوەو داوای کۆتا چاکی ژیانیان لەخودا کرد چیرۆکی ئەم گەنجە وەکو پەند مایەوە بۆ ئەو کەسەی کە دەشێ پەند وەرگرێ.

ولا حول ولا قوة الا بالله.

(شێخ أحمد القحطاني لەوتارێکی باسی کردووە)

# چیرۆکی دەیەم

## ئەو ئافرەتە سفورەی کەنوێژی نەدەکرد

یەکێك لەو خوشکانەی کە بە شوشتنی مردوو هەڵدەستان ئەم چیرۆکە راستەقینەیەمان بۆ دەگێرێتەوە دەڵێ:

رۆژێك خێزانێك پەیوەندی پێوەکردم داوای ئامادەبوونی منیان دەکرد بۆ شوشتنی ئافرەتێکی مردوو کە لەلای ئەوان بوو، منیش بۆلایان رۆیشتم، کاتێك چوومە ئەو ژوورەی مردووەکەی لێبوو لەکاتێکدا یەکەم کەس بووم کە چوومە ژوورەوە..

پاشان دانیشتوویماڵەکە هەڵسان بە داخستنی دەرگاکە بە کلیل، بەتەنیا لەژوورەکە لەگەڵ مردووەکە مامەوەو دوو دڵیم لەبەسەرهاتەکە کردو گومانم برد کە ئەم ئافرەتە کوژراوە، ئینجا لەدەرگای ژوورەکەمدا بەڵام کەس دەرگای لێ نەکردمەوە، ترسێکی زۆر دایگرتم پاشان دەستم بە خۆپارێزیو خوێندنی چەند ئایەتو دوعایێك کرد هەتا خۆم هێمن کردەوە، پاشان داوای یارمەتیم لەخوا کردو دەستم بە شوشتنی مردووەکە کرد، هەرچی پێویستم پێی بوو ئامادەکرابوو، جا کاتێك دەمو چاوی ئافرەتەکەم هەڵدایەوە بینیم کە رەنگێکی رەشی لەسەر بوو هەروەکو بڵێی پارچەیەك رەژووە، جارێکی تر هەستم بە ترس کرد بەڵام من هەر خۆم هانداو بڕیاری شوشتنیمدا بەهیوای پاداشتەکەی جا کاتێك دەستم بە شوشتنی لاشەی کرد گۆشتی لەدەستم وەکو لۆکە لەدەستم پارچە پارچە دەبوو، پاشان پەلەم کرد لەشوشتنیو ئامادەکردنیو لەم کارەم بوومەوەو نازانم چۆنیش تەواوم کرد، پاشان لەدەرگام دا تاوەکو دانیشتوانی ماڵەکە دەرگایەکەم لێ بکەنەوە، بڕوایان نەکرد کەوا من شوشتوومە، دووپاتم کردەوە کەوا بێگومان لەشوشتنی بوومەوە،کاتێك دەرگایان کردەوە بەپەلە دەرچوومو گەڕامەوە ماڵەوە،سێ رۆژ مامەوە نەدەنوستمو

نەکردەبومەوە لەگریان، پاشان پەیوەندیم کرد بە یەکێك لەزاناکانو ئەوەی بینیم بۆم باسکرد، ئەویش پێی گوتم: هەرچی رەشاتی یەکەیە ئەوە دەردەخات کە بێگومان ئەو نوێژی نەکردووە، هەرچی پارچە پارچە بونی گوشتەکەیە ئەوە دەردەخات کە بێگومان مکیاجی کردووەو خۆی دانەپۆشیوە، دوای کۆتا هاتنی سێ رۆژی پرسەکە بۆ لای کەسو کاری ژنەکە چووم تاوەکو لەبەسەرهاتەکە دڵنیاببمەوە وپێم گوتن: دەمەوێ تێبگەم کە بۆچی دەرگاتان لەسەرم کلیل دا؟

دوایی گوتیان: سوێند بە خوا پێشی تۆ سێ ژنی تر هاتن هەر هەموویان رەتی شووشتنیان کردەوە دوای ئەوەی دەمو چاویان بینی، کلیل دانی دەرگاکە نەبێ هیچ چارەسەرێکی تر نەبوو تاوەکو بەشوشتنی هەڵسی..

پاشان لەحاڵی ئافرەتەکەم پرسی، گوتیان: بەراستی نوێژی نەدەکردو خۆشی دانەدەپۆشیو بەردەوام مکیاج دەکرد.

خوایە کچو ئافرەتانی موسڵمانان بپارێزە، خوایە کۆتا ژیانمان باشبکە ئەی بەخشندەو میهرەبان.

## چیرۆکی یازدەم

## سایتێکی بەرەڵایی

گێرەوەی چیرۆکەکە دەڵێ: برادەرێکی زۆر نزیکم هەبوو کە لەجێی برا بوو بۆم، حەوتەی رابردوو لەرووداوی هاتووچۆ، رەحمی خوای کرد، خوا بەر رەحمەتی خۆی بخاتو ئارامیو خەم بیرچوونەوەش بەکەسو کاری ببەخشێ..ئەو برادەرە خاوەنی چەند پۆستەیەکی بەرەڵاییو رووتو قووت بوو.. پەنا بەخوا..سایتێکی بەرەڵایی هەبوو لەئینتەرنێت کە لەوێنەی سێکسی پێکهاتبوو..

کارەسات ئەوەبوو کە ئێمە هێما نهێنی یەکەی ئەم مەوقیعانەمان نەدەزانی. دەمانویست رەشی بکەینەوە..بەڵام نەمانتوانی..بڕواداران ئەو پیاوەیان لەسەر تابووت هەڵگیرابوو بەڵام کۆمەڵەی چەند وێنەیەکی رووتو قووتی وەردەگرت هەرچی دایکیەتی لەخەونی دا چەند کچێکی لەسەر گۆڕەکەی بینی کە بەسەر گۆڕەکەیدا تێدەپەڕینو میزیان لەسەر گۆڕەکەی دەکرد..ئەم دایکە هەژارە هیچ دەربارەی کێشە نادیارەکان نازانێ!! سوێند بە خوا ئەو کچانەی میزیان لەسەر گۆڕەکەی دەکرد ئەوانە بوون کەوا ئەو وێنانەیان بۆ سایتەکەی لەسەر ئەنتەرنێت دەنارد!! گفتوگۆمان لەگەڵ کەسانی کۆمپانیاکە کرد کە ناونیشانی ئەنتەرنێتی ئەویان بۆ چوو بوو وەڵامیان ئەوە بوو کە بەراستی ناتوانن هیچ کارێك بکەن!!

ئەی کۆمەڵەی پیاوان ئەم کوڕە مرد.. کاریگەریەکانی خوێن لەدڵمان دەهێنێ..تاکەی ئەم حاڵە وادەمێنێ!!

ئەم کۆمەڵە گڵاوو سایتە پیسانە ریسوایان کرد، ئەوەش بەهۆی کاریگەری شەیتانی جنۆکەو مرۆڤ خوا تۆڵەیان لێ بکاتەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو ناوچە ئینتەرنێتی یانەیان داناوە بۆ فریودانی خەڵکی!! تکای بڵاوکردنەوەی ئەو نامەیە دەکەم بۆ ئەوەی زیندووان دەرك بە دۆخیان بکەن بەر لەبەسەرچوونی کات و ئەو کەسەی سابتێکی ئەنتەرنێتی بەرەڵای هەیە یان کۆمەڵە پۆستەیەکی بەرەڵایی یان هاوبەشێکی لەگەڵی هەیە پێی دەڵێم: سوێند بە خوای بەرزو گەورە دەخۆم بێگومان ئەم خراپەکارانە سوودیان نی یە بۆت..بەڵکو خەمو پەشیمانیت زیاد دەکەن لەرۆژێك کە پەشیمانی سوودی نی یە!!

وحسبي الله ونعم الوكيل

# چیرۆکی دوازدەم

## مردن لەسەر کاری خراپ

ابن کثیر لەکتێبی (البدایة والنهایة) چیرۆکی شاعیر أحمد بن کلیبی باس کردووە، گوتویەتی: ئەوە کەسێکە لەوانەی بە ئاشقی لەناوچووە، ابن الجوزی لە(المنتظم) بەسەنەدی خۆی ئەمەی گێڕاوەتەوە: کی أحمد بن کلیب ئەو هەژارە فریوخواردووە ئاشقی هەرزەکارێك بوو پێی دەگوترا: (أسلم بن أبی الجعد) لەبەنی خلد بوو وەزارەتیان لەدەست بوو، واتە: وەزیرو دەرگاوانی پاشاکان بوون، ئەم شاعیرە چەند شیعرێکی بەسەر ئەم هەرزەکارەدا هۆنیەوە کە خەڵکی باسیان دەکرد، ئەم گەنجەش (أسلم) لەدانیشتگای شێخەکان دەیخوێند، جا کاتێك ئەوەی ابن کلیب دەربارەی گوتبوی پێی گەیشت شەرمی لەخەڵك کردو لەماڵی خۆی دوور کەوتەوەو لەگەڵ هیچ کەسێك دانەدەنیشت، پاشان خۆشەویستی ابن کلیب هەر زیادی کرد تاوەکو بەهۆی ئەمەوە نەخۆش کەوتو نەخۆشێکی توندی گرت بەشێوەیەك خەڵك لێی دەڕەوینەوەو نەیاندەزانی چییەتیو هەندێك لەشێخەکانیش لێی هەڵگەڕانەوە پاشان زانایێك پرسیاری نەخۆشییەکەی لێکرد؟ ئەویش گوتی: ئێوە ئەمە دەزاننو ئەزانن نەخۆشی من لەچیەو یەوەو دەرمانیش چی یە، سوێند بە خوا گەر (أسلم) سەردانی کردبام و تەنها جارێك سەیری کردبام چاك دەبوومەوە.

لەدوایی دا ئەو زانایە وای بە باش زانی کە سەر لە (أسلم) بداو داوای ئەوەی لێکرد کە سەردانی بکات بە نهێنی گەر جارێکیش بێت، ئەم پیاوە زانایە هەر داوای لە(أسلم) دەکردو تا وەڵامی سەردانی کردنی دایەوەو چوون بۆ لای ابن کلیب، جا کاتێك چوونە نزیك ماڵەکەی هەرزەکارەکە شەرمی کرد بچێتە ژوورەوەو بە پیاوە زاناکەی وت: ناچمە لای بەراستی باسی کردوومەو ناوی هێناوم بە پیاهەڵدانو ئەمەش جێگەی گومانو

تاوان خستنه پاڵەو منیش حەزناکەم بچمە ناو جێگای تاوانو گومان. پاشان زانایەکە بە هەموو شێوەیەك سوور بوو کە بچێتە ژوورەوە بەڵام ئەمەی نەکرد،پاشان زانایەکە پێی گوت: بێگومان مردووە چارنیە، جا ئەگەر لێی چویتە ژووری هەڵی دەستێنینەوە، جا (أسلم) گوتی: با بمرێ، من ناچمە شوێنێك کە خوا تورە دەکاتو رقی هەڵدەسێنێو نەچووە ژووری و ئەوێی بەجێ هێشتو گەڕایەوە ماڵەکەی.

پاشان پیاوە زاناکە چووە لای ابن کلیب و باسی ئەوەی بۆ کرد کە أسلم چی کردووە لەگەڵی و خزمەتکارە هەرزەکارەکەی ابن کلیب پێش ئەوە هاتووەتە لایو مژدەی ئامادەبوونی خۆشەویستەکەی پێدا ئەویش زۆر دڵخۆش بوو بەمە، جا کاتێك لەگەڕانەوەی لەلای ئەو دڵنیابویەوە گوتەکانی تێکەڵی یەکتربوونو دەروونی ناجێگیر بوو بەو پیاوە زانایە نێراوەی نێوانیانی گوت گوێ بگرەو ئەمەی دەیڵێم لەبەری بکە ئەی ابا عبدالله پاشان وتی:

أسلم يا راحةَ العليل رَفْقاً على الهائمِ النَّحيلِ

وصلُكَ أشْهى إلى فُؤادي مِنْ رَحْمَةِ الخالقِ الجَليلِ

پاشان پیاوە زاناکە پێی گوت: قوڕت بەسەر لەخوای گەورە بترسە، ئەم تاوانە گەورەیە چی یە؟

ئەویش گوتی: بێگومان ئەوە بوو کە بیستت – یان گوتی: گوتەکە ئەوەبوو کە بیستت.

چیرۆك بێژ دەڵێ پاشان پیاوە زاناکە لەلای دەرچوو، هێشتا نەگەیشتبووە ناوەڕاستی خانووەکە گوێی لەهاوارێك بوو و گوێی لەقیژەی مردنەکەی بوو بەراستی لەسەر ئەوە دونیای جێهێشت، پەنا بە خوا.

الحافظ ابن کثیر فەرمویەتی: ئەمە فریوخواردنێکی قێزەوەنەو ئابڕوچوونێکی گەورەیەو کارەساتێکی ترسناکە- ئەگەر ئەو پێشەوایانە باسیان نەکردبا ئەوا باسم نەدەکرد، بەڵام پەندی تیا هەیە بۆ خاوەن هۆشەکان‌و ئاگاداریەکە بۆ خاوەن کارامەو ئەقڵەکان کە داوای بەزەییو تەندروست چاکی لەخوا بکەن‌و پەنا بە خوا بگرن لەبێ باوەڕی لەوەی دیارەو نادیارە و کۆتاچاکی ژیانیان پێ ببەخشێت لەکاتی مردن بەراستی هەر ئەو بەخشندەو دەستکراوەیە.

## چیرۆکی سێزدەم

## کچێك دەنێژرێ کاتێ لەحاڵەتی سەماکردن دایە

سەعات چواری عەسرە، کاتەکە دەڕوات‌و شۆفێرەکەش لەدەرەوە چاوڕێ دەکات..کچەکە عەباکەی هاوێشتە سەر شانەکانی‌و سەرپۆشەکەی هاوێشتە سەر سەری..هیچ لەگۆڕی نیٚ یە دوایی لەناو ئۆتۆمبێڵەکە چاکی دەکەم..

سواری ئۆتۆمبێڵەکە بوو، چەفیەکەی لەسەر رووخساری لابرد، باری عەباکەی سازاند، جەختی لەسەر جانتاکەی کردەوە، مۆبایلەکەی‌و سەروەت‌و بۆنەکەی..هیچ شتێکی لەبیر نەکردبوو..

ئۆتۆمبێڵەکە لەسەرەخۆ بۆ ئارایشگا رۆیی، ئەو کچە لەجامەکەوە چاوی گێڕا. ئۆتۆمبێڵەکەی راگرت‌و دابەزی پاشان پەیوەندی بە شۆفێرەکەوە کرد : سەعات دوازدە بگەڕێوە لامان..

ئافرەتەکان ژمارەیان زۆرە لەناوەوە، هیچ من کڕیارێکی بەردەوام و جیاوازم، چارنیە دەبێ خاوەنی ئارایشگاکە ئەمە لەبەر چاوبگرێ ئەگەر نا..لەراستیدا چووە ناو ئارایشگاکەو پێشوازی کردنەکە پێشوازی کردنێکی گەرم بوو، لەگەڵ یەکترپێدەکەین ترس نەما، بێگومان زۆر دواناکەوین..

ئەوە گەرماوی رۆنی یە، خانمەکەم سەعاتێك چاوەڕێ بکە..

گۆڤارێکی عەزییەی وەرگرت کە تیایدا هەندێ نمونەی مۆدیلی قژ داهێنانی تێدابوو، لاپەڕەکانی هەڵدایەوەو لەگۆڤارێکەوە بۆ گۆڤارێکی تر دەڕۆیی لەنێوان گۆڤارە جیاوازەکان..

کاتژمێرێك بەسەرچوو، دەنگی بانگی مەغریب بەرزبۆوە، پاش ئەوە خۆی دایە دەست رێکخەری قژ، قژی وشك کردەوە، بانگەکە تەواو بوو کاتی نوێژەکە نەما..هەڵنەستا نوێژ بکات.. قژ رێکخەرەکە قژی رێکدەخستو پیستی خاوێن دەکردەوەو کچەکەش گوێی لەمۆسیقا لەسەرەخۆکە دەگرت، رووی وەرگێڕا بۆ گەرماوی ئاوی..

دووبارە دەنگی بانگ بەرزبوویەوە، بێگومان کاتی نوێژی عیشایە، چەند کاتژمێرێك زیاتر لەسەر دڵخۆشی یەکە بەردەوام نەبوو..

سەری خستە بەردەستی قژ رێکخەرەکە، مۆدیلی تەسریحەکەی هەڵبژارد، قژی پەرشو بڵاو بوو لەبەردەستیو بەدڵتەنگی بەجێی دەهێلیٚو سەیرێکی ئاوێنەی کرد خۆی نەناسیەوە، خەندەیەك لەسەر لێوەکانی وێنەی دەکێشاو دەیگوت: کەس پێشم ناکەویٚ..

روخساری نەخشاند..بەچەند رەنگێك بۆیەی کرد، روخساری جیاواز بوو، سەیری کاتژمێرەکەی کرد، عەبایەکەی هاوێشتە سەر شانەکانی و زۆر بە ئاگاداری یەوە سەرپۆشەکەی هاوێشتە سەر سەری..

سواری ئۆتۆمبێلەکە بوو..بۆ ماڵەوە بەخێرایی وتی بەراستی دواکەوتم..

کراسەکەی لەبەر کرد، لەئابڕۆی خۆی کەم کردەوە، لەراستیدا کراسەکەی سکی و هەموو پشتی بەدەرخستو کراسەکە هەڵچوو بوو بۆ سەرەوەی چۆکەکانی، لەدەوری

خۆی دەسوڕایەوە، بێگومان کەس ناتوانێت بەسەرم زاڵ بێ.. من شاژنی جوانی ئەم ئاهەنگەمە ! !

چووە ناو هۆڵەکەی نمایش‌و چاوەکان دەستیان بەسەیرکردنی کرد، هەموو دیقەتیان دەدایێ‌و لێی نزیك دەبوونەوە.. هەرچی گەوجەکانن بە لێدوانە تەشخەڵەبازەکان بە دوای دەکەوتن..

هەڵسایەوەو دەستی بەسەما کردن کرد..لەسەر ئاوازەکانی مۆسیقا سەمای دەکرد، لاشەی دەهەژا..

گۆرانی یەکان جیاواز دەبوون‌و سەماکەی جیاواز دەبوو..

کەس پێشی نەکەوتوو کەسیش سەری نەکەوت..

هەموو چاودێرییان دەکردو قسەیان دەربارەی دەکرد..

ئەم هەمووەی لەکوێوە هێنا ؟

چۆن ئەم هەمووە فێربووە ؟ چۆن ئەم هەموو گۆرانی یەی لەبەر کردووە ؟

هەمووی دەیەوێ پرسیاری لێبکات‌و وەڵامەکەی لێوە بزانێ..

ساتێك لەسەماکرنەکە وەستا، دوای ئەوە کەوتە سەر زەوی و هاوارەکان بەرزبونەوە، ئافرەتەکان پاڵی یەکتریاننا بۆ چوونە سەر شانۆکە، بانگیان کرد بەڵام وەڵامی نەدایەوە، جوڵاندیان بەڵام نەجوڵا..

جارێکی تر قیژەکان بەرزبوونەوە، هەڵیانگرت، ئاویان هێنا، دەستیان بەسەر روخساری داهێنا، بەڵام بێ سوود بوو..

دایك‌و خوشکەکانی گریان و دەنگی شین‌و گریان و ناڵە بەرزبوویەوە، باوکەکەو براکەی کەوتنە بەینیانەوە، کارەکان تێکەڵ بوون‌و ئاسوودەیی بۆ دڵتەنگی گۆڕاو قاقالێدانەکان بۆ گریان سەراوژێربوو، هەموو شتێك وەستا..

باوکەکە هاواری کرد: جلی لەبەرکەن..ئەوەی لەجەستەیەوە دیارە داپۆشن..بەراستی دکتۆرەکە ئامادەبوو دەستی گرت، سەماعەکەی لەسەر سنگی داناو کەمێك سەری لەقاندو چەند وشەیەك لەلێوەکانییەوە دەرچوون: بەراستی مرد..بەراستی مردووە..دەنگی گریان بەرزبویەوەو فرمێسکەکان رژان..

دایکەکە بەجەستەیەوە خۆی هاوێشتە سەر بچکۆڵە جوانەکەی‌و باوکەکە روخساری لەبەر دەستی شاردەوەو براکەشی هەنسکی دەداو دەیگوت: تەواو دایە گیان تەواو..

دایکەکە بە واق ورماوی هەڵسایەوەو هاواری کردو گوتی: بە راستی کچەکەم جوڵا..بینیم پێ‌و دەستەکانی دەجووڵاند، سەرنجدانەکان روویان کردە ئەو پێیان گوت: بەراستی مرد هەروەکو دکتۆرەکە گوتی..

باوك‌و براو خوشکەکان بەپەلە روویان تێکرد بۆ هێورکردنەوەی..دیمەنەکە ترسناکەو دیمەنەکەش ئازاردەرە..لەو کاتە دایکەکە کەوتە سەر زەوی..خوشکەکان کۆنترۆڵیان لەدەست دا لەسەر هەست‌و سۆزیان ..وبراکەش هاواری دەکرد..نەخێر..نەخێر..ئەستەمە..

باوکەکە ئارامی گرت، براکەی گرت‌و بەشێوە دوانێکی یەکلایی کەرەوە پێی گوت: خوشکەکانت دەرکەو با دایکیانیش هەڵگرن.. هەندێك لەژنانی خێزانەکە ئامادەبوون..

سەیری مردووەکەیان کرد، فرمێسەکەکان رژان، خوشکە گەورەکەیان دەستی لەسەر سەری دانا، وشەیەکی لەدەم دەرچوو:: ئابرۆچوون بوو ئابرووچوون..

بەپەلە بەرەو باوکی چوو پێی گوت: باوکە پێویستە بیشاریتەوە، مردوو شۆرەکە ئامادەبکەن، لەنێوان نوێژەکان بیشارنەوە، بەراستی ئەمە ئابرووچونە، خەڵکی چمان پێدەڵێن..

باوکەکە سەری لەقاندو گوتی: بەڵێ، بەڵێ، إنَّا لِله وإنَّا إلَيْهِ راجِعون..مردوو شۆرەکە هاتو تەختە بەندی شوشتنی ئامادەکردو کفن‌و بۆنەکانی داناو ئاوەکەشی ئامادەکردو گوتی: لاشەی مردووەکە لەکوێ یە؟ پلکەکەی لەپێشیەوە رۆیشت‌و دەرگاکەی کردەوە..وتی: ئەوە کچەکەیە کە بەداپۆشەرێکی ئەستوورو درێژ داپۆشراوە لەسەر خەوگەکە..دایکەکەش لەتەنیشت خەوگەکەوە وەستاوەو فرمێسکەکانی دەسڕییەوە.. مردوونامەکەی بەدەستەوە گرت، ناو: (........).

تەمەن: ١٨ ساڵ.

هۆکاری مردن: وەستانی دڵ..

دایکەکە دڵی تەنگ بوو، بەچەند وشەیەك دڵنەوایی کردن، پاشان بە لابردنی داپۆشەرەکەوە هەستاو دڵتەنگی گۆڕا بۆ تووڕەیی، مردووشۆرەکە گوتی: بۆچی لەسەر ئەم بارە بەجێتان هێشتوە، ئەندامەکانی لاشەی هەموو رەقبووە، چۆن کفنی بکەین؟ چۆن لەگۆڕی دەنێین؟

ئامادەبوان نەیانتوانی وەڵام بدەنەوە، کەمێك بێدەنگ بوون..

تووڕەیی مردوو شۆرەکە زیادی کردو دەنگی دایکەکەش تێکەڵ بەگریانەوە بوو گوتی: خۆ ئەو کاتەی مرد وانەبوو، سوێند بە خوا چەند ساتێك دوای مردنی وای لێهاتووە..

سوێند بەخوا کاتێ لەسەر شانۆکە کەوت سەمای دەکرد، بەشێوەی تەرمێکی خاو هەڵمانگرت، دکتۆرەکە ئامادەبوو، راپۆرتەکەی نووسی، ئەو کات دووپاتی کردەوە کەوا بێگومان کچەکەم لەدەستداوە، خۆم بەسەردادا، چووم ماچی بکەم‌و گریانم بۆی دەهات، هەستم کرد دەستی راستی بەرزدەبوویەوەو دەستی چەپی لەدواوەی پشتی دەهاتەوە، هەرچی قاچی چەپیەتی بەرەو دواوە گەڕایەوە، دۆخەکە ترساندمی، ئەو

كات قیژەم لێداو كەوتمە سەرزەوی، دواتر لەژوورەكەم خۆم بینییەوەو لەدەوروبەرمیش كچەكانم لەسەر خوشكیان دەگریانو لەبەر كۆتا بەر ئازارەكەی دەگریا..

دایكەكەش دایە پرمەی گریان و دەیگوت: من هۆكاری ئەوەم من ئەو كەسەم كە زیادەڕەویم لەپەروەردەكردنی كرد، ئەو كەسە بووم كە خەڵەتاندم، هاوار بۆ خۆم و بۆ ئەو لەسزای خوا..هاوار بۆ هەموومان..ئەم كچە سەماو گۆرانی پیّ خۆش بوو، لەدوایش لەسەر ئەمە مرد كە پێی خۆش بوو.. دواییش لەگۆڕەكەی دەشاردێتەوە.ئەی پەروەردگار بەزەییت پێدابێتەوە ئەی پەروەردگار ڕەحمم پیّ بكە ئەی پەروەردگار لەمنو لەویش خۆشبە..

هەوڵەكانیش دەستیان پێكرد بۆ گەڕاندنەوەی لاشەی بۆ سەر بارە سروشتی یەكەی، بەڵام هەموو هەوڵەكان بەسەرنەكەوتوویی بە كۆتا هاتنو ئەنجامەكەش ئەمە بوو: كە مردوو شۆڕەكە ڕەنجێكی زۆری دا لەكفن كردنی..لەساتی هێمنیو دوور لەچاوان بۆ گۆڕستان گوازرایەوە..و لەوێدا باوكو براكەو هەندێك لەخزمان نوێژیان لەسەر كرد..بەڵیّ سوێند بەخوا بەراستی بەحاڵەتی سەماكەری شارداریەوە.. پەنا بەخوا..

خوایە كۆتا ژیانمان چاك بكە ئەی بەزەییترینی بەزەیی پێكەران..آمین.

# چیرۆکی چواردەم

## کچێك بەربەرەکانی خوا دەکات

ئەم چیرۆکە راستەقینەیەو لەشاری غەززەی فەلەستینی ڕوویداوە.. لەوێدا کچێکی خۆرازێنەرەوەو دیار بەوێنەیەکی سەرنج راکێش لەناوەڕاستی مانگی رەمەزانی پیرۆز لەساڵی رابردوو..

ئەو کچە سواری ئۆتۆمبێلێك بوو کە بۆ کرێ بوو خۆرازاندنەوە بەسەریەوە دیاربوو و جێی سەرنج بوو لەراستی دیمەنی ئەم کچە شۆفێری ئۆتۆمبێلەکەی تورەکرد، پاشان بەشێوەیەکی تێگەیشتوانە گفتوگۆی لەگەڵ کرد بەوەی کە لەخوا بترسێ لەو پۆشاکەی کەلەبەری کردوەو خۆی دابپۆشیەو بەتایبەتی لەو مانگە پیرۆزە کە تیایدا سەرپێچیکەران روو لەخوای گەورە دەکەن..

جا چۆن بیردەکەنەوە لەوەڵامەکەی، لەراستیدا بەم دەستەواژەیە وەڵامی دایەوە.. وتی: ها تەلەفۆنەکە بگرەو قسە لەگەڵ پەروەردگارت بکە بۆ ئەوەی شوێنێکم بۆ لەدۆزەخ دابنیێو شوێنێکیش لەبەهەشت بۆ تۆ دابنیێ..

وەڵامەکەش لەخواوە خێرابوو وەڵامی داواکەی دایەوە، ئینجا گیانی کێشاو لەو کاتەدا کەلەسەر کوشنی ئۆتۆمبێلەکە دانیشتبوو وەفاتی کردو شوفێرەکەش بە خێرایی بۆ نەخۆشخانەی بردو هەروەکو بۆی دەچوو وابوو ئەم کچە خرایە ناو بەفرگەری نەخۆشخانەکەو کاتێك تەواو کەسو کارەکەی ناسرانو هاتن بۆ بردنەوەی، لەبەفرگری نەخۆشخانەی الشّفاء دەرهێنراو لاشەو روخساری بەرەنگێکی رەشی تاریك بەدەرکەوت پەنا بەخوا..تەنانەت نەیانتوانی مۆبایلەکەش لەناو دەستی دەربهێنن و وای لێهات کە لەگەڵیدا بشاردرێتەوە تاوەکو لەسەری ببێتە شایەت لەرۆژی دوایی.. پەنا بەخوا..

خوایە کۆتا ژیان و چارەنووسمان بەچاك بگێرە ئەی بەسۆزترینی سۆزداران.

# چیرۆکی پازدەیەم

## بەراستی من جێگای خۆم لەناو ئاگر دەبینم

لەناوچەی ئەبها لەیەکێك لەکۆلیژەکانی کچان..یەکێك لەدکتۆرەکان چیرۆکی ماشطة ی کچی فیرعەون دەگێڕێتەوە.. ئەو چیرۆکەش ئەوەیە کە کاتێك (فیرعەون) بانگی کردو پێی گوت: فلان، ئایا جگە لەمن پەروەردگارێکت هەیە؟ گوتی: بەڵێ. پەروەردگاری منو پەروەردگاری گەورەو خاوەن شکۆی تۆ ئەو پەروەردگارەی کە لەئاسمانە، پاشان فرمانی کرد مەنجەڵێك لەمس بێنن زەیتی تێدا بێ ئینجا مەنجەڵەکە گەرمکرا تاوەکو زەیتەکەی تێدا کوڵا.. پاشان فەرمانی بەوە کرد کە خۆیو منداڵەکانی فڕێبدرێنە ناوی، ئینجا گوتی: لەراستی دا پێویستی یەکەم پێت هەیە، گوتی: ئەو پێویستیە چی یە؟ گوتی: ئەوەیە کە ئێسقانی منو منداڵم لەیەك جل کۆبکەیەوەو بمانئێژی. (فیرعەون) گوتی: باشە ئەوەت بۆ دەکەین.

ئینجا فرمانی کرد کە منداڵەکانی فڕێبدرێنە ناویو لەم کاتەدا فڕێدرانە ناو مەنجەڵەکە..یەك بە یەك لەنێوان دەستەکانی دەردەهێنران بۆ فڕێدانیان بۆ ناویو ئەویش ئێسقانی منداڵەکانی دەبینی کە سەر زەیت کەوتبوو..سەیری دەکردو هەر بە ئیمان و خۆڕاگریش بوو. تا وای لێهات تەنها بێچوێکی شیرەخۆرەی مایەوە لەبەر ئەم بێچوە واپێدەچوو پاشەکشە بکات، لەم کاتەدا (بێچوەکە ) وتی: دایکە، خۆت فڕێدەو ئارامبگرە بێگومان تۆ لەسەر رێگەی راستیو بێگومان سزای دونیا کەمترە لەسزای دوارۆژ؛ پاشان لەگەڵ منداڵەکەی فڕێدرایە ناوی..

هێشتا دکتۆرەکە لەوتارەکەی نەبوویەوە لەپڕ هاوار رێك بەشەکانی هۆلەکەی هەژاند..ودەنگی گریان بەرەبەرە بەرز دەبویەوە..دوایی کە ئاوڕیان دایەوە قوتابیێکیان بینی..کە کراسێکی ئابڕووبەری لەبەر بوو..گریا تاوەکو کەوتە سەر زەوی..ئینجا قوتابیەکانی تر لەسەری کۆبوونەوەو بردیانە دەرەوە..دەرەوەی هۆلەکە تاوەکو ئارامو هێور بوویەوە پاشان گەڕاندیانەوە.. شێخەکەش هەر دەدواو باسی ئەو

نیعمەتەی دەکرد کە ئەم ژنە باوەڕدارە پێی دەبەخشرێ..بێگومان ئەو ئافرەتە هەر پێنج منداڵەکەی جوانەمەرگ کرد لەپێناو هەڵنەگەڕانەوەی لەدینی خوا..

لەناکاو دووبارە دەنگی هاوارەکە بە گوێماندا بەرزدەبوویەوە.. بینیمان کە هەمان قوتابیە کە بە تین دەگری تاوەکو جارێکی تر کەوتە سەرزەوی..ئینجا قوتابیەکان لەسەری کۆبوونەوەو بردیانە دەرەوە..تاوەکو هێمنو خامۆش بوویەوە پاشان گەڕندیانەوە..شێخەکەش هەر بەردەوام بوو لەدووانو باسی خۆشی بەهەشتو بەرامبەرەکەی دەکرد کە سزای ئاگری دۆزەخە..لەدوایی دا جارێکی تر ئەم کچە قیژاندی پاشان بەبێ دەنگی کەوتە سەر زەوی و لێوەکانی لەوەستان کەوت..هاوڕێکانی لەقوتابیەکان لەسەری خڕبونەوەو بانگیان دەکرد: فلان..فلان..بەڵام تەنها بەیەك وشەش وەڵامی نەدایەوە..هەروەکو ئەوەی کە لەکاتی سەرەمەرگدا بێت..قوتابیەکان دووبارە بانگیان کردەوە: فلان..فلان..لەناکاو کە چاوی دەبڕیە ئاسمان..دڵنیابوونەوە کەوا لەسەرەمەرگە..ئینجا دەستیان کرد بەشایەتی پێهێنانی..بڵێ: لا الە الا الله..بەڵام وەڵام نەبوو..وچاوتێبڕینەکەی زیادی کرد..قوتابیەکانیش تەلقینیاندەداد:

بڵێ: لا اله الا الله..

شایەتی بدە کە هیچ خوایەکی بە حەق نی یە جگە لە الله..

ئینجا کچەکە سەیرێکی کردنو گوتی:

شایەتی دەدەم..شایەتی.. دەدەم..شایەتی دەدەم کەوا بێگومان شوێنی خۆم دەبینم لەناو ئاگری دۆزەخ..ئێوە دەکەمە شایەت کەوا بەراستی شوێنەکەم لەناو ئاگری دۆزەخ دەبینم..ئەمەش کۆتا وتەی بوو کە ئەم کچە دڕکاندی. داوای کۆتا ژیانی چاك لەخوای گەورە دەکەین.

## چیرۆكی شازدەهەم

## قورئانێكم بدەنێ

ئەوەش گەنجێكی ترە كە بەرهەڵستیكەرو هاوبەشدانەر بووە بۆ خوای پاكو بێگەرد و مەزنو تووشی ئەو سەرە مەرگە بوو كە بە هەر شێوەیەك بێت توشی من و تۆش دەبێ. هاوڕێو برادەرەكانیشی هاتن بۆ لای و پێیان گوت: بڵێ: لا اله الا الله.

دواتر چەندەی هێنایی و بردی نەیتوانی هیچ بڵێ. پاشان لەدوا هەناسە توانی بڵێ: قورئانێكم بدەنێ..

ئەوانیش دڵیان خۆش بووز شادومان بوونو گوتیان: بەڵكو ئایەتێك لەكتێبی خوا بخوێنێتەوە دوایی بەمە كۆتایی بە ژیانی بێت..ئینجا ئەم گەنجە قورئانەكەی وەرگرتو بەدەستی خۆی بەرزی كردەوەو گوتی: ئێوە دەكەمە شایەت كەوا من بەبێ گومان كوفرم بە پەروەردگاری ئەم قورئانە كرد.

(لەشریتی شێخ علی القرنی، الایمان والحیاة)

## چیرۆكی حەڤدەهەم

## شای رخ

بەپیاوێك گوترا كە خووی بە یاری شەترەنجەوە گرتبوو لەو كاتەی كە لەسەر مەرگ بوو: بڵێ: لا اله الا الله. گوتی: (شاه رخ) واتە بەسەرتدا سەركەوتم..و(شاه رخ) ناوی دوو بەردە لەبەردەكانی شەترەنج لەبەر ئەوەی لەژیانی دا شەیدایی ئەوە بوو. پاشان لەسەر ناوبردنی ئەم دوو بەردە مرد پەنا بەخوا.

(لەكتێبی الجزاء من جنس العمل. د/سید حسین العفانی)

## چیرۆكی هەژدەهەم

## دووره.. تازه رۆیی

هشام لەأبی حفص ەوه گێڕاویەتەوەو گوتی: سەرم لەپیاوێكدا له (المصیصه) كه شارێكه لەسەر كەناری جیحان كه لەمردندا بوو . پێم گوت: بڵێ: لا اله الا الله.

ئینجا گوتی: تازه رۆیی.. پەرده دانراوه لەنێوان منو ئەو وشەیەو ناتوانم بیلێم.

## چیرۆكی نۆزدەهەم

## لەرەمەزان

گەنجێك لەدەرۆژی كۆتایی مانگی رەمەزان بوو خەڵكی لەرۆژووگرتنو هەڵسانەوەی شەوو زیندووكردنەوەی شەوانی قەدر و قورئان خوێندن دا بوونو هیوای چاكی دڵەكانو لێخۆشبوونی گوناهە رابردووەكان و رازی بوونی زانای نهێنیەكانیان دەخواست.

هەرچی ئەم گەنجەیە لەراستیدا لەجیهانێكی تر دەژیا..پلانی دادەناو دەیكێشا بۆ بینینی یاره تەلەفۆنی یەكەی.. هیوای دەخواستو خەونی دەبینی بەوەی كه ئەو شەوە لەباوەشی ئارەزووەكان بێ..وژوانەكه دروست بوو..شوێنی بینینی دیاری كرد، دەزانن لەكوێ؟ ژوانەكه لەنێوانێ ئەو دوو یاره لەیەكێك لەمزگەوتە پڕ نوێژكەرو شەونخونی كەران بوو، ئینجا ئەم گەنجە خۆی جوانو بۆن خۆشكردو بەرەو شوێنی ژوانەكه بەرێكەوت..شەیتانیش لەگەڵی رۆیشت تا هەڵی خەڵەتێنێ.. تووشی شتی پڕو پوچی بكات..لەوكاتەی كه ئۆتۆمبێڵەكەی بەرەو مزگەوتەكه لێدەخوڕی نەوەك بۆ پەرستنی خوای گەوره! بەڵكو بۆ پەرستنی ئارەزووی خۆی..لەناكاو لەیەكێك لەدوو ریانەكان به ئۆتۆمبێڵەكەیەوه خۆی به ئۆتۆمبێڵێكی تر دا كێشاو دوای كەمێك گیانی

لەدەستدا. بەگوێرەی ئەو كۆتایی ژیانەكەی چاوەڕوان نەكراو بوو..داوا لەخوا دەكەین كە لێی خۆشبێتو لەگوناهكارانی ئوممەتی محمدیش (ﷺ) لەیەكتاپەرستانیش خۆش بێت.

## ترسی پیاوچاكانی پێشینان لەكۆتا خراپی ژیان

بوخاری لەفەرمودە راستەكان دەگێڕێتەوە: لە(إبراهيمُ التَّيمیُّ)یەوە كە فەرموویەتی: هیچ وتەیەكم نەخستۆتە بەردەم كارەكەم كە نەترسابم لەوەی كە درۆ بكەم.

دووبارە بوخاری لەفەرمودە راستەكانی یەوە بۆمان دەگێڕێتەوە: لە عبدالله ی كوڕی مسعود رەزای خوای لێ بێت فەرمویەتی: ((بێگومان باوەڕدار گوناهەكانی وادەبینێ كە لەژێر چیاێیكەوە دانیشتبێ، دەترسێ كە بەربێتە سەری و بێ باوەڕیش گوناهەكانی بەم شێوەیە دەبینێ كە مێشێك بەسەر لوتی دا رۆییو دەستێكی بۆ درێژكرد..)) أبوشهاب فەرمویەتی بۆ سەر لووتی درێژكرد.

(ابنُ أبي مُلَيْكَةَ)ش فەرموویەتی: بە سی هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم كە هەموویان لەوە دەترسان كە تووشی دووڕوویی ببن. یەكێكیان نەیاندەگوت كە لەسەر باوەڕی جبریلو میكائیلە.

لە(الحسن)ەوەش دەگێڕدرێتەوە كە فەرمویەتی:

باوەڕدار نەبێ كەسی تر لەدووڕوویی نەترساوە و تەنها دووڕووش لەوە بێترس بووە. هیچ شتێكیش جگە لەپەشیمانی لەبەردەوام بوون لەسەر دووڕوویی‌و سەرپێچی كردن نابێتە هۆی ترسان، هەروەكو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾﴾ آل عمران: ١٣٥ ئەوانەش كە تاوانیان گوناهێك

ئەنجام دەدەن، یاخود ستەم لە خۆیان دەکەن (دوایی بە خۆیاندا دێنەوەو سزای) خوا دێتەوە یادیان، ئەوسا داوای لێخۆشبوون دەکەن، جا کێ هەیە کە لە گوناهان خۆش ببێت جگە لە خوا؟! هەروەها لەسەر گوناهو تاوانیان بەردەوام نابن، لە کاتێکدا دەزانن (ئەوە تاوانە). ﴾

**بەڵێ بەراستی ترسی پێشینان زۆربووە لەکۆتا خراپی ژیان.**

●ئەوە عومەرە لەو باسەی کە ابنُ سَعْد دەیگێڕێتەوە لەعامر بنِ رَبیعَةَ فەرموویەتی: عومەری کوڕی خەتتابم بینی کە پووشێکی لەسەر زەوی هەڵگرت ئینجا گوتی: خۆزگە ئەم پووشە بامایە! خۆزگە دروست نەبومایە! خۆزگە هەر هیچ نەباما! خۆزگە دایکم منی نەبوایە! خۆزگە لەبیرچووی باسنەکراو بوومایە.

●ئەمەش (سُفیانُ الثَّوري)ە شەوێك تاوەکو بەیانی دەگری، ئینجا پێی دەگوترێ: ئایا ئەم گریانەت لەسەر تاوانەکانە؟ ئینجا پوشێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و گوتی: تاونەکان لەوە کەمترن..لەراستیدا من لەترسی کۆتایی ژیانم دەگریم. (العاقبة في ذکر الموت والآخرة للإشبیلي : ١٧٥).

● عطاء الخفاف فەرموویەتی: سفیانم نەبینیوە مەگەر بەگریانەوە. ئینجا گوتم: چیتە؟ ئەویش گوتی: دەترسم لەیەکەم کتێبدا بەدبەخەت بم. (السیر٧/٢٦٦).

●سهلُ التُّستُریّ فەرموویەتی: ترسی راستگۆیان لەکۆتا خراپی ژیان لەکاتی هەموو بیرکردنەوەو جوولەیەکدایەو ئەوانەشن کە خوا وەسفی کردوون: ﴿وقلوبهم وجلة﴾.

# بەشی نۆیەم

## فیتنەی گۆڕ، خۆش گوزەرانیو سزاکە

ئەحمەدو ئەبوداود لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە بە إسنادێکی ڕاست کە فەرمویەتی: ((بەراستی بەندەی باوەڕدار کاتێك لەدابڕانیدایە لەدونیاو لەپێشوازی کردنی ڕۆژی دواییدایە فریشتەی روخسار سپی لەئاسمانەوە بۆی دادەبەزێ هەروەکو بلێی روخساری ڕۆژە، کفنێك لەکفنەکانی بەهەشتیان پێیەوتا چاو دەبینێ لەلای دادەنیشن، پاشان فریشتەی ڕۆح کێشان لەلای سەری دادەنیشێ دەڵێ: ئەی گیان پاك، بۆ لای لێخۆشبوونو ڕەزامەندی خوای گەورە دەرچە، ئینجا گیانی دەردەچێ هەروەکو چۆڕانەوەی دڵۆپێك لەدەمەوانەی کوندەیەك، پاشان گیانی دەکێشێت، ئینجا کاتێك گیانی کێشا بۆ چاوتروکانێکیش لەناو دەستی نایهێڵنەوەو دەیبەن، ئینجا دەیخەنە ناو ئەو کفنەو بۆنە خۆشە و بۆنێکی لێدەردەچێ لەشێوەی خۆشترین بۆنی میسك کە لەسەر رووی زەویدا بۆن کرابێ ئینجا بەرزی دەکەنەوەو بەلای هیچ فریشتەیەکدا ناڕۆن کە نەڵێن ئەم گیانە پاکە هی کێیە؟

ئینجا دەڵێن: فلانی کوڕی فلانە – بە باشترینی ناوەکانی کە لەدونیادا بانگیان پێدەکرد تاوەکو ئاسمانی دونیا ئینجا داوای کردنەوەی بۆ دەکەن، دوایی بۆی دەکرێتەوە پاشان لەهەر ئاسمانێك بۆ ئاسمانی دوای خۆی لەلایەن نزیکانی بەڕێ دەکرێ، تاوەکو دەگاتە کۆتایی ئاسمانی یەکەم، ئینجا خوای گەورەو شکۆدار دەڵێ: نامەی بەندەی من لەدەفتەرێکی بەرزدا دابنێن و بەندەکەی من بۆ سەر زەوی بگێڕنەوە بێگومان من هەر لەوە دروستم کردوون و بۆ ئەوەش دەیانگێڕمەوەو جارێکی تر لێیان دەردەهێنمەوە، ئینجا گیانی دەگەڕێندرێتەوە، دوایی دوو فریشتە دێنە لایو دادیدەنیشێنن، پاشان پێی دەڵێن: پەروەردگارت کێ یە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم

(الله)یە، ئینجا پێی دەڵێن: دینت چی یە؟ ئەویش دەڵێ: دینم ئیسلامە، ئینجا پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کێ یە کەلەنێوانتاندا نێردرابوو؟ ئەویش دەڵێ: ئەوە پێغەمبەری خوایە، ئینجا پێی دەڵێن: چی دەزانی؟ ئەویش دەڵێ: کتێبی خوام خوێندەوە دوایی باوەڕم پێی هێناو بەراستم زانی، ئینجا بانگ بێژێك لەئاسمانەوە دەڵێ کەوا بەندەکەم راستی کرد، جێگەیەکی لەبەهەشتەوە بۆ رایخەن‌و بەرگێکی بەهەشتی لەبەر بکەن‌و دەرگایەکی بەرەو بەهەشتی بۆ بکەنەوە، ئینجا لەباو بۆنی بەهەشتی بۆ دێ‌و گۆڕەکەی بۆ فراوان دەکرێ بە دووری بینینی چاوی‌و پیاوێکی روخسار جوان و بەرگ قەشەنگ‌و بۆن خۆش دێتە لای‌و دەڵێ: مژدەت لێ بێ بەوەی کە دڵت خۆش دەکات، ئەوە ئەو رۆژەی تۆیە کە پەیمانت پێدرابوو، ئینجا پێی دەڵێ: تۆ کێی؟ روخسارت بە روخساری پیاوێکی چاك دەچێ؟ دوایی دەڵێ: من کاری چاکی تۆم، ئینجا دەڵێ: ئەی پەروەردگار قیامەت هەڵسێنە، پەروەردگار قیامەت هەڵسێنە، تاوەکو بۆ لای کەس‌و کار و ماڵم بگەڕێمەوە.

لەراستیشدا کاتی دابڕانی بەندەی بێباوەڕ لەدونیاو بەرەو رۆژی دوایی چوونی، فریشتەیەکی روخسار رەش لەئاسمانەوە بۆ لای دێتە خوار، بەئەندازەی دووری بینینی چاو لای دادەنیشن، پاشان فریشتەی گیان کێشان دێت تاوەکو لای سەری دادەنیشێ، ئینجا دەڵێ: ئەی نەفسی پیس بەرەو رق‌و کینەی خوا وەرە دەرێ، ئینجا لەناو لاشەی پارچە پارچە دەبێ ئینجا گیانی دەکێشێ هەروەکو شیشێك لەناو سوفێکی تەڕ وەربهێنرێ دوایی دەیکێشێ، جا کاتێك کێشانی بۆ ماوەی چاو تروکانێکیش لەناو دەستی نایهێڵنەوەو دەیخەنە ناو ئەو بۆنە ناخۆشەو بۆنێکی لێدێ لەشێوەی بۆگەنیوترین لاشەی بۆگەنی سەرزەوی کە بۆنکرابێ ئینجا بەرزی دەکەنەوە، جا بەلای هیچ فریشتەیەکدا ناڕۆن کە نەڵێن ئەو گیانە پیسە هی کێ یە؟ ئینجا دەڵێن: فلانی کوڕی فلان بەناشیرینترینی ئەو ناوانەی کە لەدونیا پێی بانگکرابێ، تا کۆتایی پێدێنێ

بەئاسمانی دونیا، ئینجا داوای کردنەوەی بۆ دەکرێو بۆی ناکرێتەوە، پاشان ﴿ لا تفتَّح لهم أبواب السماء ﴾ دەخوێنێ دوای خوای گەورەو شکۆدار دەڵێ: نامەکەی لەنێو کتێبێکی پەستداری رەشدا دابنێن لەنزمترین ئەرز، ئینجا گیانی ئەو کەسە فرێدەدرێو رۆحەکەی بۆ لاشەی دەگەڕێتەوە، دوایی دوو فریشتە دێنە لایو دایدەنیشێننو پێی دەڵێن: کێ پەروەردگارتە؟ ئەویش دەڵێ: هاها هاها نازانم دوایی پێی دەڵێن: دینەکەت چی یە؟ ئەویش دەڵێ: هاها هاها نازانم ئینجا پێی دەڵێن: ئەو پیاوە کێ یە کە لەنێوانتاندا نێردراوە؟ ئەویش دەڵێ: هاها هاها نازانم، ئینجا بانگبێژێك لەئاسمانەوە بانگدەکات، کە بەندەی من درۆی کردو جێگەیەکی لەئاگری دۆزەخەوە بۆ راخەنو دەرگاییکی بەرەو ئاگری دۆزەخ بۆ بکەنەوە با گەرمیو گڕەی لێوە بوبیو گۆڕەکەی لەسەر تەسك دەکرێتەوە تاوەکو پەراسووەکانی دەچنەوە یەكو پیاوێکی روخسار ناشیرینو بەرگ ناشیرینو بۆن بۆگەن بۆ لای دێتو دەڵێ: مژدەت لێبێ بەوەی کە پەستت دەکات، ئەوە ئەو رۆژەتە کە پەیمانت پێدرابوو، ئینجا دەڵێ: تۆ کێی؟ روخسارت بە روخساری کەسێکی خراپ دەچێ، ئەویش دەڵێ: من کردارە خراپەکانتم، ئینجا: دەڵێ: پەروەردگارا قیامەت هەڵمەسێنە)).

# سزای بەرزەخ
# ئایا سزای بەرزەخ لەسەر گیانە یان جەستەیە یان لەسەر هەردووكیانە؟

بزانە كە لەراستیدا ئەهلی سوننەو جەماعە وای دەبینن كەوا رۆح لەلاشە جیایەو پێیەوەش پەیوەستە، شیخ الاسلام ابن تیمیە دەڵێ: ((سزاو خۆشگوزەرانی لەسەر نەفس و جەستەیە بە یەكدەنگی ئەهلی سوننەو جەماعە، نەفس دوور لەجەستە خۆشی و ناخۆشی دەبینێ‌و سزا دەدرێ كە پەیوەستە بە جەستەو جەستەش پێیەوە پەیوەستە، ئینجا خۆشی و ناخۆشی لەم بارەدا لەسەر هەردوكیانە پێكەوە، هەروەكو رۆح كە دوور لەجەستە دەبێ)).

كۆمەڵێكیش گوتویەتی: ئەوە تەنها لەسەر رۆحە. خواش زاناترو داناترە بەمە.

# كۆتایی

بەپشتیوانیو یارمەتی یەكی تەواوی خوای گەورە كتێبەكە تەواو بوو خوای گەورەش ئەوە دەزانێ كە هیچ تواناو هێزێكمان نی یە بۆ كردنی هیچ شتێك مەگەر بە یارمەتی خوای باڵادەستو گەورەو ئەگەر بە ویستی ئەو نەبا هیچ شتێك نەدەبوو نەدەبێتیش، جگە لەهەوڵو تێكۆشانیش هیچی تر لەسەر مرۆڤ نی یە و هەر خوای گەورەش سەرخەرو رێنیشاندەرە بۆ رێگای راست.

لەراستی دا هەوڵی كۆكردنەوەی هەموو بەندێكی ئەم كتێبەم لەچاكترینی سەرچاوەو كتێبو دانراوەكان داناوە لەبەر دو وشت:

(یەكەم): بۆ ئەوەی ببێتە كتێبێكی چاكی خاوەن بەهایەكی زانستیو بەبێ هیچ ناراستیو لەسنوور دەرچونێك ئەوەی لەكتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەكەی (ﷺ) دا هاتووە دەربخاتو روونبكاتەوە، چونكە كەسی وا هەیە كەوا پشتی بە چەند فەرمودەیەكی دروستكراو زۆر لاواز بەستووە بۆ ئەوەی خەڵكی بترسێنێ — بەرای خۆی — بۆ ئەوەی بۆ لای خوا بگەڕێنەوەو ئەمەش رێگەی پێنادرێ، دوایی پێویستە كە ئەو پەیامانەی لەخواو پێغەمبەرەكەیەوە بەخەڵكی دەگەیێنرێ لەسەر ئەو بنەمایانە بێ كەوا بە راست زانرابێو پشتراستكرابێتەوە نەوەك بەوەی كەوا بە لاوازەو دانراوەو زۆریش لاواز بووە مەگەر فەرموودەی لاواز بۆ ئەوە باسكرابێ كە خەڵكی لێ ئاگاداربكەینەوە یان بۆیان روونبكەینەوە بۆ ئەوەی لێیەوە ئاگادار بن.

(دووەم)یش: ئەو ترساندنو ئامۆژگارییەی لەم كتێبەدایە بۆ ئەوەیە بەڵكو ببێتە هۆكارێك بۆ ئەوەی پێش كار لەكارترازان هەر یەكێكمان بە خۆی رابگات، دوایی لەئاگری دۆزەخەوە بۆ رەحمەتی خواو بەهەشتو رەزامەندی رابكات. ئەو كەسەش راستی گوتوە كە دەربارەی بەردەوام بوون لەسەر سەرپێچی یەكانو قینی خوای گەورە گوتویەتی:

تَفْنَى اللَّذاذةُ ممَّن نال صبوتها  مِنَ الحرام ويَبْقَى الإثْمُ والعَارُ
تَبْقَى عَواقِبُ سُوءٍ في مَغَبَّتَها  لا خيرَ في لذَّةٍ من بَعْدِها النَّارُ

واتە: ئەو كەسەی حەرام تامەزرۆی بكات ئەوا تامو چێژەكەی لەدەست دەداتو گوناهو بێ ئابڕوویی بۆ دەمێنێتەوە، دواهاتەكانی خراپەش لەشوێنی دیار نەمانی دەمێنێتەوەو هیچ چاكی یەك لەو لەززەتە نی یە كە ئاگری لەدوایە.

برای موسڵمان لەخوا بترسە لەوەی كە نەفست توشی شتێكت بكاتو بەوەندە تەمەنەش رابگە كە ماوتەو هەوڵو كۆششیشت زیاد بكە لەپێناو رەزامەندیو گوێڕایەڵی خوای گەورە و بیر لەفەرمودەی خوای گەورە بكەوە: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ الزمر: ئەی پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەكانم.. ئەوانەی كە خۆتان گوناهبار كردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، چونكە بەڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست و دروست بكەن، خوا لەهەموو گوناهو هەڵەكانتان خۆش دەبێت، چونكە بێگومان ئەو خوایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیە و زۆر بە سۆزو میهرەبانیشە. ﴾.

# ناوەڕۆک



| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|
| ٣ | پێشەکی |
| ٧ | پێشەکی وەرگێڕ |
| ١٣ | **بەشی یەکەم: باس کردنی ئاگر لەقورئانی پیرۆز** |
| ٢١ | نمونەی منو نمونەی ئوممەتەکەم |
| ٢٣ | **بەشی دووەم سیفەتی ئاگر** |
| ٢٣ | ئاگردەبینێ قسە دەکا |
| ٢٤ | چینو پلەکانی ئاگر |
| ٢٤ | گڕو تینی گەرماییەکەی |
| ٢٦ | تاریکایی و ڕەشیو پرۆشکەکانی ئاگر |
| ٢٦ | دۆڵو چیاکانی ئاگر |
| ٢٧ | قوڵیو دووری بنەکەی |
| ٢٩ | زنجیرەکانی ئاگر |
| ٣٠ | مارو دووپشکەکانی ناو ئاگر |
| ٣٢ | خواردنەوەی ئەهلی ئاگر |
| ٣٤ | خواردنی ئەهلی ئاگر |
| ٣٥ | گەورەیی لاشەی ئەهلی ئاگر |
| ٣٧ | شیوەنو گریانی دۆزەخیەکان |
| ٣٨ | فریشتەکانی ئاگر |
| ٤١ | **بەشی سێیەم: حالو گوزەرانی ئەهلی ئاگر** |
| ٤٢ | سوک ترین سزای ئەهلی ئاگر |

| | |
|---|---|
| ئەوانەی یەکەم جار ئاگریان پێ گەرم دەکرێ | ٤٣ |
| مشتو مڕی نێوان بە هەشتو ئاگر | ٤٦ |
| بانگهێشتی خوا بۆ سوکترین سزای ئەهلی ئاگر | ٥٠ |
| بانگ کردنی ئەهلی ئاگر بۆ بەهەشتیەکان | ٥١ |
| بانگ کردنی ئەهلی بەهەشت بۆ ئاگرنشینەکان | ٥٢ |
| ئاخافتنێکی گرنگ لەنێوان پیاوێکی بەهەشتیو پیاوێکی ئەهلی ئاگر | ٥٣ |
| دوو رووەکان لەژێرەوە ژێرەوەی ئاگردان | ٥٥ |
| سیفەتی دووروویی‌و دوورووەکان | ٥٦ |
| گرنگترین سیفاتی دوورەکان، کە لەقورئان دا هاتووە | ٥٧ |
| (١) تێکدانی زەوی و چاکسازی نەکردنی | ٥٧ |
| (٢) تۆمەتبارکردنی باوەڕداران بەوەی نەفامو گێلن | ٥٨ |
| (٣) فێڵ کردن لەباوەڕداران بەوەی لەلای ئەوان خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن، پاشان لەلای پێڕی خۆیان کوفر ئاشکرا دەکەن | ٥٨ |
| (٤) گوێ نەدانیان بە شەرعی خوا لەلایەك، لەلایەکی تریش قەدەغەی خەڵك دەکەن کەوا حوکم بکەن بەوەی خوا ناردویتە خوار | ٥٩ |
| ٥ـ کافرەکان دەکەنە دۆستو خۆشەویستی خۆیان | ٥٩ |
| (٦) فەرمان کردن بە خراپەو قەدەغەکردنی چاکە: | ٦٠ |
| جۆرەکانی دووروویی (نفاق) | ٦١ |
| حوکمی دوو رووی(النفاق) | ٦٢ |
| پاشەگەزبوونەوە(الرّدە) | ٦٣ |
| الفسق | ٦٥ |
| الضلال: | ٦٦ |
| الطواغیت | ٦٦ |
| لێدوانێك بۆ دووڕووان | ٦٧ |

| | |
|---|---|
| خۆش گوزەرانترین کەس لەدونیا (لەکاتێك کە ئەهلی ئاگرە) | ٧٤ |
| پردی (صراط) لەسەر دۆزەخە | ٧٤ |
| رۆیشتنی باوەڕدارەکان بەسەر (صراط)و جیاواز کردنەوەی باوەڕدارەکان لە دووروومەکان | ٧٧ |
| ئایا پەڕینەوە لەسەر (صراط) تەنها بۆ باوەڕدارانەو موشریکەکان ناگرێتەوە؟ | ٨١ |
| ماناو لێکدانەوەی ئایەتی (وأن منكم إلا واردها) | ٨٣ |
| مشتو مڕو دەمەقاڵێ نێوان ئەهلی ئاگر | ٨٦ |
| (١) دەمەقاڵێ لەنێوان بەندەکانو خواکانیان | ٨٦ |
| (٢)دەمەقاڵێ دەستو پێوەندەکان لەگەڵ سەرکردە گومڕاکانیان | ٨٨ |
| (٣) دەمەقاڵێی خەڵکە سادەکان لەگەڵ پادشاو ئەمیرەکان | ٩٠ |
| (٤) دەمەقاڵێ نێوان کافرو شەیتانەکەی | ٩٣ |
| (٥)دەمەقاڵێ نێوان مرۆڤ و ئەندامەکانی: | ٩٤ |
| (٦) دەمەقاڵێ نێوان جەستەو رۆح | ٩٤ |
| (٧) بێ ئومێد بوونی کافرەکانو گەورەکانیان | ٩٥ |
| هاژوانی کافرەکان بۆ لای ئاگر | ٩٦ |
| هەمە چەشنی سزا لەنێو ئاگر | ١٠١ |
| (١)الصَّهر: | ١٠١ |
| (٢)تەفسیری ئایەتی | ١٠٢ |
| (٣) راکێشان لەسەر دەمو چاو | ١٠٤ |
| (٤)سزادان بە هەڵکشان بۆ سەرەوە سەرەوەی ئاگر پاشان فڕێ دەدرێنە ناوی | ١٠٥ |
| (٥) سزادان بەسوڕانەوە لەناو ئاگر | ١٠٧ |
| (٦) سزادان بە فڕێدانە ناو شوێنێکی تەسك | ١٠٧ |
| (٧) سزادان بە دەردو نەخۆشی | ١٠٨ |
| (٨) سزادان بە بۆنی بۆگەنو ناخۆش | ١٠٨ |

| | |
|---|---|
| (٩)سزادان بە مردن، مردنیش نیە | ١٠٩ |
| (١٠) سزادان بە هەڵپروزانی دەمو چاو | ١١٠ |
| (١١) سزای بەردەوام | ١١١ |
| (١٢) گەورەترین سزای ئەهلی ئاگر نەدیتنی خوای گەورەیە | ١١٢ |
| دۆزەخیەکان | ١١٥ |
| مانەوە لەنێو ئاگر بێ مردنو لەناوچوون | ١٢٠ |
| هەر کاتێك پێستیان سوتاو برژا | ١٢١ |
| دوایین کەس کە لەئاگر دێتەدەرەوە | ١٢٥ |
| رۆژوو مانگ | ١٢٥ |
| **بەشی چوارەم: ئەو کردەوانەی دەتباتە ناو ئاگری دۆزەخ** | **١٢٧** |
| پێناسەی گوناهی گەورە (الكبيرە) | ١٢٩ |
| ١- کوفرو، هاوەڵ دانان بۆ خوا | ١٣٣ |
| ٢- مەرایی یان ریابازی | ١٣٤ |
| ٣-کوشتنی یەکێك بە ناهەق: | ١٣٥ |
| ئەو کەسەی خۆی دەکوژێت | ١٣٦ |
| ٤-سیحر | ١٣٧ |
| ٥- نەکردنی نوێژ (ترك الصلاە) | ١٣٩ |
| ٦- نەدانی زەکات: | ١٤١ |
| ٧- شکاندنی رۆژێك لەمانگی رەمەزان بەبێ عوزر | ١٤٢ |
| ٨- نەچوونە ماڵی خوا | ١٤٤ |
| ٩-خراپە کردن لەگەڵ دایكو باوك: | ١٤٥ |
| ١٠-وازهێنان و سەردانی نەکردنی خزمو کەس: | ١٤٧ |
| ١١-زینا: | ١٤٩ |

| | |
|---|---|
| ١٢- نێربازی (اللواط) | ١٥١ |
| ١٣-سوو (الربا) | ١٥٢ |
| ١٤-خواردنی ماڵی هەتیوو ستەم کردن لێیان: | ١٥٣ |
| ١٥-درۆکردن | ١٥٤ |
| ١٦- هەڵاتن لەجەنگ | ١٥٥ |
| ١٧-خیانەت کردنی ئیمام لەگەڵەکەی و ستەم لێکردنیان | ١٥٦ |
| ١٨-خۆ بەزل زانین‌و کەیف بە خۆهاتن | ١٥٧ |
| ١٩- شایەتی دان  بە درۆ | ١٥٨ |
| ٢٠-خواردنەوەی ئارەق و حەشیشە: | ١٥٩ |
| ٢١-قومارو مەیسیر | ١٦١ |
| یاری کردن بە وەرەقە | ١٦٢ |
| ٢٢- بوختان کردن لە ئافرەتی داوێن پاك | ١٦٣ |
| ٢٣-دزین و خیانەت کردن لەغەنیمە(الغلول) | ١٦٤ |
| ٢٤-دزی کردن | ١٦٦ |
| ٢٥-رێگری | ١٦٧ |
| ٢٦-سوێند بە درۆ خواردن بە ئەنقەست (الیمین الغموس) | ١٦٩ |
| ٢٧-دەست درێژی کردن‌و ستەم | ١٧٠ |
| ٢٨- خواردنی ماڵی حەرام | ١٧٣ |
| ٢٩- قازی و دادوەری خراپ | ١٧٤ |
| ٣٠-رەشوە | ١٧٦ |
| ٣١-خۆ بەیەکتر چواندن چ نێر بۆ مێ چ مێ بۆ نێر: | ١٧٧ |
| ٣٢- گەوادو بێ ئابرو | ١٧٨ |
| ٣٣-مارە بەجاش (المحلل والمحلل له) | ١٧٩ |

| | |
|---|---|
| ٣٤-خۆ نەپاراستن لەميز | ١٨١ |
| ٣٥-شاردنەوەی عيلم | ١٨٣ |
| ٣٦-خيانەت كردن | ١٨٤ |
| ٣٧-منەت كردن لەخێر و صەدەقە | ١٨٦ |
| ٣٨-سيخوری كردن | ١٨٨ |
| ٣٩- نەميمی كردن | ١٨٩ |
| ٤٠-لەعنەت كردن لەخەڵك | ١٩٠ |
| ٤١- غەدر كردن و بەجێ نەهێنانی پەيمان | ١٩٢ |
| ٤٢- بە راست زانينی فاڵ چیو ئەستێرە ناس | ١٩٣ |
| ٤٣-بە گوێ نەكردنی ئافرەت بۆ پياوەكەی (نشوز المرأه علی زوجها) | ١٩٧ |
| ٤٤- وێنەگرتن | ١٩٩ |
| ٤٥- دەم و چاو رنينەوەو شين و يەخە دڕان | ٢٠١ |
| ٤٦-ئەزيەت دانی جيران و خەڵكی تر | ٢٠٢ |
| ٤٧-لەبەركردنی حەريرو زێڕ بۆ پياوان | ٢٠٣ |
| ٤٨-سەرپێچی كردنی بەندە (عبد) | ٢٠٤ |
| ٤٩-سەربڕين بۆ غەيری خوا | ٢٠٥ |
| ٥٠-ئەو كەسەی بە ئەنقەست خۆی ناداتە پاڵ باوكی | ٢٠٦ |
| ٥١- دەمە قاڵی و دژايەتی كردن | ٢٠٧ |
| ٥٢- گرتنەوەو قەدەغەكردنی پاشماوەی ئاو | ٢٠٨ |
| ٥٣-كەم كردنی پێوان و تەرازوو | ٢٠٩ |
| ٥٤-دڵنيابوون لەمەكرو فێڵی خوا | ٢١٠ |
| ٥٥- بێ ئومێد بوون لەرەحمەتی خوا | ٢١٢ |
| ٥٦-قۆرخ كردن (الاحتكار) | ٢١٣ |

| | |
|---|---|
| ٥٧-زەرەر گەیاندن بە وەسیەت | ٢١٤ |
| ٥٨-جنێو دان بە یەكێك لەهاوەڵان | ٢١٥ |
| **بەشی پێنجەم: ئەوانەی مژدەیان پێدراوە بە ئاگر** | **٢١٧** |
| ١- ئیبلیسی نەفرەت لێكراو | ٢١٧ |
| بم هێڵەوە تا رۆژی قیامەت | ٢٢١ |
| وتاری ئیبلیس لەنێو ئاگر | ٢٢٤ |
| ٢- قابیل | ٢٣٦ |
| ٣-كەنعانی كوڕی نوح | ٢٣٩ |
| ٤-٥ خێزانی نوح و خێزانی لوت | ٢٤٥ |
| ٦-نەمرود | ٢٤٦ |
| ٧- ئازەری باوكی ابراهیم | ٢٥١ |
| ٨- قداری كوڕی سالف | ٢٥٥ |
| ٩- فیرعەون | ٢٦٤ |
| ١٠- هامان | ٢٦٧ |
| ١١- قارون | ٢٦٩ |
| ١٢-خاوەنی دوو باغەكە | ٢٧٤ |
| ١٣-موساو سامیری | ٢٧٨ |
| ١٤-عمرو بن لحی الخزاعی | ٢٨٧ |
| ١٥-أبو جهل | ٢٩٠ |
| ١٦-أبو لهب | ٢٩٧ |
| ١٧- دایكی جەمیل | ٣٠١ |
| ١٨-وەلیدی كوڕی موغیرە | ٣٠٤ |
| ١٩-عقبة بن أبي معیط | ٣٠٨ |

| | |
|---|---|
| ٢٠-(عاص)ی کوڕی (وائل) | ٣١٢ |
| ٢١- (أبی بن خلف) | ٣١٥ |
| ٢٢- (امیه)ی کوڕی (خلف) | ٣١٨ |
| ٢٣- (نچر)ی کوڕی (حارپ) | ٣٢٢ |
| ٢٤- (عتبه)ی کوڕی (ربیعه) | ٣٢٦ |
| ٢٥-(شیبه بن ربیعه) | ٣٣٠ |
| ٢٦- کعب بن الأشرف | ٣٣٢ |
| ٢٧- حیَی کوڕی أخطب | ٣٣٦ |
| ٢٨-عبدالله کوڕی ابی کوڕی سلول | ٣٤٤ |
| ٢٩- مسیلمه الکژاب | ٣٥٦ |
| ٣٠-المسیح الدَجّال | ٣٦٠ |
| ٣١- یَأجُوج و مَأجُوج | ٣٦٩ |
| ٣٢- هاوەڵانی شەموو | ٣٧٤ |
| ٣٣-أصحاب الاخدود | ٣٧٩ |
| ٣٤- هاوەڵانی فیل: | ٣٨٥ |
| ٣٥-بکوژی (عمّار)ی کوڕی (یاسر) | ٣٩٣ |
| ٣٦-ئەو کەسەی دزی لەحاجیەکان دەکرد لەگەڵ ئەو کەسەی دزی لەماڵی پێغەمبەری خوا کرد ﷺ | ٣٩٤ |
| ٣٧-خاوەنی پشیلەکە | ٣٩٥ |
| ٣٨-ئەو ئافرەتەی بە زمانی جیرانەکانی ئەزیەت دەدا | ٣٩٥ |
| ٣٩-ئەو وتاربێژو بانگخوازانەی ریابازی دەکەن | ٣٩٦ |
| ٤٠- دزی کردن لەغەنیمەت | ٣٩٧ |
| ٤١- ئەو کەسەی فەخرو شانازی بە خۆی کرد | ٣٩٨ |

| | |
|---|---|
| ٤٢-حەفتاو دوو کۆمەڵ بۆ ناو ئاگرن | ٣٩٨ |
| ٤٣- موفلیسو قەللۆش | ٣٩٩ |
| **بەشی شەشەم: نهێنی زۆری ژمارەی دۆزەخی یەکان و بەتایبەتی لەئافرەتان** | **٤٠١** |
| نهێنی زۆری ژمارەی ئەهلی ئاگر: | ٤٠٢ |
| زۆری ئافرەت لەئاگری دۆزەخ | ٤٠٦ |
| **بەشی حەوتەم: خراپی لەکۆتایی ژیاندا** | **٤٠٩** |
| هۆکارەکانی کۆتا خراپی ژیان | ٤١٣ |
| **بەشی هەشتەم: چەند چیرۆکێك دەربارەی کۆتا خراپی ژیان بۆ پەند وەرگرتن** | **٤١٥** |
| چیرۆکی یەکەم: ((برادەرەکەی خۆمم دەوێ)) | ٤١٥ |
| چیرۆکی دووەم: ((جگەرەیەکم بدەنێ)) | ٤١٩ |
| چیرۆکی سێ یەم: ((من لەدۆزەخم)) | ٤١٩ |
| چیرۆکی چوارەم: ((بەراستی جوێنی بە دین دا)) | ٤٢٠ |
| چیرۆکی پێنجەم: ((لەنەخۆشخانە)) | ٤٢١ |
| چیرۆکی شەشەم: ((لەناو تۆتۆمبێل)) | ٤٢٢ |
| چیرۆکی حەوتەم: ((لەبانکۆك)) | ٤٢٣ |
| چیرۆکی هەشتەم: ((شەوە سوورەکە)) | ٤٢٤ |
| چیرۆکی نۆیەم: لەدوورگەکانی هیند | ٤٢٥ |
| چیرۆکی دەیەم: ئەو ئافرەتە سفورەی کەنوێژی نەدەکرد | ٤٣٠ |
| چیرۆکی یازدەم:سایتێکی بەڕەڵایی | ٤٣١ |
| چیرۆکی دوازدەم: مردن لەسەر کاری خراپ | ٤٣٣ |
| چیرۆکی سێزدەم: کچێك دەنێژرێ کاتێ لەحاڵەتی سەماکردن دایە | ٤٣٥ |

| | |
|---|---|
| چیرۆکی چواردەم: کچێك بەربەرەکانی خوا دەکات | ٤٤١ |
| چیرۆکی پازدەیەم: بەراستی من جێگای خۆم لەناو ئاگر دەبینم | ٤٤٢ |
| چیرۆکی شازدەهەم: قورئانێکم بدەنێ | ٤٤٤ |
| چیرۆکی حەڤدەهەم: شای رخ | ٤٤٤ |
| چیرۆکی هەژدەهەم : دوورە.. تازە رۆیی | ٤٤٥ |
| چیرۆکی نۆزدەهەم:لەرەمەزان | ٤٤٥ |
| ترسی پیاوچاکانی پێشینان لەکۆتا خراپی ژیا | ٤٤٦ |
| **بەشی نۆیەم: فیتنەی گۆڕ، خۆش گوزەرانیو سزاکە** | **٤٤٩** |
| سزای بەرزەخ ئایا سزای بەرزەخ لەسەر گیانە یان جەستەیە یان لەسەر هەردووکیانە؟ | ٤٥٢ |
| کۆتایی | ٤٥٣ |
| ناوەرۆك | ٤٥٤ |


سوپاس بۆ خوا کیتابەکە تەواو بوو

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

مقدمة: نحن دار ابن حجر، سوريا- دمشق.

نصرح بأننا قد أعطينا الإذن بطباعة كتاب أهل النار لمكتبة محوي في إربيل العراق باللغة الكردية، وله الحق في ذلك دون سواه.

وبناءً عليه أُعطي هذه الموافقة، وذلك بتاريخ ١/١/٢٠١٥م.

والله ولي التوفيق.

صاحب ومدير دار ابن حجر

يوسف الحاج أحمد